# مختصر صحيح البخاري

المسمى بـ:

# التجريد الصريح

دانراوی: أبی العباس زين الدين الزبيدی

به کوردی کردن و لیکۆلینه‌وه‌ی

نوری فارس حمه خان

بەگوێرەی تەخریجی (د. مصطفى دیب البغا) تەخریج کراوە

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە

دار المعرفة
بيروت - لبنان

# مُخْتَصَر صَحِيحْ الْبُخَارِي

المُسَمَّى

# بِالتَّجْرِيدْ الصَّرِيحْ

دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى

به كوردى كردن و ليّكۆلّينەوەى

نورى فارس حمه خان

بەگويّرەى تەخريجى ( د. مصطفى ديب البغا ) تەخريج كراوە

محمود أحمد محمد

پيّيدا چۆتەوەو سەرپەرشتى لە چاپدانى كردووە

2010 ز 1431 ك

بەرگى سيّهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**********************************************

📖 ناوی کتێب: مختصر صحيح البخاري المسمى بـ( التجريد الصريح ).

📖 دانراوی: ابي العباس زين الدين الزبيدي.

📖 وەرگێرانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ ( ٢٥٠٠ ) دووهەزارو پێنج سەد دانـە.

📖 ژمارەی سپاردن: ( ٢٤٦٤ سالی ٢٠٠٩ ).

📖 سالی چاپ: ٢٠١٠ ز ١٤٣١ ك

📖 کۆمپیوتەرو هەڵە چنین: ( روبار حسين/کۆمپیوتەری شانیا )

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپ کراوە. 

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٣٩- نامەی کڕینو فرۆشتن (كتاب البيوع)

(فیقهی ئاسان/٢/ ٤٤٣ز - ١٨٥) (بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە بفەرمووە موتالای بەرگی /٢ل –٤٤٣ز –١٨٥ بفەرمووە).

٩٩٣- عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (رضي الله عنهُ) لَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ آخَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ الرَّبِيعِ: إِنِّي أَكْثَرُ الأَنْصَارِ مَالا فَأَقْسِمُ لَكَ نِصْفَ مَالِي وَانْظُرْ أَيَّ زَوْجَتَيَّ هَوِيتَ نَزَلْتُ لَكَ عَنْهَا فَإِذَا حَلَّتْ تَزَوَّجْتَهَا، قَالَ: فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: لا حَاجَةَ لِي فِي ذَلِكَ، هَلْ مِنْ سُوقٍ فِيهِ تِجَارَةٌ؟ قَالَ: سُوقُ قَيْنُقَاعٍ، قَالَ: فَغَدَا إِلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَأَتَى بِأَقِطٍ وَسَمْنٍ قَالَ: ثُمَّ تَابَعَ الْغُدُوَّ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ عَلَيْهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (تَزَوَّجْتَ) قَالَ: نَعَمْ قَالَ: (وَمَنْ) قَالَ: امْرَأَةً مِنْ الأَنْصَارِ قَالَ: (كَمْ سُقْتَ؟) قَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ نَوَاةً مِنْ ذَهَبٍ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ). (الحديث ٢٠٤٨- أطرافه في: ٣٧٨٠، ٣٠٤٩، ٢٢٩٣، ٣٧٨١,٣٩٣٧,٥٠٧٢، ٥١٤٨، ٥١٥٣، ٥١٥٥، ٥١٦٧، ٦٠٨٢، ٦٣٨٦)[1].

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئێمەی کۆچکاران کۆچمان کرد بۆ مەدینە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لە نێوانی منو سەعدی کوڕی رەبیع دا، سەعد پێی گوتم: من لە هەموو یاریدەدەران (ئەنصار) دەوڵەمەندترم، هەرچی ماڵم هەیە لەبەینی خۆمو خۆتا دەیکەم بەدوو کوتەوەو نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ تۆ، دوو ژنیشم هەیە سەرنج بدە کامەیانت بەدڵە پێم بڵێ، تەلاقی دەدەم بۆت، کەی حەیەی هەڵهاتو عیددەی تەواو بوو مارەی بکە بۆ خۆت! منیش گوتم: خوا پیتو

(١) لم يوافقه مسلم على تخريجه ( فتح/٤ /٤٢٧- خاتمة كتاب البيوع ) – المترجم.

فەڕو پیرۆزیو بەرەكەت برژێنێ بەسەر خۆتو ماڵو منداڵتا، خوا سەد ئەوەندەت بداتێ من ئەوە ناكەم، كارم بەوە نییە، بەڵام پێم بڵێ بازاڕەكەتان لە كوێیە؟ ئەویش بازاڕی بەنو قەینوقاعی پێ نیشان دام ئیتر چووم بۆ بازاڕو نەگەڕامەوە، هەتا هەندێ كەشكو رۆنم لەگەڵ خۆم نەبردەوە، لەوەدوا سەرومڕ دەچووم بۆ بازاڕو سەوداو ئاڵو وێڵم دەكرد

هەتا رۆژێ چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نیشانەی زاواییم پێوە بوو، وەك شوێنەواری زەردیو بۆنی خۆش. حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم رەنگو بۆنە چییە؟ عەرزم كرد: ژنم هێناوە، لەیاریدەدەرانە، فەرمووی: چەندت مارەیی پێ داوە؟ گوتم: سەنگی ناوكەیێ زێڕ فەرمووی: (نانی شایی دروست كە، بابەكردنی گۆشتی مەڕێكیش بێ بەنانی شایی). (تاج /٥ / ٢٠٢ز- ٥٨ ف –١-ش/د). (فیقهی ئاسان/٢ل –٤٤٣ز-١٨٥).

## راڤەو روونكردنەوە:

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەبابەتەكەوە، بەهۆی بازاڕو بازرگانیەوەیە.

١- واتای پەیمانی برایەتی بەستن ئەمە بوو: دوو پیاو پەیمان گرێ دەدەن كە كۆمەكیو یارمەتی یەكتری بدەن و، هاوبەشی خەمو پەژارەو خۆشیو ناخۆشی یەكتری بكەن و، وەك دوو برای پشتیان لێ بێ، پەیمانی برایەتی لەنێوان موسوڵمانانا دوو جار لە سەردەمی پێغەمبەردا رووی داوە: جارێ لەمەككە لەنێوانی موسوڵمانەكانی مەككەدا، لەپێش كۆچدا جارێكیش لەمەدینە لەپاش كۆچ، لە نێوانی كۆچكارانو یاریدەدەرانا، پاش ئەوەی كە مزگەوتەكەی مەدینە دروست كرا، تەنانەت بەهۆی ئەم گرێدانی برایەتییەوە، كەلەپورو میراتیان لەیەكتری دەگرت نەوەك بەهۆی هاوپشتیو خزمایەتیەوە، هەتا ئایەت هات كە دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾. سورەتی ئەنفال، ٨/ ٧٥. واتە: (ئەوانەی كەخزمو خوێشی

یەکترین و رشتەی خوێشایەتی لەنێوانیانا هەیە، ئەوانە لەبەرترن بۆ یەکتری، هەتا کەسێکی تری بێگانە، بەپێی یاساو دەستوری قورئانی پیرۆز، کەنامەی بەرنامەکەی خوایە).

٢- هۆی بەستنی ئەم پەیمانی برایەتییە، پێویستی کۆچکاران بوو، بەکۆمەکی و یارمەتی یاریدەدەران، بەتایبەتی لەرووی داراییەوە.

٣- نانی شایی سونەتێکی گەورەیە: (بڕ: تاج/٣/ ٩٢، فیقهی ئاسان/٢/٦٤٢ز —٢٦٦- باسی: نانی شایی).

٤- لەبارەی واتای (ناوکەیێ زێڕ) وە، چەند راو بۆچوونێك هەیە، هەیە دەفەرموێ: (ناوکەیێ کێشی پێنج درەمە، هەیە دەفەرموێ: کەمترە یان زیاترە).

٥- پیاوانی ئەم رشتەیە، کە پێنج کەسن، گشتیان مەدینەیین هەندێ کێشە لەسەر إرسال یاوەصلی ئەم فەرموودە هەیە.

٦- ئەورەحمانی کوڕی عەوف (رەزای خوای لێ بێ) لەو دەکەسەیە کە پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، ناسراون بە (عەشەرەی موبەشەرە = دە کەسە موژدە پێدراوەکان) یەکێکە لەو شەش کەسەیش کە پێشەوا عومەر، لەپاش پێکانی خۆی لەسەرەمەرگا، دەسنیشانی کردن کە یەکێکیان لێ هەڵبژێرن بۆ جێگەنشین، چونکە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا لێیان رازی بووە.

بەدەساڵ لەپاش ساڵی عامول فیل لەدایك بووە، واتە: دەساڵ لە پێغەمبەر منالتر بووە، لەپێش ئەوەدا کەموسوڵمانان بەدزییەوە، لەماڵی ئەرقەم دا، ناوبەناو کۆببنەوە موسوڵمان بووە، دوو کۆچی ئەنجام داوە، کۆچی یەکەم بۆ حەبەشەو کۆچی دووە بۆ مەدینە، بەدری بوو، ئامادەی غەزای بەدرو شەڕگەکانی تری پاش بەدر بووە. لەجەنگی ئوحود دا بیست ویەك زامی لێ کرا، بەهۆی یەکێك لەو زامانەوە دەلەنگی، لەپێشا ناوی

عەبدولکەعبە بوو پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) گۆڕی بە عەبدولڕەحمان، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ناردی بۆ ئازادکردنی دەومەتول جەندەل، بەدەستی خۆی مێزەری بۆ پێچایەوەو لفکەکەی بەناو شانیدا شۆڕکردەوە، پێی فەرموو: (ئەگەر خوا لەسەر دەستی تۆدا ئەم وڵاتەی ئازاد کرد، کچی پادشاکەیان بهێنە بۆ خۆت). پادشاکەیان ناوی ئەصبەغی کوڕی ثەعلەبەی ئەل-کەلبی بوو، کچەکە ناوی تەماضیر بوو، کوڕێکی لێی بوو ناوی ئەبو سەلەمەی فەقیەبوو، شەرعزانێکی گەورە بوو، ئەم زاتانە لە عەبدولڕەحمانەوە، فەرموودەی پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە: کوڕەکانی خۆی ئیبراهیم‌و حەمیدو عومەرو موصعەب‌و ئەبوسەلەمەو، کوڕی کوڕی میسوەری کوڕی ئیبراهیم و، کوڕی خوشکی: میسوەری کوڕی مەخرەمە و، ئیبنو عەباس‌و ئیبنو عومەرو جوبەیری کوڕی موطعیم وجابیرو ئەنەس‌و کەسانی تریش.

لەبوخاری پیروزدا نۆ فەرموودەی هەیە، لە ژیانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) عەبدوڕەحمان فەتوای دەدا، لەسەردەمی پێغەمبەردا نیوەی دارایی خۆی بەخشی لەڕێگەی خوادا، دەوڵەمەندێکی گەورە بوو، زۆرینەی سامانەکەی هی بازرگانی بوو، لەسەر راوێژی ئەو ئیمامی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) لەسەرەفەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، نەچوو بۆ شام، تا موسوڵمانەکان لەو تاعوونە دوور بخاتەوە، کەلەشام بڵاوەبوو (بڕ: تاج/٤ل-١٧٧ف-٤).

لەسەر فەتوای عەبدوڕەحمان، ئیمامی عومەر، حیسابی ئەهلی کیتابی بۆ ئاگرپەرست (مەجووس) ەکان کردو، سەرانەی لێیان وەرگرت، ئەو ساڵەی کە عومەر بوو بەجێنشین عەبدوڕەحمانی کرد بە میرحەج، لەسەفەرێکا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) رکاتێ لەنوێژی بەیانی بەجەماعەت لەپشتیەوە کرد، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوچاکێکی راست‌و رەوان، لەپاش مەرگی خۆم ئاگاداری جوانی هاوسەرەکانم دەکا). ئەو پیاوچاکە

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو، دەیبردن بۆ حەج و کەژاوەی پەردەداری بۆ دەگرتنەوەو، لەڕێگە لەشوێنێکی بەڕێزی پەنادا بارو بنکەیانی دەخست بۆ وچان گرتن. راسپێری کرد، کەهەر کەسێ ئامادەی غەزای بەدر بووەو ماوە سەد لیرەی زێڕی پێ بدرێ، کەژمارديانن و راسپێرییەکەیان جێ بەجێ کرد، سەد پیاوی بەدری مابوون، زۆر زۆر سەخی بوو لەتەمەنی حەفتاو دووساڵیدا، لەمەدینە کۆچی دوایی کرد، لەسەر راسپێری خۆی ئیمامی عوثمان نوێژی تەرمی لەسەر کرد، لەگۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێرراوە. رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ.

٩٣٤- عن النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رضي الله عنهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الْحَلالُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَةٌ فَمَنْ تَرَكَ مَا شُبِّهَ عَلَيْهِ مِنْ الإِثْمِ كَانَ لِمَا اسْتَبَانَ أَتْرَكَ وَمَنْ اجْتَرَأَ عَلَى مَا يَشُكُّ فِيهِ مِنْ الإِثْمِ أَوْشَكَ أَنْ يُوَاقِعَ مَا اسْتَبَانَ وَالْمَعَاصِي حِمَى اللَّهِ مَنْ يَرْتَعْ حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ) (انظر: رقم ٤٨- الذي سبق) (الحديث: ٢٠٥١، طرفه في: ٤٨ت=٥٢ف) [٢].

ئەم فەرمووده پیرۆزەیە لەپێشەوە، لەژمارە (٤٨) دا رابورد، بەلام گێڕانەوەی ئێرەی پتری بەسوودی واتیادا (بڕ: تاج/٢/٢٩٦ف -ا ز-١٤٥) :

نوعمانی کوڕی بەشیر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (شتی حەڵاڵ دیارو ئاشکرایە، هەروەها شتی حەرامیش دیارو ئاشکرایە، پێویستیان بەروونکردنەوە: ی فرە نییە، بگرە هەموو کەس وەك یەك دەیانزانێ، بەلام لەم بەینەدا هەندێ شت هەن، دوو بەینین و لە هەردوولا دەچن، لەبەر ئەوە گەلێ کەس سەریان لێ دەرناکەن و، حوکمەکەیان لە شەرعا نازانن، بەلام زانایانی شەرع، لەپاش پەیجۆری و لێکۆڵینەوەیەکی باش حوکمەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیاردەدەن

(٢) راجع رقم: ٤٨ ← (ب/١/ ٧٢) - المترجم.

کەحەلاڵن، یاحەرامن، ئەوسا بۆ خەڵکی تریش هەیە، لەسەر بڕیاری ئەوان شتەکە بکەن، یا نەیکەن، جا ئەوەی کە خۆی بپارێزێ لەشتێ گومانی گوناهی لێ بکرێ، ئەوە لەحەرامی ئاشکرا باشتر خۆی دەپارێزێ، بەڵام ئەوەی کە کۆ لەو شتە نەکاتەوە کە گومانی گوناهی لێ دەکرێ بەرەبەرە توشی حەرامی تەواویش دەبێ، گوناهان پاکژو پاوەندەکانی خودان، بزانن کەبەستو پاوەندی خودایش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون، هەرکەسێ ران لەدەوری پاکژو پاوەند بلەوەڕێنێ بەرەبەرە رانەکە لەپاوەندەکەیش دەلەوەڕێ). (بڕ: ژمارە: ٤٨، + بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٤٣ رياض الصالحين).

٩٣٥-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ عُتْبَةُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَى أَخِيهِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ أَنَّ ابْنَ وَلِيدَةِ زَمْعَةَ مِنِّي فَاقْبِضْهُ قَالَتْ فَلَمَّا كَانَ عَامَ الْفَتْحِ أَخَذَهُ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَقَالَ ابْنُ أَخِي قَدْ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ فَقَامَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فَقَالَ أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ فَتَسَاوَقَا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أَخِي كَانَ قَدْ عَهِدَ إِلَيَّ فِيهِ فَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ أَخِي وَابْنُ وَلِيدَةِ أَبِي وُلِدَ عَلَى فِرَاشِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ) ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ). ثُمَّ قَالَ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (احْتَجِبِي مِنْهُ لِمَا رَأَى مِنْ شَبَهِهِ بِعُتْبَةَ فَمَا رَآهَا حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ) (الحديث ٢٠٥٣- أطرافه في: ٢٢١٨، ٢٤٢١، ٢٥٢٣، ٢٧٤٥,٤٣٠٣، ٦٧٤٩، ٦٧٦٥، ٦٨١٧، ٧١٨٢)[٣].

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاص، سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصی برای راسپاردبوو: کە کوڕەکەی کەنیزەکەکەی زەمعە لە منە، وەری بگرەوە، عائیشە فەرمووی: جا ساڵی فەتحی مەککە پاش

(٣) أخرجه مسلم في الرضاع، باب: الوَلدُ للفراشِ وتوقي الشبَهات رقم: ١٤٥٧

ئازادکردنی مەککە، سەعد راسپێریەکەی براکەی جێ بەجێ کردو کوڕەکەی لێ سەندنەوە وەبردیە لای خۆی جا بۆ دادگایی چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برازای منەو کوڕی عوتبەی برامەو، کاتی خۆی عوتبە منی راسپاردووە کە ئەم خولامە کوڕی ئەوە، فەرموو تەماشای شێوەیشی بکە، شێوەی رێك لە عوتبەی برام دەچێو کوتو مت لەو دەکا. عەبدی کوڕی زەمعەیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە برای منە، لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووەو لەکۆشی ژنێ کەوتۆتە خوارەوە کە کەنیزەکی شەرعی باوکم بووە. پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) کەسەرنجی شێوەی خولامەکەی دا، روانی شێوەی تەواو لە عوتبە دەچێ بەڵام فەرمووی:

(ئەی عەبدی کوڕی زەمعە! ئەمە هی تۆیەو، ئەم خولامە شەرع دەیدا بەتۆ، چونکە منالٚ هی مێردی ئەو ژنەیە کە ئەو منالٚەی لێ دەبێ، یا هی خاوەنی ئەو کەنیزەکەیە کە بێ مێرد بێو خۆی چوبێتە لای، بەپێی دەستووری مولکول یەمین، هەناسە ساردیش بۆ داوێن پیس دەمێنێتەوە). لەپاشا بە سەودەی کچی زەمعەی فەرموو، کە خێزانی خۆی بوو: (ئەی سەودە پەچە پۆشی لێ بکە حیجابی لێ بگرەوە) واتە حیسابی برای بۆ مەکە، چونکە شێوەی لە عوتبە ئەچوو نەوەك لە زەمعەی باوکی سەودە. ئیتر ئەو کوڕە هەتا مردوو چووە دیوانی خودا چاوی بە سەودە نەکەوت) (تاج/٣/ ١٧٠ف١).

## راڤەو روونکردنەوە:

بنەمای ئەم سەرگوزەشتەیە ئاوایە، لەسەردەمی نەزانیدا هەندێك کەس کەنیزەك (ئەمەتە=جاریە) ی رادەگرت، دەیدان بەکرێ بۆ داوێنپیسی، لەم نێوانەدا خاوەنەکەشیان دەچوونە لایان، جا ئەو جۆرە کەنیزەکانە کە

منالّیان دەبوو، یائاغای کەنیزەکەکە دەیکرد بەهی خۆی یا ئەوەی لەگەڵ دایکی ئەو داوێن پیسی کردبوو، ئەو منالّەی دەکرد بەهی خۆی. جا ئەو خولامەی ئەم کێشەیەی لەبارەوە دروست بوو بوو لەم جۆرە بوو، ئەم خولامە ناوی عەبدورەحمانی کوری زەمعە بوو، ناوی لەناو هاورێیانی پێغەمبەردا هاتووە، سەودەی کچی زەمعە قورەیشییە، عامیرییە، هاوسەری پێغەمبەرە لەپاش وەفاتی خەدیجە مارەی کرد، لەمەککە گواستیەوە، لە ئاخرو ئۆخری سەردەمی پێشەوا عومەردا کۆچی دوایی کردوە — رەزاو رەحمەتی خودایگەورەی لەسەر بێ — (بڕ: تاج/٣ /١٢٨ ف-٤+٥ز-٥٠+ز-٤٨ل — ١١٩ف-١+ تاج/٥/ ١٥٨ز —٣٨ ف -١) +(بڕ: ژمارە ٢٦ب /١ ل - ٤٧).

ئەم عوتبەیەی کە خاوەنی ئەم راسپێرییە یە، لەشەڕی ئوحوددا سەری پێغەمبەری شکاندو ددانی شەهید کرد، هەندێک دەڵێن: ئیسلام بووە، جەماوەر بەصەحابەیان دانەناوە، هەندێ دەفەرموون: بەکافری مردووە.

٩٣٦– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) : أَنَّ قَوْمًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ لا نَدْرِي أَذَكَرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (سَمُّوا اللَّهَ عَلَيْهِ وَكُلُوهُ). (٢٠٥٧ – طرفاهُ في: ٥٥٠٧، ٧٣٩٨) (٤).

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جاری وا هەیە رێدەکەوێ هەندێ کەسی نۆ موسوڵمان، کە هێشتا بەباشی فێری یاساکانی ئیسلامەتی نەبوون، وادەبێ ئەو جۆرە تازە موسوڵمانانە، گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین لەکاتی سەربڕینا، ناوی خودایان لێ هێناوە یا نا، جا ئایا لێ ی بخۆین یا نا؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ) : (خۆتان ناوی خوا بهێنن و بیخۆن). (تاج/٤/ ٢٨ف -١- د/ب/ن)

---

(٤) والحديث انفرد به البخاريُ (عيني/١١/ ١٧٢ حديث رقم /١١) المترجم.

## راڤەو روونكردنەوە:

پەیوەندی ئەم فەرموودانە بەبابەتی كڕینو فرۆشتنەوە زۆر روونو ئاشكرا نییە، بەڵام مەبەستی پێشەوا بوخاری لە هێنانیان لەم بابەتەدا، ئەوەیە: كە خاییلەو دڵەڕاوكێو وەسواسو شتی گومان لێ كراو، ئەگەر خاییلەی رووت بوو، لەسەر یاساو رێسایێ نەبوو ئەوە لەبابەتی كڕینو فرۆشتنیشا وەك بابەتەكانی تر بایەخی نییە، ئەنا ئەگەر جێگەی دوو دڵی بوو، جێگەی متمانەی تەواو نەبوو، ئەوە وەك لەم فەرموودانەدا روون كراوەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكەی باشە.

٩٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لا يُبَالِي الْمَرْءُ مَا أَخَذَ مِنْهُ أَمِنَ الْحَلالِ أَمْ مِنْ الْحَرَامِ) (الحديث ٢٠٥٩- طرفه في: ٢٠٨٣) [(٥)].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەردوم دەكەونە چەرخو سەردەمێكی واوە، مرۆڤ دەربەستی ئەوە نایەت كە ئەو ماڵەی پەیدای دەكا حەڵاڵە یا حەرامە، دەربەستی حەڵاڵو حەرام نایێ). (تاج/ ٢/ ٢٩٧ف -٢).

٩٣٨- عَنْ الْبَرَاء بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رضي الله عنهما) قَالا: كُنَّا تَاجِرَيْنِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الصَّرْفِ فَقَالَ: (إِنْ كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلا بَأْسَ وَإِنْ كَانَ نَسَاءً فَلا يَصْلُحُ). (الحديث ٢٠٦٠-أطرافهُ في: ٢١٨٠، ٢٤٩٧، ٣٩٣٩) (الحديث ٢٠٦١-أطرافهُ في: ٢١٨١، ٢٤٩٨، ٣٩٤٠) [(٦)].

---

(٥) لم يوافقه مسلم على تخريجهِ (فتح/٤ / ٤٢٧ -خاتمة) المترجم.

(٦) وأخرجه مسلم في البيوع (عيني /١١/١٧٥) انظر صح /١١/١٦ -باب- الرِّبا- المترجم

بەرائی کوڕی عازیبو زەیدی کوڕی ئەرقەم(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویان: لەسەردەمی پێغەمبەردا، ئێمە دوو بازرگان بووین لەبارەی گۆڕینەوەی پارەوە بەپارەی تر (وەك فرۆشتنی زیو بەزێڕ) لەپێغەمبەرمان پرسی، فەرمووی: ئەگەر دەست بەدەست بێ(ونەخت بێ) قەیناکات، بەڵام ئەگەر دەست بەدەست نەبێ نابێ).

**ڕوونکردنەوە:**

پارە وردکردنەوە بەر بڕیاری ئەم فەرموودەیە دەکەوێ، وەك گۆڕینەوەی پارەی کاغەز دەیی‌و پێنجی، بەپارەی تری وەك دیناری نیکڵ‌و پوولی مس.

٩٣٩- عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَيْرٍ: أَنَّ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ(رضي اللهُ عنهُ) اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي اللهُ عنهُ) فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ وَكَأَنَّهُ كَانَ مَشْغُولا فَرَجَعَ أَبُو مُوسَى فَفَرَغَ عُمَرُ فَقَالَ: أَلَمْ أَسْمَعْ صَوْتَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ! ائْذَنُوا لَهُ قِيلَ قَدْ رَجَعَ فَدَعَاهُ فَقَالَ: كُنَّا نُؤْمَرُ بِذَلِكَ فَقَالَ تَأْتِينِي عَلَى ذَلِكَ بِالْبَيِّنَةِ فَانْطَلَقَ إِلَى مَجْلِسِ الأَنْصَارِ فَسَأَلَهُمْ فَقَالُوا لا يَشْهَدُ لَكَ عَلَى هَذَا إِلا أَصْغَرُنَا أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ فَذَهَبَ بِأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ فَقَالَ عُمَرُ: أَخَفِيَ هَذَا عَلَيَّ مِنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلْهَانِي الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ يَعْنِي الْخُرُوجَ إِلَى تِجَارَةٍ (الحديث ٢٠٦٢- طرفاه في: ٦٢٤٥، ٧٢٥٣) [٧].

گێڕانەوەی تاجول ئوصول ئاوایە، دەیکەین بەراڤە بۆ گێڕانەوەی ئێرە. ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەناو کوڕێ لەکۆڕەکانی یاریدەدەران (أنصار) دا، دانیشتبووم، تەماشام کرد وا ئەبوموسای ئەشعەری

---

(٧) أخرجه مسلم في الإستئذان (عين/١١/١٧٦) ص لاح/١٤/ ١٣١-١٣٥- (حم/١٤/ ١٣١ = شرح صحيح مسلم ــج /١٤ص ١٣١) المترجم.

بەشڵەژاوی هات بەرەو ئێمە، گوتمان: ها خێرە وا پەشۆکاوی ؟ فەرمووی: عومەر ناردبووی بەدواما، ڕۆیشتم بۆ لای کە گەیشتمە بەردرگاکەی سێ جار سڵاوم کرد، بەڵام کەسێ وەڵامی نەدامەوە، ئیتر منیش گەڕامەوەو نەچوومە ژوورەوە (وەك بڵێی لەو کاتەدا عومەر سەرقاڵ بوو بێ، کاتێ لێی دەبێتەوە دەڵێ: ئەرێ وادەزانم گوێم لەدەنگی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس بوو، ئادەی ڕێگەی پێ بدەن بابێتە ژوورەوە عەرزی دەکەن: گەڕاوەتەوە) دیسان ناردیەوە بەشوێنما، کەچووم فەرمووی: بۆ نەهاتیت بۆ لام؟ گوتم: من هاتم بۆ لاتو سێ جار لەبەردرگاکەتدا سڵاوم کرد، کەس وەڵامی نەدامەوە ئیتر منیش گەڕامەوە، چونکە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەئێوە سێ جار داوای ڕێگاپێدانی کرد، کە بچێتە ماڵەوە، بەڵام ڕێگەیان پێ نەدا، ئیتر بابگەڕێتەوە ئێستایش عومەر پێم دەڵێ: بەڵگە راست بکەرەوە لەسەر سەلماندنی ئەم فەرموودەیەی کە دەیگێڕیتەوە، ئەگینا ئێشت پێ دەگەیەنم!).

ئەوجا ئوبەی کوڕی کەعب فەرمووی: دەبێ بچوکترینی ئەم کۆمەڵی ئەم کۆڕی دانیشتنە، ئەم شایەتیەت بۆ بدا، ئەبو سەعید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منیش گوتم: دەی من بچوکترین کەسم لەناوتان دا فەرمووی: دەبیبە لەگەڵ خۆت، منیش هەڵسامو چووم بۆ لای عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) گوتم: من ئەوەم لە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بیستووە. عومەریش(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە بۆ ئەم یاسا جوانەی پێغەمبەرم لە دەست چووە؟ دیارە بەهۆی مشووری ئاڵو وێڵی بازاڕەوە نەم پەرژاوەتە سەر فێربوونی ئەم دەستووراتە، خەریکبوون بەبازرگانیەوە ئەمەی لەدەست داوم. (تاج/١٠/١٠٥-ش/د/ت-ف-١).

٩٤٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي اللهُ عنهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ). (الحديث ٢٠٦٧- طرفه في: ٥٩٨٦) [٨]

---

(٨) أخرجه مسلم في البرّ والصلة، باب صلة الرحم وتحريم قطيعتها، رقم ٢٥٥٧.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: گوێم لێ بوو خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەو کەسەی کە حەز دەکا رزق و رۆزی زۆر بێ و تەمەنی درێژبێ باخزم دۆست بێ، سیلەی رەحمی خۆی بەجێ بهێنێ) (تاج/٩/٤١-٢).

٩٤١- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنهُ) أَنَّهُ مَشَى إِلَى النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخُبْزِ شَعِيرٍ وَإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ وَلَقَدْ رَهَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دِرْعًا لَهُ بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ يَهُودِيٍّ وَأَخَذَ مِنْهُ شَعِيرًا لأَهْلِهِ وَلَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَا أَمْسَى عِنْدَ آلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَاعُ بُرٍّ وَلا صَاعُ حَبٍّ وَإِنَّ عِنْدَهُ لَتِسْعَ نِسْوَةٍ) (٩).

ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینە، زریەکەی خۆی لەبارمتەی هەنێ جۆدا، لەلای جولەکەیێ دانابوو، جارێ نانی جۆو هەندێ رۆنە زەنگی پیوم بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) برد، گوێم لێ بوو، دەیفەرموو: (خێزانەکانی موحەممەد - دروودی خودا لەسەر خۆی و رەزای خودا لە خێزانەکانی – یەك مەن گەنم یا یەك مەن دانەوێڵە چییە لەماڵیان دا نییە، چ بۆ بەیانی چ بۆ ئێوارەیان، ئەو کاتەش حەزرەت نۆ ماڵی هەبوو). (ریاض/٢/٧٨ ژ: ١٠/٥٠٥ز-٥٦).

٩٤٢-عَنْ الْمِقْدَامِ(رضي الله عنهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلام كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ) (الحديث ٢٠٧٢) انظر: (٣٤١٧,٤٧١٣ف) (١٠).

---

(٩) وافقه مُسلمٌ على تخريجهِ وخاتمة كتاب البيوع. (فتح/٤/٤٢٧) المترجم.

(١٠) لم يوافقه مُسلمٌ على تخريجهِ(خاتمة كتاب البيوع ج/٤/٤٢٧) المترجم.

ميقدام (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (هیچ نانێ وەك ئەوە باش نییە كە مرۆڤ لە رەنجەشانی خۆی بخوات، داود كە پێغەمبەری خوا بوو (سەلامی خوای لێ بێ) هەر لە بەری رەنجەشانی خۆی دەخوارد) لە گێڕانەوەیەكی تاج دا: (هەر لەدەست كەوتی رەنجی شانی خۆی دەخوارد).

## باسی مامەڵە خۆشی

٩٤٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَحِمَ اللَّهُ رَجُلا سَمْحًا إِذَا بَاعَ وَإِذَا اشْتَرَى وَإِذَا اقْتَضَى) (الحديث٢٠٧٦) (١١).

جابیری كوڕی عەبدوڵلا - رەزای خودا لەخۆیو باوكی- فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (رەحمەتی خوا لەوكەسە بێت كە لەسەوداو كڕینو فرۆشتنو داواكردنی هەقی خۆی دا، مامەڵە خۆشو نەرمونیان بێ، بەتایبەتی لەكاتی داواكردنی قەرزی خۆی دا، یالەكاتی دانەوەی قەرزی سەریدا) (تاج/٢/٣٠٣ز-١٤٧ ف-٨ + ریاض /٣/٩٩٢-٢).

٩٤٤- عنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَلَقَّتِ الْمَلَائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ قَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنْ الْخَيْرِ شَيْئًا؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا المعسرَ وَيَتَجَاوَزُوا عَنْ الْمُوسِرِ قَالَ: قَالَ: فَتَجَاوَزُ الله عنه). (الحديث ٢٠٧٧ – طرفاه في: ٢٣٩١، ٣٤٥١) (١٢).

حوذەیفە(رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەكاتی گیانكێشان دا، فریشتەكانی خوا گیانی پیاوێكیان وەرگرت كەلە نەتەوەكانی پێش ئێوە بوو، پێیان فەرموو: ئایا لەژیانتا هیچ چاكەیەكت كردووە؟ گوتی:

---

(١١) لم يوافقه مُسلمٌ على تخريجه(فتح/٤/٤٢٨- خاتمة كتاب البيوع) المترجم.

(١٢) أخرجه مسلم في المساقاة باب: فضل انظار المعسر، رقم: ١٥٦٠.

بەلێ قەرزم دەدا بەخەڵك دەستورم وابوو، بەپیاوەکانی خۆمم دەگوت: لەکاتی قەرز وەرگرتنەوەدا بیکەن بەعادەت: مۆڵەتی قەرزاری نەدارا بدەن و، لەگەڵ قەرزاری دەوڵەمەندیشا چاوپۆشی بکەن، مامەڵەتان خۆش بی، خودای گەورەش بەفریشتەکانی خۆی دەفەرموێ: ئێوەش چاوپۆشی لەو بکەن!) (تاج/٢/٣٠٤ ز-١٤٧ف -٩+ ریاض٣/٩٩٢ - ف -٣، ٤، ٥,٦ز-٢٤٠).

٩٤٥- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتفَرَّقَا) أَوْ قَالَ: (حَتَّى يَتفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا) (الحديث ٢٠٧٩ - أطرافُهُ في: ٢٠٨٢، ٢١٠٨، ٢١١٠، ٢١١٤) [١٣].

حەکیمی کوڕی حیزام (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کڕیارو فرۆشیار هەردوولایان خۆیان سەرپشکن و دەتوانن پەشیمان ببنەوە، هەتا لەیەکتری جیادەبنەوە، جائەگەر لەگەڵ یەکتریدا، ڕاست و دروست بن و شت لەیەکتری نەشارنەوەو، نەنگی شاراوەی سەوداکە حەشارنەدەن، ئەوە ئەو سەودایەیان پیت و فەڕی تێدەکەوێ بۆیان، بەلام ئەگەر لەگەڵ یەکتری ناڕاست بن و شت لەیەکتری حەشار بدەن ئەوا پیت و فەڕی سەوداکەیان دەچێ بەحەوادا) (تاج/٢/٣١١ف٥ز -١٤٩- ش/د/ت/ن).

٩٤٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا نُرْزَقُ تَمْرَ الْجَمْعِ وَهُوَ الْخِلْطُ مِنْ التَّمْرِ وَكُنَّا نَبِيعُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا صَاعَيْنِ بِصَاعٍ وَلا دِرْهَمَيْنِ بِدِرْهَمٍ) (الحديث ٢٠٨٠) [١٤].

ئەبوسەعید (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: تێکەڵەی خورمامان دەدرایە لەو خورما جۆراو جۆرەی کەلە هی زەکات کۆوە کرابوو، کەوەك مزە ئاش، باش و خراپی تێدا بوو، ئەوەیان لەباتی یارمەتی دەداینێ. ئێمەش دوو مەنمان لەو

---

(١٣) أخرجه مسلم في البيوع، باب: الصدق في البيع والبيان، رقم: ١٥٣٢.

(١٤) أخرجه مسلم في المساقاة، باب بيع الطعام مثلاً بمثل، رقم: ١٥٩٥ وهذا الحديث من أفراد البخاري (عيني/١١/٢٠٣) المترجم.

تێـكەڵەیە دەدا بەیـەك مـەن خورمـای تـری یـەك چەشـنی باشـتر، جا بـەم بۆنەیەوە خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی پێمـان: (شـتی‌وا مەكـەن دوو مەن بەمەنێك‌و دوو درەم بەدرەمێك مامەڵەی وا سوودە دروست نییە).

٩٤٧- عنْ أَبِي جُحَيْفَـةَ قَـالَ رَأَيْـتُ أَبِـي اشْـتَرَى عبْـداً حَجَّامًـا فَـأَمَرَ بِمَحَاجِمِـهِ فَكُسِرَتْ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ قَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الدَّمِ وَثَمَنِ الْكَلْبِ وَكَسْبِ الأمَةِ وَلَعَنَ الْوَاشِـمَةَ وَالْمُـسْتَوْشِمَةَ وَآكِـلَ الرِّبَـا وَمُوكِلَـهُ وَلَعَـنَ الْمُصَوِّرَ). (الحديث ٢٠٨٦ – أطرافهُ في: ٢٢٣٨، ٥٣٤٧، ٥٩٤٥، ٥٩٦١).

عەونی كوڕی ئەبوجوحەیفە فەرمووی: باوكم كۆیلەیـەكی كەڵەشاخگری كڕی، فەرمانی دا ئامێرەكانی كەڵەشاخگرتنەكەی شكاند، منیش لێم پرسـی: هۆی ئەمە چیبوو؟ فەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نـەهی كـردووە لـەم شتانە، لەبەهای سەگ‌و لەبەهای خوێن‌و، لەكرێی خاڵكوت‌و رێـگەیشی نەداوە كە ژن خاڵ بكوتێ بۆ خۆی، هەروا رێـگەی سـوودخۆرو سـووددەری نـەداوە، وەنەفرین‌و لەعنەتیشی كردووە لەوێنـەگر) (تـاج/٢/٣٢٦ف- ١. بڕوانـە: تـاج٤ل –١٩٤ سەرباسێ سەبارەت بەوێنەو وێنەگرتن).

**ڕوونكردنەوە:**

مەبەست لە (ثمن الدم = بـەهای خـوێن) ئـەو كـرێ‌و بەهایەیـە كەلـەباتی خوێنی گیاندار وەردەگیرێ، چ خوێنی مرۆڤ بێ، چ خـوێنی گیانـداری تـر بـێ، وەك كەسـێ كەڵەشـاخ لەكەسـێ بگـرێ‌و لەسـەر ئـەوە كرێـی لـێ وەربگـرێ، یاقاپێ خوێنی خۆی بفرۆشـێ بـە كەسێـكی تـر كـە پێویـستی بـە خـوێن بـێ، لـــەكاتی وادا ئەگـــەر خـــوێن وەرگـــر پاداشتێـــكی مـــاددی ببەخـــشێ بەخوێنبەخـشەكە، ئـەوە قەیـدی نییـە، بەمـەرجێ لەسـەر شـێوەی كـڕین‌و فرۆشتن‌و كرێی ئاسایی نەبێ.

بـەڵام گۆڕینـەوەی قـاپێ خـوێن بەقاپێـکی تـر وەك لەخەسـتەخانەو نەخۆشخانەکاندا، دەیکەن بـۆ ئاسـانکاری، ئـەوە قـەیـدی نییـە، هـەروەها کـرێ وەرگـرتن لەسـەر فەحـصی خـوێن، وەك لـەتاقیگاکان دەکـرێ قەیـدی نییـە، هـەروەها کـڕین‌و فرۆشـتنی ئـەم جـۆرە ئامێرانـە کـە بـۆ دەرهێنـانی خوێن‌و گواسـتنەوەی خـوێن‌و هەڵـگرتنی خـوێن بـەکاردەهێنرێن قەیـدی نییـە، وەك دەرزی‌و کیسی تایبـەت‌و ترمـسی تایبـەت، بـەقیاس لەسـەر کـڕین‌و فرۆشـتنی زەرووی پزیشکی‌و ئامێری کەڵەشاخگرتن.

بـەڵام هـەموو جـۆرە مامەڵەیـەکی تـر بەخوێنـەوە حەرامـە، وەك کەسـێ قەساب بێ خوێنەکە کۆبکاتـەوە هـەتا دەبـێ بـە تەنەکـەیێ، یاکـەمتر یازیـاتر، ئەوسا بیفرۆشێ بۆ پەیناوی گوڵ، یا بۆ مەبەستی تر، لەڕاستیدا هەنـدێ شت پەیـدا بـوون وەك کرێـی گووڕێـژو پـەین بـۆ پـەین‌و شـتی تـری وا، پێویـستی بەکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژە.

٩٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (الْحَلِفُ مُنَفِّقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مُمْحِقَةٌ لِلْبَرَكَةِ) (الحديث ٢٠٨٧) [(١٥)]

ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) لەپێغەمبـەرەوە (دروودی خـوای لەسەر بـێ) دەفـەرموێ: (سوێندی درۆ برەو بەفرۆشتنی کاڵا دەدا بەڵام پیت‌و بەرەکەتی مامەڵە دەبا) (تاج/٢/٣٠٠ف -٢).

٩٤٩- عَنْ خَبَّابٍ قَالَ كُنْتُ قَيْنًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ قَالَ لا أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَقُلْتُ لا أَكْفُرُ حَتَّى يُمِيتَكَ اللَّهُ ثُمَّ تُبْعَثَ قَالَ دَعْنِي حَتَّـى أَمُـوتَ وَأُبْعَـثَ فَسَأُوتَى مَالا وَوَلَدًا فَأَقْضِيكَ فَنَزَلَتْ أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لأُوتَيَنَّ مَالا وَوَلَدًا أَطَّلَعَ

(١٥) أخرجه مسلم في المساقاة باب: النهي عن الحلف في البيع رقم: ١٦٠٦.

الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا) (الحديث ٢٠٩١، أطرافُهُ في: ٢٢٧٥، ٢٤٢٥، ٤٧٣٢، ٤٧٣٣، ٤٧٣٤، ٤٧٣٥)[١٦].

خەببابی كوڕی ئەڕەتت(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی نەفامی دا لە مەككە ئاسنگەر بووم، شمشێرێكم بۆ عاصی كوڕی وائلی ئەل سەهمی بەقەرز دروست كرد، دوایی چووم داوای هەقدەستەكەیم لێ كرد، گوتی: ناتدەمێ هەتا لە موحەممەد هەڵنەگەڕێیتەوە، منیش گوتم: بەخودا قەت لە دینی موحەممەد هەڵناگەڕێمەوە، نەبەزیندوویی‌و نەبەمردوویی‌و نەئەو كاتەیش كە خودا تۆ دەمرێنێ‌و لەپاشدا لەقیامەتدا زیندووت دەكاتەوە! عاص بەئیستیهزاو بەتەوسەوە گوتی: كەوابو ئێستا وازم لێ بێنە هەتا دەمرم‌و زیندودەبمەوە، ئەگەر ئەمە وابێ دیارە ئەو كاتەش ماڵ‌و منداڵم دەبێ، جا ئەو حەلە وەرە قەرزەكەت دەدەمەوە! جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لأوتَيَنَّ مَالا وَوَلَدًا * أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا﴾ مەریەم/١٩/٧٧-٧٨ واتە: دەبێ حاڵی شڕی ئەو كابرایە چۆن بێ، كە گاڵتەی بەقەبرو قیامەت دێ‌و، بەتەوسەوە بەموسوڵمانان دەڵێ: من لەقیامەتیشا ماڵ‌و منداڵم دەبێ ئەگەر حەقێكتان لەسەرمە، پەلەم لێ مەكەن لەوێ دەتاندەمەوە! دیارە كەئەم كابرایە غەیبزان نییەو، ئەوەندەش پیاوێكی پیرۆزو پاك نییە، كە عەهدو پەیمانی وای لە خوای میهرەبان وەرگرتبێ، كەواتە باگاڵتەی بەئایینی ئێمە كردبێ، رۆژێ دێ لەدیوانی خوادا خۆی بەتاوانباری دەبینێتەوە. (تاج/٧/٢٣ف-٦ سوورەتی مەریەم).

**قسەیەكی نەستەق:**

دەڵێن: جارێ پیاوێ لەمەولەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەپرسێ: قوربان! كەسێ بزنێ بدزێ لەقیامەتدا چی لێ دەكەن؟ مەولەوی دەفەرموێ: دادگایی

---

(١٦) اخرجه مسلم في صفات المنافقين و احكامهم، باب: سؤال اليهود النبي(درودی خوای لەسەر بێ) عن الروح، رقم: ١٧٩٥.

دەكەن‌و نامەی كرداری، كەفریشتەكان لەسەریان نوسیوە دەهێنن‌و بۆی دەوردەكەنەوە بەپێی ئەوە سزای دەدەن!

كابرا دەڵێ: من ئەو فریشتانەم بەشایەت قبووڵ نییە، ئەوان خودا هەرچیان پێ بفەرمووێ ئەوە دەنووسن، مەولەویش دەیەوێ شتەكە لەكورتی ببڕێتەوە، دەڵێ: ئەوكاتە خودا بزنەكە زیندوو دەكاتەوەو دەیهێنێتە زوبان‌و دێت شایەتیت لێ دەدا! كابرایش دەڵێ: جامنیش ریشی بزنەكە دەگرم‌و دەیدەمەوە دەستی خاوەنەكەی‌و دەڵێم: ها برا! ئەوە بزنەكەت ئیتر ئەم شایەت‌و شایەتكارییەی پێ ناوێ!

بەڵام ئەم قسەیەی كابرای دزە لەساویلكەییەوەیە، نەوەك وەك قسەكەی عاصی كوڕی وائیل، لەلەئامەتەوە بێت.

٩٥٠- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِطَعَامٍ صَنَعَهُ قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُبْزًا وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيْ الْقَصْعَةِ قَالَ فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ) (الحديث ٢٠٩٢، أطرافُهُ في: ٥٣٧٩، ٥٤٢٠، ٥٤٣٣،٥٤٣٥، ٥٤٣٦،٥٦٣٧، ٥٤٣٩)[١٧].

پێشەوا ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەرگدروییێ نانی دروست كرد بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و بانگی كرد، گوتی منیش لەگەڵ حەزرەتدا چووم، كە نانەكەی دانا بریتی بوو لە نانی جۆ، مەرگەی كوولەكەو لەتكە گۆشت، سەرنجم دا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەم لاو لای لەگەنەكەوە، كولەكەكەی دەچنیەوەو دەیخوارد، ئیتر منیش لەو رۆژەوە هەتا ئێستا حەزم لە كوولەكەیە) (تاج/ ٤/٧٣ –ش/د/ت/ن).

---

(١٧) أخرجه مسلم في الأشربة، رقم: ٢٠٤١

٩٥١- عَـنْ جَـابِرِ بْـنِ عَبْـدِ اللّـهِ (رَضِـيَ اللّـهُ عَنْهُمَـا) قَـالَ كُنْـتُ مَـعَ النَّبِـيِّ(صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فِـي غَـزَاةٍ فَأَبْطَـأَ بِـي جَمَلِـي وَأَعْيَـا فَـأَتَى عَلَـيَّ النَّبِيُّ(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) فَقَـالَ جَـابِرٌ: فَقُلْـتُ: نَعَـمْ قَـالَ: (مَـا شَـأْنُكَ قُلْـتُ أَبْطَأَ عَلَيَّ جَمَلِي وَأَعْيَا فَتَخَلَّفْتُ فَنَزَلَ يَحْجُنُهُ بِمِحْجَنِهِ) ثُمَّ قَالَ: (ارْكَـبْ) فَرَكِبْـتُ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَكُفُّهُ عَنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَزَوَّجْتَ) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟) قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا قَالَ: (أَفَلا جَارِيَةً تُلاعِبُهَـا وَتُلاعِبُـكَ) قُلْـتُ: إِنَّ لِي أَخَوَاتٍ فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ امْرَأَةً تَجْمَعُهُنَّ وَتَمْشُطُهُنَّ وَتَقُومُ عَلَـيْهِنَّ قَـالَ: (أَمَّـا إِنَّكَ قَادِمٌ فَإِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ) ثُـمَّ قَـالَ: (أَتَبِيـعُ جَمَلَـكَ؟) قُلْـتُ: نَعَـمْ، فَاشْتَرَاهُ مِنِّي بِأُوقِيَّةٍ ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللّـهِ (صَـلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَبْلِـي وَقَـدِمْتُ بِالْغَدَاةِ فَجِئْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ قَالَ: (أَالآنَ قَدِمْتَ؟) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (فَدَعْ جَمَلَـكَ فَادْخُلْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ) فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ فَأَمَرَ بِلالاً أَنْ يَزِنَ لِي أُوقِيَّةً فَوَزَنَ لِي بِلالٌ فَأَرْجَحَ لِي فِي الْمِيزَانِ فَانْطَلَقْتُ حَتَّى وَلَّيْـتُ فَقَـالَ: (ادْعُ لِي جَابِرًا) قُلْتُ: الآنَ يَرُدُّ عَلَيَّ الْجَمَلَ وَلَمْ يَـكُنْ شَيْءٌ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْـهُ قَـالَ: (خُـذْ جَمَلَـكَ وَلَـكَ ثَمَنُهُ) (الحديث ٢٠٩٧)(١٨).

جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ فەرمووی: لەغەزایەکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، وشترەکەم لەژێرما وەستاو لەسوپاکە بەجێ مام، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەدوای سوپاکەوە بوو، تەشریفی هاتو منی گرتەوەو فەرمووی: (جابیر) عەرزم کرد: بەڵێ فەرمووی: (ئەوە چیتە وا جێماوی؟) گوتم: وشترەکەم پەکی کەوتووەو وەستاوە، لەبەر ئەوە بەجێماوم، جا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەولاخەکەی خۆی دابەزیو بەگۆچانەکەی خۆی چەند گۆچانێکی دا لەوشترەکەی من، ئەوجا فەرمووی: (سواربە) منیش سواربوومەوە سەرنجم دا وشترەکە واخێرا بوو، ناچاربووم کە جڵەوی بگرمەوە مەبادا پێش وشترەکەی

(١٨) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين قصرها، باب استحباب تحية المسجد، رقم ٧١٥.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بکەوێ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی جابیر! ژنت هێنا؟) گوتم: بەلێ، فەرمووی: (چیت هێناوە، کچ یا بێوەژن؟) عەرزیم کرد: نەء، بێوەژنێکم هێناوە، فەرمووی: (ئەی بۆچی کچێکت نەهێنا، پێکەوە یاریو دەسبازی بکەن؟!).

گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کە عەبدوڵڵای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، (بڕ: تاج/١٨٢/٥ف ١ز ٥١) باوکم کەمرد حەوت خوشك، یا هەشت خوشکی سەروقنگی منالکاری بەسەردا بەجێی هێشتم، لەبەر ئەوە بێوەژنێکم هێنا کەکارامە بێ، ماڵو مێردی دیبێ وەك خۆیان کوڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا سەرپەرشتیان بکاو کۆمەڵیان کۆبکاتەوەو، نەهێڵێ سەریان لێ بشێوێو سەریان شانە بکاو سەرەو کاریان بکا..

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نزای باشی بۆم کردو فەرمووی: (ئەوا دەڕۆیتەوە، کەچویتەوە هۆشیاربە هۆشیار! نەکەی بەهۆی دوورییەوە، بۆسەرجێیی، جڵەوی هۆش لەدەست بدەی!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا وشترەکەت دەفرۆشیت؟!) گوتم: بەلێ، جا بەئۆقیەیەك کەدەکاتە چل درەمی زیو لێی کڕیم. ئەنجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەپێش منەوە گەیشتە ماڵەوە، منیش بۆ سبەینێ گەیشتمەجێو ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، تەماشام کرد پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەردرگای مزگەوت بوو، فەرمووی: (ئێستاکە گەیشتیتەجێ؟) وتم: بەلێ، فەرمووی: (دە وشترەکەت بەردەو بچۆرە ناو مزگەوتو دوو رکات نوێژی سوننەتی گەڕانەوە لەسەفەر لەناو مزگەوتدا بکە) منیش چوومە ژوورەوەو نوێژەکەم کرد. ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بەبیلال کرد ئۆقیەیێ زیوی لەباتی وشترەکەم بۆم کێشاو لەکێشانەکەیشا سلاوی دایەوەو قورس کێشای. منیش پارەکەم وەرگرتو ڕۆیشتم، تاپشتم هەلکرد

لەوان بەرەو ماڵ کەوتمەڕێ، کەچی گوێم لێی بوو فەرمووی: (ئادەی جابیرم بۆ بانگ بکەرەوە!) منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەی! ئێستا وشترەکەم دەداتەوە بەسەردا وەلەدڵەوە لەوەم پێ ناخۆشتر نەبوو کە وشترەکەم بداتەوە بەسەردا، کەچی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وشترەکەت بەرەوە بۆ خۆتو پارەکەیشی هەر بۆ خۆت) (تاج/٣/٥٥ف –٤ز- ٢٥).

٩٥٢- عنْ عَبْدِ اللَّهِ بنْ عمربن خطابْ (رضي اللهُ عنهُ) كَانَ رَجُلٌ اسْمُهُ نَوَّاسٌ وَكَانَتْ عِنْدَهُ إِبِلٌ هِيمٌ فَذَهَبَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فَاشْتَرَى تِلْكَ الإِبِلَ مِنْ شَرِيكٍ لَهُ فَجَاءَ إِلَيْهِ شَرِيكُهُ فَقَالَ: بِعْنَا تِلْكَ الإِبِلَ فَقَالَ: مِمَّنْ؟ بِعْتَهَا قَالَ: مِنْ شَيْخٍ كَذَا وَكَذَا فَقَالَ: وَيْحَكَ ذَاكَ وَاللَّهِ ابْنُ عُمَرَ فَجَاءَهُ فَقَالَ: إِنَّ شَرِيكِي بَاعَكَ إِبِلاً هِيمًا وَلَمْ يَعْرِفْكَ، قَالَ: فَاسْتَقْهَا قَالَ فَلَمَّا ذَهَبَ يَسْتَاقُهَا فَقَالَ: دَعْهَا رَضِينَا بِقَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا عَدْوَى) (٢٠٩٩- أطرافه في: ٢٨٥٨، ٥٠٩٣، ٥٠٩٤، ٥٧٥٣، ٥٧٧٢) [١٩].

ئیبنو دینار(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لێرە لەمەککە، پیاوێ هەبوو ناوی نەوواس بوو، هاوبەشێکی هەبوو، سەوداو مامەڵەی وشتریان بەیەکەوە دەکرد، هەندێ وشتری بەئاوکەوتویان هەبوو، کەبەئاوکەوتن جۆرە نەخۆشیەکە توشی گیاندار دەبێ، دووئاو دەکەوێ هەر ئاو دەخواتەوەو هەر تێرئاو نابێ، وادیارە ئەم جۆرە نەخۆشینەش دەتەنێتەوە لەنەخۆشەوە بۆ ساخ.

جا ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەچێ ئەو وشترە نەخۆشانە لەهاوبەشەکەی دەکڕێ. هاوبەشەکەی نەوواس دەچێ بۆ لای نەوواس و پێی دەڵێ: وشترەکانم فرۆشت، نەوواس پێی دەڵێ: بەکێت فرۆشت؟ دەڵێ: فرۆشتم بە پیرەمێردێکی واوا، نەوواس پێی دەڵێ: هاوار لەخۆت، چۆن شتی وات کردووەو بەخوا ئەوە ئیبنو عومەر بووە، شایانی شتیوا نییە..

---

(١٩) قال العلآمة العيني: (وهذا الحديث من أفراد البخاري) ج/١١ ص ٢١٨ء قال العسقلاني في خاتمة كتاب البيوع: لم يوافقه مسلم على تخريجه - المترجم.

جا نـەوواس دەچـێ بـۆ خزمـەتـیو، عـەرزی دەکـا: قوربـان هاوبەشـەکەم هەندێ وشتری دووئاو کەوتووی بەتۆ فرۆشتووە، جەنابتی نەناسیوە، ئـەویش دەفـەرموێ: دەی کـەوابێ بیانبـەرەوە. کەنـەوواس دەچـێ وشـترەکان بباتـەوە، ئیبنـو عومـەر رای دەگـۆڕێو دەفـەرموێ: (وازیـان لـێ بێنـە سـەوداکە هەڵناوەشێنمەوە، رازیم بەو بڕیارو فـەرمانو حوکمـەی کەپێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەری کردووە، لەم بارەیەوە کە دەفەرموێ: نەخۆشی تەنینـەوە نییـە) (بڕ: تاج/٤/٢٢٧ز -٧٦).

**روونکردنەوە:**

لەم فەرموودەیەوە وەردەگیرێ: (کە واباشە مرۆڤ خۆی لەئازاردانی پیـاوی بـاش زیـاتر بپـارێزێ، دەڵێن: نـەوواس هاونـشینی ئیبنـو عومـەر بـووە، زۆر لەخزمەتیدا دادەنیشت، گەلێ جار قسەی خۆشی بۆ ئیبنـو عومـەر دەکردو دەیهێنایـە پێـکەنین، رۆژێ نـەوواس دەڵـێ: خۆزگـەم بەقـەد کێـوی ئـەبو قوبەیس زێڕم دەبوو!! ئیبنو عومەر پێی دەفـەرموێ: جا چیت لـێ دەکرد؟ دەڵـێ: بەسـەریا دەمـردم!!) ئـەم داسـتانە لـە عەسـقەلانی لـە فـەتح دا لـە حومەیدییەوە راگوێزی دەکا.

٩٥٣- عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: حَجَـمَ أَبُـو طَيْبَـةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، وَأَمَـرَ أَهْلَـهُ أَنْ يُخَفِّفُـوا مِنْ خَرَاجِهِ) (الحديث ٢١٠٢- أطرافُهُ في: ٢٢١٠، ٢٢٧٧، ٢٢٨٠، ٢٢٨١، ٥٦٩١) [٢٠]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: ئەبوطیبە(ڕەزای خوای لێ بێ) کەڵەشاخی لەحەزرەت گرت، حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) لەباتی ئەوە مەنێ خورمای پێدا، وەفەرمانیشی کرد بەئاغاکانی کە لەسەرانەکەی کەم بکەنەوە.(تاج/٢/٢٩٩- ٢ز-١٤٦+ تاج/٤/١٩٧ف- ١ز-٦١ف-١، ٢، ٣، ٤,٥,٦,٧,٨).

---

(٢٠) أخرجه مسلم في (حل أجرة الحجامة) (صم /١٠ ص٢٤٢) — المترجم.

**٩٥٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ احْتَجَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَعْطَى الَّذِي حَجَمَهُ وَلَوْ كَانَ حَرَامًا لَمْ يُعْطِهِ. (الحديث٢١٠٣، طرفهُ في: ١٨٣)[٢١]**

**ئیبنوعەبباس** (ڕەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **کەڵەشاخی لەخۆی گرتو بەخششی بەو پیاوەدا، کە کەڵەشاخەکەی لێ گرت، دیارە ئەگەر مزو هەقدەستی کەڵەشاخگر حەرام بوایە پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **شتیوای نەدەکرد، کە بچێ بەخششێ بدا بەو کەسەی کەڵەشاخی لێ گرتووە.(تاج/٢/٣٠٠- ٣ ز- ١٤٦).**

**٩٥٥- عَنْ عَائِشَةَ أم المؤمنين (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) أَنَّهَا اشْتَرَتْ نُمْرُقَةً فِيهَا تَصَاوِيرُ فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ عَلَى الْبَابِ فَلَمْ يَدْخُلْه، فَعَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ فقلتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ مَاذَا أَذْنَبْتُ فقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَا بَالُ هَذِهِ النُّمْرُقَةِ) قلت: اشْتَرَيْتُهَا لِتَقْعُدَ عَلَيْهَا وَتَوَسَّدَهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ أَصْحَابَ هَذِهِ الصُّوَرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُعَذَّبُونَ فيُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ وَقَالَ إِنَّ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ الصُّوَرُ لا تَدْخُلُهُ الْمَلائِكَةُ. (الحديث ٢١٠٥ أطرافهُ في: ٣٢٢٤، ٥١٨١,٥٩٥٧، ٥٩٦١، ٧٥٥٧)[٢٢].**

**عائیشە دایکی ئیمانداران** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: قاڵیچەیەکم کڕی، وێنەی پێوە بوو کاتێک پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **تەشریفی هات بۆ لام، قاڵیچەکەی بینی ڕاخراوە، ئیتر نەهاتە ژوورەوە، لەبەر دەرگاکە ڕاوەستا، هەستم کرد کە زوویری بەڕویەوە دیارە، لەبەر ئەوە عەرزم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! چی گوناهێکم کردوە کە تۆ وا لێم زوویری، تەوبەی**

---

**(٢١) أخرجه مسلم في مبحث حل أجرة الحجامة (صم/١٠ص ٢٤٢) - المترجم.**

**(٢٢) أخرجه مسلم في اللباس والزينة باب: تحريم تصوير صورة الحيوان رقم: ١٥٣٣.**

لــێ دەكــەم لەسەردەســتی خــوداو لەســەر دەســتی پێغەمبەرەكەیــدا؟ پێغەمبەریش (درוودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم قاڵیچەیە چییە؟) عەرزم كرد كڕیومە بۆ تۆ هەتا لەسەری دابنیشی‌و شانی لەسەر دادەیت! پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەراستیدا خاوەنانی ئەم وێنانە لەرۆژی قیامەتدا، سزا دەدرێن، پێیان دەگوترێ: لەسەر شێوەی تەعجیزو دەسەوسانكردن پێیان دەگوترێ، ئەم دروستكراوانەی خۆتان زیندووبكەنەوە) پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرموووشی: (هەر ماڵێ وێنەی تیادابێ فریشتەی رەحمەت ناچنە ناوی). (تاج/٤/١٥٩ز —٥٠ هەتا كۆتایی).

**روونكردنەوە:**

باسێكی بەسوودم نووسیوە لەسەر بابەتی وێنە بەگشتی، لەتاجا لەبەرگی چوارا لەلاپەڕە سەدو شەست‌و چوارا، جاوا لێرە بۆ تەواوكاری ئەو باسە دەڵێم (پێش هەموو شتێ بڕوانە زنجیرە/ ٣٠٥ بەتەواوی لەبەرگی چوارەمی ریاض دا) :

١- كڕین‌و فرۆشتنی وێنەو شتێ وێنەی پێوە بێ، وەك پارچە كوتاڵ‌و بەڕەو قاڵی‌و بەتانی‌و دەرگاو شتی تری وا، دادەمەزرێ بەڵام ناباشە. (بڕوانە: فتح/٤/٣٢٥).

٢- بەڕای هەموو خاوەن ویژدانێ، هەتا ئەم ساتەش زیانی وێنە لەئایین‌و لەڕەوشتی بەرز، لەهەموو شتێكی تر زیاترە، ئەو بەدڕەوشتیە ئەمڕۆ سیدی بڵاوی دەكاتەوە بەشەیتانیش ناكرێ.

٣- راستە كە ئەمڕۆ وێنە بووە بەبەشێكی سەرەكی لەڕەوڕەوەی پێشكەوتن لەڕوی زانستی‌و هونەری‌و پزیشكی‌و تەكنۆلۆژییەوە، بەبێ هونەری وێنە، بەهەموو جۆرەكانییەوە، پێشكەوتنی پیشەسازی‌و زانستی‌و هونەری‌و

راگەیاندن‌و سەفەر بۆ ناو بۆشایی ئاسمان ئەستەم دەبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وێنە بووە بەشەیتانی عەصر، بووە بەمیکرۆبی بێ ڕەوشتی بووە بەهەوێنی داڕووخانی خێزانی‌و مایەی بەر بەرەڵایی‌و سەرچاوەی تێکبەربوونی نێرو مێی بێ سنوور، لەبەر ئەوە بەبۆچوونی بەندە هەموو جۆرە وێنەیێ، بەم چەند مەرجە حەرام دەبێ ئەگەر:

أ- بەمەبەستی لاسکایی خەلقی خودا بێ‌و بۆ چاولێکریی بێ لەکاری خوا.

ب- بۆ پەرستن‌و بەگەورە زانین‌و تەئلیهو تەخلید بێ، وەك لەكۆندا بەزۆری وێنەو پەیکەر بۆ ئەم دوو مەبەستە بوون، ئێستاش هاکا وای لێ هاتەوە!

ج- بۆ برەودان بە بەربەرەڵایی‌و بێ ڕەوشتی‌و بێ دینی‌و گەندەڵی کۆمەڵ بێ.

٤- زۆر لەزانایانی شەرع دەفەرموون: (هەر وێنەیێ لەسەر شێوەیێ بێ کە لەسەر ئەو شێوەیە خاوەنەکەی نەژی، وەك مرۆڤێ سەربڕاوبێ یا لەناوەڕاستا دووکەرت کرابێ، یانیوەی لەشی گیاندارەکە بێ یا تەنها سەری بێ، حەرام نییەو موباحە).

٥- هەروا زۆر لەزانایانی شەرع دەفەرموون: (هەر وێنەیێ بۆژەکرابێ واتە مومتەهەن بێ، وەك لەژێر پێدا ڕاخرابێ، یابەدیواری ئاودەستەوە بێ، یابەشێوەیەکی بۆژەکراوی تر دانرابێ، یاهەڵواسرابێ حەرام نییە!) ، عەللامەی عەینی لە عومدەتول قاری شەرحی صەحیحی بوخاریدا لەبەرگی یازدەدا لاپەڕە سەدو بیست‌و چواردا بەدەق دەفەرموێ: (قال الطحاوي: فلمّا ابيحَتْ التّماثيلُ بَعدَ قَطعَ رؤسِها الذي لو قُطِعَ منْ ذي الرّوحِ لم يَبقَ، دلّ ذلك على إباحةِ تّصوير ما لا روح لَهَ، وعلى خروجِ ما لا روحَ لمثلِهِ منَ الصّورِ، ممّا قد نُهيَ عنهُ في الآثارِ....) وقال أيضاً: (... وقال الخطّابيّ:.. فأمّا ما ليس بحرام من كلبِ الصّيدِ والزّرعِ، والماشيَةِ والصّورَةِ التي

تُمتَهَنُ في البِساطِ والوِسادةِ، وغيرهما فلا يمنَعُ دخولَ الملائِكَـةِ بسَبَبِهِ، وأشـار القاضي إلى نحوِ ما قالَ الخطّابي....).

٦- دانانو هەڵواسینی وێنەو هەڵگرتنی بۆ یادگارو شتی وا، ئەگەر ناتـەواوبێ، یاجەستەدارنەبێ بەتایبەتی ئەگەر لەسـەر شێوەیێ بـێ، کـە خاوەنەکـەی لەسەر ئەو شێوەیە نەژی ئەوە حەرام نییە.

٧- کـورتو پوخـت: (هـەر وێنـەیێ خزمـەتی دیـنو دونیـای موسـوڵمانان بکـا لەسەر رای پسپۆڕانی ئیمانداری دڵسۆزی ئیسلام دروستەو حەرام نیە).

٨- بڕوانە ریاض الصالحين بەرگی دووەم بەکوردی ژمارە /٥٧٧ لاپەڕە: ١٣٥.

## باسی بازاڕو سەوداو مامەڵەو ئەیارەو پێوانە

٩٥٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَكُنْتُ عَلَى بَكْرٍ صَـعْبٍ لِعُمَـرَ فَكَـانَ يَغْلِبُنِـي فَيَتَقَـدَّمُ أَمَـامَ الْقَـوْمِ فَيَزْجُرُهُ عُمَرُ وَيَرُدُّهُ ثُمَّ يَتَقَدَّمُ فَيَزْجُرُهُ عُمَـرُ وَيَـرُدُّهُ فَقَـالَ النَّبِيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) لِعُمَرَ: (بِعْنِيهِ) ) قَالَ: هُوَ لَـكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ بِعْنِيهِ (فَبَاعَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (هُوَ لَـكَ يَا عَبْـدَ اللَّـهِ بْنَ عُمَرَ تَصْنَعُ بِهِ مَاشِئْتَ). (الحديث ٢١١٥ – طرفاه في: ٢٦١٠، ٢٦١١) [٢٣].

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، من خۆم بەسـواری نوومـا وشترێـکی تـۆڕی توخـسی چەموش بـووم، کـەهی بـاوکم بـوو، هەرچـەندم دەکـرد بـۆم زەوت نـەدەکرا، هـەموو جـارێ وەپێش خەڵـکەکە دەکەوت باوکیشم ئـەوەی پـێ نـاخۆش بـوو، کـەئاوا پـێش پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بکـەوێ، لەبـەر ئـەوە تێـی دەخـوڕیو تەسـی پـێ

(٢٣) قال العسقلاني لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عمر (كان على جمل صعب..) (فتح/٤٢٨/٤- خاتمة كتيب البيوع ) - المترجم.

دەكردەوە بۆ دواوە، بەڵام دیسانەوە نۆبەنە وشترەكە وەپێش دەكەوتەوە، هەمدیسان باوكم تەسی پێ دەكردەوەو دواى دەخستەوە!.

جا پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) بەعومەرى فەرموو: (ئەم نۆبەنە وشترەم پێ بفرۆشە) ئەویش عەرزیكرد: قوربان بەبێ پارە پێشكەشت بێ. دووبارە فەرموویەوە: (پێم بفرۆشە) ئەویش فرۆشتى پێى. جا پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) بەمنى فەرموو: (ئەى عەبدوڵلاى كوڕى عومەر! ئەوە بۆ تۆ چى لێ دەكەى بیكە).

٩٥٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَجُلا ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ فَقَالَ: (إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ لا خِلابَةَ) (الحديث ٢١١٧- أطرافُهُ في: ٢٤٠٧، ٢٤١٤، ٦٩٦٤) [(٢٤)].

عەبدوڵلاى كوڕى عومەر(ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: پیاوێ عەرزى پێغەمبەرى كرد، كە لەسەوداو مامەڵەدا دەخەڵەتێ، فەرمووى پێى: (كاتێ سەوداى شتێ دەكەى بڵێ: بەبێ فرو فێڵ و قۆڵبڕین). (تاج/٢/٣٠٠ز-١٤٧-ش/د).

٩٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنْ الارْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: (يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ) (الحديث ٢١١٨) [(٢٥)].

عائیشە (ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: (لەشكرێ دێن بدەن بەسەر كابەدا وغەزوى بكەن، دێن هەتا دەگەنە بەیدا،

---

(٢٤) اخرجه مسلم في البيوع، باب: من يخدع في البيع، رقم: ١٥٣٣.

(٢٥) اخرجه مسلم في الفتن واشراط الساعة، باب: الخسف بالجيش رقم: ٤٢١.

كـەناوی جێـگەیەکی تایبەتییـە، وا لەناوەنـدی مەککـەو مەدینـەدا، لـەوێ هەموویان ڕۆدەچن بەناخی زەویدا) ، منیش گووتم: ئەی ڕەوانەکراوی خـودا! چۆن وبۆچی هـەموویان وەك یـەك ڕۆدەچـن، خـۆ هەیانـە بـۆ شـەڕ نـەهاتووە تـەنها بازاڕیـان بـۆ سـاز دەکـا، وەهەشـیانە لـەوان نییـەو بـەزۆر هێناویانـە ؟ فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (هـەموویان چـون یـەك ڕۆدەچـن بـەناخی زەویـدا، بەڵام لەڕۆژی قیامەتا هەر کەسـەیان لەسـەر نیـازی خـۆی زیـدوو دەکرێتـەوە، چاکیان بەچاك پاداشتی دەدرێتەوەو خراپیان بەخراپ).(تـاج/٢/٢٧٥ف- از-١٣٧ ـش/د/ت/ن).

٩٥٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فِي السُّوقِ فَقَالَ رَجُلٌ يَا أَبَا الْقَاسِمِ فَالْتَفَـتَ إِلَيْـهِ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ إِنَّمَا دَعَوْتُ هَذَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَمُّوا بِاسْـمِي وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي) (الحديث ٢١٢٠ طرفاهُ في: ٢١٢١، ٣٥٣٧) [٢٦].

ئەنـەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەبازاڕەکەی بەقیع بـوو، پیـاوێ بـانگی پیاوێـکی تـری دەکـرد، گوتـی: ئـەی ئەبولقاسـم! پێغەمبـەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) ئـاوڕی لـێ دایـەوە، وایزانـی کـە بانگی ئەو دەکا، پیاوەکە گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەگـەڵ تـۆم نـەبوو، بانگی ئـەو پیـاوەی تـر دەکـەین بەویش هـەر دەڵێین ئەبولقاسـم. پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ناوی من بکەن بەناو بۆ خۆتان بەڵام کەسناوەکەم مەکەن بە کەسناو بۆ خۆتان، واتـە کونیەکـەی مـن کـە ئەبولقاسمـە، مەیکـەن بەکونیە بۆ خۆتان، بەڵام خۆتـان نـاو بنـێن محمـد....) (تـاج/١٠/١٥٥ز- ٦٢ف – ١+٢+٣+٤).

(٢٦) أخرجه مسلم في الآداب، باب: النهي عن التكني بأبي القاسم رقم: ٢١٣١.

٩٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي طَائِفَةِ النَّهَارِ لا يُكَلِّمُنِي وَلا أُكَلِّمُهُ حَتَّى أَتَى سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعَ فَجَلَسَ بِفِنَاءِ بَيْتِ فَاطِمَةَ فَقَالَ أَثَمَّ لُكَعُ أَثَمَّ لُكَعُ فَحَبَسَتْهُ شَيْئًا فَظَنَنْتُ أَنَّهَا تُلْبِسُهُ سِخَابًا أَوْ تُغَسِّلُهُ فَجَاءَ يَشْتَدُّ حَتَّى عَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ وَقَالَ: (اللَّهُمَّ أَحْبِبْهُ وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ) (الحديث ٢١٢٢، - طرفهُ في: ٥٨٨٤)[٢٧].

ئەبوهورەیرە (کەلە هۆزی دەوسە) فەرمووی: جارێك بەرۆژ نەك بەشەو لەگەڵ پێغەمبەردا دەرچووم، لەرێ بەبێ قسەو گفتوگۆ بەبێدەنگی رۆیشتین، نەئەو قسەی لەگەڵ من کرد نەمن قسەم لەگەڵ ئەو کرد، تاچوینە بازاڕی قەینوقاع کەیەکێکە لەبازەڕەکانی شاری مەدینە، ئەوجا گەڕایەوەو چوو بۆ ماڵی فاطیمەی کچی، کەهاوسەری ئیمامی عەلی‌و دایکی حەسەن‌و حوسەینە، لەوێ لەحەوشەکەی ماڵی فاطیمە دانیشت‌و فەرمووی:

(ئەرێ بچکۆل لەوێ یە، ئەرێ بچکۆل لەوێ یە؟) جادایکی نەختێ دوای خست، وابزانم دایکی ویستی بیشوات‌و هەنێ حەتحەتۆکەی بۆنخۆشی لەمل بکا، زۆری پێ نەچوو کەحەسەن بەهەڕاکردن هات‌و لەگەڵ پێغەمبەر دەستیان کردە ملی یەکتری، باوەشیان کرد بەیەکاو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) خۆش خۆش ماچی دەکرد، ئەوجا خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودایە! من ئەمەم خۆش دەوێ، ساتۆیش خۆشت بوێ‌و ئەو کەسەیشت خۆش بوێ کە ئەوی خۆش دەوێ). (تاج/٢/١١٤ف-٤).

٩٦١-حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ حَدَّثَنَا أَبُو ضَمْرَةَ حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ عَنْ نَافِعٍ حَدَّثَنَا ابْنُ عُمَرَ أَنَّهُمْ كَانُوا يَشْتَرُونَ الطَّعَامَ مِنَ الرُّكْبَانِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَبْعَثُ عَلَيْهِمْ مَنْ يَمْنَعُهُمْ أَنْ يَبِيعُوهُ حَيْثُ اشْتَرَوْهُ حَتَّى يَنْقُلُوهُ حَيْثُ يُبَاعُ الطَّعَامُ ) الحديث ٢١٢٣، أطرافه في: ٢١٣٣، ٢١٣٧، ٦٨٥٢.

---

(٢٧) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل الحسن والحسين رضي الله عنهما، رقم: ٢٤٢١.

(قَالَ: وَحَدَّثَنَا ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَنْ يُبَاعَ الطَّعَامُ إِذَا اشْتَرَاهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَه) (الحديث ٢١٢٤ اطرافه في: ٢١٣١، ٢١٣٧، ٢١٦٦، ٢١٦٧، ٦٨٥٢) [٢٨].

ئیبنوعومەر (رمزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران خەڵكو جامباز دەچوون بۆ قەراخ شار، دەچوون بەپیر كاروانو ئەو كەسانەی كەلەم لاولاوە خۆراكو شمەكیان دەهێنا بۆ شار بۆ فرۆشتن، جاپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كەسانێكی نارد بۆ سەریان كە نەهێڵن، لەوشوێنەدا كە كڕیویانە هەر لەو شوێنەش دا بیفرۆشنەوە، بەڵكو دەبێ بیگوێزنەوە بۆ شوێنی ئاسایی فرۆشتنی خۆراك، وەك مەیدانو عەلوەو بازاڕ).

ئیبنوعومەر(رمزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی كردوە لەوە كە كەسێ خۆراكێ بكڕێ لەكەسێ، پێش ئەوەی كە خۆی لە فرۆشیار وەری بگرێ، بچێ بیفرۆشێتەوە بەكەسێكی تر).

٩٦٢- عنْ عطاءِ بنِ يَسَار (رحمه الله تعالى) قَالَ لَقِيتُ عَبْدَاللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قُلْتُ أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي التَّوْرَاةِ قَالَ أَجَلْ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا وَحِرْزًا لِلأُمِّيِّينَ أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي سَمَّيْتُكَ المتَوَكِّلَ لَيْسَ بِفَظٍّ وَلا غَلِيظٍ وَلا سَخَّابٍ فِي الأَسْوَاقِ وَلا يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ بِأَنْ يَقُولُوا لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَيَفْتَحُ بِهَا أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوبًا غُلْفًا) (الحديث٢١٢٥، طرفه في: ٤٨٣٨) [٢٩].

---

(٢٨) أخرجه مسلم في البيوع، باب: بطلان المبيع قبل القبض، رقم: ١٥٢٧.

(٢٩) لاحظ ماجاء في خاتمة كتاب البيوع في الفتح، حيث لم يستثن العسقلانيُ هذا الحديث من المتفق عليه بين الشيخين – المترجم.

عـەطـائى كـوڕى يەسـار(رەزاى خـواى لـێ بـێ) فـەرمووى: گەيـشتم بەخزمـەت عەبدوڵلاّى كوڕى عـەمرى كـوڕى عـاص(رەزاى خـواى لـێ بێ) عـەرزيم كـرد: نيـشانەى پێغەمبـەرى خۆمـان لەتـەوراتا چـييە پـێم بلـێ ؟ فـەرمووى: (بـەڵێ باشـە بـەخودا، ناونيـشانى لەتەوراتيـشدا وەك ئـەو نيـشانەى وايـە كـە لـەم ئايەتـەى قورئاندا باسكراوە كەدەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ ئەحزاب/٣٣/٤٦.

واتە: ئەى پێغەمبەرى پايەبەرز ئێمـە تۆمـان رەوانـە كـردوە بەشـايەتو مـژدەدەرو بەترسـێنەر، لەگـەڵ بـازێ نيـشانەى تـردا كەدەفـەرموێ: وەتۆمـان كـردووە بەقـەڵاو سـەنگەر بـۆ نەتەوەيـەكى نەخوێنـدەوار، كەگـەلى عـەرەبن‌و ناويان بەنەخوێندەوارو بێ سەواد دەركـردووە، تـۆ بەنـدەو فروسـتادەى منـى، خۆم ناوم ناوى پشت بەستوو بەخودا، (موتەوەككيل) ئـەو پێغەمبـەرى ئـاخر زەمانە مرقن‌و مۆن‌و دڵڕەق نييـە، وەلـەناو بـازاڕا دەنگـى دەرناچـێ‌و بەسـەر خەڵـكا ناقيـژێنێ‌و دەنگـە دەنـگ كـار نييـەو بەربەرچـى خراپـە بەخراپـە ناداتـەوە، بەڵـكو چاوپۆشـى دەكـاو لێبـوردنى هەيـە، خـودا نايباتـەوە بـۆ لاى خـۆى‌و نـايمرێنێ هـەتا ئـەو ميللەتـە لارو خـوارەى پـێ راسـت نەكاتـەوە، كەميللەتى عەرەبن، كەلە ئايينە راست‌و دروستەكەى ئيبراهيم لايـان داوە، بـۆ فرە خوايى‌و بتپەرستى.

ئەو راستكردنەوەيەش بەوتنى وشەى پيرۆزى (لاإله إلا الله: تـەنها خـودا خودايەو بەس) جا بەباوەڕى تەواو بەم وشـە پيرۆزەيـە بـەرى چاويان رۆشـن دەكاتـەوە، چـاويان كەلەئاسـتى حـەق كـوێر بـووە روون دەبێتـەوە، گوێيـان كەلەئاسـتى بيـستنى حـەق كـەڕ بـووە، دەكرێتـەوەو حـەق دەبيـستێ، دڵيـان كـەمۆركراوەو پـەردەى رەشـى بەسـەردا هـاتووە، بـەكليلى (لاإلـه إلا اللـه) دەكرێتەوە) (تاج/٤/ ٢٦٧ف -٣).

٩٦٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَاسْتَعَنْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى غُرَمَائِهِ أَنْ يَضَعُوا مِنْ دَيْنِهِ فَطَلَبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيْهِمْ فَلَمْ يَفْعَلُوا فَقَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اذْهَبْ فَصَنِّفْ تَمْرَكَ أَصْنَافًا الْعَجْوَةَ عَلَى حِدَةٍ وَعَذْقَ زَيْدٍ عَلَى حِدَةٍ ثُمَّ أَرْسِلْ إِلَيَّ فَفَعَلْتُ ثُمَّ أَرْسَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَاءَ فَجَلَسَ عَلَى أَعْلاهُ أَوْ فِي وَسَطِهِ ثُمَّ قَالَ كِلْ لِلْقَوْمِ فَكِلْتُهُمْ حَتَّى أَوْفَيْتُهُمْ الَّذِي لَهُمْ وَبَقِيَ تَمْرِي كَأَنَّهُ لَمْ يَنْقُصْ مِنْهُ شَيْءٌ (الحديث ٢١٢٧، أطرافُهُ في: ٢٣٩٥، ٢٣٩٦، ٢٤٠٥، ٢٦٠١، ٢٧٠٩، ٢٧٨١، ٣٥٨٠، ٤٠٥٣، ٦٢٥٠)[٣٠].

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم ناوی عەبدوڵڵای کوڕی حەرام بوو، کاتێ مرد قەرزار بوو چوومە خزمەتی حەزرەت عەرزیم کرد: قوربان! باوکم مردووەو قەرزی لەسەرە منیش هەر ئەوەم هەیە کە باخە خورماکەی خۆی دەیگرێ، بەروبومی ئەو باخەیش بەچەند ساڵێ هێشتا بەشی دانەوەی قەرزەکەی کەلەسەریەتی ناکا، جابفەرموو وەرە لەگەڵما نەبادا خاوەن قەرزەکان قسەیەکی ناشیرین بکەن لەڕووما، خۆ ئەگەر لوتفیش بفەرمووی کە داوایان لێ بکەی هەر خاوەن قەرزەی لەلایەن خۆیەوە هەندێ لەقەرزەکەی دابشکێنێ ئەوە یارمەتیەکی گەورەیە بۆ ئێمە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەم لایەنەوە روی لێنان کەشتێ لەقەرزەکانیان، کەوا لەسەر باوکم دابشکێنن و کەم بکەنەوە، بەڵام ئەوان رازی نەبوون و ئەوەیان نەکرد. جاپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (برۆ خورماکەت کۆمەڵ کۆمەڵ کە چەند جۆرە هەر جۆرە خۆی بەتەنها کۆبکەرەوە وبیکە بەخەرمانێ، جۆری عەجوە کەخورمایەکی زۆر چاکە بەجیا، جۆری عەزقی

(٣٠) لم يوافقهُ مسلم على تخريجهِ (خاتمة كتاب البيوع) المترجم.

زەید کە جۆرە خورمایەکی ترە بکە بەخەرمانێکی تر بەجیا، وەهەروەها جۆرەکانی تریش ئەوجا بنێرە بەدواما خۆم دێم).

منیش حەزرەت چیفەرموو رێك وام کرد، ئەوجا ناردم بەشوێنیدا کەتەشریفی هات سووڕایەوە بەدەوری خەرمانێ لەخەرمانە خورماکانا ونزای بەسەرا خوێندن و لەخودا پاڕایەوەو لەسەر تەوقەسەری بەرزترین خەرمانیان، لەناوەڕاستیدا دانیشت و فەرمووی: (دەی دەست بکەن بەپێوانە بۆ خاوەن قەرزەکان) ئیتر یەکە یەکە بەقەد قەرزەکەی خۆیان بەتەواوی خورمام بۆیان پێوا، هەتا هەموو قەرزەکانم بەتەواوی پێیان دایەوە، بەڵام هێشتا لەپیت و فەڕی پێغەمبەرەوە(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەندەی تری لێ زیاد بوو، مایەوە بۆ خۆم، بگرە وەك هیچی لێ کەم نەبووبێتەوە وابوو) (تاج/٤/٣٤٦ز -١٠٨ف ١) شێخی عەینی دەفەرموێ: (ئەو خاوەن قەرزانە جولەکە بوون).

٩٦٤- عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (كِيلُوا طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ لَكُمْ) (الحديث٢١٢٨) [٣١].

میقدامی کوڕی مەعدیکەریب(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەکاتی کڕین و فرۆشتن و سەرفکردن دا خۆراکتان بپێون خوا پیت و فەڕی تێدەخا بۆتان). (تاج/٢/٣٠٧ز -١٤٨).

## ڕوونکردنەوە:

میقدامی کوڕی مەعدیکەریبە کەسناوی (أبوکریمە) یە، لەئەصلا خەڵکی شامە لەهاوڕێ مناڵەکانی حەزرەتە، عەرزیان کرد: ئەی ئەبوکەریمە! خەڵك دەڵێن: تۆ پێغەمبەرت نەدیوە؟ فەرمووی: (با، بەخودا بەخزمەتی گەیشتووم

(٣١) قال العلامة العيني: (هذا الحديث من أفراد البخاري ) -ج/١١/٢٤٧- المترجم.

جارێ لەگەڵ مامەما دەڕۆیشتم پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەرمەی گوێچکەی گرتم‌و فەرمووی بەمامەم: (بەزەینی تۆ دەبێ ئەم گوێچکە گوشینەی منی لەبیر بمێنێ) وەبیستیشم دەیفەرموو: (لەمناڵی لەبارچووەوە هەتا ئیختیاری کەفتەکار، لەرۆژی قیامەتدا لەتەمەنی سیی ساڵیدا حەشر دەکرێن...).

لەشام دەژیا، فەقێی زۆری هەیە لەخەڵکی شام، لەتەمەنی نەوەدویەك ساڵی دا، لەشام ئەمری خودای کرد، لەساڵی هەشتاو حەوتی کۆچیدا، لەبوخاری دا دوو فەرموودەی هەیە، لەسەر فەرمایشتی مقدمەی فتح الباری.

٩٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لَهَا وَحَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ وَدَعَوْتُ لَهَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا مِثْلَ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلام لِمَكَّةَ) (الحديث ٢١٢٩)[٣٢].

عەبدوڵڵای کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) بەفەرمانی خودا، مەککەی کردووە بەحەرەم‌و بەستێکی ئەمین‌و هێمن‌و قەدەغەی کردووە کە کاری ناشایستەی تیادا بەرپا بکرێ، وە دوعاو نزای باشی‌و پیرۆزی کردووە بۆ دانیشتوانی، وەمنیش بەفەرمانی خودا مەدینەم حەرام کردووە کردوومە بەبەست‌و حەرەم، هەروەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حەرام کردووەو کردویەتی بەبەست‌و حەرەم، وە من دووعاو نزای پیت‌و فەڕم کردووە بۆ مەن‌و مشتی مەدینە، دووقاتی ئەو دوعاو نزایەی کە ئیبراهیم کردوویەتی بۆ خەڵکی مەککە).

**ڕوونکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصم، ئەنصارییە، خەزرەجییە، لەبەنی نەجارە ئوحودییە، بەڵام ڕاجیایی هەیە لەبەدرییەتی دا، بەشداری کرد لە

---

(٣٢) أخرجه مسلم في الحج، باب: فضل المدينة ودعاء النبيّ (صلى الله عليه وسلم) فيها بالبركة، رقم:١٣٦٠.

كوشتنی موسەیلەمەی كەذذابدا، نۆ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، سەعیدی كوڕی موسەییب، عەببادی كوڕی تەمیمی ئەنصاریو كەسانی تریش فەقێی بوون، لەرۆژی (الحرة)دا، شەهید بوو، كە ئەم رووداوە لەساڵی شەستو سێی كۆچیدا بووە، رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ.

## باسی هەندێ دەستووری فرۆشتنی خۆراكو شت شاردنەوە بۆ كاتی گرانی

٩٦٦- عَنْ عبدالله بن عمر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ رَأَيْتُ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ الطَّعَامَ مُجَازَفَةً يُضْرَبُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَبِيعُوهُ حَتَّى يُؤْوُوهُ إِلَى رِحَالِهِمْ) (الحديث ٢١٣١، سبقت أطرافُهُ في: رقم: ٩٦١ت= ٢١٢٣ و٢١٢٤ف) [٣٣].

ئیبنو عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەچاوی خۆم ئەوانەم دیوە كە شتو مەكیان بەگۆترە دەكڕی، نەیاندەهێشت كە هەر لەو شوێنەدا بیفرۆشنەوە، بەڵكو دەبێ بیبەنەوە بۆ شوێنو جێگەی خۆیان، ئەوسا ئەگەر ویستیان بیفرۆشن ئەگەر وایان نەكردایەو بەر لەگواستنەوەی بیانفرۆشتایەتەوە لێیان دەدان).

٩٦٧-عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ طَعَامًا حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ كَيْفَ ذَاكَ قَالَ ذَاكَ دَرَاهِمُ بِدَرَاهِمَ وَالطَّعَامُ مُرْجَأٌ). (الحديث ٢١٣٢، طرفُهُ في: ٢١٣٥) [٣٤].

ئیبنوعەبباس (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا كەسێ ئەندازەیێ خۆراك بكڕێو، بەر لەوەی كە خۆی وەری بگرێ لەفرۆشیار، بیفرۆشێتەوە بەكەسێ تر، عەرزی ئیبنوعەبباس كرا ئەم

---

(٣٣) والحديث أخرجه مسلم في البيوع (عيني/١١/٢٤٩) المترجم.

(٣٤) أخرجه مسلم في البيوع، باب: بطلان بيع المبيع قبل القبض، رقم: ١٥٢٥.

مەسەلەیە چۆن چۆنییە، بۆمان روون بکەرەوە، بالە مەبەستەکەی تێبگەین؟ فەرمووی: ئەوە وەك ئەوە وایە پارە بدەیت بەپارە بەشێوەی سووخۆری، خۆراکەکەیش ئامادە(حازر) نەبێ). (تاج/٢/٣٠٧ف –٤ز- ١٤٨).

## روونکردنەوە:

وەك ئەوە ئازاد مەنێ گەنم لەکامەران بکڕێ، بەدرەمێ، بەو مەرجە پاش مانگێ مەنە گەنمەکەی لێ وەربگرێ، جا هەر ئەو مەنە گەنمە کە هێشتا وەرنەگیرابێ، ئازاد بیفرۆشێتەوە بەمایەکەی خۆی یابەزیاتر، یابەکەمتر، وەبەکامەران یابەکەسێکی تر، مامەڵەی وا بەپێی شەرع دادەنرێ بەسوود، لەبەر ئەوە بەرگیری لێ دەکرێ).

٩٦٨- عَنْ عُمَرُ بن الخطّاب (رضي اللهُ عنهُ) يخبر عن رسول الله (صَلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ) (الحديث٢١٣٤، طرفاهُ في: ٢١٧٠، ٢١٧٤)[٣٥].

مالیکی کوڕی ئەوس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ویستم سەد دیناری زێڕ بگۆڕمەوە بەدرەمی زیو، طەلحەی کوڕی عوبەیدیلا بانگی کردم وسەودامان بڕیەوەو ڕێکەوتین لەسەر گۆڕینەوە، کەلەباتی هەر دینارێ ژمارەیەکی دیاریکراو درەمی زیوم پێبدا، جا طەلحە زێڕەکەی لەمن وەرگرتو لەدەستیدا ئەم دیوو ئەودیوی پێدەکرد، ئنجا فەرمووی: باکلیلدارەکەم لە جەنگەڵەکە بێتەوە، درەمە زیوەکانت دەداتێ، جەنگەڵەکە شوێنێکی نزیکە لەمەدینە وا لەعەوالی مەدینە، ناودارە بەغابەی مەدینە.

عومەریش(ڕەزای خوای لێ بێ) گوێی لەم قسانەمان بوو، فەرمووی: ئەی مالیك! بەخودا نابێ لە طەلحە جیاببیتەوە هەتا زیوەکەی لێ وەرنەگریت، بانەبێ

(٣٥) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: الصرف وبيع الذهب بالورق نقداً رقم: ١٥٨٦.

به سوود، چونكه پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرموی لەم بارەیەوە: (زێڕ بەزێڕ دەست بەدەست نەبێ سوودە، گەنم بەگەنم دەست بەدەست نەبێ سوودە، خورما بەخورما دەست بەدەست نەبێ سوودە، جۆ بەجۆ دەست بەدەست نەبێ سوودە). (تاج/٢/٣٢٦ف-٣ز-٤).

**روونكردنەوە:**

لەم رۆژگارەی ئێمەدا، طاقەی رۆحی، هێزی مەعنەویات كز بووە لەسایەی عەولەمەو عەلمەنەوە، مادده پەرستی پەرەی سەندووە: ماڵو سامانو هەوەسبازیو ئارەقو مەی وبادەو باوەشی یار، بوون بەهەموو شتێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی حەق، موسوڵمانی باش بەشی خۆی هەرماوە، جا لەم روانگەوە ئەوەندەی بكرێ، مرۆڤ بۆ خودا چەندی پێ بكرێ لەنەشری حەقا درێغی نەكا، ئەگەر لەسەرانسەری دنیادا یەك كەس بەگوێی بكا زۆرە. (بڕ: ژمارە ٩٧٧).

٩٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ وَلا تَنَاجَشُوا وَلا يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ وَلا يَخْطُبُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ وَلا تَسْأَلُ الْمَرْأَةُ طَلاقَ أُخْتِهَا لِتَكْفَأَ مَا فِي إِنَائِهَا) (الحديث ٢١٤٠، أطرافُهُ في: ٢١٤٨، ٢١٥٠، ٢١٥١، ٢١٦٠، ٢١٦٢، ٢٧٢٣، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١) [٣٦].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەیی دەكرد: لەوەی كە شاریی ببێ بەدەلاڵ بۆ لادێیو شتی بۆ بفرۆشێ، وەدەیفەرموو: (كۆستە كۆستە لەیەكتری مەكەن، سەودا لەسەر سەودا حەرامە، وەخوازبێنی بەسەرخوازبێنی برای خۆتا مەكەن، وەدروست نییە بۆ ژن كەداوای تەڵاقدانی خوشكی ئایینی خۆی بكا، تا ئەو بەتەڵاق بداو خۆی

(٣٦) اخرجه مسلم في البيوع، تحريم بيع حبل الحبلة، رقم: ١٥١٥.

بەشوێنەکەی شاد ببێ!) (تاج/٢/٣١٧ف –٣+ ٤+٥ +٦+٧ +٨ + تاج/٣/١٥٠ف – ٣+رياض/١/٢٣٥).

٩٧٠– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ غُلامًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ فَاحْتَاجَ فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟) فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بِكَذَا وَكَذَا فَدَفَعَهُ إِلَيْهِ) (الحديث ٢١٤١، أطرافُهُ في: ٢٢٣٠، ٢٣٢١، ٢٤٠٣، ٢٤١٥، ٦٧١٦، ٦٩٤٧، ٧١٨٦)[٣٧].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەیاریدەدەران، واتە: لەئەنصار، خولامێکی هەبوو ئازادی کرد بەمەرجێ لەپاش مردنی خۆی ئازاد بێ، کەبەمە لەزاراوەی شەرعی پیرۆزدا دەگوتری: مودبەر، پیاوەکە هیچ ماڵێکی تری وای نەبوو، جادامابوو بۆ ماڵ، جا لەپاشا کە ئەم باسە گەیشتەوە بەحەزرەت – دروودی خوای لەسەر بێ، پێغەمبەر پیاوەکەی خستە سەر مەزاتو فەرمووی: (کێ ئەم پیاوەم لێ دەکڕێ؟) جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵلا لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پارەکەی وەرگرتو دای بەخاوەنەکەی کەناوی ئەبومەذکوور بوو، غولامەکەشی ناوی ئەبو یەعقوب بوو. (تاج/٢/٢٣٤٨ف –٣ز –١٦٥+تاج/٣/٤١ز –١٩ف –١).

٩٧١– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ وَكَانَ بَيْعًا يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ ثُمَّ تُنْتَجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا) (الحديث ٢١٤٣، طرفاهُ في: ٢٢٥٦، ٣٨٤٣)[٣٨].

ئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەرگیریی (نەهی) کردووە لەو جۆرە فرۆشتنەی کەدەبەسترێ بەزایینی بەچکەی

---

(٣٧) أخرجه مسلم في الزكاة، باب الإبتداء في النفقة بالنفس ثم بأهلِهِ، رقم: ٩٩٧.

(٣٨) أخرجه مسلم في البيوع، تحريم بيع حبل الحبلة، رقم: ١٥١٤.

ناوسکی وشتری ئاوسەوە! ئەم جۆرە فرۆشتنەیش لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلاما باوبوو، خەڵك دەیانکرد لەسەر یەکێ لەم دوو شێوەیە: یەکەم پیاوێ وشترێکی دەکڕی یا شتێکی دەکڕی، بەبەهایەکی دیاریکراوی نەدراوی دواخراو، بەوادەی ئەوەندە کە ئەو وشترە بزێ‌و سکەکەشی بزێتەوە ئەوسا بەهاکە بدات، دووەم بەچکەی ئەو بەچکەیە کەوا لەسکی ئەم وشترە ئاوسەدا لەتۆم کڕی بەئەوەندەو ئەوەندە.

**ڕوونکردنەوە:**

لەم شوێنەدا مامۆستای پایەبەرز عەللامەی عەینی رایەکی زۆر بەسوودی هەیە، کەبەرپەرچی ئیمامی نەوەوی پێ دەداتەوە، کە بۆ ئەم رۆژگارەی ئێمە ئەم جۆرە رایە زۆر زۆر باش‌و لەبارە، دەفەرموێ: (بيعُ المعاطاةِ صحيحٌ، وجميعُ الناسِ اليومَ يعملُونَ في الأسواقِ بالمعاطاةِ: يأتي رجلٌ إلى بايعٍ فيشتري منهُ جملَةَ قماشٍ بثمَنٍ معيَّنٍ، فيَدفَعُ الثمَنَ ويأخذُ المَبيعَ من غيرِ أن يوجَدَ لفظُ: (بعتُ واشتريتُ) فإذا حَكمنا بفسادِ هذا العَقد يحصلُ فسادٌ كثيرٌ في معاملاتِ النّاسِ) (ر: ج/١١ ص٢٦٥- عيني).

واتە: بەیعی موعاطات دروستە، خەڵکی هەموو ئەمڕۆ، لەبازاڕا لەکاتی کڕین‌و فرۆشتندا کاری پێدەکەن،، پیاوێ دەچێ لەبازاڕا سەودای پارچەیێ کوتاڵ یا شتێ تر دەکا، وەلەسەر نرخەکەی رێك دەکەون‌و بەهاکەی دیاری دەکەن‌و کڕیار پارەکەی دەدا بە فرۆشیارو فرۆشراوەکە دەبات بەبێ ئەوە کە قسەیێ، کەلە زاراوەی شەرعا پێی دەگوترێ (صیغە) ، لەبەینیانا ببێ، نەئەو بەو دەڵێ: ئەوا پێم فرۆشتی بەئەوەندە، نەئەو بەو دەڵێ ئەوا لێم کڕیت بەئەوەندە!).

دەی ئەگەر بڕیار بدەین کە ئەم سەودایە پووچەو دانامەزرێ چونکە لەفظو بێژەی تایبەتی بۆ دانەنراوە، ئەوە فەرتەنەو ئاژاوەیەکی زۆر زۆر لەسەوداو مامەڵەی ئەو خەڵکەدا روو دەدا.

لەڕاستیدا منیش رام وەکو رای شێخی عەینی وایە، بڕوانە فیقهی ئاسان بەرگی دووەم لاپەڕە(٤٤٤) وەرگەڕاوە کوردییەکەی. وەرگێڕ/ نوری فارس.

## هەندێ مامەڵەو سەودای تایبەتی، یا نەیی لێکراو

٩٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ اشْتَرَى غَنَمًا مُصَرَّاةً فَاحْتَلَبَهَا فَإِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ سَخِطَهَا فَفِي حَلْبَتِهَا صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ). (الحديث ٢١٥١، أطرافُهُ في: ٩٦٩ت=٢١٤٠ف)[٣٩].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێ ئاژەڵی وردەی کڕی، وەك مەڕێ یابزنێ، وە بە فێڵ فرۆشیار چەند رۆژێ نەیدۆشیبوو، هەتا کڕیار پێی بخەڵەتێ‌و وابزانێ کەبەشیرە، ئەوە لەکاتی وادا لەپاش دۆشینی ئەو ئاژەڵەو رۆشن بوونەوەی کارەکە کڕیار خۆی سەرپشکە لەیەکێ لەم دووە: ئەگەر حەزکا مەڕەکە، یابزنەکە هەڵ دەگرێ‌و ئەگەر حەزکا دەیداتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، بەڵام دەبێ مەنێ خورما نەك گەنم بدا لەجیاتی شیرەکەی). (تاج/٢/٣١٣ف-١ز-١٥٠).

٩٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (إِذَا زَنَتْ الأَمَةُ فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا فَلْيَجْلِدْهَا وَلا يُثَرِّبْ ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِدْهَا وَلا يُثَرِّبْ ثُمَّ إِنْ زَنَتْ الثَّالِثَةَ فَلْيَبِعْهَا وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ). (الحديث ٢١٥٢، أطرافُهُ في: ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩)[٤٠].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەنیزەك کەبەعەرەبی پێی دەگوترێ: ئەمەتە زینای

---

(٣٩) أخرجه مسلم في البيوع، (عيني/١١/٢٧٥) المترجم.

(٤٠) أخرجه مسلم في الحدود، باب: رجم اليهود أهل الذمة في الزنا، رقم: ١٧٠٣.

كردو زيناكەی لەسەر ئیسپات بوو باخاوەنەكەی داری حەددی لێ بداو، ئیتر سەركۆنەی نەكاو هەموو كاتێ بیداتەوە بەچاویدا، جا ئەگەر دیسان زینای كردەوە با دووبارە داری حەددی لێ بداتەوە، ئیتر سەركۆنەی نەكا، بەلاَم ئەگەر بۆ جاری سێهەم زینای كردەوە، ئیتر ئەگەر فرۆشتویەتی بەپەتكی موو بابیفرۆشێ) (تاج/٣/٢٤٤ز -٩٢ف-٩).

٩٧٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لا تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ وَلا يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ قَالَ فَقُلْتُ لإبْنِ عَبَّاسٍ مَا قَوْلُهُ لا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ قَالَ لا يَكُونُ لَهُ سِمْسَارًا). (الحديث ٢١٥٨، طرفاهُ في: ٢١٦٣، ٢٢٧٤) [٤١]

ئیبنوعەبباس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەچن بەپیر كاروانیەوە بۆ ئەوەی كە پێش ئەوەی كە بگەنە بازاڕ، كالاَكەیان لێ بكڕنو خۆتان لەوەدوا بەگران بیفرۆشنەوە، وە شاریش شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ).

تاووس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم بەئیبنو عەبباس: قوربان! شاریش شت بۆ لادێی نەفرۆشێ واتای چییە؟ فەرمووی: (نەبێ بەدەلاَلی) (بڕوانە: ریاض/٤/ز- ٢٥٥ژ -١٧٧٥).

٩٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: (لايبيعُ بعضُكم على بيعِ بعضٍ، ولاتلقّوا السلعَ حتّى يهبط بها إلى السّوقِ). (الحديث ٢١٦٥، أطرافُهُ في: ٢١٣٩) [٤٢].

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەودا لەسەر سەودای یەكتری مەكەن، وەمەچن بەپیر ئەو

---

(٤١) اخرجه مسلم في البيوع، باب: تحريم بيع الحاضر للبادي، رقم: ١٥٢١

(٤٢) اخرجه مسلم في البيوع عن يحيى بن يحيى (عيني/١١/٢٩٠) المترجم.

کەس و کاروانیانەوە، کەلەدەرەوە خۆراك و شمەکیان هێناوە تالەناو شارا بەنرخی ئاسایی و رۆژو بازاڕ بیفرۆشن، مەچن بەپیری ئەم جۆرە کەسانەوە بۆ ئەوەی پێش ئەوەی بگەنە ناو بازاڕ، کاڵاکەیان بەهەرزان لێ بکڕن و خۆتان لەوەدوا بەگران ئەو شتانە بفرۆشنەوە، بەڵکوو کەی شتو مەکەکە گەیشتە ناو بازاڕو جێگەی ئاسایی فرۆشتنی ئەوسا ئەگەر ویستتان بیکڕن).

٩٧٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُزَابَنَةُ بَيْعُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً وَبَيْعُ الزَّبِيبِ بِالْكَرْمِ كَيْلاً. (الحديث ٢١٧١، أطرافُهُ في: ٢١٧٢، ٢١٨٥، ٢٢٠٥) [٤٣].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەرگیری کردووە لەو جۆرە فرۆشتنە کەلەشەرعا ناودارە بەموزابەنە. موزابەنە واتە: بەرسیلەکاری (بریتییە لەفرۆشتنی فەریکە خورما کەپێی دەگوترێ روتاب، بەخورمای کامڵ بەپێوانە، وەبریتییە لەفرۆشتنی مێوژ بەترێ بەپێوانە) (تاج/٢/٣١٩).

**روونکردنەوە:**

حیکمەتی ئەم جۆرە نەهیە چونکە ئەم جۆرە فرۆشتنە سەردەکێشێ بۆ قومارو غەرەرو شتی وا.

٩٧٧- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ (رضي اللهُ عنهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ الْتَمَسَ صَرْفًا بِمِائَةِ دِينَارٍ قال: فَدَعَانِي طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ فَتَرَاوَضْنَا حَتَّى اصْطَرَفَ مِنِّي فَأَخَذَ الذَّهَبَ يُقَلِّبُهَا فِي يَدِهِ ثُمَّ قَالَ حَتَّى يَأْتِيَ خَازِنِي مِنْ الْغَابَةِ وَعُمَرُ يَسْمَعُ ذَلِكَ فَقَالَ وَاللَّهِ لا تُفَارِقُهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا

(٤٣) أخرجه مسلم في البيوع، باب: تحريم بيع الرّطب بالتمر الا في العرايا، رقم: ١٥٤٢

إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاّ هَاءَ وَهَاءَ). (الحديث ٢١٧٤ )(٤٤).

وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی لەژمارە(٩٦٨) دا رابوورد، طرفه في: (٩٦٨ت=٢١٣٤ف).

## روونکردنەوە:

مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حدثان هاوەڵی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بوو، لەسەردەمی نەزانی دا جەحێڵ بوو، سواری مایین دەبوو، بەڵام دیارە درەنگ موسوڵمان بووە، لەبەر ئەوە هەندێ لە پسپۆڕان بەتابیعی دادەنێن، بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان گێڕانەوەی هەیە لە خودی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوثمانو عەلیو کەسانی ترەوە، لەسەردەمی عومەردا دەمڕاستی هۆزەکەی بوو. لەتەمەنی نەوەدو چوار ساڵیدا، لەساڵی نەوەدو دووی کۆچی، هەندێ دەڵێن: پەنجاو دووی کۆچی، لەمەدینە ئەمری خودای کردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دوو فەرموودەی لەبوخاری دا هەیە، ئەگەر لە پەنجاو دووی کۆچیدا مردبێو تەمەنیشی نەوەدو دوو بووبێ، ڕاستە کەلەسەردەمی نەزانیدا، زەلام بووەو وابووە کە بتوانێ سواری ولاخی بەرزە ببێ.

٩٧٨- عن أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ وَالْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ إِلاّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ وَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ كَيْفَ شِئْتُمْ). (الحديث ٢١٧٥، طرفهُ في: ٢١٨٢)(٤٥).

(٤٤) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: الصرف وبيع الذهب بالورق نقداً، رقم: ١٥٨٦.

(٤٥) أخرجه مسلم في المساقاة،باب الصرف وبيع الورق بالورق نقداً، رقم: ١٥٩٠.

ئەبوبەكرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕ مەفرۆشن مەگەر سەر بەسەرو بەبێ باقی، هەروا زیو بە زیو، بەلام زێڕ بەزیوو زیو بەزێڕ چۆنی دەفرۆشن بیفرۆشن).

٩٧٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ وَلا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ وَلا تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ). (الحديث ٢١٧٧، طرفاهُ في: ٢١٧٦، ٢١٧٨)[٤٦].

ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورماو خوێ بەخوێ) دەبێ دەقاو دەق بنو بەقەد یەك بن وەبەبێ زیادو كەم بن، نابێ حازریان بە بزر بفرۆشن، وەك ئەوە لایەكیان زێڕەكەی حازر بێو ئەو لایەكەی تریان زیوەكەی دواخراو بێ).

٩٨٠- عن أبي صَالِحٍ الزَّيَّاتَ رحمه الله تعالى أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ فَقُلْتُ لَهُ: فَإِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لا يَقُولُهُ: فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ سَأَلْتُهُ فَقُلْتُ سَمِعْتَهُ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ كُلَّ ذَلِكَ لا أَقُولُ وَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِّي وَلَكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لا رِبًا إِلاَّ فِي النَّسِيئَةِ). (الحديثان: ٢١٧٨، ٢١٧٩، طرفاهما في: ٢١٧٦)[٤٧].

ئەبو صالحی زەییات (سۆزو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوێم لێ بوو ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (دیناری بەدیناری،

---

(٤٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: الربا، رقم: ١٥٨٤.

(٤٧) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: بيع الطعام مثلاً، رقم: ١٥٩٦.

دەست بەدەست، بەبێ زیادو كەم، دەفرۆشرێ، هەروا درەم بەدرەم) منیش عەرزیم كرد: قوربان! ئەی بۆچی ئیبنوعەبباس وا نافەرموێ؟ بەڵكوو دەڵێ: مادەم حازر بەحازرە مەرج نییە وەك یەك بن‌و بەقەد یەكتربن؟!

ئەبوسەعید فەرمووی: منیش بۆ ئەمەی تۆ دەیڵێیت ئەی زەییات! لە ئیبنوعەبباسم پرسی، پێم گوت: ئەمەی كەدەیڵێیت خۆت لە پێغەمبەرت بیستووە، یا لەنامەی خودادا دیدووەدتەوە؟ فەرمووی: من شتی وا ناڵێم ئێوە خۆتان زاناترن لەمن بەهەواڵەكانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەڵام من ئوسامەی كوڕی زەید(رەزای خوای لێ بێ) هەواڵی پێم دا: كە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (سوود كاتێ روودەدا كە لایێ لە دوو بەهاكە حازربێ‌و ئەوی تریان قەرز، یادواخراوبێ).

٩٨١-عن أبي الْمِنْهَالِ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ وَزَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) عَنْ الصَّرْفِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يَقُولُ: هَذَا خَيْرٌ مِنِّي فَكِلاهُمَا يَقُولُ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ دَيْنًا). (الحديثان ٢١٨٠و ٢١٨١، طرفاهما في: ٩٣٨ت= ٢٠٦٠، ٢٠٦١ف) [٤٨].

ئەبومینهال فەرمووی: لەبارەی پارە گۆڕینەوە بەپارەی تر، لەبەرائی كوڕی عازیبم پرسی، فەرمووی: لەزەیدی كوڕی ئەرقەم بپرسە، ئەو باشتری لێ دەزانێ، كەلەزەیدم پرسی، ئەویش فەرمووی: لەبەراء بپرسە، ئەو باشتری لێ دەزانێ هەركەسەشیان بەوی تریانی دەفەرموو: ئەو لەمن باشترە، وەهەردوكیشیان سەرەنجام فەرموویان: (پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) پێشگیری كردووە لەفرۆشتنی زێڕ بەزیو، ئەگەر بەقەرز بێ).(تاج/٢/٣٢٨ف —٦ز-١٥٤).

---

(٤٨) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: النهي عن بيع الورق — رقم: ١٥٨٩.

**روونكردنهوه:**

سوود -ريبا- لهكۆن و نوێدا لهجیهانی ماڵ و سامانا، رۆڵێكی گرنگی بینیوه وهله ئایینه ئاسمانییهكانا، سوود حهرام كراوه، سوودی حهقیقی كه ئایین به ناڕهوای دادهنێ ئهو جۆره سهوداو مامهڵهیه، كهسهر دهكێشێ بۆ خواردنی ماڵی خهڵك بهههوانته، یا بهشێوهیهكی بێویژدانانه، قهت وهك ئهم سهردهمه (كهسهردهمی شهڕی زهمانه) سوود ئاوا پهرهی نهسهندووه، بڕوانه: فیقهی ئاسان، بهرگی دووهم، لاپهڕه /٤٥٥ز- ١٩٤ ههتا لاپهڕه/٤٧٢.

٩٨٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاحُهُ وَلا تَبِيعُوا الثَّمَرَ بِالتَّمْرِ) (الحديث ٢١٨٣، طرفهُ في: ١٤٨٦) (٤٩).

عهبدوڵلای كوڕی عومهر(ڕهزای خوای لێ بێ) فهرمووی: پێغهمبهر(دروودی خوای لهسهر بێ) فهرمووی: (مێوهو بهری دارو درهختو شینایی تاپێنهگاو بهكهڵكی خواردن نهیێ مهفرۆشن، وهروتاب مهفرۆشن بهخورمای گهییوی تهواو).

٩٨٢م- وعنهُ رضي الله عنهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَخَّصَ بَعْدَ ذَلِكَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ بِالرُّطَبِ أَوْ بِالتَّمْرِ وَلَمْ يُرَخِّصْ فِي غَيْرِهِ) (الحديث ٢١٨٤، أطرافهُ في: ٢١٧٣، ٢١٨٨، ٢١٩٢، ٢٣٨٠) (٥٠).

دیسان عهبدوڵلای كوڕی عومهر(ڕهزای خوای لێ بێ) فهرمووی: زهیدی كوڕی ثابیت (ڕهزای خوای لێ بێ) فهرمووی: (پێغهمبهر(دروودی خوای لهسهر بێ) لهوهدوا رێگهی (بیع العرایا)ی دهدا، كه بهروتاب یابه خورما بفرۆشرێ، وهلهشتی تردا رێگهی نهدهدا). (بڕ: تاج/٢/ز١٥٣ل ٣٢٤).

---

(٤٩) أخرجه مسلم في البيوع، باب: تحريم بيع الرطب بالتمر الا في العرايا، رقم: ١٥٣٩.

(٥٠) أخرجه مسلم في البيوع، باب: النهي عن بيع الثمار قبل بدوّ صلاحها، راجع صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٠ص١٨٢ — المترجم.

٩٨٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَطِيبَ وَلا يُبَاعُ شَيْءٌ مِنْهُ إِلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إِلاَّ الْعَرَايَا) (الحديث ٢١٨٩) (٥١).

جابیر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەفرۆشتنی بەری دارو درەخت تاخۆش نەبێو بەکەڵکی خواردن نەیێ، وەهیچی لێ نافرۆشرێ مەگەر بەپارە بێجگە لە عەرایا، بەڵام عەرایا واتە: دارە دۆخە، دروستە بەرەکەی بفرۆشرێ بەخورما.

**ڕوونکردنەوە:**

عەرایا ئەوەیە: کە دەوڵەمەندێ دارێ دووان دەدا بەهەژارێ، تابەرەکەی بخواو لەپاشا دارەکە هی خۆیەتی، جا لەپاشا بۆ بارسوکی -ئەگەر کابرای هەژار لەو ماوەیەدا بەری دارەکەی بەکارنەهێنابوو- خاوەن باخەکە بەرەکەی لێ دەکڕێتەوە، بەخورمای گەییو ئەگەر هەردوولا مەیلی ئەوەیان هەبوو.
(بڕ: تاج/٢/ل/٣٢٤ف-٢).

٩٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ قَالَ نَعَمْ) (الحديث ٢١٩٠، أطرافُهُ في: ٢٣٨٢) (٥٢).

عەبدوڵڵای کوڕی عەبدول وەهاب فەرمووی: گوێم لێ بوو، عوبەیدوڵڵای کوڕی ڕەبیع لەمالیکی پرسی: ئایا لەداودت بیستووە کە ئەبوسفیان لە ئەبوهورەیرەوە بۆی گێڕابێتەوە: کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی بەیعول عەرایای داوە، بەمەرجێ لەپێنج وەسق زیاتر نەبێ، یا فەرمووی:

---

(٥١) أخرجه مسلم في البيوع، باب: النهي عن بيع الثمار قبل بدو... رقم: ١٥٣٦.

(٥٢) أخرجه مسلم في البيوع، باب: تحريم بيع الرّطب بالتمر الا في العرايا، رقم: ١٥٤١.

بەمەرجێ لەپێنج وەسق کەمتر نەبێ؟ مالیك رەحمەتی خودای لێ بێ فەرمووی: (بەلێ ئەوەم لەو زاتە بیستووە) (بڕ: تاج/٢/ل/٣٢٥ف-٣).

٩٨٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّاسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَبَايَعُونَ الثِّمَارَ فَإِذَا جَدَّ النَّاسُ وَحَضَرَ تَقَاضِيهِمْ قَالَ الْمُبْتَاعُ إِنَّهُ أَصَابَ الثَّمَرَ الدُّمَانُ أَصَابَهُ مُرَاضٌ أَصَابَهُ قُشَامٌ عَاهَاتٌ يَحْتَجُّونَ بِهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لَمَّا كَثُرَتْ عِنْدَهُ الْخُصُومَةُ فِي ذَلِكَ فَإِمَّا لا فَلا تَتَبَايَعُوا حَتَّى يَبْدُوَ صَلاحُ الثَّمَرِ كَالْمَشُورَةِ يُشِيرُ بِهَا لِكَثْرَةِ خُصُومَتِهِمْ ) (الحديث: ٢١٩٣) [٥٣].

زەیدی کوڕی ثابیت(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەردومەکە لەکاتی پێغەمبەر خوێدا(درودی خوای لەسەر بێ) بەری دارە خورمایان بەکاڵی، بەرلە پێگەیشتن دەکڕی‌و دەفرۆشت.

جا کاتێ باخەکەیان دەڕنی‌و کاتی دەورو تەسلیم دەهات، کڕیارەکە دەیگووت: ئەم خورمایە کەرووی هەڵهێناوە دەردی پێگەیشتووە، پوچەڵە، پوکاوەتەوە، بەم جۆرە نەخۆشین‌و دەردانە بڕو بیانویان دەهێنایەوە، جا لەم رووەوە کاتێ مەردومەکە سکالایەکی زۆریان لە خزمەت حەزرەتدا کرد، کەهەر کەسەیان بەلای خۆیاندا رایان دەکێشاو بەباشی نەدەچوونە ژێر بارەکە، حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) لەرووی ئامۆژگاری‌و راوێژەوە، نەوەك لەرووی قەدەغەکردنی ئێجگارییەوە، پێی فەرموون: (کە هەر دەیفرۆشن، مەیفرۆشن تابەرەکەی بەکەڵکی خواردن دێ لەم جۆرە ئافەتانە رزگاری دەبێ).

٩٨٦- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تُبَاعَ الثَّمَرَةُ حَتَّى تُشَقِّحَ فَقِيلَ وَمَا تُشَقِّحُ قَالَ تَحْمَارُّ وَتَصْفَارُّ

---

(٥٣) لم يخرجه مسلم حسبما ذكر العسقلاني في خاتمة كتاب البيوع ج/٤/٤٣٧ —المترجم.

وَيُؤْكَلُ مِنْهَا). (الحديث ٢١٩٦، أطرافُهُ في: )[٥٤].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەفرۆشتنی بەری دارو درەختو بەری سەوزەواتو شینایی هەتا ماتە دەدا، لەسەعیدی کوڕی میناء پرسیارکرا، کە یەکێك بوو لەپیاوانی ڕشتەی ئەم فەرموودەیە: ماتەدان واتای چییە؟ فەرمووی: یانی سوور ببێو زەرد هەڵگەڕێو بەکەڵکی لێ خواردن بێت.

٩٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ فَقِيلَ لَهُ وَمَا تُزْهِي قَالَ حَتَّى تَحْمَرَّ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَرَأَيْتَ إِذَا مَنَعَ اللَّهُ الثَّمَرَةَ بِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ؟). (الحديث ٢١٩٨)[٥٥].

ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەفرۆشتنی بەروبووم هەتا ماتەنەدات، پێیان گوت: ماتەدان واتای چییە؟ فەرمووی: ئەوەتە کەسوور ببێ. پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی پێم بڵێن: ئەو بەروبوومەی کەبەکاڵی دەیفرۆشن بەرلەوەی کە پێ بگات، ئەگەر خوا فەوتانی ئیتر فرۆشیار بەچی مەهانەیەکی ناڕەوا ماڵی کڕیار دەخوات؟)

٩٨٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟) قَالَ: لا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاثَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ

(٥٤) قال العيني: (والحديث أخرجه مسلم في البيوع) (ر: صم/١٠ص١٩٥=صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٠ص١٩٥).

(٥٥) اخرجه مسلم في المساقاة، باب: وضع الحواج، رقم: ١٥٥٥.

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا تَفْعَلْ بِعْ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا) (الحديث ٢٢٠١، أطرافُهُ في: ٢٣٠٢، ٤٢٤٤، ٤٢٤٦، ٧٣٥٠) (الحديث ٢٢٠٢، أطرافُهُ في: ٢٣٠٣، ٤٢٤٥، ٤٢٤٧، ٧٣٥١)(٥٦).

**ئەبوسەعیدی خودریو ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرموویان: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **پیاوێکی کرد بەسەرکاری سەر قەلای خەیبەر کەهاتەوە خورمایەکی نایابی هێنابوو، پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئایا خورمای خەیبەر هەمووی ئاوایە؟ وەك ئەمە گشتی ئاوا نایابو هەڵبژاردەیە؟) پیاوەکە گوتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا، بەلام مەنێ لەم خورما نایابە لەباتی دوومەن لەخورمای ئاسایی وەردەگرین، وەدوو مەن لەجیاتی سێ مەن! فەرمووی**(درودی خوای لەسەر بێ) **: (شتی وا مەکەن بانەبێ بەسوود، واتە: بانەبێ بەریبا، بەلام خورما ئایەخەکە بفرۆشن بەپارە، لەپاشا ئەو پارەیە چەندی کرد، خورمای نایابی پێ بکڕن). (بڕ: تاج/٢/ل/٣٣٨ز-١٦١).**

## ڕوونکردنەوە:

**مەبەست لەم جۆرە مامەڵەیە ئەوەیە کە موسوڵمان خۆی لە شتی گوماندار بپارێزێ، هەمیشە خۆی رابهێنێ بەکاری پاکی بێ گەردی بێ گومانەوە، بەپێی تەواناییش بەپێی کاتو شوێنو جێگەورێگە، کارئاسانیش بەکاربهێنێ، بار لەمەردوم گران نەکا لەکاتی سەوداو مامەڵەی رۆژانەدا، کە زۆربەی کات، زۆربەی خەڵك لە زۆربەی شوێن، ناچاری کردنی ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕە دەبن، جا وەك رێسایەکی دامەزراو دەڵێین: (گۆڕینەوەی میوە بەمیوە هەروەها دانەوێڵە بەدانەوێڵە، وەك ترێ بەترێ، چ رەش چ سپی چ باش چ خراپ، گەنم بەگەنم، چ باش چ خراپ، خورما بەخورما، جۆ بەجۆ،**

(٥٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: بيع الطعام مثلاً بمثل رقم: ١٥٩٣.

هەروا، مێوە بەمێوە لەجۆری خۆی، دانەوێڵە بەدانەوێڵە لەجۆری خۆی، لەزاراوەی یاسانامەی پیرۆزی خودادا، هەموو بەیەك چەشن دادەنرێن، لەکاتی کڕینو فرۆشتنو قەرزو ئاڵو گۆڕی تردا، دەبێ هەردوو لایەکە وەك یەك بنو کەمو زیادیان نەبێ، سەربەسەربن، چ بەپێوانەبێ چ بەکێشانە بێ...).

ئەگەر دوو کەس ویستیان بەوێنە گەنم بەگەنم بگۆڕنەوە هی لایەکیان باش بوو، وەکوو ئەوە قەندەهاری بوو، هی ئەو لایەکەیان خراپ بوو، وەك ئەوە ڕەشگوڵ بوو، وەویستیان کەسیان زەرەر نەکەن، ئەوە دەبێ لەپێشا ڕەشگوڵەکە بقەبلێنن بەپارە، بابلێین دەڕبە ڕەشگوڵ دەکاتە دە دینار، ئەوجا بەو پارەیە گەنمە قەندەهاری لەکابرای دووهەم بکڕێ، ئەگەر قەندەهاری ربەی بەدوو دیناربێ، دەبێ دەدینار بدا بەخاوەنی ڕەشگوڵەکەو دە ڕەبەی ڕەشگوڵی لێ وەربگرێ، ئەوسا پێنج ربەی قەندەهاری پێ بفرۆشێو دە دینارەکەی لەباتی ئەوە لێوەربگرێ!

٩٨٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُخَاضَرَةِ وَالْمُلامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ وَالْمُزَابَنَةِ (الحديث ٢٢٠٧)[(٥٧)].

ئیمامی ئەنەس فەرمووی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی کردووە لە: موحاقەلەو موخاضەرەو لە مولامەسەو مونابەذەو لە موزابەنە).

**ڕوونکردنەوە:**

موحاقەلە، واتە: قەرسیلکاریی، بریتییە لە فرۆشتنی قەرسیلو شینایی نەدووراوە بە گەنم یا بە دانەوێڵەی تر، موخاضەرە واتە: فرۆشتنی بەروبوومو میوەو دانەوێڵە بەسەوزی، پێش ئەوەی کە بگەیێ، مولامەسە

---

(٥٧) قال العيني: (الحديث من أفراد البخاري) ج/١٢ص١٤-المترجم.

واته: فرۆشتن بەدەست لێدان، موونابەذه واته: فرۆشتن بەهەڵدان بۆ یەكتری، موزابەنـە بەرسیلەكاری، واتـە فرۆشـتنی روتـاب‌و بەرسیلەی تـرێ بەسـەر دارەوە، بەخورماو مێوژ بەپێوانەیـەكی دیاریكراو.(بڕ: تـاج/٢ل /٣١٥ف —٢+ل —٣١٨ف -١١).

ئێستا واباوە فەریكە نۆك‌و روتاب‌و سێوی كاڵی نەگـەیوو هەڵـوژەو چوالەی سـەوزو شـتی تـری لـەم بابەتانـە پـێش ئـەوەی بەتـەواوی پێبگـەن، دەیانڕنن‌و دەیانفرۆشن، مەبەست ئەوەیە سەوزەو میوەو بەری دراو درەخت، دەبێ كاتێ مامەڵەی كڕین‌و فرۆشتنیان بـۆ ئـەنجام بـدرێ، كـە ئـەو مامەڵەیـە كێشەیێ بۆ كڕیار، یابۆ فرۆشیار یا بۆ ئابووری گشتی دروست نەكا.

٩٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ هِنْدٌ أُمُّ مُعَاوِيَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ سِرًّا؟ قَالَ: (خُذِي أَنْتِ وَبَنُوكِ مَا يَكْفِيكِ بِالْمَعْرُوفِ).

(الحديث ٢٢١١، أطرافُهُ في: ٢٤٦٠، ٣٨٢٥، ٥٣٥٩، ٥٣٦٤، ٥٣٧٠، ٦٦٤١، ٧١٦١، ٧١٨٠)[٥٨].

عائیشه (رەزای خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: هیندی دایكی موعاویە (رەزای خودایان لێ بێ) عـەرزی پێغەمبـەری كـرد(درودی خوای لەسەر بێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئـەبو سـفیانی مێـردم، پیاوێـكی رژدو گـیرەو، ئەوەنـدەم نـاداتێ كەبەئاسـایی بەشی خۆم‌و ماڵ‌و مناڵەكانم بكا، مەگەر ئەو نـەزانێ شـتی تـری ببـەم ئەوسا بەشمان بكا، جا ئایا ئەگـەر بـەنهێنی لەماڵەكەی ببـەم بـۆ مەسـرەفی خۆم‌و مناڵەكانم گوناهم دەگات؟ فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (ئەوەندە ببە كـە بەشـی خۆت‌و مناڵـەكانت بكـا، بەشـێوەیەكی پەسـەند بـەپێی یاسـای شـەرع). (تـاج /١٩٦/٢ف —٨ش).

---

(٥٨) قال العيني: (وأخرجه مسلم في آخر الكتاب، ج/١٢/١٩ عمدة القاري- المترجم.

٩٩١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ فَإِذَا وَقَعَتْ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتْ الطُّرُقُ فَلا شُفْعَةَ) (الحديث ٢٢١٣، أطرافُهُ في: ٢٢١٤، ٢٢٥٧، ٢٤٩٥، ٢٤٩٦، ٦٩٧٦) [٥٩].

**جابیر**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: (پێغەمبەر**(درووودی خوای لەسەر بێ) **شوفعەی داناوە، لەهەموو شتێکا کە هاوبەشی بێو هێشتا دابەش نەکرابێ، بەڵام ئەگەر شتەکە جیاکرایەوەو سنوور دانراو توخوبو مەرز نیشانەکراو ڕێگەو بان دیاری کرا، ئیتر هەقی شوفعەی بەسەرەوە نامێنێ) (شوفعە: بەشی هاوبەشو هاوسا هەڵگرتنەوە، کاتێ هاوبەشەکە یا هاوساکە، بەشی خۆی بفرۆشێ یا کەسێکی تر بەپێی شەرع ئەو بەشە بفرۆشێ).**

٩٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (هَاجَرَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلام بِسَارَةَ فَدَخَلَ بِهَا قَرْيَةً فِيهَا مَلِكٌ مِنْ الْمُلُوكِ أَوْ جَبَّارٌ مِنْ الْجَبَابِرَةِ فَقِيلَ دَخَلَ إِبْرَاهِيمُ بِامْرَأَةٍ هِيَ مِنْ أَحْسَنِ النِّسَاءِ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ مَنْ هَذِهِ الَّتِي مَعَكَ؟ قَالَ: أُخْتِي ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهَا فَقَالَ: لا تُكَذِّبِي حَدِيثِي فَإِنِّي أَخْبَرْتُهُمْ أَنَّكِ أُخْتِي وَاللَّهِ إِنْ عَلَى الأَرْضِ مُؤْمِنٌ غَيْرِي وَغَيْرُكِ فَأَرْسَلَ بِهَا إِلَيْهِ فَقَامَ إِلَيْهَا فَقَامَتْ تَوَضَّأُ وَتُصَلِّي فَقَالَتْ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ وَأَحْصَنْتُ فَرْجِي إِلاَّ عَلَى زَوْجِي فَلا تُسَلِّطْ عَلَيَّ الْكَافِرَ فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِهِ قَالَ الأَعْرَجُ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ راوي الحديث: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَتْ: اللَّهُمَّ إِنْ يَمُتْ يُقَالُ: هِيَ قَتَلَتْهُ فَأُرْسِلَ ثُمَّ قَامَ إِلَيْهَا فَقَامَتْ تَوَضَّأُ تُصَلِّي وَتَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ آمَنْتُ بِكَ وَبِرَسُولِكَ وَأَحْصَنْتُ فَرْجِي إِلاَّ عَلَى زَوْجِي فَلا تُسَلِّطْ عَلَيَّ هَذَا الْكَافِرَ فَغُطَّ حَتَّى رَكَضَ بِرِجْلِهِ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ إِنْ يَمُتْ فَيُقَالُ هِيَ قَتَلَتْهُ فَأُرْسِلَ فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ فَقَالَ وَاللَّهِ مَا أَرْسَلْتُمْ إِلَيَّ إِلاَّ شَيْطَانًا ارْجِعُوهَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَأَعْطُوهَا آجَرَ

---

(٥٩) اخرجه مسلم في المساقاة، باب: الشفعة، رقم: ١٦٠٨.

فَرَجَعَتْ إِلَى إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلام فَقَالَتْ أَشَعَرْتَ أَنَّ اللَّهَ كَبَتَ الْكَافِرَ وَأَخْدَمَ وَلِيدَةً) (الحديث ٢٢١٧، أطرافُهُ في: ٢٦٣٥، ٣٣٥٧، ٣٣٥٨، ٥٠٨٤، ٦٩٥٠)[٦٠].

**ئەبوهورەیرە**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست**(دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئیبراهیم پێغەمبەر**(سەلامی خوای لێ بێ) **لەگەڵ خاتوو هاجەرەی خێزانی کۆچی کرد بۆ وڵاتێ ڕۆشتنە ناو شارێ، پادشایەکی لێ دەبێ، یا فەرمووی: (زۆردارێ لە زۆردارە ملهوڕەکانی لێ دەبێ. سارە بۆ جوانی وێنەی نابێ، دەچن بەپادشاکە دەڵێن: پیاوێ هاتووە، ناوی ئیبراهیمە، ژنێکی جوانی شۆخو شەنگی واپێ، جا زۆردارەکە دەنێرێ بۆ لای ئیبراهیمو پرسیاری لێ دەکەن: ئەی ئیبراهیم! ئەم ژنەی وا لەگەڵتا چیتە؟ دەفەرموێ** (سەلامی خوای لێ بێ) **: خوشکمە.**

**ئەوجا ئیبراهیم دەگەڕێتەوە بۆ لای سارە! پێی دەفەرموێ: ئەی سارە!من بەمانەم گوتووە کە تۆ خوشکمی، ئەگەر لە تۆیان پرسی لەم بارەیەوە، قسەکەم بەدرۆ نەخەیتەوە، تۆیش پێیان بلێ: کە تۆ خوشکی منی، دەی لەراستیدا تۆ خوشکی ئایینی منی بەپێی ئیسلامەتی، موسوڵمان براو خوشکی موسوڵمانە، دەی سوێندم بەزاتی خودا، لەسەر رووی زەوی بێجگە لە خۆمو لەخۆت، موسوڵمانێکی تر گومان نابەم، جا پاش ئەم ئامۆژگارییە، ئیبراهیم سارە خاتون دەنێرێ بۆ زۆردارەکە(وە لەدڵیشەوە دڵنیا دەبێ لەوە کە خودای مەزن ئابڕوی لەکەدار ناکاتو، ئەم کارە بێ حیکمەت و دانایی نییە)..**

---

(٦٠) أخرجه مسلم في كتاب الفضائل، باب: فضائل ابراهيم الخليل (عليه السلام). (صم/١٥/١٢٢) المترجم.

جا هەر کە سارە دەچێتە ژوورەوە بۆ لای زۆردارەکە، کابرا خۆی بۆ ناگیرێو دەستی بۆ دەبا، جا سارە هەڵدەستێ دەستنوێژێکی ئاسایی دەگرێو، دەست دەکا بەپاڕانەوەو نوێژکردنو دەفەرموێ: ئەی خودای خۆم! کەس نەزانێ تۆ دەزانی، کەمن باوەڕم بە تۆو بەڕەوانەکراوی تۆ کە ئیبراهیمە هێناوە و، موسوڵمانێکی پاكو بێ گەردمو، داوێنی خۆم لەهەموو کارێکی ناڕەوا پاراستووە، بێجگە لەهاوسەری خۆم کە ئیبراهیمە کەسی تر، دەستی بۆ نەهێناوم، من لەشتی واوە زۆر دوورم، شایانی ئەو بێ ڕێزییە نیم، هەتا دەستەڵاتم هەبوو ئەمە حاڵم بوو، ئێستایش بێدەستەڵاتم، خودایە! تۆ تواناو بەدەستەڵاتی، ئەم زەندیقەم بەسەردا زاڵ مەکەو ئابڕوم بپارێزە، جا خودا زۆردارەکە لە گلو گۆ دەخا،و هەناسەی دەگیرێو دەست دەکا بەلرخە لرخ! تەنانەت دەست دەکات بەلەقە فرتێی مەرگ).

ئەعرەج (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕێتەوە، لێرەدا فەرمووی: ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدورەحمان، کە ئەویش یەکێکە لەگێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە، ئەم پارچەیەی تری ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوەو فەرمووی: ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووشی: (سارە فەرمووی: خودایە! ئەم بەدکارە بەمە بمرێ من تاوانبار دەکەنو دەڵێن: ئەم ژنە کوشتی، لەبەر ئەوە کە خوێنی ئەم سەگە پیسە بەناهەق نەتلێتەوە بەسەر مندا، بەمە مەیکوژە، ئیتر کابرا فێو پەرکەمەکەی بەری دەدا.

بەڵام عارنانێو دیسان پەلاماری خاتوو سارە دەداتەوە، ئەویش دیسانەوە دەستنوێژ دەگرێتەوەو نوێژ دەکاتەوەو لە خودا دەپاڕێتەوە، کابرایش هەمدیسان توشی پەرکەم دەبێتەوەو دەکەوێتە کەف چنانو لرخە لرخو لەقە فرتێ، هەمدیسانەوە خاتوو سارە دەفەرموێ: خودایە! ئەگەر بمرێ، دەڵێن: ئەم ژنە کوشتی! دیسان کابرا حاڵەتەکە بەریدەدا،، جا تا سێجار

ئەمە لەنێوانیان دا روو دەدا، لەسەری جاری سێیەمدا، کابرای زۆردار بەناچاری دەڵێ: (بەخودا ئەمەی ئێوە هێناوتانە بۆ من، جنۆکەیە دەست لەمرۆڤ دەوەشێنێ، بەکەڵکی من نایەت بیبەنەوە بۆ ئیبراهیم خۆی).

وەلەسەر فەرمانی ئەو پادشایە خاتوو هاجەرەیان بەدیاری پێشکەش کرد بەخاتوو سارە، وەئەویش ئەو دیاریەی قەبوڵکردو، گەڕایەوە بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیمو فەرمووی پێی: (خۆ ئاگات لێ بوو خوا چۆن ئەو بێبڕوایەی کۆڵەکوتاو، ئەم کارەکەرەیشی بۆمان رەخساند کە هاجەرەیە. ئیبراهیمیش دیاری کابرای بێبڕوا، کە خاتوو هاجەرە بوو، کە دابووی بەسارە خاتوون دامەزراندو رەتی نەکردەوە).

## روونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە روونکردنەوە: یەکی باشی دەوێ، بەپێی سەرچاوەکانی شیکردنەوەی ئەم جۆرە بەهرانەی واتیادا:

١- (بڕوانە: تاج/٥/٢٥٧ف —١+ بڕوانە: تاج/٤/٣٧٦ ف —٣ +عینی/١١ ص٣٠ + فتح الباری ژمارە: ٢٦٣٥، ٣٣٥٧، ٣٣٥٨، ٥٠٨٤، ٦٩٥٠) هەروا (بڕوانە: تاج/٦ل —١٥ف —١٢+ تاج/٥ل —٢٥٧ف —١).

٢- فەتحولباری دەفەرموێ: جێگەی پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەم شوێنەیەوە، کە باسی کڕینی کۆیلەو وەرگرتنی دیاریو بەخشینو دەسەنەیە لەکافری جەنگی، ئەو پارچەیەیەتی کە دەفەرموێ: (وأعطوها آجَر، واتە: خاتوو هاجەرەی بەدیاری بدەنێ). هەروا دەفەرموێ: (بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەستنوێژ لەناو نەتەوە موسوڵمانەکانی تری پێش ئێمەدا بووە).

٣- نوێژو نزاو پاڕانەوەو دەستنوێژو یادی خوداو پشت بەستن بەخواو هانا بردن بۆ خوداو خودا کردن بەشایەت لەسەر کردەوەی چاك، ئەم جۆرە

شـتانه هەمیـشەو هـەموو کاتێـك باشـترین چـەکی دەسـتی مـرۆی موسـوڵمانن، بەتایبـەتی لـەکاتی لێقـەومان‌و کەساسـی‌و دامـاوی‌و بـێ دەرەتانی دا.

٤- حیلـە شـەرع‌و فێڵـی شـەرعی‌و درۆو سـوێنی درۆو تەوریيـەو شـوێنەونیَ، لەکاتی وادا دروستە، تەنانەت تەڵاق خواردن‌و ظیهارکردنیش لەکاتی وادا دروستەو، نەتەڵاقەکە دەکەوێ‌و نەظیهـارەکـە دادەمـەزرێ، بەمـەرجێ بـۆ بەرژەوەندیەکی رەوای وابـێ کەشایستەی کـردن یـان گـوتنی ئـەو شتانە بێ، کـردن‌و گـوتنی ئـەم جـۆرە شـتانە لـەحوکمی ئیکـراه دان، بەمـەرجێ کردن‌و گوتنیان بۆ پاراستن‌و رزگارکردنی سەرو ناموس‌و سامانی بێ کە شایستەی ئـەوەبێ، بەڵـکوو هەنـدێ جار سـوننەتن، بگـرە جاری وادەبـێ پێویستن، واتە: واجبن.

٥- وشەی (ئیبراهیم) - لەسەر فەرمایشتی عەسقەلانی — ناوێـکی سوریانییە واتە: (أبٌ رحیم = باوکی دڵسۆز= باوکی میهرەبان).

٦- زۆرجـار خـودای گـەورە پیاوچـاکان تـاقی دەکاتـەوەو تووشـی دەردو بـەڵاو کێـشەو تـەنگ‌و چـەڵەمەو سـەخڵەتییان دەکـا، تـابزانێ پلـەی صـەبرو تەحـەمولیان چـۆنە مەبەسـت رەفعـی دەرەجاتیانـە، هـەروەك مەبەسـت ئەوەیـشە کـەببن بەسەرمەشـق بـۆ موسـوڵمانان بەشـێوەی گـشتی کەلـەکاتی وادا بڵـێن: خـۆ مـن لـە حـەزرەتی ئیـبراهیم زیاتر نیم... تاد.

٧- ئـەم فەرموودەیـە نیـوەی مـسندەو نیوەکـەی تـری مەوقوفـە لەسـەر ئەبوهورەیرە (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموو گێڕەرەوەکانی بێ).

٩٩٣- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا

فَيَـكسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لا يَقْبَلَـهُ أَحَـدٌ)
(الحديث ٢٢٢٢، أطرافُهُ في: ٢٤٧٦، ٣٤٤٨، ٣٤٤٩) [٦١].

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خوای گەورەیـە، هاکا عیسای کوڕی مەریـەم** (سەلامی خوای لێ بێ) **لـە ئاسمانـەوە هاتـەخوارەوە بۆ ناوتـان و، بـوو بەدادپەروەرێـکی دادپـەروەر بەسـەرتانەوە، ئـەو کاتـە کـە دێ بـەپێی ئـایینی پیرۆزی ئیسلام حوکم دەکا، لەبـەر ئـەوە خـاچ (واتـە: صلیب) دەشـکێنێ کـە نیـشانەی نەصـرانییەتە، وەبـەراز دەکـوژێ (کـە لـەئایینی گاورانـدا جـۆرە گرنگییەکی تایبەتی هەیە)، وەسەرانە هەڵدەگرێ (چونکە هەموو ئاییـنـەکانی تر پوچ دەکاتەوەو، بەس ئایینی پیرۆزی ئیسلام قەبوڵ دەکا).**

**سـامانو مـاڵیش وا زۆردەبـێ دەبـێ بەلێـشاو، بەشـێوەیەکی وا بێـزراو دەبـێ لەبەر زۆری کەس وەری ناگرێ لەکەس، هـەتا دەگاتـە ئـەو رادەیـە کـەس تاقـەتی ماڵداری نامێنێو، مـەردوم بەگشتی دەزانـن کـەوا قیامـەت نزیـك بۆتـەوە، لەبـەر ئـەوە دڵیـان بـەدنیا خـۆش نابـێو، هـەموو سـەر دەکەنـە بەنـدەییو پەرستشو خواپەرستیو تاعەتو نوێژو رۆژوو، تاوای لێدێ کە تاکە یـەك کڕنـووش بـردن بۆ خودا، باشتر دەبێ لەجیهانو هەرچی وا لەجیهان دا). (تاج/١٠ل —٣٣٤ف١).**

## **روونکردنەوە:**

**پەیوەنـدی ئـەم فەرموودەیـە بەباسـی کڕینو فرۆشـتنەوە لـەو رووەوەیـە: شتێ کوشـتنی بەشـێوەیەکی گـشتی رەوا بـێو، دروسـت بـێ قـەڵا چـۆبکرێو بنەبڕبێ، شایانی کڕینو فرۆشتن نییە.**

---

(٦١) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: نزول عيسى (عليه السلام) حاكماً بشريعة نبينا محمد (صلى الله عليه وسلم) . رقم: ١٥٥.

# باسى كرينى وێنەی شتى بێ گيان

٩٩٤- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ إِنِّي إِنْسَانٌ إِنَّمَا مَعِيشَتِي مِنْ صَنْعَةِ يَدِي وَإِنِّي أَصْنَعُ هَذِهِ التَّصَاوِيرَ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لا أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللَّهَ مُعَذِّبُهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَدًا) فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ فَقَالَ وَيْحَكَ إِنْ أَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تَصْنَعَ فَعَلَيْكَ بِهَذَا الشَّجَرِ كُلِّ شَيْءٍ لَيْسَ فِيهِ رُوحٌ. (الحديث ٢٢٢٥، أطرافُهُ في: ٥٩٦٣، ٧٠٤٢)[٦٢].

لەعەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە(رەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی وێنەکێش هاتە خزمەتی، عەرزی کرد: قوربان! من مرۆڤێکم، بەرەنجەشانی خۆم دەژیم، من ئەم وێنانە دەکێشم، ئایا تۆ رەوایان دەبینی یان نا؟ ئەویش پێی فەرموو: وەرە پێشەوە ئەوجا ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: بۆ خۆم چیم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لەسەر بێ) بیستووە، ئەوەت پێدەڵێم، بیستم لە پێغەمبەر دەیفەرموو: (هەرکەسێ وێنەیێ دروست بکا، خودا لەقیامەتا لەسەر ئەوە سزای دەدا، پێی دەگوترێ: ئەم ئێش و ئازارەت بەردەوام دەبێ، هەتا گیان دەکەی بەبەر ئەم وێنەیەدا کە دروستت کردووە، قەت قەتیش ناتوانێ گیان بکات بەبەریدا) ئیتر کابرا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو راچەنی و زەرد هەڵگەڕا.

ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: هاوار لەخۆت! خۆ ئەگەر هەر چارت نییەو ئەم ئیشە هەر دەکەیت ئەوا وێنەی دارو درەخت و شتی بێ گیان و ئەم جۆرە شتانە دروست بکە،کە بێ گیانن و گیان لەبەر نین.(تاج/٤ز- ٥٠ل-١٦١ فـ٥).

---

(٦٢) أخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: تحريم تصوير صورة الحيوان، رقم: ٢١١٠.

**ڕوونکردنەوە:**

لەبەرگی چواری تاجول ئوصولی پیرۆزدا باسێکی باشم لەسەر وێنەگرتن، بەعەرەبیو بەکوردی لە لاپەڕە ١٦٤ تا ١٦٦ نووسیوە، موتالاکردنی بێ سوود نییە، ژمارە (٣) ی تەرجەمەکەی هەڵەیەکی گەورەی واتیادا، ڕاستەکەی ئاوایە، ٣- دانانو هەڵواسینی وێنە ئەگەر تەواو نەبێو، لەسەر شێوەیەکی وا بێ کە خاوەنەکەی لەسەر ئەو شێوەیە نەژی، ئەوە حەرام نییە، بەڵام یارۆچکەی منالانو بارستەدار(مجسَّم) یش بێ قەیناکا، تەواویش بێ قەیناکا.

## مرۆڤی ئازاد نافرۆشرێ

٩٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (قَالَ اللَّهُ: ثَلاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ) (الحديث ٢٢٢٧، طرفه في: ٢٢٧٠) [٦٣].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ئەم سێ جۆرە کەسەیە، لەرۆژی قیامەتا خۆم بەتایبەتی داواچیم لەسەریان: ئەو کەسەیەی کە بەهۆی ناوی پیرۆزی منەوە کەسێك هێمن دەکاتەوە، وەك ئەوە پەیمان دەدا بەکەسێكو سوێند بەخودا دەخوا کە ئەو پەیمانە دەباتە سەر، یا لەبەر خوا تەماداری دەکا کە ئەو شتەی دەداتێ، یا بۆی دەکا، کەچی لەپاشا دەستخەڕۆی دەکاو، پەیمانەکەی دەشکێنێو ناپاك دەردەچێ، دووەم پیاوێ ئادەمیزادێکی ئازاد بفرۆشێو بەهاکەی بخوا، سێیەم: پیاوێ کرێکارێ بەکرێ بگرێو کاری خۆی پێتەواو بکاو، کەچی کرێکەیی نەداتێ). (تاج/٢/٣٠٨ف -١١).

---

(٦٣) قال العلامة العينى -رحمه الله تعالى-: (وهذا الحديث من أفراد البخاري – عمدة/١٢ص٤٢) المترجم

**ڕوونكردنەوە:**

مرۆڤی ئازاد كڕینو فرۆشتنو هبەو بەخشینو كردنی بەوەقف دانامەزرێ. بەڵام ئەگەر كەسێ بڵێ: نەزر بێ لەسەرم منالی لەمنالەكانم بكەم بەمەلا، یا بەپزیشك ئەوە نەزرەكەی دادەمەزرێ دەبێ بەپێی توانا جێ بەجێی بكا، لەم سێ شتەدا جیاوازی لەنێوانی پیاوو ژن دا نییە، ناوهێنانی پیاو لە فەرموودەكەدا بۆ نموونەیە، نەوەك بۆ قەیدو مەرج.

٩٩٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ: (إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ) فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: لا هُوَ حَرَامٌ) ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذَلِكَ: (قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ) (الحديث ٢٢٣٦، طرفاه في: ٤٢٩٦، ٤٦٣٣) [٦٤].

جابیری كوڕی عەبدوڵلا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادكردنی شاری مەككە لەو كاتەدا كە هێشتا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لە مەككە مابوو، نەگەڕابووەوە بۆ مەدینە، لەخۆیم بیست دەیفەرموو: (خوداو پێغەمبەری خودا، كڕینو فرۆشتنی مەیو ئارەقو مردارەوەبووو بەرازو بتیان حەرام كردووە) عەرزی كرا قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا پێمان بفەرموو: ئەی ئایا ئەوە چۆنە كەخەڵك بەزو پیوی مردارەوە بوو، كەشتیو كەوڵی پێ چەور دەكەن، یا چرای پێ دەگرێنن؟ شتی وا دەبێ یا نا؟ فەرمووی: (نابێ ئەوەیش هەر حەرامە). لەهەمان كاتدا فەرموووشی(درودی خوای لەسەر بێ) : (خودا بچێ بەگژ جولەكەكاندا، كاتێ خودای گەورەو سەروەر، بەزو پیوی

---

(٦٤) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: تحريم بيع الخمر، الميتة، الخنزير، الأصنام، رقم: ١٥٨١.

مردارەوەبووی لێ حەرام کردن، دەچوون بەئاگر دەیان توانەوەو پوختیان دەکردو دەیان پالأوتو بەرۆنی دەیانفرۆشت ئەوجا پارەکەیان دەخوارد). (تاج/٢/٣٠٥ —ا ز ١٤٨) پەیوەندی فەرموودەکە بەبابەتی کڕینو فرۆشتنەوە ئاشکرایە.

٩٩٧- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَمَهْرِ الْبَغِيِّ وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ) (الحديث ٢٢٣٧، أطرافُهُ في: ٢٢٨٢، ٥٣٤٦، ٥٧٦١) [٦٥]

ئەبومەسعودی ئەنصاری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەهای سەگو کرێی حیزو وەڵیفەتو سەرقەڵەمانەی کوڵەنانی قەدەغە کردووە). ) تاج/٤/٢٣٥-١).

پێشەوا شێخی عەسقەلانی لەپایانی ئەم نامەی کڕینو فرۆشتنەدا دەفەرموێ: (ئەم نامەیە دووسەدو چلو حەوت فەرموودەی بەرزەوە بوو (مرفوع) ی لەخۆ گرتووە، چلو شەشیان بێ ڕشتەن، واتە: موعەللەقن ئەوانی تریان هەموویان پەیوەستن، واتە: مەوصولن، دووبارەکانیان سەدو سیی و نۆ فەرموودەن، پوختەکەیان سەدوهەشت فەرموودەن، =(٢٤٧-١٣٩=١٠٨) پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) وەك پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم فەرموودانەی هەموو گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم بیستو نۆ فەرموودەیەیان:

١- فەرموودەی ژمارە (٩٣٣ت=٢٠٤٨ فتح= چیرۆکی ژنهێنانی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف).

٢- فەرموودەی(٢٠٥٥ فتح= أجِدُ تمرَةً ساقِطَةًعلى فِراشي) لەتەجریدەکەدا نییە.

٣- فەرموودەی (٩٣٦ت=٢٠٥٧ ف = سمُّو الله عليه وكلوهُ).

---

(٦٥) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: تحريم ثمن الكلب، رقم: ١٥٦٧.

٤- فەرموودەی (٩٣٧ت=٢٠٥٩ ف = يأتي على النّاس زمانٌ ).

٥- (٢٠٧٠ق) فەرموودەکەی ئەبوبەکر: قدْ عِلِمَ قومِي أنَّ حرفتِي...).

٦- (٩٤٢ت=٢٠٧٢ ف=أطيبُ ما أكَلَ منْ كسبِهِ) فەرموودەکەی میقدام(ڕەزای خوای لێ بێ).

٧- فەرموودەکەی جابیر (رحِمَ اللهُ رجلاً سَمْحاً =٩٤٣ت=٢٠٧٦ف).

٨- (...لاداءَ ولاخبثَـــةَ ولا غائِلَـــةَ) لـــە فـــەتحا وا لـــەنێوانی ژمـــارە (٢٠٧٨و ٢٠٧٩ دا).

٩- (٩٤٧ت=٢٠٨٦ف= باسی نەیی کردن لەبەهای خوێن) ؟.

١٠- ئەثەرەکەی ئیبنو عەبباس سەبارەت بە دوائایەتی هاتووی قورئان، کەوا لەپێش ژمارە: ٢٠٨٦ وە.

١١- (٢٠٨٨ف) لەتەجریدەکەدا نییە، فەرموودەی: (إنّ رجُلاً أقامَ سلعةً).

١٢- ئەثەرەکەی ئیبنو عومەر (كانَ على جَمَلٍ صـعْبٍ) وا لـەپێش ژمـارە (٢٠٩٧ دا لەفەتح دا).

١٣- فەرموودەی: (٩٥٢ت =٢٠٩٩ف) باسی وشتری بەناو کەوتوو.

١٤- فەرموودەی: (إكتالوا حتّى تَسْتوفُوا).

١٥- فەرموودەکـەی عوثمـان: (إذا بِعــتَ فَكِــلْ) ئـەم دووە وان لـەپێش ژمـارە (٢١٢٦)ی فەتحەوە.

١٦- (٩٦٣ت = ٢١٢٧ف).

١٧- (٩٦٤ت = ٢١٢٨ ف).

١٨- فەرموودەی: (٢١٣٨ف) باسی کۆچی پێغەمبەرو ئەبوبەکرە.

١٩- فەرموودەی: (المَكرُ والخَديعَةُ في النّار) وا لەپێش (٢١٤٢ف).

٢٠- نـەهی لـە مولامەسـە فەرموودەکـەی ئەنـەس وا لـەپێش ژمـارە (٢١٤٤) ، نەهی لە مونابەذە وا لەپێش (٢١٤٦ف).

٢١- فـەرموودەی (إذا استَنْـصَحَ أحـدُكمْ أخـاهُ فَلْيَنـصَحْ لَـهُ) وا لـەپێش ژمـارە (٢١٥٧ف).

٢٢- فەرمووده‌ی (٢١٥٩ف =لايبيعُ حاضِرٌ لبادٍ) گێڕانەوەی ئیبنو عومەر.

٢٣-فەرموودەی (٢١٨٧ف- ئیبنوعەبباس) لە تەجریدەکەدا نییە.

٢٤- فەرموودەکـەی زەیـدی کوڕی ثـابیـت سـەبارەت بـە فرۆشتنی میوەجاتو بەروبوومی باخو باخات =(٩٨٥ت =٢١٩٣ف).

٢٥- فەرموودەی(وقال النّبيُّ(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لسلمان: كاتِبْ وكانَ حُرّاً).

٢٦- (٢٢١٩ف = قال عبد الرحمن بن عوف رضي الله عنهُ لصهيب: إتّقِ الله...).

٢٧- فەرموودەی (ثلاثةٌ أنا خصمُهمْ...=٩٩٥ت=٢٢٢٧ف).

٢٨- فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە سەبارەت بەدەرکردنی جوولەکە لە دوورگەی عەرەب، والەپێش ژمارە: ٢٢٢٨ف.

٢٩- بڕوانە ژمارە (٢٠) لەم زنجیرەیە، چونکە بریتییە لە دوو فەرموودە.

هەروا مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: (...ئەم نامەی کڕینو فرۆشتنە پەنجاو دوو ئەثەر (بیستراو) ی صەحابەو تابعینی واتیادا).

**تێبینی:**

لەتەجریدەکەدا لـە پوختـەی نامـەی کـڕینو فرۆشـتن، کـە سـەدو هەشت فەرموودەیە، شەستو پێنج فـەرموودەیان هـاتووە، لـەژمارە(٩٣٣) هـەتا ژمـارە (٩٩٧=٩٩٧-٩٣٢=٦٥). (باسـی کـڕینو فرۆشـتن بـەدوورو درێـژی وا لەبـەرگی دووەمی فیقهی ئاساندا، لاپەڕە/٤٤٣/ ز-١٨٥ هەتا ز-٢٠٣ل -٤٧٢).

جا تکایە لەخوێنەری ئازیز، لەکاتی کێشەیەکا، بـەوردی موتـالای باسـەکە بفـەرموون لـە کتێبـەکانی فیقهـدا. چـونکە سەرچـاوەی ئـەو کتێبانـەش هـەر سوننـەتی پێغەمبەرو ئایەتەکانی قورئانە، وە بەبێ گومان خاوەن ئـەو پـەڕاوە پیرۆزانە گەلێ لە ئێمە لە فەرموودەو ئایەتەکان تێگەیشتوون.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٠- نامەی سەلەم

(بڕ: فیقهی ئاسان/٢/٤٥١ز -١٨٨)

٩٩٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَالنَّاسُ يُسْلِفُونَ فِي الثَّمَرِ الْعَامَ وَالْعَامَيْنِ فَقَالَ: (مَنْ سَلَّفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ) (الحديث ٢٢٣٩، أطرافُهُ في: ٢٢٤٠، ٢٢٤١، ٢٢٥٣) وعنه في رواية: (إلى أجلٍ مَعْلُومٍ) ( الحديث: ٢٢٤٠) (٦٦).

ئیبنوعەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵك بەسەر بەری دارو درەختو شیناییو دانەوێڵە، سەلەمیان دەکرد بۆ ماوەی ساڵێ، دووان، جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەر کەسێ سەلەم بەسەر خورما دەکا، یاسەلەم بەسەر شتێ دەکا با ئەندازەی شتە سەلەم بەسەر کراوەکە دیاری بێت، ئەگەر بەپێوانەبێ ئەندازەی پێوانەکەی زانراوبێ، وەك تەنەکەو قەزناخو ربەو تەغارو مەن، ئەگەر بەکێشانە بوو، عەیارەی کێشانەکەی زانراوبێ، وەك: کیلۆو هۆقەو میسقاڵ، هەروەها بۆ ماوەی چەندیشە ماوەکەی دیاری بکرێ، وەك: ساڵێ، دوو ساڵ، مانگێ، دوو مانگ...تاد).

٩٩٩- عَنْ ابْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ إِنَّا كُنَّا نُسْلِفُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ ) (الحديث ٢٢٤٢، طرافاهُ في: ٢٢٤٤، ٢٢٥٥) (٦٧).

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (بەسەرینی پێغەمبەر خۆی(دروودی خوای لەسەر بێ) هەروا بەسەرینی ئەبوبەکرو عومەریش(ڕەزای

(٦٦) أخرجه مسلم في الساقاة، باب: السلم، رقم: ١٦٠٤.

(٦٧) حسب خاتمة كتاب السلم في الفتح ج/٤ص٤٣٥ لم يوافقهُ مسلم على تخريجهِ — المترجم.

خوای لێ بێ) پارەمان بەسەلەم دەدا بە جوتیارەکانی شام، بەسەرگەنم‌و جۆو مێوژو خورماو رۆنی زەیتوون، بە پێوانەیەکی دیاری، وەهەتا ماوەیەکی دیاری). (تاج/٢/٣٣٠ف -٢).

– وعنه في رواية: (قَالَ كُنَّا نُسْلِفُ نَبِيطَ أَهْلِ الشَّأْمِ فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّيْتِ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ قيلَ لهُ: إِلَى مَنْ كَانَ أَصْلُهُ عِنْدَهُ؟ قَالَ مَا كُنَّا نَسْأَلُهُمْ عَنْ ذَلِكَ ) (الحديث ٢٢٤).

ئەم گێڕانەوە ئەم پترییەی هەیە، کە دەفەرموێ: (عەرزی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام کرد: باشە پارەکەتان بەسەلەم دەدا بەو جۆرە کەسانە، کە بنك‌و بنەتۆوی ئەو شتانەیان هەبوو؟ فەرمووی: پرسیاری ئەوەمان لێ نەدەکردن، کە ئایا ئێوە کشتوکاڵ‌و ئاژەڵ‌و شتی واتان هەیە،کەسەرچاوەی هەبوونی ئەم شتانەن، چونکە شتی‌وا لەسەلەما مەرج نییە).

لەپایانی نامەی سەلەم دا عەسقەلانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (نامەی سەلەم سیی‌و یەك فەرموودەی واتیادا، چواریان بێ ڕشتەن، واتە: تەعلیق (موعەللەقن) ، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: مەوصولن، پاڵفتەکەیان پێنج فەرموودەیانە ئەوانی تریان هەموو دووبارەن، پێشەوا موسلیم لەپێنجە پوختەکە، دوانەکەی ئیبنوعەبباسی گێڕاوەتەوە).

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤١- نامەی شوفعه

(هەڵگرتنەوەی بەشی هاوبەش‌و هاوسێ (بڕ: فیقهی ئاسان/ ٢ل- ٥١٥ز -٢٢٤).

١٠٠٠- عن أَبِي رَافِعٍ رضي الله عنه، مَوْلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انه جاء الى سَعْد بن أبي وقاص رضي اللهُ عنهُ فقال: ياسعد ابْتَعْ مِنِّي بَيْتَيَّ فِي دَارِكَ فَقَالَ سَعْدٌ وَاللَّهِ مَا أَبْتَاعُهُمَا فَقَالَ الْمِسْوَرُ وَاللَّهِ لَتَبْتَاعَنَّهُمَا فَقَالَ سَعْدٌ وَاللَّهِ لا أَزِيدُكَ عَلَى أَرْبَعَةِ آلافٍ مُنَجَّمَةً أَوْ مُقَطَّعَةً قَالَ أَبُو رَافِعٍ لَقَدْ أُعْطِيتُ بِهَا خَمْسَ مِائَةِ دِينَارٍ وَلَوْلا أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ مَا أَعْطَيْتُكَهَا بِأَرْبَعَةِ آلآفٍ وَأَنَا أُعْطَى بِهَا خَمْسَ مِائَةِ دِينَارٍ فَأَعْطَاهَا إِيَّاهُ) (الحديث ٢٢٥٨، أطرافُهُ في: ٦٩٧٧، ٦٩٧٨، ٦٩٨٠، ٦٩٨١) [٦٨].

ئەبورافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) کەئازادکراوی پێغەمبەر بوو(دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، فەرمووی پێی: ئەو دووماڵەم کەوان لەناو خانووەکەی تۆدا، بیانکڕە لێم، سەعدیش پێی فەرموو: بەخوا نایانکڕم لێت، میسوەری کوڕی مەخرەمەیش کە لەوێ بوو، بەسەعدی فەرموو: بەخوا دەبێ بیانکڕیت لێی، سەعدیش فەرمووی: کەوای لێ هات بەخوا چوارهەزار زیاترت پێ نادەم، ئەویش بەقەرزێ کەبکرێ بەچەند قیستێ، ئەبورافیعیش فەرمووی: (بەم بەشەم کەوا لەناو خانووەکەی تۆدا، پێنج سەد دیناریان پێ داوم، بەڵام لەبەر ئەوەی کەبە خودی خۆم لەزاری پێغەمبەرم بیستووە، کە دەیفەرموو: دەراوسێ لەپێشترە بۆ هەڵگرتنەوەی لاتەنیشتی خۆی هەتا کەسێکی تر لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر نەبوایە، بەچوارهەزار نەم دەدا بەتۆ، لەکاتێکا کە کەسانی تر ئامادەن کە بەپێنج هەزار لێم بکڕن، ئیتر ئەبو رافیع ماڵەکەی بەو نرخە دا بەسەعد، کەچوار هەزار بوو).

(٦٨) انفرد بهِ المصنف عن مسلم –رحمهما الله تعالى- خاتمة كتاب الشفعة ج/٤/٤٣٩ فتح – المترجم.

**روونكردنەوە:**

ئەبو رافیع(ڕەزای خوای لێ بێ) راستتر ئەوەیە كەناوی ئەسلەم بووە، لەبنەڕەتدا قیبطییە، دەڵێن لەپێش دا كۆیلەی عەبباسی مامەی پێغەمبەر بووە، بەخشیویەتی بەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كاتێك كە عەبباس ئیسلام دەبێ، ئەبو رافیع ئەو مژدەیە بەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رادەگەیەنێ، پێغەمبەریش لە مژدانەی ئەوەدا ئازادی دەكا، لەپێش بەدردا ئیسلام بووە، بەڵام بەدریی نییە، واتە: ئامادەی شەڕی بەدر نەبووە، وەلێ ئامادەی جەنگی ئوحودو جەنگانی پاش ئوحود بووە لەگەڵ سوپای ئیسلاما، لەدژی بێبڕوایان!

فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هەروا فەرموودەی پێغەمبەری لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودەوە گێڕاوەتەوە، ئەم زاتانەیش فەقێی ئەو بوونو فەرموودەكانی پێغەمبەریان لەوەوە گێڕاوەتەوە: منداڵەكانی خۆی: رافیعو حەسەنو عوبەیدوڵڵاو موغیرە، منداڵە زاكانی: حەسەنو صاڵحو عوبەیدوڵڵا كە كوڕانی عەلی كوڕی ئەبو رافیعن، هەروا فەضلی كوڕەزای كە كوڕی عوبەیدوڵڵای كوڕی ئەبو رافیعە... كەسانی تریش.

نەوەكانی ئەبو رافیع كە لەمەدینەو شوێنانی تریش بوون، خانەدانانی وڵات بوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كارەكەرێكی هەبوو ناوی سەلما بوو، مارەی كرد لە ئەبو رافیع، عوبەیدوڵڵای كوڕی ئەبو رافیع لەو ژنەیەتی، سەلما مامانی كاتی لەدایك بوونی ئیبراهیمی كوڕی پێغەمبەر بوو، ئەم سەلمایە لەكاتی غەزای خەیبەردا ئامادەی غەزای خەیبەر بووە، عەبدوڵڵای كوڕی، كلیلدارو نوسەری ئیمامی عەلی بوو.

ئەبو رافیع گشت جارێ شانازی بەوەوە دەكرد كە ئازادكراوی پێغەمبەرەو مەولای ئەوە، لەپاش تەمەنێكی پڕ لەتەقواو پەرستشو خواپەرستی، لەمەدینە، لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عوثمان، لەسەرەتای جێنشینی ئیمامی عەلییەوە، فەرمانی هەقی بەجێ هێنا (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

ئەم جۆرە بابەتانە ئەو لایەنە رووناکەی ئیسلام دەردەخەن، کە هەتا چی رادەیێ ئیسلام رابووردووی ژیانی موسوڵمان، لەلایەنی ئەدەبییەوە دەسرێتەوە، کۆنە کۆیلەیێ لەسایەی ئیسلامەوە، دەگا بەگەورەترین پایەی رۆشنبیری و ئەدەبی.

١٠٠١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قالتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ لِي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: (إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابًا) (الحديث ٢٢٥٩، أطرافُهُ في: ٢٥٩٥، ٦٠٢٠) [٦٩].

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی خۆشەویستم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من دوو دەراوسێم هەیە دیاری و دەسەنە بەکامیان بدەم لەپێشا ؟ فەرمووی: (بەوەیان کە دەرگاکەی لێتەوە نزیکترە).

عەسقەلانی لەکۆتایی ئەم نامەیەی شوفعەدا دەفەرموێ: (ئەم نامەیە سێ فەرموودەی پەیوەست (موصول) ی واتیادا، یەکەمیان دووبارەیە، دووەم و سێیەمیش لە تەنهاکانی دانەرن و موسلیم نەیگێراونەتەوە. دەفەرموێ: چەند بیستراوێکیشی واتیا). بۆ تێگەیشتنی تەواو لەباسی (شوفعە) (بڕوانە: فیقهی ئاسان/ ٥١٤ز —٢٢٤).

---

(٦٩) انفرد بهِ المصنف على ما جاء في خاتمة كتابِ الشفعةِ في فتح الباري (ج/٤ص٤٣٩) — المترجم.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٢- نامەی بەکرێدان (كتاب الإجارة)

١٠٠٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعِي رَجُلانِ مِنْ الأشْعَرِيِّينَ فَقُلْتُ مَاعَمِلْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ فَقَالَ: (لَنْ أَوْ لا نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ) (الحديث ٢٢٦١، أطرافُهُ في: ٣٠٣٨، ٤٣٤١، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٦١٢٤، ٦٩٢٣، ٧١٤٩، ٧٧٥٦، ٧١٥٧، ٧١٧٢) [٧٠]

ئەبو مووسا(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆم و دوو پیاو لە ئامۆزاکانم، لەئەشعەرییەکانی قەومم، چووینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێ) پیاوێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بمانکە بەسەر کاری شتێ، لەو شتانە کە خوا سپاردوویانی بەتۆو تۆی کردووە بەخاوەنیان، ئەوی تریشیان هەمان قسەی کرد منیش عەرزم کرد: قوربان! من نەمزانیوە کە بۆ ئەمە هاتوون، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێمە لەو جۆرە کەسانە ناکەین بەسەرەوکاری کارەکانمان کە خۆیان حەزیان لەسەرەوکارییە!). (تاج/٣/٢٧٠ ف-٢).

١٠٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلاَّ رَعَى الْغَنَمَ) فَقَالَ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ فَقَالَ: (نَعَمْ كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لأَهْلِ مَكَّةَ). (الحديث ٢٢٦٢) [٧١].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێ، شوانی رانی کردووە) هاوڕێکانی عەرزیان کرد: تۆیش؟ فەرمووی: (بەڵێ منیش شوانیم کردووە: منیش

---

(٧٠) قال العيني: واخرجه مسلم في المغازي (صحيح مسلم بشرح النووي ج/١٢ص٢٠٧. باب: النهي عن طلب الأمارة) - المترجم.

(٧١) لم يوافقه مسلم (فتح/٤/٤٦٢- خاتمة كتاب الإجارة) - المترجم.

بەچەند قرانێ گەلەم دەلەوەڕاند بۆ خەڵكی مەككە) ) تاج/٢/٢٩٧-٤) = تاج، بەرگی دوەم، لاپەڕە/٢٩٧ فەرموودەی ژمارە چوار لەو لاپەڕەیەدا.

١٠٠٤- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَثَلُ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ قَوْمًا يَعْمَلُونَ لَهُ عَمَلاً يَوْمًا إِلَى اللَّيْلِ عَلَى أَجْرٍ مَعْلُومٍ فَعَمِلُوا لَهُ إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ فَقَالُوا لا حَاجَةَ لَنَا إِلَى أَجْرِكَ الَّذِي شَرَطْتَ لَنَا وَمَا عَمِلْنَا بَاطِلٌ فَقَالَ لَهُمْ: لا تَفْعَلُوا أَكْمِلُوا بَقِيَّةَ عَمَلِكُمْ وَخُذُوا أَجْرَكُمْ كَامِلاً فَأَبَوْا وَتَرَكُوا وَاسْتَأْجَرَ أَجِيرَيْنِ بَعْدَهُمْ فَقَالَ لَهُمَا أَكْمِلا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمَا هَذَا وَلَكُمَا الَّذِي شَرَطْتُ لَهُمْ مِنْ الأَجْرِ فَعَمِلُوا حَتَّى إِذَا كَانَ حِينُ صَلاةِ الْعَصْرِ قَالا: لَكَ مَا عَمِلْنَا بَاطِلٌ وَلَكَ الأَجْرُ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا فِيهِ فَقَالَ لَهُمَا أَكْمِلا بَقِيَّةَ عَمَلِكُمَا مَا بَقِيَ مِنْ النَّهَارِ شَيْءٌ يَسِيرٌ فَأَبَيَا وَاسْتَأْجَرَ قَوْمًا أَنْ يَعْمَلُوا لَهُ بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ فَعَمِلُوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ حَتَّى غَابَتْ الشَّمْسُ وَاسْتَكْمَلُوا أَجْرَ الْفَرِيقَيْنِ كِلَيْهِمَا فَذَلِكَ مَثَلُهُمْ وَمَثَلُ مَا قَبِلُوا مِنْ هَذَا النُّورِ). (الحديث ٢٢٧١، أطرافُهُ في: ٢٢٦٨، ٢٢٦٩)[٧٢].

ئەبو مووسای ئەشعەری(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (داستانی موسوڵمانو جولەكەكانو نەسرانییەكان، وەك داستانی پیاوێ وایە، كەكۆمەڵێ بەكرێ بگرێ كە هەتا ئێوارێ كارێكی خۆی هەیە، بەكرێیەكی ناوبراو بۆی تەواو بكەن، جاكرێكارەكان هەتا نیوەڕۆ ئیش دەكەنو دەڵێن: ئەكرێی تۆمان دەوێو ئەئیش بۆ تۆ دەكەین، كارەكە بەنیوەچڵی بەجێ دەهێڵن خاوەن كارەكەشیان دەڵێ: شتی وامەكەن، ماوەی كارەكەتان تەواو بكەنو كرێی خۆتان وەربگرن بەتەواوی بەڵام رازی نەبوونو ئیشەكەیان بەنیوە ناچڵی بەسەر خاوەنەكەیا بەجێ هێشت، جا تاقمەیەكی تر لەپاش ئەوان بەكرێ دەگرێ، وەپێیان دەڵێ:

(٧٢) وقال العيني: (واخرجه مسلم والترمذي ايضا – عيني/٥/٥١) – المترجم.

ئێوه ئەم تاقی ئێوارەیە تەواو بکەن ئەو کرێیەی دەم دا بەوان، هەمووی دەدەم بەئێوه، جا ئەوانیش هەتا کاتی نوێژی عەصر ئیش دەکەن‌و دەست هەڵدەگرن‌و دەڵێن: ئیتر کار ناکەین‌و هەرچیشمان کردووە بۆ خۆت‌و چیمان کرێ دەکەوێ نامانەوێ ئەویش بۆ تۆ بێ!

ئەویش پێیان دەڵێ: باقی مەندەی کارەکەتان تەواو بکەن، ڕۆژ زۆری ڕۆیشتووە کەمی ماوە، بەڵام ئەوانیش ڕازی نابن‌و وازدەهێنن، پیاوەکەش دەستەیێی تر بەکرێ دەگرێ، کە ماوەی ئەو ڕۆژە، - واتە: لەنوێژی عەصرەوە تا خۆرئاوا بوون – کاربکەن، ئەوانیش بەگوێی دەکەن‌و وادەکەن، بەردەوام کاردەکەن تا خۆر ئاوادەبێ‌و سەرڕاست دەردەچن. جا لەبەر ئەوە پاداشت‌و کرێی هەردوو کۆمەڵەکە بەتەواوی وەردەگرن بۆ خۆیان. دەی ئەمە نموونەی موسوڵمان‌و نموونەی ئەم نووری ئیسلامەیە، کە قەبووڵیان کردووە). (تاج/٥ل/ ٢٦٢ف –١+ ٢).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودانە وەردەگیرێن:

١- تەمثیل‌و نمایشت‌و نموونە هێنانەوە دروستە، بگرە سوننەتە، بەمەرجێ بۆ ڕوونکردنەوە: ی ڕووی ڕاستی بێ، نەوەك بۆ چەواشەکردن‌و برەودان بەشتی ناڕەوا. لەم ڕوانگەیەوە ئەو ئەکتەرو نمایشکارانەی کە لەفلیم‌و نمایشەکانیاندا، ڕۆڵی جوان دەبینن، کارێکی باش دەکەن، دەبێ بەچاوی ڕێزەوە تەماشا بکرێن، کورت‌و پوخت: تمثیل: لەزاتی خۆیا باشە!

٢- تەشبیهی خوای گەورە بەشتی ترەوە لەهەندێ کاتا بۆ هەندێ مەبەستی ڕەوا دروستە، وەك لێرەدا خودا تەشبیه کراوە بەپیاوە بەکرێگرەکەوە.

٣- بەکرێگرتنی کۆمەڵێ، بۆ ئەنجامدانی کارێ بۆ کاتێکی دیاری، بەکرێیەکی ناوبراو دروستە، گەرچی لەفیقهدا، لەشتی وادا ڕاجیایی هەیە

٤- كۆڵینەوەیەكی زۆر بەپێوەری جیهانی، لەم جۆرە كارە نهێنیو غەیبیانە كارێكی ناباشە، زۆرتر سەردەكێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست!

**١٠٠٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: انْطَلَقَ ثَلاثَةُ رَهْطٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حَتَّى أَوَوْا الْمَبِيتَ إِلَى غَارٍ فَدَخَلُوهُ فَانْحَدَرَتْ صَخْرَةٌ مِنْ الْجَبَلِ فَسَدَّتْ عَلَيْهِمْ الْغَارَ فَقَالُوا: إِنَّهُ لا يُنْجِيكُمْ مِنْ هَذِهِ الصَّخْرَةِ إِلاَّ أَنْ تَدْعُوا اللَّهَ بِصَالِحِ أَعْمَالِكُمْ.**

**فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: اللَّهُمَّ كَانَ لِي أَبَوَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ وَكُنْتُ لا أَغْبِقُ قَبْلَهُمَا أَهْلاً وَلا مَالاً فَنَأَى بِي فِي طَلَبِ شَيْءٍ يَوْمًا فَلَمْ أُرِحْ عَلَيْهِمَا حَتَّى نَامَا فَحَلَبْتُ لَهُمَا غَبُوقَهُمَا فَوَجَدْتُهُمَا نَائِمَيْنِ وَكَرِهْتُ أَنْ أَغْبِقَ قَبْلَهُمَا أَهْلاً أَوْ مَالاً فَلَبِثْتُ وَالْقَدَحُ عَلَى يَدَيَّ أَنْتَظِرُ اسْتِيقَاظَهُمَا حَتَّى بَرَقَ الْفَجْرُ فَاسْتَيْقَظَا فَشَرِبَا غَبُوقَهُمَا اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَفَرِّجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ مِنْ هَذِهِ الصَّخْرَةِ فَانْفَرَجَتْ شَيْئًا لا يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :**

**وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ كَانَتْ لِي بِنْتُ عَمٍّ كَانَتْ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَيَّ فَأَرَدْتُهَا عَنْ نَفْسِهَا فَامْتَنَعَتْ مِنِّي حَتَّى أَلَمَّتْ بِهَا سَنَةٌ مِنْ السِّنِينَ فَجَاءَتْنِي فَأَعْطَيْتُهَا عِشْرِينَ وَمِائَةَ دِينَارٍ عَلَى أَنْ تُخَلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِهَا فَفَعَلَتْ حَتَّى إِذَا قَدَرْتُ عَلَيْهَا قَالَتْ لا أُحِلُّ لَكَ أَنْ تَفُضَّ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ فَتَحَرَّجْتُ مِنْ الْوُقُوعِ عَلَيْهَا فَانْصَرَفْتُ عَنْهَا وَهِيَ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ وَتَرَكْتُ الذَّهَبَ الَّذِي أَعْطَيْتُهَا اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ فَانْفَرَجَتْ الصَّخْرَةُ غَيْرَ أَنَّهُمْ لا يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ مِنْهَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :**

**وَقَالَ الثَّالِثُ: اللَّهُمَّ إِنِّي اسْتَأْجَرْتُ أُجَرَاءَ فَأَعْطَيْتُهُمْ أَجْرَهُمْ غَيْرَ رَجُلٍ وَاحِدٍ تَرَكَ الَّذِي لَهُ وَذَهَبَ فَثَمَّرْتُ أَجْرَهُ حَتَّى كَثُرَتْ مِنْهُ الأَمْوَالُ فَجَاءَنِي بَعْدَ حِينٍ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ أَدِّ إِلَيَّ أَجْرِي فَقُلْتُ لَهُ: كُلُّ مَا تَرَى مِنْ أَجْرِكَ مِنْ الإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ وَالرَّقِيقِ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ لا تَسْتَهْزِئُ بِي فَقُلْتُ إِنِّي لا أَسْتَهْزِئُ بِكَ فَأَخَذَهُ**

كُلَّهُ فَاسْتَاقَهُ فَلَمْ يَتْرُكْ مِنْهُ شَيْئًا اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ فَانْفَرَجَتْ الصَّخْرَةُ فَخَرَجُوا يَمْشُونَ). (الحديث ٢٢٧٢) [٧٣].

ئەبوعەبدوڕەحمان عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، ناسراو بەئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: جارێ سێ کەس لە پێشینان بەڕێگایەکدا دەڕۆیشتن، باران دایگرتن، جا شەوێ پەنایان بردە ناو ئەشکەوتێ لەکێوێ، تاوێرێ لە کێوەکەوە گل بووەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپات کرد. جا لەناو خۆیاندا گوتیان سەیر بکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بۆ خوا، بەو کردەوانە لە خودا بپاڕێنەوە، سا بەشکوو بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە خودا دەروتان لێ بکاتەوەو، لەم تاوێرە رزگارمان بکا..

یەکێکیان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کەمن باوك و دایکێکی ئیختیارم هەبوون، لەگەڵ چەند منداڵێکی وردا شوانیم بۆیان دەکردو، بەشوانی بەخێویانم دەکرد، هەموو جارێ کەدەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشی وەلەپێشدا دەرخواردی باوك ودایکمم دەدا، ئەوجا بەشی منداڵەکانی خۆیشم دەدا، هەتا رۆژێ بەشوێن لەوەڕی باش دا دوورکەوتمەوەو، درەنگم بەسەر هات، کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە شەو بوو، روانیم باوك ودایکم خەوتوون، منیش وەك جاران شیرم دۆشیو بۆم بردنو بەدیار سەریانەوە راوەستام تاکەی خەبەریان بووەوە شیرەکەیان بخۆنەوە، بەڵام حەزم نەکرد کەخەبەریان بکەمەوە، وەپێشم ناخۆش بوو کەلەبەر ئەوان شیربدەم بەمنداڵەکان، منداڵەکانیشم لەو وەختەدا لەبەر پێما لەبرساندا، هەر دەزرووکانەوە، هەتا شەبەقی دا ئەمە حاڵمان بوو، کەشەبەقی دا ئەوسا شیرەکەیان خواردەوە، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر

---

(٧٣) أخرجه مسلم في الذكر والدعاء، باب: قصة أصحاب الغار الثلاثة... رقم: ٢٧٤٣.

ڕەزامەنـدی تـۆ کـردووە، ئـەوا دەرووبـەکمان لـێ بکـەرەوە کەلەبەرێـکمان، بۆبکەرەوە، کە ئاسمانی لێوە ببینین!

جا خودا کەلەبەرێکی لێ کردنەوەو ئاسمانیان لێوە دەرکەوتو تاوێرەکە تۆزێ خزا، بەڵام نـەیانتوانی دەربـچن یەکێـکی تریـان ووتـی: خودایـە! خـۆت دەزانی کە کچێـکی ئامۆزام هەبوو، چەنده پیاو حەز لـەئافرەت دەکا ئەوەنـدە حەزم لێی بوو، کەداوای ئیشی خراپەم لێی کرد، خۆی نەدا بەدەستەوە، هـەتا ساڵێـکیان دوچـاری گرانـیو قـاتو قـڕی بـوو، وەبەناچـاری هـات بـۆ لام، سەدوبیست دیناری زێڕم داپێی لەباتی ئەوەی کـەخۆیم تەسلیم بکا، ئـەویش وای کـرد جـا کـاتێ دەسـتم لێـی گیربـوو، وەلـەناو کۆشـیا دانیـشتمو یـستم بەدەستی بگـرم، کـچەکە گـوتی: ئـەی عەبـدوڵلا! ئـەی بەنـدەی خـودا! لـەخوا بترسەو ئەم مۆرە بـەناڕەوا مەشکێنە، ئـیتر منـیش هەڵسامو وازم لـێ هێنـاو، پارەکەیـشم پێـی دا بـەخۆڕایی بـۆ خـۆی، وەلـەو حاڵەتەیـشدا زۆر حـەزم لێـی بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەنـدی تـۆ کـردووە، ئەوا دەرووبەکمان لێ بکەرەوە لەم سەخڵەتییە، ئـیتر خـودا دەرووبـەکی تـری لێ کردنەوەو تا دوو بەشی تاوێرەکەلەسەر دەرگاکە لاچوو.

سێهەمیان گوتی: ئـەی خودایـە! تـۆ خـۆت ئاگات لێیـە، کـەمن جارێ بـە قزناخێ برنج کرێـکارێکم گرت، کە ئیشەکەی تـەواو کـرد، گـوتی: کرێـکەمم بدەرێ، منیش گوتم: کرێکەت ئەوەتانێ کەچی بـەدڵی نـەبوو، وەری نـەگرت، منیش کەئەو ڕۆیی پارەو کرێی کرێـکارەکانی تـرم هـەمووداو، وەچـەڵتوکەکەی ئەویشم هەموو وەرزێ دەچاندو بەرهەم دەهێنا،تاوا زۆر بوو گاگەلێـكو ڕانـە وشترو مەڕو چەند بەندەیەکم پێی کڕی، تـا ڕۆژێ کرێـکارەکە هاتـەوە بۆلام، گوتی: لەخودا بترسە کرێـکەمم بـدەرێ، منـیش ووتم: بـڕۆ ئـەو ڕانـە وشـترو گاگەلو ڕانەمەڕو شوانەکانیان ببە بۆ خـۆت، هـەمووی هـی کرێـکەتە، گـوتی: ئەی عەبدی خودا! لەخودا بترسە گاڵتـەم پـێ مەکـە، منـیش گوتم بەڕاستمە

گاڵتەت پێ ناکەم، هەمووی هی خۆتە بیبە، ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆ خۆی، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بەتەواوی بۆ بکەرەوە، جا خودا دەرگای بەتەواوی بۆ کردنەوەو تاوێرەکە خزاو هاتنە دەرەوەو ڕۆیشتن. (تاج/١ل- ٦٦+ ریاض/١ل-١٧-١٢/١٢).

١٠٠٦- حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا: يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ وَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لا يَنْفَعُهُ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ وَاللَّهِ إِنِّي لارْقِي وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدْ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنْ الْغَنَمِ فَانْطَلَقَ يَتْفِلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ قَالَ فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمْ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اقْسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى لا تَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : فَذَكَرُوا لَهُ فَقَالَ وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ ثُمَّ قَالَ قَدْ أَصَبْتُمْ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ: وَقَالَ شُعْبَةُ: حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ سَمِعْتُ أَبَا الْمُتَوَكِّلِ بِهَذَا) (الحديث ٢٢٧٦، أطرافُهُ في: ٥٠٠٧، ٥٧٣٦، ٥٧٤٩)[٧٤].

(٧٤) أخرجه مسلم في السلام، باب: جواز أخذ الأجرة على الرقية بالقرآن والأذكار، رقم: ٢٢٠١.

ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویی: دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر - درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوڕێیانی بێ – دەچن بۆ سەفەرێ، دەڕۆن تا لای خێڵێ عەرەب دا لادەدەن، دەیانەوێ بەمیوان قەبوڵیان بکەن بەڵام خێڵەکە ڕازی نابن و دایان ناکەن و، میوانداریيان پێ ناکەن، جا ئاغای خێڵەکە شت پێوەی دەدا، وە بەزۆر شت هەوڵی لەگەڵ دەدەن، بەڵام سوودی نابێ بۆی تا هەندێکیان دەڵێن: بۆ ناچن بۆ ناو ئەم کاروانییە کەلێرەدا لایان داوە، سابەشکوو چارەیێ لەلای کەسێکیان هەبێ، جا دەڕۆن بۆلایان و دەڵێن: سەرخێڵەکەمان شت پێوەی داوەو بەزۆرشت هەوڵمان لەگەڵی داوە، بەڵام سوودی نییە بۆی، ئایا لەلای کەسێ لەئێوە چارەیێ نییە؟ یەکێکیان دەڵێ: با، بەخوا من دوعای گەزندە دەکەم، بەڵام بەخوا چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لێ کردن، کەچی ئێوە داتان نەکردین و ڕازی نەبوون، منیش دوعاتان بۆ ناکەم تاسەرقەڵەمانەیێکمان بۆ دانەنێن.

ئینجا ڕێدەکەون لەسەر بڕکەیێ پەز، ئیتر ئەویش لەگەڵیان دەچی بۆ لای سەر خێڵەکەو لەوێ سوورەتی ﴿الحَمدُ لله ربِّ العالمين﴾ دەخوێنێ بەسەریاو کەمێ تفی لێ دەدا، وەهەتا حەوت جار، لەپێشا فاتیحە دەخوێنێ، وەئینجا بەتەڕایی دەمی پفی لێ دەکا، ئیتر شت پێوەدراوەکە وەك وشترێ لەپەت بەربێ، دەست و پای کرایەوەو هەستاو کەوتە گەڕو یەك دەنك پەلەقاژێ و پەلەفرتێ و پەلەپڕووسکێی نەما. گوتی: ئیتر ئەو سەرقەڵەمانەی کەلەسەری پێك هاتبوون بەتەوای دایان پێیان.

جا هەندێ کەسیان گووتیان: بابەشی بکەین لەناو خۆمانا، بەڵام دوعا خوێنەکە گوتی: دابەشی مەکەن تا دەچینەوە لای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وراستی ڕووداوەکەی عەرزدەکەین هەتا بزانین ئەو فەرمانی بەچییە پێمان، جا کەهاتنەوە لای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و ئەمەیان بۆی گێڕایەوە،

فەرمووی: چۆنت زانی ئەوە دۆعایە، گوتی: شتێ ڕاست بوو خودا خستیە ناو دڵمەوە، فەرمووی: شتێ باشتان کردووە،دەی دابەشی بکەنو پشکێکیش بۆ من دابنێن لەگەڵ خۆتاندا، هەتا بەتەواوی دڵنیابن لەدروستی کارەکەیانو لەحەڵاڵی سەرقەڵەمانەکەیان، ولەو کرێیەی کەوەریانگرتووە.

جاپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاش دابەش کردنەکە، دیسانەوە ڕەزامەندی خۆی دەربڕیەوە بەزەردەخەنەیێ) لەگێڕانەوەیەکی تاجا هەندێ کەسیان ئەمەیان بەدڵ نەبووە، وەدەیانگوت: تۆ لەسەر نامەی خودا کرێت وەرگرتووە، تاکاتێ هاتنەوە بۆ مەدینە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە لەسەر نامەی خودا کرێی وەرگرتووە؟ ئەویش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕەواترین شت کە کرێی لەسەر وەربگرن قورئانی پیرۆزە، کە نامەی خودای گەورەو سەرومرە) (تاج/٤ل/٢٢٣ف-٣ز-٧٥ش/ت/ن. باسی (الرّقيةُ بالقرآنِ الكريمِ وجَوازُ أخذِ الأجرِ عليها).

بسم الله الرحمن الرحيم

بەندە لەم بابەتی دوعاو نووشتە کردن بەقورئانی پیرۆزەو خواصی قورئان، لەپەڕاوی (بينَ يدَي كتابِ اللهِ)و شەرحەکەی دا کۆمەلێ شتی جوانو بەسوودو ڕاستو دروستم کۆکردۆتەوە. وا لێرەدا بۆ سوودی موسوڵمانان هەندێکی لێ ڕاگوێز دەکەین، لەخودا داوا دەکەم کە پیتو فەڕی تێ بفەرموێ:

فضائلُ القرآن لاتعدُّ لجزرِ بحرِها المدى والمدُّ
نذكرُ منها ههنا مُرادَنا نشكرُ من قدْ زادَ ما أفادَنا
من كانَ توفيقُ السّما سلْمَهُ (تعلّمَ القرآنَ أو علّمَهُ!)
كلامُ ربّي إسمُهُ القرآنُ تشفي بهِ القلوبُ والأبدانُ

بجيئِــــهِ تبــــارَكَ الزّمــــانُ وطــابَ مــن ترتيلِــهِ المكــانُ
يــاحيُّ يــاقيّومُ يــا رحمــانُ اجعَــلْ قلوبَنــا بــهِ تــزّدانُ
مــن مُعجــزاتِ ربّنــا القــرآنُ علــى كمــالِ ذاتِــهِ برهــانُ
لــشرحِ امــرِ خلقِــهِ تبيــانُ نعــمَ المفــسّرُ لــهُ الزّمــانُ!
لاتنقــضي عجائِــبُ القــرآنِ لأنّــهُ معجــزةُ الأزمــانِ
إنْ غــاصَ في غــورِهِ الأصــغرانُ صــادا معــاً جــواهرَ المعــاني
ونُــورُهُ للقلــبِ روحُ ثــانِ ورفعُــهُ في آخــرِ الزّمــانِ
بفــضلِكَ العمــيمِ ياشــكور بالمــصطفى المُختــارِ يــاغفورُ!
يــاحيُّ يــا قيّــومُ يــا قــدير اجعــل قلوبنــا بــهِ تــنيرُ!
لاعــيشَ الا العــيشَ في ظلالِــهِ لنــاظرِ الحيــاةِ مــن خلالِــهِ
أكــرِم بمبنــاهُ ففــي جمالِــهِ ســامى عــلا معنــاهُ في كمالِــهِ
يــضفي علــى معنــاهُ مــن ظِلالِــهِ كأنّــهُ العــروسُ في حجالِــهِ
قــدْ ضَــاعفَ الزّينــةَ في جلالِــهِ كأجمــلِ العــروسِ في غِلالِــهِ
بحــقِّ مــا جــاءَ بــهِ محمّــدُ تعبُّــدٌ بلفظِــهِ مؤكّــدُ!!
ورقيَــةٌ بــهِ صــحيحٌ مــسندُ مــن ربّــهِ الرّاقــي بــهِ يــسدّدُ
إنّ الرُّقــى بــالآيِ في القــرآنِ مــن أهلِــهِ مــنْ طبّــه الرّوحــاني
وعنــدَما عــزّتْ علــى الإنــسان مــالُوا إلى طــبّهم الجــسماني
عليــكَ بالــدُّعاء فالــدّعاء لكــلّ دائنــا هــوَ الــدّواءُ!!
فخــذ مــن القــرآنِ مــا تــشاءُ لمــا تــشاءُ يحــصلُ الرّجــاءُ!
واعلــم اذا تــأخّر العطــاءُ اختــارَ غــيرَهُ لــكَ الــسّماءُ
عليــكَ بالــدّعاء والــدّواء ففيهمــا شــفاء كــلّ داء
الاّ الــذي يعــصي علــى الــشّفاء كــالموتِ والهــرمِ والقــضاءِ!
ألا علــيكم بالــشفائين العــسل وكِلــم القــرآنِ أنــوارِ الأمــلْ

يُرقى بهِ قراءةٌ بلا ملَلْ مكررًا، أو مرةً حسبَ العمَلْ
وكتبَ شيئٍ منهُ في اناءِ وأكلَ ما فيهِ وشربَ الماءِ
منهُ أجرٌ، بنيّةِ الشفاءِ ثمّ استعنْ بخيرةِ الدّواءِ
النظرُ في المصحفِ عبادةْ و الموتُ في سبيلِهِ شهادةْ
(الموتُ آتٍ من أتى الولادة أكرم بهِ في صورةِ الشهادة)
لبعضهم بعضِ الخواصِ ينجلي للمعتنى بهِ، كهندٍ وعلي!
قرآنُ ربّي قلبُهُ ياسينُ فقلبُ تاليها بها يلينُ
ياسينُ تقرأ على الأمواتِ وجارةٌ لسورةِ الصّافاتِ
ليسَ لتفريحِ القلوبِ مثلُها وكلَ ليلِ قبلَ نومِ فاتلُها
إنّ المدارَ لعلى الإخلاصِ وقوّةِ اليقينِ للخلاصِ
يسينُ والصافاتُ قد تقاسموا (لو- زلّ) عالمٌ لزلّ العالمُ

وجاء في شرحِ الأرجوزة:

انّ الرقية من حيثُ العموم جائزةٌ خاصة بالقرآن الكريم، وهي مشروعةٌ ومطلوبةٌ عند الحاجة، بشرط ان تكون بكلام الله تعالى او بأسمائهِ وصفاتِه الكريمة.

لاريب انّ كلّ مسلمِ يجوز لهُ ان يحصّنَ نفسَهُ وماله وعياله بقراءةِ آياتٍ وسورٍ من القرآن الكريم، أو بأدعية الحفظ الواردة في السّنةِ المطهرة النبوية الشريفة ولكن المدار في النجاحِ والنيلَ بالمرادِ، على قوّةِ اليقينِ وخلوصِ النيّة، وصدقِ الإخلاصِ، ومشروعيّة الدّعوى وخيريّة المطلوبِ، مع مراعاةِ آداب الدّعاء الأخرى، كاختيار المكانِ والزمانِ.

لقد تأكّد لدى المنصفين من أهلِ العلمِ أنّ حصول المطلوب ونيلَ المُنى قد تحققَ بادعية أهلِ الفضلِ، وببركةِ أنفاسهم الطيّبة بصورةٍ مشهودةٍ، لايسعُ

العقل السليم إنكارُها، أو عدمُ الإعتراف بها، حتى أصبحت الحالة من الموروثاتِ الرّوحيّة، والحقائِقِ الدّينيّة المعترفِ بها، لدى الصّديقِ والمخالِفِ!

وكلّ محاوَلةِ لطمسِ معالِم هذهِ الحقيقة الحيّة، أيّاً كان مصدرها، ومن كانَ منفذوها، وتحتَ أيّ شعار كان، محاولة مجهضةٌ انّ القرآن الكريم والسّنّة المطهّرة، وكذلك الكُتب المقدّسة لدى أهل الكتاب تؤكّد هذا الأمر بقوّة، وقد روت لنا أعاجيب من فضلِ الأدعية وتأثيرها الخارق. ثمّ انّ للرّقيّة أنواعاً، منها ملفوظة يقرأها الرّاقي على المرقيّ، ومنها مكتوبة، تكتبُ في صكّ، وتعلق على المرقيّ، كالتمائم المعلّقة على الصّغار.

ولاريبَ أنّ للرقيّ والعزائِم آثاراً عجيبةً تتقاعدُ العقول عن الوصولِ إلى كنهِها، ولها ألفاظ وكلمات مخصوصة وعلى هيئات وكيفيات خاصّة، منها مأثورة ومنها مرتبة ومرويّة من العلماء والمشايخ الكاملين من أهل الصّلاحِ والتقوى.

إنّ اولياء الشّياطين اليوم بايحاءٍ منها، عندما صدمتهم الحقائق الصّارخة، يحاولون تسمية الأشياء بأسماء أضدادها. وقاموا بخزعبلات سحريّة متوارثة من سلفهم الخائب، على امل معارضة ما لأهل الدّين من التأثير الرّوحي الغيبي التابع من الإيمانِ باللهِ ورسولِهِ.

١٠٠٧- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهما) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ. (الحديث ٢٢٨٤) [(٧٥)]

ئیبنوعومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: (پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەکرێی پەڕینی نێر لەمێ وەك ئەوە پەڕینی ماینێ لەئەسپێ، یالەنێرەکەرێ چاك بکرێ، وەخاوەنی نێرەکەرەکە یا ئەسپەکە کرێی ئەو پەڕینە لە خاوەنی ماینەکە وەربگرێ). (تاج/٢/٣٠٨-٩ —ب/د/ت/ن).

---

(٧٥) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٤/ص ٤٦٣- خاتمة) المترجم.

# پایانـــــیٚ

مامۆســـتای عەســـقەلان (رەزاو رەحمـەتی خـودی لـێ بـێ) لـــەپایانی ئـــەم نامـــەی بـە(كرێـدان)ەدا دەفـەرموێ: (٣٠) فـەرموودەی بـەرزكراو (مرفـوع) ی واتیـا، پێنجیـان بـێ ڕشـتەن، واتـە: تـەعلیقن، ئـەوانی تریـان پەیوەسـتن، واتـە: مەوصولن، شازدەیان دووبـارەن، هەیانـە لـەم باسـە خۆیـدا دووبـارە بۆەتـەوە، هەیانەلەباسەكانی پێشتردا، پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخـاری، (رەحمەتو رەزای خودایـان لـێ بـێ) هـەموو ئـەم فەرموودانـەی گێڕاوەتـەوە بێجگـە لـەم چـەند ژمارەیان:

١- فەرموودەی (١٠٠٣ت=٢٢٦٢ف) باسی شوانی كردنی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ).

٢- فەرموودەی (المسلمون عندَ شروطِهِمْ) بێ ڕشتەو بێ ژمارەیە، لەفەتح دا، وا لە نێوان ژمارە(٢٢٧٣) و (٢٢٧٤) دا.

٣- فەرموودەكەی ئیبنوعەبباس: (أحقُّ ما أخذتُمْ عليهِ أجراً كتـابُ اللهِ) لەفـەتح دا بێژمارەیە، والەپێش ژمارە(٢٢٧٦) دا.

٤- فـەرموودەی (١٠٠٧ت=٢٢٨٤ف) نـەیی كـردن لـەكرێی ئـاوی نێـری، هـەروا دەفەرموێ: (هەژدە بیستراو -ئەثەر- ی صەحابەو تابعینیشی واتیادا).

## تێبینی:

یەكـەم: صـەحیحی بوخـاری دەیـان شـەرحی گـەورە گـەورەی لەسـەرە، ئێستاش بـەردەوام لەهـەموو وڵاتـە ئیسلامییەكان، بەسـەدان زانـا خـەریكی ڕوونكردنـەوە: یـین، كەچـی هێشتا زیـاتر شیكردنەوەو لەسـەر نوسین هـەڵ دەگرێ، دەی ئەم موختەصەرەیشی هەروایە، لەبەر ئەوە هەروا بەئاسانی بـەم جـۆرە وەرگەڕانـە كورتـە، بـا زۆر پوخـتو نایـابیش بـێ، بەتـەواوی ڕوون ناكرێتەوە.

دووەم: هـۆی دووبـارە بوونـەوەی ئـەم فەرموودانـە، لەچـەند شـوێن‌و بابەت‌و باسێك دا، لە بوخاری پیرۆزدا، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆی جیاجیا، ئەگەر كەسێ پەڕاوێكی گەورە لەسەر ئـەم باسی دووبارەبوونەوەیـە بنووسێ ئەوپەڕی ناكەوێ. وەك ئەوە:

١- فەرموودەكـە خـۆی چـەند بابەتێـكی جیاجیـای لـەخۆگرتووە، وەك فەرموودەی: (بُنِيَ الإسلامُ على خمسٍ= فـەرموودەی ژمـارە -٨- لـەم كتێبـە) كەباسی شەهادەو زەكات‌و حەج‌و ڕۆژووی واتیا، لەبەر ئەوە ئـەم فەرموودەیـە بۆ هەر پێنج بابەتەكە دەست دەدا، هـەر لەبـەر ئەوەیشە كە بۆ هـەر پێنـج بابەتەكە دەكرێ بەبەڵگە.

٢- هـۆی تـر زۆرە بـۆ دووبارەبوونـەوە، لێـرەدا ئەوەنـدەبزانین بەسـە: كەزۆرینـەی بـەهرە نهێنییـەكانی صـەحیحی بوخـاری شـەریف وا لەدووبارەبووەكانی دا.

سێیەم: باسی ئـەم بابەتـە كـە بەكرێدانـە، لـە فیقهی ئاسـاندا والەبـەرگی دووەم دا، لە لاپەڕە /٥٢٤ز-٢٢٩.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٣- (نامەی بەرەو ڕوكردنەوە = حەواڵە) (كتابُ الحوالات)

(بڕوانە فیقهی ئاسان/٢/٤٨٢ز-٢١٢. بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە)

١٠٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ فَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ). (الحديث ٢٢٨٧، أطرافاهُ في: ٢٢٨٨، ٢٤٠٠) (٧٦)

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (قەرزكۆێری پیاوی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! زۆر ناڕەوایە ئەگەر كەسێكیشتان لەلایەنی قەرزارەكەی خۆیەوە، بەرەو ڕووی پیاوێكی دەوڵەمەند كرایەوە، كەئەو پیاوە دەوڵەمەندە لەباتی قەرزارەكەی خۆی قەرزەكەی پێبداتەوە، ئەوە بابچێ قەرزەكەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە) ) تاج/٢/٣٤٩- ١ز-١٦٦- ش/د/ت/ن).

**ڕوونكردنەوە:**

لە (فیقهی ئاسان) دا، بەرگی دووەم لاپەڕە (٤٨٤) زنجیرە: (٢١٢) باسی: هەواڵە = حەواڵە (الحوالة) دەفەرموێ: (هەواڵە یا حەواڵە، وشەیەكی لەبنەڕەتدا عەرەبییە، لەزمانا بەمانا گواستنەوەیە لە عورفی شەرعیشا بریتییە لە گواستنەوەی مافێك لەئەستۆی كەسێكەوە بۆ ئەستۆی كەسێكی تر. ڕاستیەكەی فرۆشتنی قەرزە بەقەرز، بەڵام لەبەر پێداویستی، ڕێگەی پێدراوە، سەربەڵگەی دروست بوونی هەواڵە ئیجماعە، لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی كە شێخان دەیگێڕنەوە، كە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (قەرزكوێری دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! تادوایی فەرموودەكە).

---

(٧٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: تحريم مطل الغني وصحة الحوالة، رقم: ١٥٦٤.

## قەرزی مردوویش دروستە هەواڵەی سەرکەسێ تر بکرێ

١٠٠٩-عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا فَقَالَ: (هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ؟) قَالُوا: لا قَالَ: (فَهَلْ تَرَكَ شَيْئًا؟) قَالُوا: لا،فَصَلَّى عَلَيْهِ ثُمَّ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلِّ عَلَيْهَا قَالَ: (هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ؟) قِيلَ: نَعَمْ قَالَ: (فَهَلْ تَرَكَ شَيْئًا؟) قَالُوا: ثَلاثَةَ دَنَانِيرَ فَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ أُتِيَ بِالثَّالِثَةِ فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا قَالَ: (هَلْ تَرَكَ شَيْئًا؟) قَالُوا: لا قَالَ: (فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ؟) قَالُوا: ثَلاثَةُ دَنَانِيرَ قَالَ: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ) قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: صَلِّ عَلَيْهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَيَّ دَيْنُهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ) (الحديث ٢٢٨٩، طرفه في: ٢٢٩٥) (٧٧).

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت خۆشەویست دا دانیشتبووین، لەوکاتەدا تەرمی مردوویەکیان بۆ هێنا کە نوێژی مردووی لەسەر بکا، عەرزیان کرد قوربان: نوێژی لەسەر بکە، فەرمووی: (ئایا قەرزی کەسێکی لەسەرە؟) گوتیان: نەخێر قەرزاری کەس نییە، فەرمووی: (ئایا لەپاش خۆی ماڵێکی لێ بەجێماوە؟) عەرزیان کرد: نەء، لەپاش خۆی سامانی بەجێ نەهێشتووە، ئیتر پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی تەرمی لەسەر کرد.

لەپاشا تەرمێ تریان بۆ هێنا، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر بفەرموو: ، فەرموویەوە: (ئایا قەرزی لەسەرە؟) گوتیان: بەلێ. فەرمووی: (ئایا ماڵێ، شتێکی لێ بەجێماوە؟) گوتیان: ئا: سێ دینای لەپاش بەجێماوە، ئیتر لەسەر ئەویش نوێژی مردووی کرد، لەپاشا تەرمی سێهەمیان هێنا بۆی، عەرزیان کرد: قوربان بفەرموو! نوێژی لەسەر بفەرموو، فەرمووی: (ئایا هیچی بەجێ هێشتووە؟) گوتیان: نەء، فەرمووی: (ئایا

---

(٧٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (خاتمة كتاب الكفالة فتح/٤/٤٧٨) المترجم.

قەرزی لەسەرە؟) عەرزیان کرد: ئا، سێ لیرەی زێڕی لەسەرە، فەرمووی: (دە خۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن! ئەبوقەتادە، کەیەکێ بوو لەهاوڕێیانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، لەوێ بوو عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ نوێژەکەی لەسەر بکە، ئەو سێ لیرەیە لەسەر من من دەیدەمەوە بە خاوەن قەرزەکە، با ئەم موسوڵمانە ئەم بەهرە گەورەیەی لەکیس نەچێ، پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) نوێژی لەسەر مردووەکە کرد. ) تاج/٢/٣٤٦-٩).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٤٤- نامەی دەستە بەربوون (کەفالەت) (كتاب الكفالة)

(بڕوانە فیقهی ئاسان/٢ل /٤٩٤ز –٢١٦ بۆ زیادە بەهرەو تێگەیشتن)

١٠١٠– عنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) : أَنَّه قِيلَ لَه: أَبَلَغَكَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا حِلْفَ فِي الإِسْلامِ) ؟ فَقَالَ قَدْ حَالَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِي) (الحديث ٢٢٩٤، طرفاهُ في: ٦٠٨٤، ٧٣٤٠) [٧٨].

عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیکیان کرد: ئایا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر گەیشتووە پێت، کە دەفەرموێ: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نییە) ئەنەس فەرمووی: لەماڵی منا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی دۆستایەتیو برایەتی بەست، لەنێوانی کۆچکاران کەلەهۆزی قورەیش بوون، بەشێوەی گشتیو لەنێوانی یاریدەدەران (أنصار) دا، کەلەخەڵکی مەدینە بوون.) ت/٥/٢٠٣-ف-٢+٣+٤+٥ز-٥٨) (فیقهی ئاسان/ بەرگی/٢ل –٤٩٤ز-٢١٦).

---

(٧٨) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: مؤاخاة النبيَ (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) بين أصحابه، رقم: ٢٥٢٩.

**روونكردنهوه:**

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباسەکەوە لەو رووەوەیە کە چوونە ژێر پەیمانو پەیمان بەستن لەسەر شتی رەوا، جۆرێکە لە دەستەبەربوون، چونکە دەستەبەربوون لەیاسانامەی خودادا، بریتییە لەئەستۆ گرتنی کارێکی باش، بەبێ وەجەڵ (عوض) دەی پەیمان بەستنیش لە ئیسلاما شتێکە لەم بابەتە.

١٠١١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لَوْ قَدْ جَاءَ مَالُ الْبَحْرَيْنِ قَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وَهَكَذَا) وَهَكَذَا فَلَمْ يَجِئْ مَالُ الْبَحْرَيْنِ حَتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا جَاءَ مَالُ الْبَحْرَيْنِ أَمَرَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى مَنْ كَانَ لَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنَا فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِي كَذَا وَكَذَا فَحَثَى لِي حَثْيَةً فَعَدَدْتُهَا فَإِذَا هِيَ خَمْسُ مِائَةٍ وَقَالَ: (خُذْ مِثْلَيْهَا) (الحديث ٢٢٩٦، أطرافُهُ في: ٢٥٩٨، ٢٦٨٣، ٣١٢٧، ٣١٦٤، ٤٣٨٣)[٧٩].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەگەر ماڵ (سەرانەی) بەحرەین هات، ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت ئەدەمێ) ئیتر وارێکەوت ماڵی سەرانەی بەحرەین هەر نەهات هەتا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گیانی پاکی سپارد. بەڵام کاتێ ماڵەکە گەیشت، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) بوو بە جێنشین، فەرمانی فەرموو جارچی جاری دا: هەرکەسێ بەڵێن یاقەرزێکی هەیە لەسەر پێغەمبەر- دروودی لەسەر - با بێ بۆ لای ئێمە، منیش چوومو عەرزیم کرد: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) واو وای بەمن فەرموو، ئەویش لاگوێلێکی لەماڵەکە داپێم، کەژماردم پێنجسەدبوو، فەرمووی: دوو ئەوەندەی تریش هەڵبگرە بۆ خۆت). (ریاض/٢/ل/٢١٤ف-٦٩١).

(٧٩) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: ما سُئل رسول الله (صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ) شيئا قط فقال: لا، رقم: ٢٣١٤.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٥- نامەی جیدارییی، واتە: وەکالەت (كِتَابُ الوكالة)

(پێشەکی بروانە فیقهی ئاسان، بەرگی/٢ل ---٥٠٠ز-٢٢٠ بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە)

١٠١٢- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَاهُ غَنَمًا يَقْسِمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ فَبَقِيَ عَتُودٌ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (ضَحِّ بِهِ أَنْتَ). (الحديث ٢٣٠٠، أطرافُهُ في: ٢٥٠٠، ٥٥٤٧، ٥٥٥٥)[٨٠].

عوقبەی کوڕی عامیر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بڕکەیێ ڕانی پێم دا، کە دابەشی بکەم بەسەر هاوڕێکانم دا بۆ قوربانی، گێسکێ مایەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد: قوربان! گێسکێ ماوەتەوە، فەرمووی: (ئەویش بکە بە قوربانی بۆ خۆت) ) فیقهی ئاسان١ل ---٥٠٠ز-٢٢٠).

١٠١٣- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ كَانَتْ لَهُمْ غَنَمٌ تَرْعَى بِسَلْعٍ فَأَبْصَرَتْ جَارِيَةٌ لَنَا بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِنَا مَوْتًا فَكَسَرَتْ حَجَرًا فَذَبَحَتْهَا بِهِ فَقَالَ لَهُمْ: لا تَأْكُلُوا حَتَّى أَسْأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ أُرْسِلَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ يَسْأَلُهُ وَأَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَاكَ أَوْ أَرْسَلَ فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا ). (الحديث ٢٣٠٤، أطرافُهُ في: ٥٥٠١، ٥٥٠٢، ٥٥٠٤)[٨١].

کەعبی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کەنیزەکێکم هەبوو، لەلای ڕانەکەمان بوو، ڕۆژێ دەبینێ مەڕێ پێکراوە، خەریکە دەمرێ، ئیتر

---

(٨٠) أخرجه مسلم في الأضاحي، باب: سِنّ الأضحية، رقم: ١٩٦٥.

(٨١) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٤/٤٧٨-خاتمة كتاب الكفالة والوكالة) — المترجم.

کەنیشکەکە، بەردێ لەت لەت دەکاو تیژی دەکا، ئەوجا مەڕەکە بەو چەقۆ بەردینەیە سەر دەبڕێ، کەعب کاتێ بەکارەکەی زانی فەرمووی: لێ ی مەخۆن هەتا لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەپرسم لەم بارەیەوە، یا فەرمووی: هەتا کەسێ دەنێرم بۆ خزمەت پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە لەم بارەیەوە پرسیاری لێ بکات، دوایی خۆی لێ ی پرسی یا کەسێکی نارد لێ ی پرسی، فەرمووی: (بیخۆن). (تاج/٤/٢٦ز-٧ف-٢)

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباسەکەوە لەو ڕووەوەیە، کە جێدارو شوان لەکاتی ناچاریدا، بەرپرسن نین، بەمەرجێ درێغی لەئەرکی سەرشانی خۆیان نەکەن، وەك ئەم ڕووداوە.

١٠١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَقَاضَاهُ فَأَغْلَظَ فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (دَعُوهُ فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً) ثُمَّ قَالَ: (أَعْطُوهُ سِنًّا مِثْلَ سِنِّهِ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لانجدُ إِلاَّ أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ فَقَالَ: (أَعْطُوهُ فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً) (الحديث٢٣٠٦، أطرافُه في: ٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩) [٨٢].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ قەرزی لەسەر پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، هات بۆ خزمەتی بەشێوەیەکی ڕەق و تەق داوای قەرزەکەی لێ کردەوە، هاوڕێیانی پێغەمبەر - دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هاوڕێکانی بێ- ویستیان تەمێی بکەن، بەقسە یا بەئازاردان، لەسەر ئەوە چۆن بێویلی وا لەڕووی پێغەمبەردا ئەنجام دەدا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەکەن، وازی لێ بێنن، چونکە خاوەنی ماف ڕێگەی گوتاری هەیەو، مافی ئەوەی پێ دراوە کە قسەی خۆی بکا) ئەوجا فەرمووی:

---

(٨٢) اخرجه مسلم في المساقاة، باب: من استلف شيئا فقضى... رقم: ١٦٠١.

(وشترێکی پێ بدەن کە لەسێرەی وشترەکەی خۆی دا بێ) عەرزیان کرد: قوربان! وشتری وامان لا نییە، کە لەتەمەنی وشترەکەی خۆی دا بێ، مەگەر وشترێکی تەمەن گەورەتری پێ بدەین فەرمووی: (بیدەن پێی، لەڕاستیدا مرۆڤی باش هەمیشە قەرزی خەڵك بەباشی دەبژێرێتەوە).

جێگەی پەیوەندی ئەم فەرموودەیە لەو رستەیەدایە کە دەفەرموێ: (أعطوهُ: بیدەن پێی) چونکە ئەم فەرمان کردنە بەجێدارو وەکیل بۆ دانەوەی قەرزەکە، ئەمەیش دووشت دەگەیەنێ: جێداریو وەکالەت دروستە، دووەم: جێداری لەقەرز دانەوەش دا دەبێ.

١٠١٥- عن مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَحَبُّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ إِمَّا السَّبْيَ وَإِمَّا الْمَالَ وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِهِمْ). وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْتَظَرَهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنْ الطَّائِفِ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلاَّ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ قَالُوا: فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمُسْلِمِينَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: (أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلاءِ قَدْ جَاءُونَا تَائِبِينَ وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ بِذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ) فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَهُمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنَّا لا نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذَلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعُوا إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ) فَرَجَعَ النَّاسُ فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا). (الحديث ٢٣٠٧، أطرافه في: ٢٥٨٤، ٢٥٣٩، ٢٦٠٧، ٣١٣١،

٤٣١٨، ٧١٧٦). (الحديث: ٢٣٠٨، أطرافُهُ في: ٢٥٤٠، ٢٥٨٣، ٢٦٠٨، ٣١٣٢، ٤٣١٩، ٧١٧٧)[٨٣].

عورەوە دەفەرموێ: مەروانی کوڕی حەکەم ومیسوەری کوڕی مەخرەمە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویان: هۆزی هەوازین لەپاش تەواو بوونی غەزای حونەین، ئیسلام بوون و، دەستەیەکیان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) داوایان لێیکرد: کەماڵو ژنو خێزانە بەدیل گیراوەکانیان پێ بداتەوە، ئەویش پێی فەرموون:

(من بەش بەحاڵی خۆم حەزم لەقسەی ڕاستە، قسەو گفتوگۆ هەتا ڕاستتربێ خۆشەویستترە لەلای من، کەوابوو یەکێ لەم دووشتە هەڵبژێرن: یا دیلەکانتان پێ بدەمەوە، یاماڵەکانتان، وەمن گەلێکیش چاوەڕوانیم کردن، سابەشکو ئێوە ئیسلام ببنو بێن بۆ لام هەتا شتەکانتان پێ بدەمەوە، بەڵام ئێوە هەرنەهاتن بۆیە منیش تاڵانیو دیلەکانم دابەش کرد، ئەوەبوو پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کەلەغەزای تائیف گەڕایەوە، دەشەو زیاتر چاوەنواڕی ئەوانی کرد سابەشکو بچن بۆ خزمەتی، هەتا شتومەکەکانیان پێ بداتەوە. وەفدەکەیش کەزانیان پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەریەکێ لەودوو شتەیان پێ دەداتەوە، گوتیان: کەواتە دیلەکانمان دەوێتەوە.

ئیتر پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەڵسایەوە لەناو موسوڵمانەکاندا ووتارێکی فەرموو، سوپاسو ستایشێکی جوانی وای خودای گەورەی کرد، کەهەر شایانی ئەو زاتە بێ، ئەوجا فەرمووی: لەپاش سوپاسو ستایشی خودا ئەم برادەرانە، کەبرای ئایینی ئێوەن کەنوێنەری هەوازینن، پەشیمان بوونەتەوە لەکاری ناشیرینی خۆیانو ئیسلام بوونو هاتوون بۆ لامان، منیش لەبەر ئەوە بڕیارم داوە کەژنو مناڵە بەدیل گیراوەکانیان پێ بدەمەوە، بەڵام

(٨٣) لم يوافقه مسلمٌ على تخريجهِ (فتح/٤/٤٧٨- خاتمة) — المترجم.

ئێوە بەکەیفی خۆتان یەکێ لەم دوو ڕێگەیە هەڵبژێرن: یەکەم: هەرکامێکتان پێی خۆشە کە بەپیاوەتی بەشی خۆی ڕەت بکاتەوەو بیداتەوە پێیان ئەوە زۆر باشە، دووەم: هەرکامێکتان پێی خۆشە کەلەسەر بەشی خۆی بمێنێ بابمێنێ، بەڵام ئەوەی کەلایەتی لەم خاوو خێزانە دیلانە بارەتی بکاتەوە، بیاندەینەوە بەکەسو کارەکانیان، هەتا لەیەکەم تالانی کە خودا دەیڕەخسێنێ بۆمان تۆڵەی ئەوەی بۆ دەکەینەوە.

مەردومەکەش عەرزیان کرد: قوربان! لەبەر خاتری تۆو لەسەر فەرمانی تۆ هەموومان حەزدەکەین بەپیاوەتی، بەبێ وەجەڵ بیاندەینەوە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێستا ئێمە بەڕوونی نازانین بۆ ئەم مەسەلەیە کێ ڕازی بووەو کێ ڕازی نەبووە، لەبەر ئەوە ئێستا بڕۆنەوە بۆ جێگەو ڕێگەی خۆتان، لەدواییدا سەرکارو چاوەشەکانتان وەڵامەکانی ئێوەمان بەبوونو بەنەبوون بۆ بهێننەوە، خەڵکەکەش ڕۆیشتنەوە سەرکارەکانیان یەکەیەکە قسەیان لەگەڵ کردن، هاتنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزیان کرد: کە خەڵکەکە بەخۆشنودیی خۆیانو بەڕەزامەندی خۆیان، دەیانەوێ منداڵو ژنە دیلەکانیان پێ بدەنەوە).
(بڕوانە: تاج/٨/١٧٦ز -٧١٠- للأميرِ المنُّ والفِداء.. + تاج/٨/ل/٢٣٧ز-٩٦- غەزای حونەین ف-١).

**ڕوونکردنەوە:**

لەپاش ئازادکردنی مەککەی پیرۆز لەبیستی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچیدا، پێغەمبەرو سوپاکەی لەپێنجی شەشەڵانی هەمان ساڵ دا، لەمەککە دەرچوون، ڕۆیشتن بۆ غەزای هۆزی هەوازین، کەناسراوە بە غەزای حونەین، جا لەشکری هەردوولا بەرامبەر یەکتری ڕاوەستان، سوپاکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەسەرەتاوە شکستیان هێنا، بەڵام لەئەنجاما لەپاش نەبەردێکی

سەخت، لەشكری ناموسوڵمانەكان شكاو هەڵیان تۆڕاندو، سەرو ماڵیان بو بە تاڵانی بۆ سوپای ئیسلام، وە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وەك لە فەرموودەكەدا دەفەرموێ: لەپاش چاوەڕوانییەكی زۆر، تاڵانییەكەی دابەش كرد بەسەر جەنگاوەرەكاندا، بەڵام دوایی تكای لێ كردن كەژنو منالە دیلەكانیان بۆ رەت بكەنەوە.

ژیاننامەی مەخرەمە لەپێشەوە رابوورد، مەڕوان لە پیاوان(رجال) ی صەحیحی بوخارییە، پێشەوا موسلیم لەصەحیحی موسلیم دا گێڕانەوەی لەووەوە ئەنجام نەداوە. ئەم مەڕوانە كوڕی ئەو حەكەمەیە كە نووسەری پێغەمبەر بوو، وەپێغەمبەر نەفی كرد بۆ تائیف.

تەمەنی لەكاتی كۆچی دوایی حەزرەت دا لەدەوری هەشت ساڵاندا بوو، ئیمامی عوسمان لەسەردەمی جێنشینی خۆی دا كردی بەنووسەری خۆی، بەرە بەرە زاڵ بوو بەسەر هەستو هۆشی ئیمامی عوثمان دا، هەتا وای لێ هات عوثمان لەقسەی دەرنەدەچوو، مەڕوان كوڕی مامی حەزرەتی عوسمان بوو، یەكێ بوو لەهۆیەكانی كوشتنی پێشەوا عوسمان، لەرۆژی جەنگی ئەل جەمەل دا، لەگەڵ عائیشە بوو لەدژی پێشەوا عەلی، موعاویە كردی بەسەرەكشاری مەدینە. ئیبنو عەبدول بەر (رەحمەتی خودای لێ بێ) لە ئیستیعابا هێرشێكی توندو تیژ دەكاتە سەر مەڕوان، بەتایبەتی كۆمەڵی لەو هەڵبەستانە یاد دەكا، كە عەبدورەحمانی برای مەڕوان لەزەمی مەڕوان دا گوتویانی، دەڵێ: بەهۆی شەڕەدەمێیەكەوە لەنێوانی خالیدی كوڕی یەزیدی كوڕی موعاوییەداو لەنێوانی مەڕوان دا روو دەدا، لەسەر ئەم شێوەیە مەڕوان دەرمان خوارد دەكرێ: (مەروان بۆ سووكایەتی بەخالید دایكی مارە دەكا، رۆژێ لەسەر شتێ دەبێ بە شەڕە دەمیان، مەڕوان قسەی رەق بەخالید دەڵێو تانەی ناشیرین لە دایكی خالید دەدا، كەژنی خۆیەتی، مەڕوان دەچێ بۆلای دایكیو سكاڵای حاڵی لەلا دەكا، ئەویش دڵنیای دەكا كە تۆڵەی لێ

دەستێنێ، ومدمرمان خواردی دەکاو دەیکوژێ، لەبەر ئەوە مەشهووره کە مەڕوان بەدەستی ژن کوژراوە، لەسالی شەستو پێنجی کۆچیدا، لەتەمەنی شەستو سێ دا. هەندێ دەڵێن: لەتەمەنی شەستو هەشت دا مردووە.

مەڕوان فەقێی زۆری هەبووە لەپەیڕەوان کە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، خۆشی لەم زاتانە کەلە هاوڕێیانی پێغەمبەرن، گێڕانەوەی هەیە، لەعومەرو عوسمان وعەلیو زەیدی کوڕی ثابیتو کەسانی تریش (ڕەزاو رەحمەتی خودا لە هەموویان بێ). (بۆ ئەم مەبەستە تەماشای بەرگی سێهەمی فیقهی ئاسان، لاپەڕە/٨٥١ بفەرموون).

١٠١٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وَكَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ وَقُلْتُ وَاللَّهِ لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ وَلِي حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ قَالَ فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ؟) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالاً فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ). فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهُ سَيَعُودُ فَرَصَدْتُهُ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ لا أَعُودُ فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ؟) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالاً فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ).

فَرَصَدْتُهُ الثَّالِثَةَ فَجَاءَ يَحْثُو مِنْ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ فَقُلْتُ: لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ وَهَذَا آخِرُ ثَلاثِ مَرَّاتٍ أَنَّكَ تَزْعُمُ لا تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ قَالَ دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهَا قُلْتُ: مَا هُوَ؟ قَالَ إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ اللَّهُ لا

إِلَهَ إلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ فَإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلا يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ.

فَأَصْبَحْتُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ؟) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهَا فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ: (مَا هِيَ؟) قُلْتُ: قَالَ لِي: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَقَالَ لِي لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنْ اللَّهِ حَافِظٌ وَلا يَقْرَبَكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلاثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟) قَالَ: لا قَالَ: (ذَاكَ شَيْطَانٌ) (الحديث ٢٣١١، أطرافُهُ في: ٣٢٧٥، ٥٠١٠).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئاگاداری سەرفیترەی ڕەمەزانی پێسپاردم، جا زەلامێ هاتو دەستی کرد بە خۆراك بردن لە کۆمەڵەی سەرفیترەکە بەگوێل دەیماڵیە ناو کۆشی منیش گرتمو گوتم: بەخوا دەتبەم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تا تۆڵەی ئەم تاوانەیەت لێ بستێنێ، کەدزی دەکەیت، بەڵام کابرا پاڕایەوەو گوتی: ئەمە هی ئاتاجو نەدارایانە، منیش نەبووەو ئاتاجم، گەلێ نەدارامو سەرەڕای ئەوەش خێزانێکی زۆری ڕەشو رووتم وابەسەرەوە، لەبەر ئەوە منیش وازم لێیهێنا، بۆ بەیانی حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئەبوهورەیرە! ئەرێ دوێ شەو چیت لەدیلەکەت کرد؟ گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خوا! سکاڵای لەدەست نەبوونیو بەسەراکەوتنی خێزانی زۆر کرد، منیش بەزەییم پیا هاتەوەو بەرەڵاییم کرد، فەرمووی: ئەدی ئەوە درۆی لەگەڵ کردووی دیسان دێتەوە.

ئیتر لەبەر فەرمایشتەکەی حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) زانیم کە ئەو کابرایە دیسان دێتەوە بۆ دزی، جا خۆم لێ داگرت، تاهاتەوەودەستی کرد بەلامشت

لێدان لەخۆراکەکە منیش گرتمەوەو گوتم: بەخوا دەتبەم بۆ دادگایی بۆ لای پێغەمبەری خودا، ئەو خۆی دەزانێ کەمافت چییە، گوتی: ئەم جارەیش وازم لێ بێنەو مەم بە، ئەم خۆراکە خۆشی هی نەداراو ئاتاجانەو منیش نەداراو ئاتاجمو کۆشێ خێزانی رەشو روتیشم بەسەردا کەوتووە، بەخوا ئیتر نایەمەوە، منیش بەزەییم پیادا هاتەوەو وازم لێی هێنایەوە، بۆ سبەینێ حەزرەت فەرموویەوە: ئەی ئەبوهورەیرە! دیلەکەت چی لێ کردووە؟ گوتم: قوربان! دیسانەوە سکاڵای لەدەست نەبوونیو پێویستی کردو دەیگوت خێزانی زۆری بەسەرەوەیە ئیتر منیش رەحم پێی جوڵاو بەرەڵاییم کردەوە، فەرموویەوە: ئەوە درۆی لەگەڵ کردوویت هەمدیس دێتەوە!

جا لەشەوی سێیەم دا خۆم بۆ مەڵاس داو خۆم لێی داگرت، تاهاتەوە هەمدیسان دەستی کردەوە بەلالەویچ دان لەرزقەکە، منیش پڕم پیادا کردەوەو گوتم: ئەمجارەیان دەتبەم بۆ دادگایی کردن بۆ لای پێغەمبەری خوا، ئەمە سێیەم جارە تۆ ئەم درۆیە دەکەی، گوایە ئیتر نایەیتەوە کەچی هەمدیسانەوە دێیتەوە، کەچی گوتی: ئەگەر وازم لێ بێنیت چەند ووشەیەکی سوکەڵەو کەمت فێردەکەم، کەخوا بەهۆی ئەوەوە سوودو قازانجت پێ دەگەیەنێ. گوتم: کوا؟ کامانەن ؟ گوتی: کاتێك دەچیتە سەر نوێنی خەوتنەکەت ئایەتەلکورسی بخوێنە، کەئایەتی ﴿اللَّـهُ لا إِلَـهَ إِلاَ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ە، هەتا کۆتایی دەوری بکەرەوەو ئایەتەکە بەتەواویبخوێنە، ئیتر لەتەرەفی خوداوە پاسەوانێکت بۆ دیاری دەکرێ ئێشکت دەگرێ وەهەتا بەیانی شەیتان توخنت ناکەوێ!

جا بۆ سبەینێ خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) کەلە خودای گەورەوە ئاگادرای کارەکە کرابوو، فەرمووی پێم: ئەرێ دیلەکەت چی لێکرد؟ عەرزیم کرد: قوربان! ئەی رابەری یەزدان بەقسەی خۆی چەند وشەیەکی پێ نیشان دام، گوایە ئەو ووشانە ئەو سوودەیەم پێدەگەیەنێ، کە ئەو ووتی ئیتر

منیش بەرەللاییم کرد، فەرمووی: ئەو وشانە کامانەن؟ گوتم: دیلەکەم پێی گوتم: کاتێك دەچیتە سەر نوێن، ئایەتەلکورسی بەتەواوی بخوێنە کەئەم ئایەتەیە (اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ) ، دەیگوت: ئیتر لەلایەنی یەزدانەوە پاسەوانێ بەدیارتەوە دەبێ، وەتا بەیانی شەیتان‌و جنۆکە نزیکت نابنەوە.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەدی ئەم قسەیەی راستە، کەبە تۆی گوتووە ئەمە یەکێکە لەپیت‌و فەڕو سوودی ئایەتەلکورسی، وەلێ ئەم دیلەی تۆخۆی درۆزنە ئەی ئەبوهورەیرە! ئەدی دەزانی کەئەمە سێ شەوە تۆ لەگەڵ کێ دا گفتوگۆ دەکەی؟ گوتم: نەء، نا نازانم، فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : ئەوە شەیاتینی بوو! ) ریاض الصالحین/٣ل/٨١٨ف-١٢ز- ١٨٣+ تاج/٥ل-٣٠٠ف-٢ز-٨٢).

لەعەینی‌و فەتحول باریدا، زۆریان لە بەهرەکانی ئەم فەرموودەیە نووسیووە، وەك جنۆکە کەئەو خۆراکانە دەخۆن کە مرۆڤ دەیخوات، جاری وادەبێ مرۆڤ دەیانبینێ بەزمانی مرۆڤ قسەدەکەن، دزی‌و فڕو فێڵ دەکەن ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی ئایەتەلکورسی، ئەو خۆراکەی ناوی خودای لەسەر یادنەکرێ، شەیاتینی‌و جنۆکە لێی دەخۆن، دز لەکاتی گرانی دا دەستی نابڕڕێ، عوزر قبوڵ کردن کارێکی باشە، پۆشینی نهێنی‌و عەیب‌و نەنگی خەڵکی کارێکی پەسەندە، هەروا دەفەرموون: بەڵگەیشە لەسەر ئەوە کەوەرگرتن‌و فێربوونی دانایی‌و زانستی باش، هەمیشە نێچیری پیاوی موسوڵمانە، بۆیە لەهەرلا چنگی بکەوێ هەر لەخۆی جوانە.

جا بەندە لەم روانگەیەوە دەڵێم: وەرگرتنی زانست لەبەدکار(فاسق)و بێ بڕوا دروستەو ناردنی فێرخوازو قوتابی‌و خوێندکار بۆ دەرەوەی وڵاتی ئیسلامی دروستە لەقورئانی پیرۆزدا، لەداستانی یاخی بوونی شەیتانا، زۆر پەندو حیکمەت‌و بەهرەی واتیادا، تەنانەت لە گوتەکانی شەیتانیش دا کە قورئان دەیگێڕێتەوە زۆر بەهرەی واتیا.

**هەر لەم بابەتەیە ئەم چیرۆکە:**

دەڵێن: سیّد شەریفی جورجانی (رەحمەتی خودای لێ بێ) کەخۆی سوننیو زانایەکی گەورەیە لەگەڵ کۆمەڵێ فەقێی تری سوننی دا، لەخزمەت نەصیرەددینی طوسی دا، کتێبی شەرحە مەواقیف دەخوێنن، کە دانراوی نەصیرەددینی طوسی شیعییە، تا ماوەیەکی زۆر لەلای دەخوێنن، وەبۆ بەرزەوەندی خوێندنەکەیان، دڵی ڕادەگرنو ڕێزی هەستی دەگرن. تا پاش ماوەیێ نەصیرەددینی مامۆستایان نەخۆش دەکەوێ، ئەوانیش بۆ حەقی وەفا دەچن بۆ سەردانیو سەرخۆشی لێ کردنی، مامۆستای طوسی فەقێکانی خۆی بەئەهلی راوێژ دەزانێ: بەئومێدی ئەوەی چارەیێکیان لەلابێ، پێیان دەڵێ: فەقێینە! لەم حاڵی سەرەمەرگەدا حاڵم شڕە بەتایبەتی بۆگەنی دەمم، خۆمو هاونشینانمی هەراسان کردووە، دەبێ هۆی چی بێ؟

سیّد شەریفی جورجانیش پێی دەفەرموێ: (... ئەوە هی ئەو ناماقوڵییانەیە کەلە کۆتایی شەرحە مەواقف دا، دەربارەی حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان نووسیوتە، هەروا هی ئەو رەفو جمێنانەیە کە لەکاتی دەرسەکان دا، دەربارەی ئەم زاتانە دەتکرد، ئەمە بەرایی سزایە، سزای سەختتر وا لەدواوە!) طوسیش بەحەسرەتەوە دەڵێ: بۆ ئێوە لەوانن! تازە لەدەستم چوو، دەنا یەك وشەم فێر نەدەکردن.

١٠١٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ جَاءَ بِلالٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مِنْ أَيْنَ هَذَا؟) قَالَ: بِلالٌ كَانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيٌّ فَبِعْتُ مِنْهُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ لِنُطْعِمَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (عِنْدَ ذَلِكَ أَوَّهْ أَوَّهْ عَيْنُ الرِّبَا عَيْنُ الرِّبَا لا تَفْعَلْ وَلَكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ فَبِعْ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ ثُمَّ اشْتَرِهِ) (الحديث ٢٣١٢) (٨٤)

---

(٨٤) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: بيع الطعام مثلاً بمثل، رقم: ١٥٩٤.

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: جارێ بیلال(ڕەزای خوای لێ بێ) خورمای بەرنی کە جۆرە خورمایەکی زۆر نایابە، خریلەیەکی زەردباوە، هێنای‌و داینا بۆ پێغەمبەر کەنۆشە بکا، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە هی کوێیە؟) بیلال فەرمووی: خورمایەکی ئایەخمان هەبوو، یەك بەدوو فرۆشتم بەمە، هەتا پێشکەشی پێغەمبەری خۆشەویستی بکەین، تانۆشی بفەرمووێ: کە بیلال وای فەرموو: حەزرەت فەرمووی: (وای! وای! ئەوە سوودی پەتییە، ئەوە سوودی تەواوە، بەڵام کاتێ ویستتان مامەڵەی وا ئەنجام بدەن، خورماکەی خۆت بەفرۆشتنێکی سەربەخۆ بفرۆشە، ئەوسا بەبەهاکەی خورماکەی تر بکڕە). (بڕوانە: فەرموودەی: ٢٢٠١کەلەم بەرگەدا لەپێشەوە رابوورد).

بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی(ڕەزای خوای لێ بێ) ناوردارە بەبانگدەری پێغەمبەر، یەکێکە لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکان، دەڵێن: حەوتەم کەس بووە کە ئیسلام بووە، دایکی ناوی حەمامە بوو، برایەکی هەبوو ناوی خالید بوو، خوشکێکی هەبوو ناوی عەفرە بوو، پیاوێکی کەڵەگەتی لاوازی سەوزە بوو، زۆر دڵپاك بوو زۆر موسوڵمانێکی جوان‌و ڕاست‌و دروست بوو، لەسەر ئیسلامەتی بتپەرستەکان ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دا، ئومەییەی کوڕی خەلەف لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا، لەسەر زیخ‌و لمی زیخەڵانەکەی مەککە، لەسەر گازەرەی پشت تەخت ڕای دەکێشاو تاوێرێکی گەورەی دەخستە سەر سکی‌و پێی دەگوت: یا کافر دەبی بە موحەممەد، یا ئەمە حاڵتە تادەمری، لەسەر ئەم حاڵە ئەبوبەکر لەم کاتەدا بینی، کڕی‌و ئازادی کرد.

لەهەموو شەڕگەو غەزاو مەڵبەندەکاندا، لە خزمەت پێغەمبەر دا ئامادەی شەڕ بووە، هەمیشە لەخزمەت پێغەمبەردا بووە، لێی جیانەدبووەوە مەگەر لەکاتی تایبەت دا، لەکاتی پەیمانبەستنەکەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر

بێ) كردی بەبرای ئەبوعوبەیدەی جەڕاح، لەپاش وەفاتی پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) بیلال دەچوو، بۆ غەزاکردن، هەتا لەسەردەمی جێنشینی عومەردا لەشام لەتەمەنی شەستو سێ ساڵیدا گیانی پاکی سپارد.

ئەم زاتانە گێڕانەوەیان لێوە ئەنجام داوە: ئەبوبەکرو عومەرو ئوسامەو عەبدوللای کوڕی عەمرو کەسانی تریش، لەفەتحول باریدا دەفەرموێ: بیلال سێ فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، پێغەمبەر زۆر خۆشی دەویست، واڕێدەکەوێ: بیلال خوا بۆی دەڕەخسێنێ ئومەییەی کوڕی خەلەف دەکوژێ، ئەبوبەکری صدیق بەم هەڵبەستە پیرۆزبایی‌و دەستخۆشی لێ دەکا:

هنيئاً زادك الرحمن خيراً فقدْ أدركتَ ثأرَكَ يابلالُ!

واتە:

پیرۆزبێ، بیلال! خواپیرۆزیکا تۆڵەی خۆتت سەند لە دوژمنی خوا

١٠١٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ رضي الله عنه قَالَ: جِيءَ بِالنُّعَيْمَانِ أَوْ ابْنِ النُّعَيْمَانِ شَارِبًا فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ كَانَ فِي الْبَيْتِ أَنْ يَضْرِبُوه قَالَ فَكُنْتُ أَنَا فِيمَنْ ضَرَبَهُ فَضَرَبْنَاهُ بِالنِّعَالِ وَالْجَرِيدِ) (الحديث ٢٣١٦، طرفاهُ في: ٦٧٧٤، ٦٧٧٥) [(٨٥)]

عوقبەی کوڕی حاریث(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو، ناوی نوعەیمان بوو، یەکێ بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر، لەگەڵ سوپای ئیسلام، لەدژی بێبڕوایان ئامادەی غەزای بەدر بوو، ئەنصاری بوو، جارێ ئەم نوعەیمانەیان بەسەرخۆشی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی بەوانەدا، کەلەماڵەکەدا بوون، ئادەی لێی دەن، فەرمووی: جا من

(٨٥) لم يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (خاتمة –فتح/٤/٤٩٤) – المترجم.

خۆم یەکێك بووم لەوانە کەلێیمان دا، ئیتر بە سۆڵو پەلکە خورماو شتیوا لێمان دا. (تاج/٣ل-٢٥٢ف-٢ز-٩٦- باسی حەددی ئارەقخۆر).

پەیوەندی ئەمە بەباسەکەوە لەوەدایە، کە پێغەمبەر ئامادەبووانی کردووە بەجێداری خۆی، کە حەدد لەسەر نوعەیمان جێ بەجێ بکەن، کەواتە وەکیلیو جێداری لەم جۆرە شتانەدا دروستەو دەبێ.

عوقبەی کوڕی حاریث رۆژی ئازادبوونی مەککە، ئیسلام بوو لەبوخاری دا سێ فەرموودەی هەیە،، لەسەردەمی نەزانیدا ئیمامی خوبەیب ئەم عوقبەیە کوشتی. لەسەردەمی جێنشینی زوبەیردا بەدەردی خودا دەمرێ - رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ-.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٤٦- نامەی کێڵانو زەوی دان بە موڵکانە

## بابُ: الحرثِ والمزارعة

١٠١٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إِلاّ كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ وَقَالَ لَنَا مُسْلِمٌ حَدَّثَنَا أَبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةُ حَدَّثَنَا أَنَسٌ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٣٢٠، طرفُهُ في: ٦٠١٢) [٨٦].

ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ نەمامێ بنێژێ، یاشتێ بچێنێ، باڵندەیێ، کەسێ، ئاژەڵێ، لێی بخوات، یا هەر سوودێکی تری لێ وەربگیرێ، دەبێ بەخێرو بەخشش بۆی).

(٨٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: فضل الغرس والزرع، رقم: ١٥٥٣.

ماموٚستای عەسقەلانی لەشیکردنەوەی ئەم فەرموودەیە دا دەفەرموێ: (..خوازەی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە: پاداشی ئەوە بەردەوام دەبێ مادام ئەو نەمامە، یا ئەو چێنراوەی بمێنێ، تەنانەت ئەگەر خاوەنەکەشی یاچێنەرەکەشی بمرێ، یا خاوەنێتی ئەو چێنراوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسێ تر هەروایەو، خێرەکەی ئەو بەردەوامە، ئەوەش کە دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ یا هەر گیانداری لەسەر شێوەی گشتی، بەڵگەی ئەوەیە، هەر موسوڵمانێ ئازادبێ یا کۆیلە، ژن بێ یا پیاو، بەدین بێ یا نافەرمان، کارێکی وا ئەنجام بدا، کە گیانداران کەڵکی لێ وەربگرن، بۆی دەبێ بەخێرو خێراتو بەخشش‌و خێری نەبڕاوە...).

بەندەیش دەڵێم: چێنراو نموونەو وێنەیە، دەنا هەموو کارێکی رەوای بەردەوام هەمان خێرو پاداشتی بۆ هەیە، هەتا کەسێ بەهرەی لێ وەربگرێ، وەهەتا گیانداری کەڵکی لێ وەربگرێ، وەك: بیرو کارێزو پردو مزگەوت‌و کتێب‌و خانووو شتی تری لەم بابەتە، لەپاش مردنی خاوەنیشی هەروا لەپاش گواستنەوەی خاوەنێتیشی واتە: نەقڵی موڵکیەتی، خێرو پاداشتی دروستکەری یەکەمی هەر دەمێنێ، ئەوەش مەعنای وانییە، ئەگەر کەسی دووەم کاتێ ئەوشتە دەکڕێ‌و دەیکا بەخێر خێری ئەو ناگات، بەڵکو هەمووڵا خێریان دەگا، بۆ خودا چی تێ دەچێ.

١٠٢٠- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّه رَأَى سِكَّةً وَشَيْئًا مِنْ آلَةِ الْحَرْثِ فَقَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لا يَدْخُلُ هَذَا بَيْتَ قَوْمٍ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الذُّلَّ قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ وَاسْمُ أَبِي أُمَامَةَ صُدَيُّ بْنُ عَجْلانَ) (الحديث ٢٣٢١) [٨٧].

---

(٨٧) لم يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (خاتمة كتاب الحرث والمزارعة- فتح الباري – المجلد الخامس -ص ٢٨-المترجم.

ئەبو ئومامە صودەی کوڕی عەجلانی ئەل-باهیلی- (ڕەزای خوای لێ بێ) جارێ هەوجارو یەرەق‌و گاسن‌و شتی تری لەکەرەسەی جووت بینی، فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم ژنەوت، دەیفەرموو: (ئەمە سەربکا بەهەر ماڵێکا، خودا دەیکا بەمایەی ژێردەستی‌و کەساسی بۆیان!).

## ڕوونکردنەوە:

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە دوو شتی سەرەکییە: **یەکەم** موسوڵمان سەرنەکەنە کشت‌و کاڵ‌و ماڵداری‌و شتی‌وا، بەجۆرێکی‌وا کەدووریان بخاتەوە لەدروستکردنی هێزی سەربازی پێویست، بەڵکو لەپلەی یەکەما دەبێ گرنگی بەجێ بەجێ کردنی ئەم ئایەتە بدەن کە دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ﴾. **دووەم**: فەلایی‌و کشتیاری‌و شتی‌وا، لك‌و پۆپی زۆری لێ دەبێتەوە، وەك: مافی مڵکانەو مافی هەژاران‌و مافی زەکات. زۆرینەی کاتیش ئەم جۆرەشتانە سەردەکێشن بۆ یەکێ لەم دوو شتە: **یەکەم** بەرپرسیاری لای خوا لەقیامەتا. **دووەم**: داماوی‌و کەساسی‌و ژێردەستی ئاغاو خاوەن موڵك.

ئەوەی لەبەر چاوە، هەتا کو ئەمڕۆکەش لەوڵاتی ئیسلاما، لەمسکێن‌و فەلاو جوتیار کەساسترو بێنەواتر نییە، کەواتە ئەم فەرموودەیە بەپێچەوانەی فەرموودەی یەکەم نییە، بەڵکوو مەبەست لەهەردولا پلەی (اعتدال) و مامناوەندییە، کەنەشیش بسوتێ‌و نەکەباب‌و نەدەست!.

ئەبو ئومامەی باهیلی ناوی صودەی کوڕی عەجلانە، لە هۆزی باهیلەیە خۆی دەفەرموێ: کاتێ ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾ لە قورئانی پیرۆزدا لەپەسەن‌و مەتحی بەشدارانی بەیعەتی رضواندا هاتەخوارەوە، عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! منیش یەکێك

بووم لەو كۆمەڵەی كەلەژێر ئەم شێخەڵەدا پەیمانم دا بەتۆ، فەرمووی: (تۆ لەمنیو منیش لەتۆم).

هەروا خۆی دەفەرموێ: لەغەزایەكا چوومە خزمەت حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم كرد: قوربان! نزام بۆ بكە كە خودا لەم غەزایەدا شەهید بوونم بەنسیب ببێ. بەڵام خۆشەویست فەرمووی: (اللـهمَّ سلِّمهُم وغنِّمهُمْ) واتە: (خودایە! لەم غەزایەدا هەم بێ وەیو سەلامەتیان بكەو هەم تاڵانیان بەنسیب بفەرموو!).

ئەبو ئومامە(رەزای خوای لێ بێ) لەحومس، لەشام دەژییا، دەڵێن: دواهەمین كەس بووە لەهاوەڵانی پێغەمبەری ئازیز كەلە شام مردووە. گێڕانەوەی زۆری لەخۆشەویستەوە ئەنجام داوە، زۆرینەی گێڕانەوەكانی شامیەكان دەیگێڕنەوە. لەفەتحو عەینی دا دەفەرموێ: سێ فەرموودەی لەبوخاری دا هەیە، هەروا مامۆستای عەینی دەفەرموێ:...ئەوپەڕی داماویو كەساسی والەناو فەلاو جوتیارو وەرزێرەكانی میسردا، چونكە دەرەبەگەكان زاڵ بوون بەسەریاناو بەوپەڕی چەوسانەوە دەیانچەوسێننەوە، لێیان دەدەن زیندانیان دەكەن، وەك كۆیلەی زەرخرپیدە رەفتاریان لەگەڵ دەكەن، بەهیچ شێوەیێ ناتوانن خۆیان لەچنگی ئەم ستەمكارانە رزگار بكەن، هەتا كوڕ لەباتی باوك دەگرن! ئەبو ئومامە لەتەمەنی نەوەدو یەك ساڵی دا، لەساڵی هەشتاو یەكی كۆچی دا لەشام بەمردنی خوا دەمرێ، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

١٠٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ أَمْسَكَ كَلْبًا فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌ إِلاَّ كَلْبَ حَرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ). قَالَ ابْنُ سِيرِينَ وَأَبُو صَالِحٍ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِلاَّ كَلْبَ غَنَمٍ أَوْ حَرْثٍ أَوْ صَيْدٍ). وعَنْه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَلْبَ صَيْدٍ أَوْ مَاشِيَةٍ) (الحديث ٢٣٢٢، طرفهُ في: ٢٣٢٣) [٨٨].

---

(٨٨) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: الأمر بقتل الكلاب و بيان نسخهِ، رقم: ١٥٧٥.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێ سەگێ رابگرێ کە سەگی پاسی زەوی‌و زارو، پاسی ران‌و ئاژەڵ نەبێ، هەموو رۆژێ دووپارچە لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: (..کەسەگی پاسی ران‌و کێڵگەو راو نەبێ..).

لەگێڕانەوەیەکی تریدا: (..کەسەگی پاسی ئاژەڵ‌و ڕاوپێکردن نەبێ...).

**روونکردنەوە:** (بڕوانە: تاج/٢/٣٥٧ ز –١٧١).

لێرەدا مامۆستای مەزن ئیبن حەجەری عەسقەلانی، روونکردنەوە: یەکی نایابی هەیە کە گوێزانەوەی بۆ ئێرە، لەم رۆژگارەدا زۆر لەبارە، چونکە ئێستا واباوە کەلەولاتی خۆرئاوا ئەم یاسایە چەسپاوە: (بەپلەی یەکەم مافی سەگ‌و بەپلەی دووەم مافی ژن‌و بەپلەی سێیەم مافی پیاو رەچاو دەکرێ!).

عەسقەلانی دەفەرموێ: لەم فەرموودەیەدا ئەوەی واتیا کەڕاگرتنی سەگ، بۆ ڕاوو پاس دروستەو رەوایە، هەروا ئەگەر لەبەر هەر بەرژەوەندییەکی رەوای تر رابگیرێ، یا لەبەر پێشگیری لەهەر زیانێ رابگیرێ، کەواتە پوختەی کار ئەمەیە: (راگرتنی سەگ بەبێ کارپێبوون‌و بەخۆڕایی ناباشەو مەکروهە چونکە دەبێت بەهۆی تۆقانی خەڵک‌و دوورکەوتنەوەی فریشتە لەوشوێنە...).

لەراستی دا لەم رۆژگارەی ئێمەدا سەگ بۆ زۆر مەبەستی رەواو گرنگ بەکارئەهێنرێ، وەك سەگی پۆلیسی، سەگی چاوساغ، سەگی ئەزموونی پزیشکی‌و بەکارهێنانی سەگ لەمەودا زانستی‌و هونەرییەکاندا، کەبەئاژەلی تر ناکرێ، چونکە سەگ زۆر زیرەکە، زووشت فێردەبێ دەتوانێ فەرمان جێ بەجێ بکا.

حا لەم كاتانەدا كە سەگ رابگیرێ بۆ مەبەستی رەوا راگرتنەكەی پاداشی باشی هەیە، نەك گوناه، چونكە سەگیش بەر ئەو فەرموودەیە دەكەوێ كە دەفەرموێ: (فِي كُلِّ ذاتِ كَبِدٍ حرّى أجرٌ= ئەوەی تەڕایی ژیانی تیابێ خێری پێ دەشێ).

وەكی تر: كەراگرتنی سەگ دروست بێ، بەمەرجی خۆی دیارە پەروەردەكردنی بەچكەشی هەر دروستە، بەهەمان مەرج، بەلام بەپێی توانا پێشگیری لەزیانەكانی بكرێ، وەك: كوتانی پزیشكی هەتا نەبێ بەهۆی هاربوونی كەسێ، هەروەها نەهێلرێ ببێ بەهۆی پیس و پۆخلی و ئازاردانی مەردوم بەهۆی وەڕین و شتی تری واوە، یان لەبەر برسێتی بچێ شتی دەرو دەراوسێ بدزێت و بیخوات.

عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە كراوە بەبەلگە لەسەر ئەوە، كە هەر سەگێ دروست بێ رابگیرێ پاكە، چونكە خۆلێپاراستنی زۆر زەحمەتە.

## باسی ئەوەی هەرشتێ بۆ شتێ دروست كراوە

١٠٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَيْنَمَا رَجُلٌ رَاكِبٌ عَلَى بَقَرَةٍ الْتَفَتَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: لَمْ أُخْلَقْ لِهَذَا خُلِقْتُ لِلْحِرَاثَةِ) قَالَ: آمَنْتُ بِهِ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (وَأَخَذَ الذِّئْبُ شَاةً فَتَبِعَهَا الرَّاعِي فَقَالَ لَهُ الذِّئْبُ: مَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ يَوْمَ لا رَاعِيَ لَهَا غَيْرِي) قَالَ: آمَنْتُ بِهِ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ. قَالَ الراوي عن أبي هريرة: وَمَا هُمَا يَوْمَئِذٍ فِي الْقَوْمِ) (الحديث ٢٣٢٤، أطرافُهُ في: ٢٤٧١، ٣٦٦٣، ٣٦٩٠) [٨٩].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: جارێ پیاوێ سواری رەشە ولاخێ بوو بوو، رەشە ولاخەكە ئاوڕی لێ دەداتەوەو پێی دەلێ: من بۆ ئەمە دروست نەكراوم، من بۆ سواربوون و

(٨٩) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل أبي بكر الصديق (صلى الله عليه وسلم)، رقم: ٢٣٨٨.

بارهەڵگرتن دروست نەكراوم، بەڵكوو من بۆ جووت كردن دروست كراوم، خوا هەر شتێكی بۆ شتێ دروست كردووە، مرۆڤ بۆ خواپەرستی، گا بۆ جووت كردن. جا خەڵكەكە لەمە سەرسام بوونو هانایان بردە بەر یادو ذیكری خوا، گوتیان: سوبحانەڵلا، نامە خوا لەكاری خوا، رەشە ولاخ قسەدەكا! جاحەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر هەندێ كەس سەرسام دەبن لەقسەكردنی ئاژەڵی بێ زمان، بەڵام من خۆمو ئەبوبەكری صدیقو عومەری فاروق باوەڕدەكەین بەم گفتوگۆیە، سەرسام مەبن بەشتیوا بۆ خوا چی تێ دەچێ، ئەو كەسەی ئادەمیزادی هێناوەتە قسە دەتوانێ ئاژەڵیش بهێنێتە قسە، فەرمووی: جارێ گورگێ مەڕێ دەفڕێنێ لەبەر شوانێ، شوانەكە شوێنی دەكەوێو دەنیشێتە سەری، هەتا لێی دەسێنێتەوە، جا گورگەكە پێی دەڵێ: ئەی ئەو رۆژە كەرۆژ رۆژی دڕندەیەو، جگە لەمن شوانی تری نییە، كێ قوتاری دەكا لەچنگم!.

مەردومەكە گوتیانەوە: سوبحانەڵلا! حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: منو ئەبوبەكری صدیقو عومەر باوەڕ بەمە دەكەین. ئەبوسەلەمە كە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە لە ئەبوهورەیرەوە، فەرمووی: ئەو كاتەی كە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەم شایەتیەی دەدا بۆ ئەبوبەكرو عومەر، خۆیان لەوێ حازر نەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی پشت سووردەبێ لەئیمانو باوەڕی پتەویان، بەهەرچی كە پێغەمبەری خوا بیفەرموێ، بۆیە لەنادیار شایەتیان بۆ دەدا. (تاج/٢/٣٥٨ز-١٧١ف-٢).

١٠٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَتْ الأَنْصَارُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : اقْسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا النَّخِيلَ قَالَ: (لا) فَقَالُوا: تَكْفُونَا الْمَئُونَةَ وَنَشْرَكْكُمْ فِي الثَّمَرَةِ قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا. (الحديث ٢٣٢٥، طرفاهُ في: ٢٧١٩، ٣٧٨٢) [٩٠].

(٩٠) اخرجه مسلم في البيوع (عيني/١٢ص١٦٣) المترجم.

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یاریدەدەران عەرزی پێغەمبەریان کرد: قوربان! بەبۆنەی کۆچکردنی کۆچکارانەوە لەخزمەت جەنابتا لە مەککەوە بۆ مەدینە، کێشەی نەبوونیو ئاتاجی دروست بووە، جا ئێمە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە پێشنییار دەکەین کە جەنابت باخو بێستانەکانی ئێمەی یاریدەدەران (أنصار) دابەش بکەی بەسەر ئێمەو ئەوانا تا ئەوانیش وەك ئێمە ببن بەخاوەنی ماڵو سامانو مایەی ژێواریان بۆ دابین بکرێ؟

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نابێ) جایاریدەدەران فەرموویان: دەی ئەی پێغەمبەری خودا! ئێوەی کۆچکاران باخو بێستانەکانمان بۆ بەخێوبکەنو بۆمان بەرهەم بهێنن، ئێمەیش دەتانکەین بەهاوبەشی خۆمان لەبەروبوومەکەی دا؟ فەرمووی: (باشە) کۆچکارانیش کە بینیان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وا بۆ ئەمەیان موافقە بەیەك دەنگ فەرموویان: (سمِعْنا وأطَعْنا = ئەمەیان زۆر بەجێیە بۆ ئەمەیان بەگوێتان دەکەین).

١٠٢٤- عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا أَكْثَرَ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مُزْدَرَعًا كُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ بِالنَّاحِيَةِ مِنْهَا مُسَمًّى لِسَيِّدِ الأَرْضِ قَالَ: فَمِمَّا يُصَابُ ذَلِكَ وَتَسْلَمُ الأَرْضُ وَمِمَّا يُصَابُ الأَرْضُ وَيَسْلَمُ ذَلِكَ فَنُهِينَا وَأَمَّا الذَّهَبُ وَالْوَرِقُ فَلَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ. (الحديث ٢٣٢٧)(٩١).

رافیعی کوڕی خەدیج (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەدینە ئێمە لەهەمووان زیاتر زەویو زارمان هەبوو، کەدەست بدەن بۆ چاندن، جا جاری واهەبوو زەویمان دەدا بە ملکانە، لەسەر ئەم شێوەیە: پارچەیەکمان لەزەویەکە دیاری دەکردو ئەو پارچەیەمان دادەچاند، بۆ خاوەنی زەویەکە لەباتی ملکانەو، ئەویتریشی بۆ وەرزێرەکە دای دەچاند بۆ خۆی.

(٩١) أخرجه مسلم في البيوع، باب: كراء الأرض بالطعام، رقم: ١٥٤٨.

جا زۆر جاری وا ڕێدەکەوت پارچەیەکیان باشی دەهێناو بەڵام پارچەکەی تر باشی نەدەهێنا جا لەکاتی خەرمان هەڵگرتنو کۆکردنەوەی بەروبووم دا دەبوو بەناکۆکیان، جا لەبەر ئەوە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەهی لێ کردین، هەتا ناخۆشی بەرپا نەبێ، لەو ڕۆژگارەدا نەبوو بوو بەباو کە زەویو زار بەپارە، بەزێڕو زیو بدرێ بەکرێ. (تاج/٢/٣٢٥ف١+٢+ل٣٥٥ف١ز١٦٩).

١٠٢٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ فَكَانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ مِائَةَ وَسْقٍ ثَمَانُونَ وَسْقَ تَمْرٍ وَعِشْرُونَ وَسْقَ شَعِيرٍ فَقَسَمَ عُمَرُ خَيْبَرَ فَخَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ مِنْ الْمَاءِ وَالأَرْضِ أَوْ يُمْضِيَ لَهُنَّ فَمِنْهُنَّ مَنْ اخْتَارَ الأَرْضَ وَمِنْهُنَّ مَنْ اخْتَارَ الْوَسْقَ وَكَانَتْ عَائِشَةُ اخْتَارَتْ الأَرْضَ) (الحديث ٢٣٢٨) [٩٢]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ قەڵای خەیبەری ڕزگارکرد، دایەوە بەدانیشتوانی خەیبەر کەبە نیوەیی بەرهەمی بهێنن چ بەروبووم چ شینایی بەنیوەیی، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو ساڵێ لە دەرامەتی خەیبەر سەد وەسقی دەدا بەهاوسەرەکانی خۆی هەشتای خورماو بیستی جۆ.

جا کاتێ پێشەوا عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) بو بەجێنشینو خەیبەری دابەش کرد، هاوسەرەکانی پێغەمبەری کرد بەسەرپشك، کەیا زەویو ئاو هەڵبگرن، یالەسەر ساڵانەی خۆیان بنو ساڵ بەساڵ چەند تەغاریان موچە بۆ دانراوە ئێستاش وەك جاران هەموو ساڵێ هەمان موچە وەربگرن، ئیتر ئەوەبوو هەندێکیان زەویو ئاویان وەرگرت وەهەندێکی تریان ساڵانەیان هەڵبژارد،

(٩٢) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: المساقاة و المعاملة بجزء من الثمر و الزرع، رقم: ١٥٥١.

عائیشەو حەفسە لەو هاوسەرانە بوون کەپارچەیێ زەوی‌و زاریان هەڵگرتبوو. (تاج/٢ل-٣٥٦-ش/د/ت).

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەنصارییە، لەرۆژی بەدرا لەبەر ئەوەی کە مێرد منداڵ بوو، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) رێگەی پێ نەدا کەبەشداری لەغەزای بەدردا بکا، بەڵام لەرۆژی جەنگی ئوحوددا رێگەی پێ دا لەم جەنگەدا تیرێ بەریکەوت، لەحەفتاو چواری کۆچی دا لەتەمەنی هەشتاو شەشساڵی دا، هەڵی دایەوەو بوو بەتیراوی‌و کوشتی، دەڵێن: ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) تەرمەکەی بەڕێ دەکا، کۆمەلێ ژن بەقیژەو هاوار شوێنی دەکەون ئیبنوعومەر پێیان دەفەرموێ: (وس بن ئەم پیرەمێردە گوناهبار مەکەن، خوێ پیرەمێردێکی ئیختیارە بەرگەی سزای خوای گەورە ناگرێ).

١٠٢٦- عنْ عَمْرٍو رحمه الله تعالى قَالَ: قُلْتُ لِطَاوُسٍ رحمه الله تعالى: لَوْ تَرَكْتَ الْمُخَابَرَةَ فَإِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْهُ؟ قَالَ أَيْ عَمْرُو إِنِّي أُعْطِيهِمْ وَأُغْنِيهِمْ وَإِنَّ أَعْلَمَهُمْ أَخْبَرَنِي يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَنْهَ عَنْهُ وَلَكِنْ قَالَ أَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهِ خَرْجًا مَعْلُومًا) (الحديث ٢٣٣٠، طرفاهُ في: ٢٣٤٢، ٢٦٣٤)[٩٣].

عەمری کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی طاووسم کرد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ): خۆزیا وازت لەبەکرێدانی زەوی بەمڵکانە دەهێنا، چونکە ئەوانە بەقسەی خۆیان دەڵێن: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەیی لەشتی‌وا کردووە؟ طاووس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: زاناترینیان کە ئیبنوعەبباسە (ڕەزای خوایان لێ بێ) هەواڵی داوەپێم: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەیی لێ نەکردووە بەڵام

(٩٣) اخرجه مسلم في البيوع، باب: الأرض تمنح، رقم: ١٥٥٠.

فەرموویەتی: ئەگەر زەوی‌و زارتان بەپیاوەتی بدەن بەبرای ئایینی خۆتان، کەبۆ خۆی دایچێنێ لەوە باشترە کەبە ملکانە پێی بدەن!.
(تاج/٢/٣٥٢ز/١٦٨ف-٢-ش/د/ت/ن).

١٠٢٧- عَنْ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) انَّهُ قَالَ: لَوْلا آخِرُ الْمُسْلِمِينَ مَا فَتَحْتُ قَرْيَةً إلاّ قَسَمْتُهَا بَيْنَ أَهْلِهَا كَمَا قَسَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ (الحديث ٢٣٣٤، أطرافُهُ في: ٣١٢٥، ٤٢٣٥، ٤٢٣٦)[٩٤].

عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەگەر لەبەر بەرژەوەندیی دواییینەی موسوڵمانان نەبێ، کەنەبادا هیچیان بۆ نەمێنێتەوە، دەنا هەر گوندو شارو وڵاتێ ئازاد بکەم، یەکسەر دابەشی دەکەم بەسەر ئەو غەزاکارانەدا کە ئازادی دەکەن، وەك چۆن پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کاتێ قەڵای خەیبەری ئازاد کرد، دابەشی کرد بەسەر ئازادکارەکاندا).

## باسی زەوی بێ خاوەن‌و ئاوەدان کردنەوەی

١٠٢٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ أَعْمَرَ أَرْضًا لَيْسَتْ لأحَدٍ فَهُوَ أَحَقُّ) (الحديث ٢٣٣٥)[٩٥].

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێك زەوییەك ئاوەدان بکاتەوە، کەهی کەسێکی تر نەبێ ئەوە دەبێ بەهی خۆی).
(تاج/٢/٣٥٠ف-ا/ز-١٦٧)

١٠٢٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَجْلَى الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا ظَهَرَ عَلَى خَيْبَرَ أَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا وَكَانَتْ الأرْضُ حِينَ ظَهَرَ عَلَيْهَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ

(٩٤) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٥/٢٨- خاتمة كتاب المزارعة) -المترجم.
(٩٥) قال العلامة العيني: (وهذا الحديث من أفراده، ج/١٢ص١٧٦) المترجم.

(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَلِلْمُسْلِمِينَ وَأَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا فَسَأَلَتِ الْيَهُودُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لِيُقِرَّهُمْ بِهَا أَنْ يَكفُوا عَمَلَهَا وَلَهُمْ نِصفُ الثَّمَرِ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (نُقِرُكُمْ بِهَا عَلَى ذَلِكَ مَا شِئْنَا). فقرُّوا بِهَا حَتَّى أَجْلاهُمْ عُمَرُ إِلَى تَيْمَاءَ وَأَرِيحَاءَ) (الحديث ٢٣٣٨) [٩٦].

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، جولەکەو گاورەکانی لەحیجاز وەدەرناو خاکی حیجازی پێ چۆڵ کردن، هۆی ڕەوایی ئەم کارەی عومەریش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم داستانە: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ سەرکەوت بەسەر قەڵای خەیبەردا، ویستی بەجولەکەکانی چۆڵ بکا، چونکە بەئازادکردنی خەیبەر، لەلایەنی سوپای ئیسلامەوە، خاكو زەوی خەیبەر هەمووی بوو بەهی خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان، لەهی ناموسوڵمان دەرچوو، جا کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ویستی خەیبەر بەجوولەکەکان چۆڵ بکا، جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کرد: کەلەوێ بیانهێڵێ، هەتا زەویو زارەکەی بەرهەم بهێنن، بەمەرجێ جوولەکەکان کارەکان ئەنجام بدەنو کارو ئیشو فەرمانی بەرهەمهێنان لەسەر ئەوان بێ بەڵام بەروبومەکەی بەنیوەیی بێ: نیوەی بۆ موسوڵمانانو نیوەی بۆ جوولەکەکان. پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە لەسەر ئەمە ڕێدەکەوینو مافی مانەوەتان پێ دەدەین، هەتا خۆمان ئارەزومان هەبێ!!) ئیتر ئەوانیش بەمە ڕازی بوونو لەوێ مانەوە هەتا ئەو سەردەمەی عومەر ئەوێی پێ چۆڵ کردنو ڕەهەنەی کردن بۆ تەیماو ئەریحا.

١٠٣٠- عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ بْنِ رَافِعٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنْ عَمِّهِ ظُهَيْرِ بْنِ رَافِعٍ قَالَ ظُهَيْرٌ لَقَدْ نَهَانَا رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) عَنْ أَمْرٍ كَانَ بِنَا رَافِقًا

(٩٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: المساقاة والمعاملة بجزء، رقم: ١٥٥١.

قُلْتُ مَا قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَهُوَ حَقٌّ. قَالَ: دَعَانِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا تَصْنَعُونَ بِمَحَاقِلِكُمْ؟) قُلْتُ: نُؤَاجِرُهَا عَلَى الرُّبُعِ وَعَلَى الأَوْسُقِ مِنْ التَّمْرِ وَالشَّعِيرِ قَالَ: (لا تَفْعَلُوا ازْرَعُوهَا أَوْ أَزْرِعُوهَا أَوْ أَمْسِكُوهَا) قَالَ رَافِعٌ: قُلْتُ: سَمْعًا وَطَاعَةً) (الحديث ٢٣٣٩، أطرافه في: ٢٣٤٦,٤٠١٢) [٩٧].

رافیعی کوڕی خەدیج ی کوڕی رافیع (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مامەم ظوهەیری کوڕی رافیع (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەراستی دا سەرەنجام پێغەمبەر لەسەر شێوەیەکی روونو ئاشکرا نەیی لێ کردین لەکارێ لەبار بوو بۆمان. منیش گوتم: هەرچی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بیفەرموێ:

• رەوایەو راستەو دروستە. فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بانگی کردمو فەرمووی: (زەویو زارەکانتان چۆن چۆنی بەرهەم دەهێنن؟) عەرزیم کرد: دەیدەین بەکرێ، بە چواریەکی داهاتەکەیو بەچەند تەغارێکی ناوبراو لەخورماو جۆ، فەرمووی: (وامەکەن، بەڵکوو خۆتان بۆ خۆتان دایچێنن یابەپیاوەتی بیدەن بەکەسێ بۆ خۆی دایچێنێ، یا بەبەیاری بیهێڵنەوە!).

## راڤەو شیکردنەوە:

یەکەم: زەوی دان بەمڵکانە راجیاییەکی زۆری واتیا بەڵام کورتو پوخت: (شتیوا دروستە بەمەرجێ سەرنەکێشێ بۆ کێشەو بەرەلەنێوانی خاوەنی زەویەکەو وەرزێرو ئاودێرەکانو کشتیارەکان دا).

دووەم: ظوهەیری کوڕی رافیع (رەزای خوای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، مامەی رافیعی کوڕی خەدیجە، کەلەکۆتایی فەرموودەی ژمارە ١٠٢٥ دا ژیاننامەکەی

---

(٩٧) قال العيني: أخرجه مسلم في البيوع عن اسحق بن منصور (عمدة القاري ج/١٢ص ١٨١) - المترجم.

رابوورد. ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە، لەم پەیمانەدا پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەردا بەست عەسقەلانی لەئیصابەدا دەفەرموێ: ئامادەی جەنگی بەدر بووە، کەواتە بەدرییە، بەڵام لەئیستیعابا ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: (ئامادەی بەدر نەبووە بەڵام ئامادەی جەنگی ئوحودو شەڕگەو جەنگەکانی تری پێغەمبەر بووە، کەلەپاش ئوحود رویان داوە) لەسەر فەرمایشتی موقەدیمەی فەتحولبارییەك فەرموودەی لەصەحیحی بوخاری پیرۆزدا هەیە، دیارە کەئەویش ئەم فەرموودەیەی ئێرەیەتی (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ).

١٠٣١- عَنْ نَافِعٍ رحمه الله تعالى أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) كَانَ يُكْرِي مَزَارِعَهُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَصَدْرًا مِنْ إِمَارَةِ مُعَاوِيَةَ ثُمَّ حُدِّثَ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ فَذَهَبَ ابْنُ عُمَرَ إِلَى رَافِعٍ فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَسَأَلَهُ فَقَالَ نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَدْ عَلِمْتَ أَنَّا كُنَّا نُكْرِي مَزَارِعَنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا عَلَى الأَرْبِعَاءِ وَبِشَيْءٍ مِنْ التِّبْنِ) (الحديث٢٣٤٣، طرفه في: ٢٣٤٥، والحديث: ٢٣٤٤) (٩٨).

نافیع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران ئیبنوعومەر (رەزای خوایان لێ بێ) لەسەردەمی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان دا(رەزای خوایان لێ بێ) جاران ئیبنوعومەر(رەزای خوای لێ بێ) لەسەردەمی ئەم زاتانەدا، هەتا سەرەتای فەرمانڕەوایی موعاویەیش، لەم ماوەیەدا زەوی‌و زاری خۆی دەدا بەکرێ، بەڵام کە فەرموودەکەی رافیعی کوڕی خەدیجی ژنەوت، کەلەپێشەوە: ژمارە١٠٢٤و ١٠٣٠ دا رابوورد، کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نەهیی کردووە لەبەکرێدانی زەوی‌و زار، کاتێ ئەم فەرموودەی پێ گەیشت ئیبنوعومەر خۆی

(٩٨) اخرجه مسلم في البيوع، باب: كراء الأرض، رقم: ١٥٤٧

چوو بۆلای رافیع بۆ دڵنیا بوون لەکارەکە، منیش لەخزمەتی دا چووم کەلێم پرسی رافیع فەرمووی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێشگیری (نەیی) کردوە لەبەکرێدانی زەوی‌و زار).

ئیبنوعومەر فەرمووی: (ئەوەی من دەیزانم جاران زەوی‌و زارمان لەسەردەمی پێغەمبەردا دەدا بەکرێ لەسەر ئەم شێوەیە: ئەوەی لەسەر ماکاو وجۆگەلەکانە بۆ خاوەن زەوییەکە لەگەڵ هەندێ کا، لەباتی مڵکانە) (تاج/٢/٣٥٣/-٤ز -١٦٨)

١٠٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَوْمًا يُحَدِّثُ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ: (أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ فَقَالَ لَهُ: أَلَسْتَ فِيمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلَى وَلَكِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَزْرَعَ قَالَ فَبَذَرَ فَبَادَرَ الطَّرْفَ نَبَاتُهُ وَاسْتِوَاؤُهُ وَاسْتِحْصَادُهُ فَكَانَ أَمْثَالَ الْجِبَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ دُونَكَ يَا ابْنَ آدَمَ فَإِنَّهُ لا يُشْبِعُكَ شَيْءٌ فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: وَاللَّهِ لا تَجِدُهُ إِلاَّ قُرَشِيًّا أَوْ أَنْصَارِيًّا فَإِنَّهُمْ أَصْحَابُ زَرْعٍ وَأَمَّا نَحْنُ فَلَسْنَا بِأَصْحَابِ زَرْعٍ فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث٢٣٤٨، طرافاهُ في: ٢٥١٩)[99].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رۆژێکیان فەرمایشتی دەفەرموو، پیاوێکی دەشتەکیش لەخزمەتی دا بوو، فەرمووی: لەبەهشتا پیاوێ لەخودا داوا دەکا کەرێگەی پێ بدا، کەکشتوکاڵ بکا، خودایش پێی دەفەرموێ: لەچیت کەمە واحەز لەچاندن دەکەیت؟ ئەویش دەڵێ: لەهیچم کەم نییە، ئەوەی پێم خۆش بێ هەمە، بەلام وەك خولیایێ مەراقم پەرپووەتە سەر ئەوە کە کشتوکاڵ بکەم! جا خودا رێگەی پێ دەدا گورج تۆوْ دەوەشێنێ، بەچاوتروکانێ سەوزدەبێ‌و نێر دەبێ‌و راست دەبێتەوەو پێ دەگاو وەختی دروێنەی دێ‌و دەدوورێتەوە، وەك کێو کۆمەڵ کۆمەڵ خڕ هەڵ

(٩٩) لم يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (خاتمة كتاب المزارعة) ج/٥/ص٢٨) المترجم.

دەدرێ‌و دەبێ بەشاراو خەرمان‌و جوخێن‌و شتی‌وا، خوای گەورە لەڕووی نازگرتنەوە پێی دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزادی چاوبرسی! بەهیچ تێر ناخۆی، دەها ئەمیش هەمووی بۆ تۆ! عارەبە دەشتەکیەکەش قسەیەکی خۆشی کرد، فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەو خودایە ببێ‌و نەبێ ئەو پیاوە کشتیارە لەخۆتانە، لەئێمە نییە، یا قوڕەیشییە یان ئەنصارییە، چونکە ئەوان فەلان‌و فێری کشتوکاڵن، بەڵام ئێمە فێری ئەوە نین، ئێمە چێودارین، خاوەن ئاژەڵین‌و بەدوای لەوەڕدا دەگەڕێین! لەبەر ئەوە پێمان ناکرێ بەدیار کشتوکاڵەوە ببەسترێینەوە، خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) لەخۆشی ئەم حاڵەتەو ئەم قسە نەستەقە خۆشە پێکەنی. (تاج/١٠ل-٤٥١ز-١٤١).

## پایانی = خاتمة

مامۆستا شێخ ئیبنوحەجەری عەسقەلانی (سۆزو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) دەفەرموێ: نامەی کێڵان‌و زەوی‌و زارو پێوە بەسراوەکانی، وەك: بابەتی ئاوەدان کردنەوەی زەوی بێ خاوەن، کەپێی دەگوترێ: (ئاوەدانکردنەوەی وێرانە =إِحيَاءُ المَواتِ) دەفەرموێ: ئەم نامەیەو پاشکۆکانی چل فەرموودەی بەرزەوەکراوی واتیادا، نۆیان بێ ڕشتەن ئەوانی تریان پەیوەستن، دووبارەکانیان بیست‌و دوو فەرموودەن، پاڵفتەکەیان دەکاتە (٤٠-٢٢=١٨) هەژدە فەرموودە لەم هەژدەیە چواردەیان لەتەجریدەکەیدا هاتووە، لە (١٠١٩) ەوە، هەتا (١٠٣٢)، چونکە (١٠٣٢-١٠١٨=١٤). هەروا دەفەرموێ: پێشەوا موسلیمیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) هەموویانی دەرهێناوە بێجگە لەمانەیان:

١- فەرموودەکەی ئەبوئومامە (١٠٢٠ت=٢٣٢١فتح).

٢- فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە، سەبارەت بەدابەشکردنی ماڵەکانیان (١٠٢٣ت = ٢٣٢٥فتح). بەڵام عەینی دەفەرموێ: موسلیم لەنامەی البیوع دا دەری هێناوە، بڕوانە: ژمارە (١٠٢٣ت).

٣- فەرمووده‌کەی عومەر(١٠٢٧ت = ٢٣٣٤ف)
٤- بێڕشتەکەی عەمری کوڕی عەوف لەتەجریدەکەدا نییە، والەپێش ژمارە: ٢٣٣٥.
٥- بێڕشتەکەی جابیر وا لە دوا بێڕشتەکەی عەمری کوڕی عەوفەوە.
٦- فەرمووده‌کەی عائیشە (١٠٢٨ت = ٢٣٣٥ف).
٧- فەرمووده‌کەی تۆوکردن لەبەهەشت دا (١٠٣٢ت = ٢٣٤٨ف).

هەروا مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: سیو نۆ ئەثەری هاوڕێیانو پەیڕەوانی واتیادا. خودا بۆ خۆی لەهەموو کەسێ باشتر دەزانێ.
(بۆ زیادە بەهرە بڕوانە فیقهی ئاسان بەرگی /٢/لاپەڕە/٥٣٢ز-٢٣١)

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٤٧- نامەی باخەوانی(مساقات)و شت خواردنەو خێری ئاوو بیرو شتی تری لەم بابەتە (كتاب المساقاةِ (الشُّربْ)

(بڕ: فیقهی ئاسان/٢/٥٢٢ز ٢٢٨. بۆ تێگەیشتی تەواو لەم باسە) +(تاج ٢ل /٣٥٦ز/ ١٧٠)

١٠٣٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَدَحٍ فَشَرِبَ مِنْهُ وَعَنْ يَمِينِهِ غُلامٌ أَصْغَرُ الْقَوْمِ وَالأَشْيَاخُ عَنْ يَسَارِهِ فَقَالَ يَا غُلامُ أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَهُ الأَشْيَاخَ قَالَ مَا كُنْتُ لأُوثِرَ بِفَضْلِي مِنْكَ أَحَدًا يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ). (الحديث ٢٣٥١، أطرافُهُ في: ٢٣٦٦، ٢٤٥١، ٢٦٠٥، ٢٦٢٠)[١٠٠].

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) بووین،جامێ خواردنەوەیان هێنا بۆ

(١٠٠) اخرجه مسلم في الأشربة، باب: استحباب إدارة الماء.. عن يمين، رقم: ٢٠٣٠.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) خۆی لێی خواردەوە، لەلای راستیەوە کوڕێکی لاوی لێ بوو لەلای چەپیشیەوە پیرەکان دانیشتبوون، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەکوڕە لاوەکەی فەرموو: (ئایا رازی دەبیت کە خواردنەوەکە لەپێش تۆدا بدەم بەم پیرانە؟) کوڕەکەش ئیبنوعەبباس بوو گووتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! بەشی خۆم لەبەر ماوەی پیرۆزی تۆ بەکەس نادەم، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) جامەکەی دایە دەستی. (ریاض/٢/٢/٥٧٠ز — ٦٦٣ف-٢).

١٠٣٤– عَنْ الزُّهْرِيِّ رحمه الله تعالى قَالَ حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهَا حُلِبَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَاةٌ دَاجِنٌ وَهِيَ فِي دَارِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ وَشِيبَ لَبَنُهَا بِمَاءٍ مِنْ الْبِئْرِ الَّتِي فِي دَارِ أَنَسٍ فَأَعْطَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْقَدَحَ فَشَرِبَ مِنْهُ حَتَّى إِذَا نَزَعَ الْقَدَحَ مِنْ فِيهِ وَعَلَى يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ عُمَرُ وَخَافَ أَنْ يُعْطِيَهُ الأَعْرَابِيَّ أَعْطِ أَبَا بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ عِنْدَكَ فَأَعْطَاهُ الأَعْرَابِيَّ الَّذِي عَلَى يَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ) (الحديث ٢٣٥٢، أطرافُهُ في: ٢٥٧١، ٥٦١٢، ٥٦١٩) [(١٠١)].

زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەنەسی کوڕی مالیک(رەزای خوای لێ بێ) فەرمایشتی گێڕایەوە بۆم فەرمووی: جارێ خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) لە ماڵی من میوان بوو، شیری ئاژەڵێکی وردەی ماڵیان دۆشی بۆی، بەئاو شکاندیانەوە بەئاوی بیرەکەی خانوەکەی من کەمێ ترنگیان کردەوە، جامە شیرەکەیان بردە خزمەت پێغەمبەر لێی خواردەوە، لەوکاتەدا عارەبێکی دەشتەکی لەلای راستی پێغەمبەرەوە بوو، وەئەبوبەکریش لەلای چەپیەوە بوو.

(١٠١) أخرجه مسلم في الأشربة، باب: استحباب إدارة الماء.. عن يمين، رقم: ٢٠٢٩.

جا كاتێك پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) جامەكەی لەدەمی دوورخستەوە، عومەر لەبەر ئەوەی، كەمەترسی ئەوەی هەبوو، جامەكەی بدا بەئەعرابیەكەو نەیدا بە ئەبوبەكر، فەرمووی: قوربان! بفەرموو جامەكە بدە بە ئەبوبەكر، كەوا لەلاتا، بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) جامەكەی دا بەعەرەبە دەشتەكیەكە، كەلەلای راستیەوە بوو، وە فەرمووی: (لای راست لەپێشترە، كەواتە دەبێ جامەكە بەلای راستدا بگێڕدرێ) (ریاض/٢ف-٥٦٩+ف-٧٦٠). بڕوانە: تاج/٤ل-٥٧ باسی نەریت ودەستووری شت خواردنەوە زنجیرەی ١٧ بەتایبەتی فەرموودەی ژمارە: ١٤(فیقهی ئاسان/٢/٥٢٢ز-٢٢٨).

## راڤەو روونكردنەوە:

١-ئیمامی زوهری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ناوی پێشەوا ئەبوبەكر موحەممەدی كوڕی موسلیم ە، نازناوی زوهرییە، ناوداریشە بە ئیبنو شەهاب، لەتابیعییە بچكۆڵەكانە، فەرموودەی لە ئیمامی ئەنەس و ڕەبیعی كوڕی عبادو هاوەڵانی ترەوە وەرگرتووە، ئیبنو عومەری بینیوەو بەخزمەتی گەیشتووە، وەفەرموودەی لەویشەوە گێڕاوەتەوە، هەندێ دەفەرموون: تەنیا دوو فەرموودەی لە ئیبنوعومەر وەرگرتووە. فەرموودە زانێكی ناودارە لەریجالی صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیمە، ئیمامی موسلیم (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لە صەحیحی موسلیم دا، لەپەسنی جوانی ئیمامی زوهریدا بەدەق دەفەرموێ: (.. لمثلِ الزّهري في جلالتِهِ وكثرَةُ أَصحابِهِ الحُفّاظُ المُتقِنين لحَديثِهِ...) كەمەبەست لەم فەرمایشتەی ئیمامی موسلیم ئەمەیە: (ئیمامی زوهری پێشەوایەكی فەرموودەزانی شكۆمەند بووە، كۆمەلێ فەرموودەزانی شارەزای پسپۆڕی زەین رۆشنی هەبووە، كەهەمیشە لەخزمەتی دا بوون و فەرموودەكانی ئەویان زۆر بەباشی لەبەركردووە). یەكێ لەفەقێكانی زوهری پێشەوا عومەری كوڕی عەبدولعەزیزبوو لەجێنشینە هەقناسە

هەقیبەروەرەكان، كە پێش ئەوەی ببێ بەجێنشین ئیمامی ئەنەس نوێژی لەپشتیەوە دەكرد، كاتێ دەمرێ هەندێ پارچە نینۆك و مووی پێغەمبەری(دروودی خوای لەسەر بێ) هەبوو، رایسپارد كەلەناو كفنەكەی دا دایبنێن و لەناوی دا بینێژن...

١٠٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ الْكَلأُ) (الحديث ٢٣٥٣، طرفاهُ في: ٢٣٥٤، ٦٩٦٢)[١٠٢].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئاوی زیادە قەدەغە مەكەن، هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بكەن). (تاج/٢/ل-٣٦٥ف-١/ز-١٧٤).

## راڤەو شیكردنەوە:

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: وەك ئەوە كەسێ لەدەشت یالەشوێنێ، بیرێكی هەبێ، وەئاوی بیرەكە لەخۆی زیادبێ، وەلەنزیكی ئەو بیرەوە لەوەڕ هەبێ، جا ئەگەر خاوەن بیرەكە، ئاوی زیادەی بیرەكەی قەدەغە بكا لەڕان و گایەل و مالات و ئاژەڵ، ئیتر لەبەر بێ ئاوی كەس ئاژەڵ و مالات نالەوەڕێنێ لەو لەوەڕگایە!

١٠٣٥-(مكرر) وعَنْهُ في روايةٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ فَضْلَ الْكَلإِ) (الحديث ٢٣٥٤). وەرگەڕاوەكەی لەپێشەوە رابوورد.

١٠٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ

(١٠٢) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: تحريم بيع فضل الماء الذي يكون بالفلاة، رقم: ١٥٦٦.

هُوَ عَلَيْهَا فَاجِرٌ لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ). فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ الآيَةَ. فَجَاءَ الأَشْعَثُ فَقَالَ مَا حَدَّثَكُمْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ فِيَّ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ كَانَتْ لِي بِئْرٌ فِي أَرْضِ ابْنِ عَمٍّ لِي فَقَالَ لِي: شُهُودَكَ قُلْتُ: مَا لِي شُهُودٌ قَالَ: (فَيَمِينُهُ) قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِذًا يَحْلِفَ فَذَكَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذَا الْحَدِيثَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ ذَلِكَ تَصْدِيقًا لَهُ. (الحديث ٢٣٥٦، أطرافُـــهُ في: ٢٤١٦، ٢٥١٥، ٢٦٦٦، ٢٦٦٩، ٢٦٧٣، ٢٦٧٦، ٤٥٤٩، ٦٦٥٩، ٦٦٧٦، ٧١٨٣، ٧٤٤٥) و (الحديث ٢٣٥٧، أطرافُهُ في: ٢٤١٧، ٢٥١٦، ٢٦٦٧، ٢٦٧٠، ٢٦٧٧، ٧١٨٤)[١٠٣].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ بەناهەق سوێند بخوا، هەتا بەو سوێنە ناڕەوایە ماڵی کەسێکی تر ببچڕێنێ بۆ خۆی، ئەوە کاتێ دەچێتە دیوانی خودا لەرۆژی زینەوەدا، خودای گەورە زۆر توڕەیە لێی). جا خودا بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئالی عیمران -٣/٧٧-.

واتە: (ئەو کەسانەی کەپەیمانی خوداو سوێندی خۆیان دەفرۆشن بەبەهایەکی کەمی دنیایی دەیانگۆڕنەوە، ئەوانە لەرۆژی پاشەڕۆژدا، بێ بەش و بارەن لەهەموو خۆشیەکی قیامەت، وەخودای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکا، بەچاوی میهرو رەحمەتیشەوە تەماشایان ناکات، وەڕووی خۆشیان ناداتێ و پاکیان ناکاتەوەو تاریفیان ناکا، سەرەڕای ئەوەیش سزای سەختیان بۆ ئامادەکراوە).

---

(١٠٣) اخرجه مسلم في الإيمان، باب: وعيد من اقتطع حقّ مسلم بيمين فاجرة، رقم: ١٣٨

جا ئەشعەثی کوڕی قەیس هات گوتی: (ئەوە باوکی عەبدوڕەحمان — واتە: ئیبنو مەسعود -چیان بۆ باس دەفەرمویٚ؟ ئەم ئایەتە پیرۆزە، هۆی هاتنی من بووم، داستانەکە ئاوابوو: بیریٚکم هەبوو، لەزەوی ئامۆزایەکما بوو ئامۆزاکەم حاشای لیٚ کرد، بۆ داداگایی بردم بۆ خزمەتی پیٚغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بیٚ) فەرمووی: (کوا شایەتەکانت ئامادەیان بکە) گوتم: شایەتم نییە، فەرمووی: (دە سویٚندی بدە) عەرزیم کرد: قوربان! سویٚند دەخوات دەربەستی سویٚند نایێ، ئیتر پیٚغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بیٚ) ئەم فەرموودەیەی فەرموو. لەپاشاش خوای گەورە بۆ پشتیوانی فەرموودەکەی پیٚغەمبەر ئایەتەکەی نارد).

## راڤەو روونکردنەوە:

١- بەپیٚی بنەمای (الحديثُ يفسِّرُ بعضُهُ بعضاً) بۆ وەرگیٚڕانەکە بەهرە لەگیٚڕانەوەو ئەطرافەکانی فەرموودەکان وەردەگیریٚ. بۆ نموونە لەطەرەفی ژمارە (٢٥١٥) دا، ئەشعەث، سەبارەت بەمتمانە کردن بەسویٚندو قسەی ئامۆزاکەی، سەبارەت بەم بابەتە عەرزی پیٚغەمبەر دەکا: (إذاً يحلِفُ ولايُبالي) بەلاّم لەگیٚڕانەوەی ئیٚرەدا هۆی سویٚنخواردنەکەی روون نەکراوەتەوە.

٢- ئەشعەثی کوڕی قەیس لەهۆزی کیندییە، کەسناوی باوکی موحەممەدە، (أبو محمد) ، لەسالّی دەی کۆچیدا لەگەلّ شاندیٚکی حەفتا کەسیدا، لەهۆزی کیندە هاتن بۆ خزمەتی پیٚغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بیٚ) کە ئەو سەرۆکیان بوو، ئیسلام بوونی خۆیان راگەیاند، یەکیٚ بوو لەپادشاکانی کیندە، لەپاش دەرچوونی حەزرەت لەجیهان لەگەلّ زۆر کەس لەهۆزی کیندە لەئیسلام پاشگەزبوونەوە، بەدیلی هیٚنایان بۆلای ئەبوبەکر، داوای لیٚ کرد کەنەیکوژیٚ، وەسوودی لیٚ وەربگریٚ لەشەڕەکانی ئاییندەی دا، هەروەها داوای

لەئەبوبەکر کرد کەخوشکێکی خۆی لێ مارەبکا، ئەبوبەکریش بەگوێی کردو فەروەی کچی ئەبوقوحافەشی لێ مارەکرد، جارێ جەریرو ئەشعەث ئامادەی سەرتەرمێ بوون، ئەشعەث جەریری پێش خۆی خست، وتی: چونکە من پاشگەزبوومەوە، بەڵام تۆ پاشگەز نەبوویتەوە.

لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عەلی بەچل شەو مردوە، حەسەنی کوڕی عەلی نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەبوخاری پیرۆزدا یەك فەرموودەی هەیە – رەزاو رەحمەتی خودای لەسەر بێ-.

١٠٣٧- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (ثَلاثَةٌ لاَ يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ رَجُلٌ كَانَ لَهُ فَضْلُ مَاءٍ بِالطَّرِيقِ فَمَنَعَهُ مِنْ ابْنِ السَّبِيلِ وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لا يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا سَخِطَ وَرَجُلٌ أَقَامَ سِلْعَتَهُ بَعْدَ الْعَصْرِ فَقَالَ وَاللَّهِ الَّذِي لا إِلَهَ غَيْرُهُ لَقَدْ أَعْطَيْتُ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ رَجُلٌ) ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾. (الحديث ٢٣٥٨، أطرافُهُ في: ٢٣٦٩، ٢٦٧٢، ٧٢١٢، ٧٤٤٦) [١٠٤].

(بڕوانە: ریاض/٤ل-١٣٢٨ف-٢٨).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتا ئەم سێ جۆرە کەسە خودای گەورە نەبەچاوی رەحمەت تەماشایان دەکا، نەلەتاوان پاکیان دەکاتەوە، سەرەڕای ئەوەش سزایەکی بەسۆیان بۆ ئامادەکراوە: پیاوێ کەزیادە ئاوی هەبێو لەسەرە ڕێ بێو لەرێبواری قەدەغەبکا، پیاوێکیش پەیمان بدا بەپێشەواو سەیری بەرژەوەندی دنیایی خۆی بکا، ئەگەر پێشەوا بەشی دا ئەویش بەگوێی بکا، ئەگەر پێشەواکەی بەشی نەدا ئەویش ناڕازی بێو بەگوێی نەکا، پیاوێکیش

(١٠٤) اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان غلظ تحريم اسبال الإزار، رقم: ١٠٧.

کەلەپاش عەصر، کاتی بازاڕداخستن‌و دوکان هەڵگرتن‌و بەرزەوەبوونی فریشتەکانە، لەگەڵ کردەوەی ڕۆژی بەندەدا، کەچی ئەو لەو کاتە ناسك‌و پیرۆزەدا، لەسەر مامەڵەو سەودا، بۆ تەفرەدانی کڕیار سوێندی درۆ بخوات، وەك: ئەوە بڵێت: بەوتاقە خودایە، کەبێجگە لەخۆی خودای تر نییە، لەپێش تۆدا ئەوەندەو ئەوەندەیان داوە پێم نەمداوە، گەلێ زیاتر لەو نرخەی تۆ دەیدەی بەمن، پیاوێکیش بڕوا بەدرۆکەی بکاو شتەکەی بەو نرخە درۆیە لێ بکڕێ) لەپاشا ئەم ئایەتەی خوێندەوە بۆ پشتیوانی فەرموودەکە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ ڕاڤەکەی لەژمارە (١٠٣٦) دا ڕابوورد.(تاج/٢/٣٦٥-٢-ش/د/ت/ن).

١٠٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بَيْنَا رَجُلٌ يَمْشِي فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَنَزَلَ بِئْرًا فَشَرِبَ مِنْهَا ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا هُوَ بِكَلْبٍ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنْ الْعَطَشِ فَقَالَ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا مِثْلُ الَّذِي بَلَغَ بِي فَمَلأَ خُفَّهُ ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ ثُمَّ رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْرًا؟ قَالَ: (فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ). (الحديث٢٣٦٣) (١٠٥).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ لەچۆلێ بەڕێگایەکدا دەڕۆی، تونێتی زۆری بۆ هێنا، تابیرێکی دۆزیەوەو چووەناوی‌و تێر ئاوی خواردەوە، کاتێ هاتەدەرەوە ڕوانی واسەگێ لەتوونیانا وا زمانی دەرکێشاوەو هاسکە هاسکیەتی‌و، لەتاوا تەڕایی دەوری بیرەکە دەلێسێتەوە، جا پیاوەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەم سەگەیش لەتوونیانا وەکو منی بەسەر هاتووە! جادیسانەوە ڕۆیشتەوە خوارەوە بۆ ناو بیرەکەو کاڵە (خوففە) کەی پێی داکەندو پڕی کرد لەئاوو،

(١٠٥) اخرجه مسلم في السلام، باب: فضل ساقي البهائم المحترمة واطعامها، رقم: ٢٢٤٤

گرتـی بەدەمیـەوە بـەدیواری بیرەکـەدا هەڵزنییـەوە سـەرکەوتەوە سـەریٚو سەگەکەی ئاودا، جا خوا لەسەر ئەوە سوپاسی کردو تۆڵەی بۆ کردەوەو لـێی خۆش بوو!).

هـاوەڵان عـەرزیان کـرد: قوربـان! ئـەی رەوانـەکراوی خـودا! دیـارە هەرچـاکەیێ لەگـەڵ گیانلەبـەری بێزمانـا بکـەین خێـرو پاداشـی هەیـە؟ فەرمووی: (بەڵێ وایە، هەرچاکەیێ لەگەڵ هەرشتێ بکرێ، کەتـەڕایی ژیانی تیابێ، خێرێکی گەورەیە).(تاج/٢/٣٦٨-٣-ش).

١٠٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَذُودَنَّ رِجَالاً عَنْ حَوْضِي كَمَا تُذَادُ الْغَرِيبَةُ مِنْ الإِبِلِ عَـنْ الْحَوْضِ) (الحديث ٢٣٦٧) [(١٠٦)].

ئـەبوهورەیرە(رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست(درودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (سوێندم بـەو کەسـە کە گیـانی منـی بەدەسـە، لـەڕۆژی قیامەتـدا، کەدادەنیشم بۆ پێشوازی لەدێنیکەرانی نەتـەوەی ئیسلامم، کە دێـن بـۆ سـەر حـەوزی کـەوثـەرم، بەدەسـتی خـۆم، لەهەنـدێ پیـاو گـورێ گـورێ دەکـەمو لەحەوزی کەوثەرم دووریان دەخەمەوە، هەروەك چۆن وشـتری نـامۆو ئـاوەکی گورێ گورێی لـێ دەکرێو رێگەی ئاوخواردنەوەیان پێنادرێ).

(باسـی حـەوزی کـەوثـەر لـەتاجا وا لەبـەرگی دەدا، لەلاپـەڕە (٣٧٩) ەوە، دەسـت پـێ دەکـا، هـەتا لاپـەڕە (٣٨٨) کەبریتییـە لـەزنجیرە(١٢٦) هـەتا زنجیرە(١٢٨) ) بڕوانە (ریاض/٤ل-١٣٥٦ف-٥٣).

١٠٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: (ثَلاثَـةٌ لا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ رَجُلٌ حَلَفَ عَلَى سِلْعَةٍ لَقَدْ أَعْطَى بِهَا أَكْثَـرَ مِمَّا أَعْطَى وَهُوَ كَاذِبٌ وَرَجُلٌ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ لِيَقْتَطِـعَ بِهَـا مَـالَ

---

(١٠٦) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: إثبات حوض النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) .. رقم: ٢٣٠٢.

امْرِئٍ مُسْلِمٍ وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مَاءٍ فَيَقُولُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْيَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلِي كَمَا مَنَعْتَ فَضْلَ مَا لَمْ تَعْمَلْ يَدَاكَ). (الحديث ٢٣٦٩) (١٠٧).

**دیسان ئەبوهورەیرە**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم سێ جۆرە کەسە لە قیامەتدا، خودا نەلەڕووی نازەوە قسەیان لەگەڵ دەکا، نەبەچاوی رەحمەت تەماشایان دەکا، پیاوێ بەسوێندی درۆ کاڵاو شمەکی فرۆتەنی خۆی ساغ بکاتەوە، وەك ئەوە سوێند بخوات کە ئەوشتە کڕیاری تر ئەوەندەی داوەپێم،زیاد لەوەی کەپێی دراوە، پیاوێکیش لەپاش عەصر بەسوێندی درۆ ماڵی پیاوێکی موسوڵمان بپچڕێ بۆ خۆی، پیاوێکیش زیادە ئاوی هەبێ لەکەسێ پێویستی پێی هەبێ، قەدەغەی بکات، خوای گەورە لەکاتی لێپرسینەوەدا پێی دەفەرموێ: (ئەمرۆ من فەضلو بەهرەی خۆمت لێ قەدەغە دەکەم، هەر وەکوو تۆ فەضلو بەهرەی ئەو زیادە ئاومت لەئاتاجان قەدەغە کرد، لەکاتێکا ئەو ئاوو زیادە ئاوە تۆ دروستت نەکردبوو، رزقی خوا بوو رەخساندبوی بۆت).

## راڤەو روونکردنەوە:

لەمەدا جیاوازی پیاوو ژن نییە، هەروا ئەو دیعایەو پڕو پاگەندانەش کە لە رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن دا، بۆ برەودان بەکاڵایێ دەکرێ بەر هەڕەشەی ئەم فەرموودەیە دەکەوێ. (بڕوانە ژمارە ١٠٣٧).

١٠٤١- عن الصَّعْبَ بْنَ جَثَّامَةَ قَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لاَ حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ ) (الحديث ٢٣٧٠، طرفُهُ في: ٣٠١٢) (١٠٨).

---

(١٠٧) لاحظ هامش الرقم: ١٠٣٧ — المترجم.

(١٠٨) قال العسقلانيُ: لمْ يوافقهُ مسلمٌ على تخريجِ حديث الصعب في الحمى (فتح/٥ص٥٢) - المترجم.

**صەعبی کوڕی جەثثامە**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست**(درودی خوای لەسەر بێ) **فـەرمووی: (پاکـژو پاوەنـد بـەس بـۆ خـوداو پێغەمبـەری خـودا هەیـە). (تاج/٢/٣٥٠ ص٢٢٢ف٢).**

## راڤەو روونکردنەوە:

**١- مەبەست لە پاکژو پاوان پارچەیێ زەوی لەوەڕاوییە، کەسێ، یا دێیـەك، دەیکـەن بەپاکـژ، نـابێ کـەس ران‌و گایەلـێ تیـادا بلـەوەڕێنێ، مەگـەر بـەپێی یاسـاو رێـسایەك، کـە خۆیـان لـەناو خۆیانـا لەسـەری رێـك کـەوتوون، وەك ئـەوە لـەوەڕی پـێ دەشـتەکان بـۆ هـاوین‌و لـەوەڕی شاخەکان بـۆ زسـتان کەلەوەڕ کز دەبێ.**

**٢- مەبەسـت لـەم فەرموودەیـە ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **لەژیانی خۆیداو جێنـشینی ئـەو لـەپاش ژیـانی ئـەو مـافی ئـەوەیان هەیـە کـە پارچـەیێ زەوی بکـەن بـەپاوان بـۆ مەبەستێـکی رەوا، بەنموونـە: بگـوترێ: لەوەڕی گۆیژە قەدەغەیە لەسەر ئاژەڵی زەکاتی میری!**

**٣- صـەعبی کـوڕی جـەثثامـە، لـەوەددان، نیـشتەجێ بـوو، کـە لـەوڵاتی حیجازە، دایکی ناوی فاخیتەی خوشکی ئەبوسفیانی کوڕی حەربـە، ئامـادەی ئازادکردنی وڵاتی ئیصطەخـر بـووە، دەڵـێن: لـەپاش ئـازادکردنی ئیـصطەخـر جارچـی جـاڕدەدا، کـەوا جـەجالْ هەڵـساوە، کەدەگـەن بەصـەعب**(ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: (بەگوێی خۆم لەزاری پـیرۆزی پێغەمبـەرم ژنـەوتووە دەیفـەرموو: جـەجالْ هەڵناسێ هـەتا خەڵـك باسی پـشت گـوێ دەخـەن). صـەعب چـەند فەرموودەیەکی صەحیحی گێڕاوەتەوە. لـەبوخاری دا سـێ فـەرموودەی هەیـە، راستتر ئەوەیە کەلە ئاخرو ئۆخری جێنشینی عومەردا مردووە - رەزای خودا لەهەموویان بێ -.**

١٠٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْخَيْلُ لِثَلاثَةٍ لِرَجُلٍ أَجْرٌ وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ فَأَمَّا الَّذِي لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَطَالَ لَهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ وَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذلك مِنْ الْمَرْجِ أَوْ الرَّوْضَةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ أَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَهَا كَانَ ذَلِكَ لَهُ حَسَنَاتٍ فهي لذلك أجر وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَسِتْرًا وَتَعَفُّفًا وَلَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي رِقَابِهَا وَظُهُورِهَا فَهِيَ لَهُ كَذَلِكَ سِتْرٌ وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَنِوَاءً لأَهْلِ الإِسْلامِ فَهِيَ وِزْرٌ). وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ الْحُمُرِ فَقَالَ: (مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهَا إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾) (الحديث ٢٣٧١، أطرافُهُ في: ٢٨٦٠، ٣٦٤٦، ٤٩٦٢، ٤٩٦٣، ٧٣٥٦)[١٠٩].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وڵاخی بەرزە بەپێی نیازی خاوەنەکەی سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی پاداش‌و خێرە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەری حاڵیەتی، بۆ هەندێ پیاو مایەی تاوان‌و شەڕە، مایەی پاداش‌و خێرە بۆ ئەو کەسەی کە رایدەگرێ بۆ غەزاکردن‌و خەباتکردن‌و تێکۆشان لەبەر رەزای خودا، بۆ بەرژەوەندی گەلی ئیسلام، لەمێرگێکا، یا لەمێرغوزارێکا، بەگوریسێ دەیبەستێتەوە ئیتر ئەو وڵاخە هەرچی بخوات لەو مێرگ‌و مێرغوزارەو، چەندە بلەوەڕێ لەو لەوەڕگایە، بەژمارەی ئەوە چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێ.

وەبەژمارەی تەرس‌و میزەکەیشی چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕبەندەکەی بپسێنێ، یاخود گوریسەکەی بپچڕێنێ، وەسەرێ دووسەر غاربکاو، بای باڵی خۆی بداو یاری بکا، وبەبێ

---

(١٠٩) قال العيني: (اخرجه مسلم في الزكاة (عيني/١٢ص٢١٥) المترجم.

سوارەكەی بەپشتی خاڵی ڕمبازیو تەراتێن بكا، تەنانەت لەكاتی وایش دا، خودا بەژمارەی شوێن سمو تەرسو میزەكەی چاكەو خێر بۆ خاوەنەكەی دەنووسێ، گریمان ئەگەر خاوەنەكەی لەسەر ئاوێكەوە بردی، بەنیازی ئەوەیش نا كە بیبا ئاوی بدا، بەڵام وڵاخەكە لەخۆیەوە دەمی نایە چەمەكەوەو لێی خواردەوە، ئەوە بەقەد ژمارەی ئەو ئاوەی كەدەیخواتەوە، چاكەی بۆ دەنووسرێ، دیارە ئەگەر سووارەكەی خۆی مەشقی پێ بكا، یا بچێ ئاوی بدا، یالەغەزادا سواری بێ، ئەوە پاداشتەكەی چەند قاتە. وڵاخی بەرزە چ ماین بێ، چ ئەسپ بۆ ئەم جۆرە كەسە مایەی پاداشتە. مایەی پەردەو داپۆشینە بۆ كەسێ كە رایدەگرێ، هەتا لەمەردوم بێ نیازبێو بۆ رووسووری هەردوو جیهان، كارو كەسابەتی پێوە دەكاو، ئەو مافەی كە خودا لەسەر ئەو وڵاخەی داناوە، كەبریتییە لەخەباتگێڕان لەسەر پشتی، فەرامۆش ناكا، هەروا مافی وڵاخەكەش فەرامۆش ناكا، بۆ ئەم جۆرە كەسە پەردەو داپۆشەرە.

مایەی شەڕو تاوانیشە بۆ كەسێ كە رایدەگرێ بۆ چاوەو رووپاماییو خۆنواندانو شانازیكردن بۆ دوژمنایەتیو دژایەتی گەلی ئیسلام و، لەدژی موسوڵمانان، لە حەزرەتی پێغەمبەری خودا(درودی خوای لەسەر بێ) لەبارەی گوێدرێژەوە پرسیاركرا كەچی مافێكی تیایە، زەكاتی لێ دەكەوێ یان نا؟ فەرمووی: لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سروشو (وەحی) ێكی تایبەتیم بۆ نەهاتووە، تەنها ئەم ئایەتە دانسقەو كەم هاوتایە نەبێ، كەتێكڕا هەموو جۆرە خێرێ، كەمو زۆر دەگرێتەوە، كەدەفەرموێ: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه ★ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه﴾ سوورەتی زەلزەلە ئایەتی هەشتەم، لەسوورەتی ژمارە نەوەدو نۆ، واتە: هەركەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ چاكەی كردبێ دێتەوەرپێی، وەهەركەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵی خراپەی كردبێ دێتەوەرپێی.(ریاض/٣ل-٩٠٠ف-٩+ تاج/٨ل-٨٩ف-٣).

**راڤەو روونكردنەوە:**

**١- پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەسەرباسەكەیەوە لەوێ دایە كە دەفەرمویٚ: (ولو أنّها مرّتْ بنهرٍ فشربَتْ منهُ).**

**٢- روونكردنەوە: یەكی جوانم لەسەر ئەم فەرموودەیە لەتاج دا نووسیووە، ئەگەر لەئاییندەدا لەچاپەكانی ئاییندەدا نەقلٚ بكریٚ بۆ ئیٚرەش دەبیٚ.**

١٠٤٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: أَصَبْتُ شَارِفًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَغْنَمٍ يَوْمَ بَدْرٍ قَالَ: وَأَعْطَانِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَارِفًا أُخْرَى فَأَنَخْتُهُمَا يَوْمًا عِنْدَ بَابِ رَجُلٍ مِنْ الأَنْصَارِ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَحْمِلَ عَلَيْهِمَا إِذْخِرًا لأَبِيعَهُ وَمَعِي صَائِغٌ مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ فَأَسْتَعِينَ بِهِ عَلَى وَلِيمَةِ فَاطِمَةَ وَحَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَشْرَبُ فِي ذَلِكَ الْبَيْتِ مَعَهُ قَيْنَةٌ فَقَالَتْ: أَلا يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ فَثَارَ إِلَيْهِمَا حَمْزَةُ بِالسَّيْفِ فَجَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا ثُمَّ أَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا قُلْتُ لابْنِ شِهَابٍ: وَمِنْ السَّنَامِ؟ قَالَ: قَدْ جَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا فَذَهَبَ بِهَا.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: قَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) : فَنَظَرْتُ إِلَى مَنْظَرٍ أَفْظَعَنِي فَأَتَيْتُ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ فَخَرَجَ وَمَعَهُ زَيْدٌ فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ فَدَخَلَ عَلَى حَمْزَةَ فَتَغَيَّظَ عَلَيْهِ فَرَفَعَ حَمْزَةُ بَصَرَهُ وَقَالَ: هَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لآبَائِي. فَرَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقَهْقِرُ حَتَّى خَرَجَ عَنْهُمْ وَذَلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِ الْخَمْرِ) (الحديث ٢٣٧٥) [(١١٠)]

**عەلی كوڕی ئەبوطالیب**(رەزای خوای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: لەتالانەكەی رۆژی بەدردا، كە لەخزمەتی پیٚغەمبەردا**(دروودی خوای لەسەر بیٚ) **ئامادەی ئەم نەبەردە بووم، وشترە**

---

(١١٠) قال العيني: (أخرجه مسلم) وعدّهُ العسقلانيُ من المتفق عليه بين الشيخين في خاتمة كتاب المساقاة ج/٥ص٥٢، المترجم.

مێنگەیەکی سەرەم بەرکەوت، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) وشترێکی تری وای پێ دام، بوون بەدووان، رۆژێ لەبەر دەرگای پیاوێکی ئەنصاری دا، پیخم دان، بەنیازی ئەوەی بچم باریان بکەم لەسرناتك (إذخر) وەبارە سورناتکیان پێبهێنم ولەبازاڕ بیفرۆشم و دەستگیرۆیی خۆمی پێ بکەم بۆ نانی شایی گواستنەوەی فاطیمە دەسبارێکی شارەزای ئەم کارەیشم لەگەڵ بوو، لەجولەکەکانی بەنی قەینوقاع بوو. حەمزەی کوڕی عەبدول موطەلیبیش -کەمامی هەقی من و پێغەمبەر بوو- لەژوورەوە لەو ماڵەدا، پێش ئەوەی کە مەی حەرام ببێ، دانیشتبوو، بادەی دەنۆشی مەست بوو. کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ گۆرانی بۆ دەگوت و ئەم هەڵبەستانەی بۆ دەچڕی(وافیر) :

ألا ياحَمزَ للشُرفِ النَّواءِ    وهنَّ معقَّلاتٌ بالفناءِ
ضعِ السِّكينَ في اللبَّاتِ منْها    وضرِّجهُنَّ حَمزَةُ بالدِّماءِ
وَعجِّلْ منْ أطايبها لِشربٍ    قديراً من طَبيخٍ أوْ شواءِ

واتە:

ئەی حەمزە! ئادەی، ئەو وشترانە    کەوان لەحەوشە، کۆت لەپایانە!
بیانگەوزێنە لە خوێنی خۆیان    مەنجەڵ هەڵێنجە لەگۆشت بۆیان
بەزمێ سازکە، بۆ ئەم مەستانە    بەمەرگەو کەباب بەزمێ شاهانە

بەپەخشانیش واتە:

ئەی حەمزە! ئاگات لەو وشترە قەڵەوانەیە، کەلە حەوشەدا ئەشکێل کراون و بەستراونەتەوە، ئادەی چەقۆ دابنێ لەسەر گەردەملیان و سەریان ببڕەو لەخوێنی خۆیانا بیانگەوزێنەو لەپارچە خۆشەکانیان وەك: جەرگ و دووگیان مەنجەڵ پڕبکەو شایێ لەمەرگەو کەباب بۆ ئەم کۆمەڵەی مەستانە سازبکە.

ئـيتر حـەمزەش بەشمـشێرەوە رادەپـەڕیو پـەلاماریان دەدا، بەشـیرەکەی دووگیان ئەبڕیو کەلەکەیان هەڵ ئەدڕیو لەجەرگەکەیان دەبات!

ئیبنو جورەیج کە ئـەم فەرموودەیـە لـە ئیبنـو شـەهاب (زوهـری) یـەوە، دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: عەرزی ئیبنـو شـەهابم کـرد: ئـەی لـە دووگەکـەیان؟ فەرمووی: دووگیشیان دەبڕیو لەویش دەبات. ئیبنـو شـەهاب (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: عـەلی(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: کەسـەیری ئـەم دیمەنـەم کـرد تۆقاندمی، جا بۆ سکالاکردن چووم ب خزمەت پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) ، لەوکاتـەدا زەیـدی کـوڕی حـاریثـە لەخزمـەتی دا بـوو، سەرگوزەشـتەکەم لەنووکەوە بۆ یگێڕایەوە، تەشریفی هاتـەدەرەوە، زەیـدیش لەخزمەتیدا بـوو، منـیش لەخزمەتیانـدا رۆیـشتم پێغەمبـەر(درودی خـوای لەسـەر بێ) چـووەژوورەوە، لەحـەمزە تـوڕە بـوو، حـەمزەش چاوی هـەڵبڕیو ووتـی: ئێـوە خۆتـان بەچـی دەزانن؟ ئێوە کەبەرەی عەبـدوللای بـرامو ئـەبوطالیبی بـرامن، وەك غـولامو کۆیلەی باوكو باپیرانی من وابوون!

ئـیتر پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) کەحاڵەکـەی بینـی پاشـەوپاش گەڕایـەوە دواوە، وەلای ئـەوانی چـۆڵ کـرد، نـەبادا حـەمزە بـەهۆی مەسـتییەوە کـاریّ ناشینتر بکا، ئەم رووداوە لەپێش قەدەغەکردنی مەی دا بوو.

پەیوەنـدی ئـەم فەرموودەیـە بەسەرباسـەکەی خۆیـەوە کـە: (باسـی فرۆشتنی دارو گیاو پووشە) ئاشکرایە.

## باسی زەویو زاری خەڵاتی

(بڕ: تاج/ ٢ل- ٣٧٢ ز -١٨٠).

١٠٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الأَنْصَارَ لِيُقْطِعَ لَهُمْ بِالْبَحْرَيْنِ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنْ فَعَلْتَ فَاكْتُبْ

لإِخْوَانِنَا مِنْ قُرَيْشٍ بِمِثْلِهَا فَلَمْ يَكنْ ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي) (الحديث ٢٣٧٦، أطرافُهُ في: ٢٣٧٧، ٣١٦٣، ٣٧٩٤) [١١١].

ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) یاریدەدەران (انصار) ی بانگ کرد، کە لەوڵاتی بەحرەین بەشە زەویان بۆ جیا بکاتەوەو بەخەڵاتی بیانداتێ بۆ خۆیان بەبەخشش‌و شتی‌وا بەرە جووتیان پێ بدات، ئەوانیش عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر زەوی خەڵاتی‌و بەرە جووت دەدەی بەئێمە، دەبێت بەقەد ئێمە بەشی برا کۆچکارەکانیشمان بدەیت. پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەبەر ئەوەی کە ئەوەندە زەوی بەدەستەوە نەبوو، کەبەشی هەردوو لایان بکا، وازی لەزەوی بەخشینەکە هێناو، فەرمووی: (لەپاش خۆم خۆ خۆیی لەناوتانا روو دەداو بەچاوی خۆتان دەیبینن، جا ددان بەخۆتانا بگرن‌و خۆگربن‌و بەکەمترین مەهانە ئاژاوە بەرپا مەکەن، هەتا لەقیامەتدا لەسەر حەوزی کەوثەرم، دەگەنەوە بەخۆم، جا ئەو کاتە پاداشی باشی خۆتان بەزیادەوە وەردەگرن).

## باسی مافی هاموشۆو ئاودان‌و شتی‌وا

١٠٤٥ -عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ ابْتَاعَ نَخْلاً بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ وَمَنْ ابْتَاعَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ فَمَالُهُ لِلَّذِي بَاعَهُ إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ) (الحديث ٢٣٧٩) [١١٢].

---

(١١١) أخرجه العسقلاني من الأحاديث المتفق عليه بين البخاري و مسلم (خاتمة فتح/٥/٥٢) المترجم.

(١١٢) أخرجه مسلم في البيوع، باب: من باع نخلاً عليها تمر، رقم: ١٥٤٣.

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: لەپێغەمبەرم بیست** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: (کەسێ دارە خورما یا باخە خورمای کڕی، پاش موتوربەکردنی، ئەوە بەرەکەی بۆ فرۆشیارەکەیە، لەبەر ئەوە مافی هاموشۆو ئاودان‌و شتی‌وای هەیە، تا بەرەکەی دەڕنێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ کەبەرەکەی بۆ خۆی بێ‌و فرۆشیاریش لەکاتی گرێدانەکەدا بەوە رازی بێ، وەکەسێ کۆیلەیێ بکڕێ، کە ماڵی هەبێ، ماڵەکەی هی ئەو کەسەیە کە دەیفرۆشێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ)[1].**

# پایانـــێ

**مامۆستای ئیبن حەجەری عەسقەلانی** - ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- **دەفەرموێ: نامەی باخەوانی‌و شت خواردنەوە، سیی‌و شەش فەرموودەی لەخۆ گرتووە، پێنجیان بێ ڕشتەن ئەوانی تریان پەیوەستن، دووبارەکانیان حەڤدەن پوختەکەیان نۆزدەن موسلیمیش هەموویانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەمانەیان:**

**١- بێڕشتەکەی عوثمان، لەبارەی بیری ڕۆمەوە، بێ ژمارەیە، لەتەجریدەکەدا نییەو والەپێش ژمارە (٢٣٥١) ی فەتحەوە.**

**٢- فەرموودەی ژمارە: (٢٣٦٨ف) لەتەجریدەکەدا نییە.**

**٣- فەرموودەی ژمارە: (١٠٤١ت= ٢٣٧٠ف).**

**٤- فەرموودەکەی ئیبنو شەهاب سەبارەت بەکردنی نەقیع بەپاوان، والەدوا ژمارە: (١٠٤١) تەجریدەکەوە. لەتەجریدەکەدا نییە.**

**٥- فەرموودەی ژمارە: (١٠٤٤ت= ٢٣٧٦ف). دەفەرموێ: هەروا دووئەثەر - بیستراو- ی واتیا، هەردووکیان لەئیمامی عومەرەون! باسی موساقات (باخەوانی) والەبەرگی /٢ل-٥٢٢ز-٢٢٨/ فیقهی ئاسان**

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٨- نامەی قەرزکردن‌و دانەوەی قەرزو دەست بەست‌و نابووتی (كتابُ الإستقراض وأداء الديون والحجر والتفليس)

(بڕ: فیقهی ئاسان/٢/٤٧٥ز-٢٠٤+ل-٤٧٩ز-٢٠٦) لە تاج دا وا لە (تاج/٢ل — ٣٤٣ز-١٦٤).

١٠٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللَّهُ عَنْهُ وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلافَهَا أَتْلَفَهُ اللَّهُ) (الحديث ٢٣٨٧) [١١٣].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ ماڵی کەسێ وەربگرێ‌و لەدڵەوە نیازی دانەوی هەبێ، ئەوە خوا بۆی هەڵدەسوڕێنی‌و دەیداتەوە، بەڵام ئەوەی کەدەیەوێ بیبا بۆ ئەوەی کەلرفی لێ بداو لەناوی ببا، ئەوە خودا خۆی لەناوی دەبات) (تاج/٢/٣٤٤-٣)

١٠٤٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَرَّةِ الْمَدِينَةِ فَاسْتَقْبَلَنَا أُحُدٌ فَقَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ) قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (مَا يَسُرُّنِي أَنَّ عِنْدِي مِثْلَ أُحُدٍ هَذَا ذَهَبًا تَمْضِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ إِلاَّ شَيْئًا أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ ثُمَّ مَشَى فَقَالَ: إِنَّ الأَكْثَرِينَ هُمْ الأَقَلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ مَنْ قَالَ: هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَمِنْ خَلْفِهِ وَقَلِيلٌ مَا هُمْ ثُمَّ قَالَ لِي: مَكَانَكَ لا تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَكَ ثُمَّ انْطَلَقَ فِي سَوَادِ اللَّيْلِ حَتَّى تَوَارَى فَسَمِعْتُ صَوْتًا قَدْ ارْتَفَعَ فَتَخَوَّفْتُ أَنْ يَكُونَ قَدْ عَرَضَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَرَدْتُ أَنْ آتِيَهُ فَذَكَرْتُ قَوْلَهُ لِي لا تَبْرَحْ حَتَّى آتِيَكَ فَلَمْ أَبْرَحْ حَتَّى أَتَانِي قُلْتُ يَا

---

(١١٣) لم يوافقه مسلم على اخراجه (خاتمة كتاب الإستقراض (ج/٥ص٧٧) المترجم.

رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتًا تَخَوَّفْتُ فَذَكَرْتُ لَهُ فَقَالَ وَهَلْ سَمِعْتَهُ قُلْتُ نَعَمْ قَالَ ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَانِي فَقَالَ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ قَالَ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ) (الحديث ٢٣٨٨) [١١٤].

ئەبوذەڕ(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شێوان بوو، لەخزمەتی خۆشەویستدا بووم، لەناو خڕە بەردەڵانیەکەی مەدینەدا دەڕۆیشتین، سەیری چیای ئوحودمان دەکرد، فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : ئەبوذەڕ! گوتم: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! واوام لەخزمەتدا فەرمووی: (ئەم کێوی ئوحودە ئەگەر هەمووی زێڕبێ‌و هی من بێ، حەزدەکەم گشتی بەسێ شەو داغان بکەم‌و هەمووی بکەم بەخێرو بەپیاوەتی‌و، یەك دیناری لەلام نەمێنێ، مەگەر ئەو دینارە کە هەڵی بگرم بۆ دانەوی قەرزێ).

ئەوجا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەقیامەتدا، ئەوانەی کەلەدنیادا داراتربوون‌و ماڵ‌و سامانیان زۆرتر بووە، لەوێ لەهەموو کەسێ نەداراترو کەم دەست ترن، مەگەر کەسێ ئاواوئاوا بەهەرچوارلادا لەخێرکردن درێغی‌و کۆتایی نەکا، ئەو جۆرە کەسانەیش بەراستی زۆر کەمن) جا زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) بۆ ڕوونکردنەوە: کەی ئاماژەکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ، فەرمووی: واتە: بەهەر چوارلای خۆیدا، بەراست‌و چەپدا، خێر بکاو شت ببەخشێ لەڕێگای خودادا.

ئەبوزەڕ فەرمووی: لەپاشا ڕۆیشتین هەتا فەرمووی: (ئەی ئەبوزەڕ! تۆ لێرەبە لێرە مەبزوێ تا خۆم دێمەوە بۆلات). تەشریفی ڕۆیشت تالەبەر چاوم ون بوو، بەڵام زۆر دوور نەکەوتەوە گوێم لەغەڵبەغەڵب‌و دەنگەدەنگێ بوو، گوتم: دەترسم کەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) شتێکی بەسەر بێ، ویستم بەشوێنیا بچم بۆ سوراخی ئەو مشت‌و مڕە، بەڵام ئەوەم بیرکەوتەوە کە

---

(١١٤) لم يوافقهُ مسلمٌ (المصدر السابق نفسهُ) المترجم.

فەرمووی: لەجێی خۆت مەبزوە تا خۆم دێمەوە بۆلات، کاتێ تەشریفی هاتەوە، باسی ئەو دەنگە دەنگەم بۆی کرد کەبەرگوێم کەوت، فەرمووی: (بۆ گوێت لێ بوو؟!) گوتم: بەلێ: فەرمووی: (ئەوە جبرائیل بوو-دروودی لێ بێ- تەشریفی هات بۆ لام پێی فەرمووم: ئەی موحەممەد! مژدەبێ: هەرکەسێ لەنەتەوەی ئیسلامی تۆ، لەسەرەمەرگا، لەسەر موسوڵمانەتی بمرێو لەسەر شیرك و فرەخوایی‌و ناموسوڵمانی نەمرێ دەچێتە بەهەشت!) منیش گوتم: ئەی جبرائیل! بادزی‌و حیزیش بکات؟ فەرمووی: (بەلێ، بادزی‌و حیزیش بکا). (تاج/١٠ل ٧١+تاج/٥ ص٢١٧+عمدة القارئ ج/٢٣ ص٥٢+٥٠+اقتران النيرين بەرگی هەشتەم، لاپەڕە/٧٠).

١٠٤٨-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ ضُحًى، فَقَالَ: (صَلِّ رَكْعَتَيْنِ) وَكَانَ لِي عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي) (الحديث ٢٣٩٤) [115].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتی چێشتەنگاو بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی لەمزگەوت بوو، چووم بۆ خزمەتی لەسەفەرێ گەڕامەوە، کەلەو سەفەرەدا. وشترێکی لێ کڕیم، فەرمووی: (دوو رکات نوێژ بکە). قەرزێکم لەسەری بوو، قەرزەکەی بەزیادەوە دامەوە.

## ڕوونکردنەوە:

مامۆستای عەینی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێشەوا بوخاری - ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ - ئەم فەرموودەیەی لەحەفدە جێگەدا لەصەحیحی بوخاری پیرۆزدا دەرهێناوە، هەندێ جار بەکورتی‌و هەندێ جار بەدرێژی. لەباسی (نوێژی سوننەت لەکاتی هاتنەوە لەسەفەر) دا، بوخاری ئەم فەرموودەیەی

(١١٥) قال العيني: (واخرجه مسلم في الصلاة وفي البيوع) (عيني/٤ص٢٠٠) المترجم.

بەدەق دەرهێناوە، لەوێ لەكۆتایەوە نووسراوە: (الحديث٤٤٣- أطرافُهُ في: ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧,٥٢٦٧، ٦٣٨٧). بەپێی ئەم ئەطرافانە جەنابی بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەبیستو شەش جێگەدا دەرهێناوە.

بەشێوەیەكی گشتی ئەم فەرموودەیە دەست دەدا بكرێ بە:

١- هۆی سوننەتبوونی نوێژی هاتنەوە لەسەفەر.

٢- هۆی سوننەتبوونی نوێژی دیاری مزگەوت.

٣- هۆی سوننەتبوونی نوێژی چێشتەنگاو.

١٠٤٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلاَّ وَأَنَا أَوْلَى بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلاهُ) (الحديث ٢٣٩٩، أطرافُهُ في: ٢٢٩٨، ٢٣٩٨، ٤٧٨١، ٥٣٧١، ٦٧٣١، ٦٧٤٥، ٦٧٦٣) [116].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەجیهانو لەدوا رۆژدا، من دڵسۆزترم بۆ هەموو موسوڵمانێ، لەهەموو كەسێكی تر، هەتا لەخۆیشی، ئەگەر حەزیش دەكەن میصداقی ئەم قسەیەی من لەقورئاندا بزانن، فەرموو ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێننەوە: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ – ئەحزاب - ٦/٣٣- واتە: پێغەمبەر لەهەموو شتێكا بۆ هەموو موسوڵمانێ نزیكترەو لەپێشترە لەهەموو كەسێكی تر تەنانەت لەپێشترە بۆیان لەخودی خۆیان).

---

(١١٦) عده العسقلاني في خاتمة كتاب الإستقراض من المتفق عليه بين الشيخين – المترجم.

جانەگـەر موسـوڵمانێ مـردو مـاڵی لـەپاش بـەجێما، باکەسـوکارەکەی هەرکەس هەن، کەلەپوورو میراتەکەی بەمیراتی ببەن بۆ خۆیان، بەڵام ئەگـەر قەرزی لەسەر بوو، ئەوە قەرزەکەی لەسەر من، من قەرزەکـەی بـۆ دەدەمـەوە، وەئەگەر مناڵو خێزانی بێ دەرەتانی لەپاش بەجێما، بابێن بۆ لای خـۆم، مـن خاوەنیانمو بەخێوکردنیان لەسەر منە).

١٠٥٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُـعْبَةَ(رەزای خوای لێ بێ) قَـالَ: قَـالَ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) : (إِنَّ اللَّـهَ حَـرَّمَ عَلَـيْكُمْ عُقُـوقَ الأُمَّهَـاتِ وَوَأْدَ الْبَنَاتِ وَمَنَعَ وَهَاتِ وَكَرِهَ لَـكمْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْـرَةَ الـسُّؤَالِ وَإِضَـاعَةَ الْمَـالِ) (الحديث ٢٤٠٨، أطرافُهُ في: ١٤٧٧) (١١٧).

موغیرەی کوڕی شوعبە(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: خـودا قەدەغـەیکردووە لەسـەرتان، دڵڕەنجـانی بـاوكو دایکـان، وەزیندەبەچاڵ کردنی کچان، وەنـەدانی مـافی سـەرتان، وەزەوت کردنـی مـافی خەڵکان، وەحەزیش ناکا لـەم سێ رەفتـارە بۆتـان: لـەوتی وتـیو لەپرسـیاری زۆرو لەسواڵـکردنی زۆر، لەزایـەکردنی مـاڵ بـەبێ هـوودە. (تـاج/٢/٣٤٥ف٤+تاج/٢ ص٢٢٥)

پیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباتەکەوە لە (وإضاعَةُ المالِ) دایە.

(١١٧) أخرجه مسلم في الأقضية، باب: النهي عن كثرة المسائل من غير حاجة..، رقم: ٥٩٣.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٤٩-نامەی دژایەتی(خصومەت) (كتابُ الخصومات)

١٠٥١- عَنْ عبدالله ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً قَرَأَ آيَةً وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ خِلافَهَا فأخذتُ بيده فأتيت به رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (كِلاكُمَا مُحْسِنٌ لا تَخْتَلِفُوا، فَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ اخْتَلَفُوا فَهَلَكُوا) (الحديث ٢٤١٠، أطرافُهُ في: ٢٤٠٨، ٢٤١٨، ٢٤٧٦، ٤٨١٣، ٥٠٦٣، ٦٥١٧، ٦٥١٨، ٧٤٢٨، ٧٤٧٧)[١١٨].

**عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گوێم لەپیاوێ بوو، ئایەتێكی دەخوێند، كەمن لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا، بەشێوەیەكی جیا لەو، لەبەرم كردبوو، جادەستیم گرت وبردم بۆ خزمەتی حەزرەت، كاتێ پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **شێوەی قورئانخوێندنی هەردوولامانی بۆ روون بوویەوە، فەرمووی: (هی هەردووكتان زۆر باشە دووبەرەكی پەیدا مەكەن، چونكە نەتەوەكانی پێش ئێوە، وەك: جولەكەو گاور، دووبەرەكی لەناوی بردن و بەفەتارەتی بردن). (بڕوانە: تاج/٥/ل-٣٢٥ز-٩٣ باسی قورئان بەحەوت شێوە هاتووە).**

١٠٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلانِ: رَجُلٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَرَجُلٌ مِنْ الْيَهُودِ قَالَ الْمُسْلِمُ وَالَّذِي اصْطَفَى مُحَمَّدًا عَلَى الْعَالَمِينَ، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْعَالَمِينَ، فَرَفَعَ الْمُسْلِمُ يَدَهُ عِنْدَ ذَلِكَ فَلَطَمَ وَجْهَ الْيَهُودِيِّ، فَذَهَبَ الْيَهُودِيُّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَهُ بِمَا كَانَ مِنْ أَمْرِهِ وَأَمْرِ الْمُسْلِمِ، فَدَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمُسْلِمَ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لا تُخَيِّرُونِي عَلَى مُوسَى

(١١٨) لم يوافقهُ مسلم على تخريجه(فتح/٥/٧٧-خاتمة كتاب الخصومات) المترجم.

فَـإِنَّ النَّـاسَ يَـصْعَقُونَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ فَأَصْـعَقُ مَعَهُـمْ، فَـأَكُونُ أَوَّلَ مَـنْ يُفِيقُ، فَإِذَا مُوسَى بَاطِشٌ جَانِبَ الْعَرْشِ فَلا أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ فَأَفَاقَ قَبْلِي أَوْ كَانَ مِمَّنْ اسْتَثْنَى اللَّهُ) (الحديث ٢٤١١) (١١٩).

ئـەبوهورەيرە(رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: دوو پیـاو -یـەکێ موسـوڵمان‌و یەکێـکی جولەکە- بوو بە شەڕەجنێویان، موسوڵمانەکە دەڵێ: بـەو کەسـە کـە موحەممـەدی هەڵبـژاردووەو کردوویـەتی بەسـەروەری هـەموو جیهـان! جولەکەکـەش بەرپەرچـی دەداتـەوەو دەڵـێ: بـەو کەسـە کـە مووسـای هەڵبـژاردووەو کردوویـەتی بەسـەروەری هـەموو جیهان!، ئـیتر موسـوڵمانەکە تەنگـە دەیگـرێ‌و شـەقازللەیێ لەجولەکەکـە دەدا، جولەکەکـە دەچـێ بـۆلای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وە سەرگوزەشتـەکەی خۆی‌و موسـوڵمانەکەی عـەرز دەکـا، پێغەمبـەریش(درودی خـوای لەسـەر بێ) دەنێـرێ بـەدوای موسـوڵمانەکەدا لـەم لایەنەوە پرسیاری لـێ دەکا، ئەویش دەنگوباسەکەی بۆ باس دەکا.

جـا پێغەمبـەر(درودی خـوای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (بـاوی مـن مـەدەن بەسـەر مووسـاداو مـن بەباشـتر دامـەنێن لـەو،چـونکە لـەرۆژی قیامەتـدا، کـە بـەرەی ئـادەمیزاد سـەرجەم خورپـەیان لـێ دەکـەوێ‌و لەسـام‌و بیمـی نرکـەو نەعرەتـە گەورەکـە هـەموو لـەهۆش خۆیـان دەچـن‌و دەبوورێنـەوە، منـیش لەگـەڵیاناو وەك ئەوان لەسەر خۆ دەچم، بەڵام یەکەم کەس دەبم کە دێمـەوە هۆش خۆم، کەچـی لەوکاتەدا دەبینم وا مووسا پـەلاماری دامێنـی تـەخت‌و بارەگـا(عـرش) ی خـودای داوەو، بەتوندی گرتوویـەتی، جانـازانم کـە ئایـا مووسـاش لەگـەڵ ئێمـەدا لـەهۆش خۆی دەچێ، بەڵام لەپێش مندا هۆشی دێتـەوە بەبـەردا، یا ئـەو هـەر لەسـەرتاوە نابوورێتـەوەو یـەکێ دەبـێ لەوکەسـانە کـەخودا جیـای کردوونەتـەوە، وەك لـەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ

(١١٩) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: فضائل موسى (عليه سلام) ، رقم: ٢٣٧٣.

إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ﴾٦٨/٣٩-). واته: (فوو دەكرێ بەكەڕەنادا ئیتر بەفەرمانی خودا هەرچی زیندوو هەیە لەئاسمانەكان‌و لەزەوی دا دەمرێ، مەگەر ئەو كەسە نەبێ كە خودا جیای كردوونەتەوە حەز دەكا نەمرن‌و بەر ئەم فەرمانەگشتییە نەكەون). (تاج/٣٧٩/٤ف١- باسی گەورەیی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ)).

١٠٥٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، قِيلَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا بِكِ أَفُلاَنٌ أَفُلاَنٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُضَّ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ) (الحديث ٢٤١٣، أطرافُهُ في: ٢٧٤٦، ٥٢٥٩، ٦٨٧٦، ٦٨٧٧، ٦٨٧٩، ٦٨٨٤، ٦٨٨٥)[120]

پێشەوا ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێكی جولەكە لەسەر هەنێ خشڵ، لەنێوانی دوو بەرددا سەری كچۆڵەیەكی شكاندبوو، لەپاشا توڕی دابووە ناو بیرێكەوە، كاتێك دۆزیانەوە هێشتا نیوە گیانێكی تیادا مابوو، جا لێیان دەپرسی: كێ وای لێ كردووی؟ ئایا فیسارە كەس بوو؟ ئایا ئەم بوو؟ ئایا ئەو بوو؟ تاناوی كابرایەكی جولەكەیان هێناو گوتیان: ئایا فیسارە جوولەكە وای لێ كردوویت؟ ئەویش سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی كرد، ئا ئەو وای لێ كردووم، جا كابرای جووەیان هێناو، پێی لەتاوانی خۆی ناو ددانی بەكارەكەدا ناو جووە ژێری، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی دا لەنێوانی دوو بەردا سەری ئەویشیان شكاندو لەباتی كچۆڵەكە كوشتیانەوە. (تاج/٢١٠/٣- ش/د/ت/ن).

---

(١٢٠) قال العيني: (وأخرجه مسلم في الحدود) ) عيني/٢٥٣/١٢) وعدّهُ العسقلاني من المتفق عليهِ بينَ الشيخينِ. المترجم.

١٠٥٤-عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللّٰهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ قَالَ: فَقَالَ الأَشْعَثُ: فِيَّ وَاللّٰهِ كَانَ ذَلِكَ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ أَرْضٌ فَجَحَدَنِي،فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَلَكَ بَيِّنَةٌ) قُلْتُ: لا قَالَ: فَقَالَ لِلْيَهُودِيِّ: (احْلِفْ) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ: (إِذًا يَحْلِفَ وَيَذْهَبَ بِمَالِي فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَعَالَى ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّٰهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ) (أنظر رقم: ١٠٣٦) (الحديث ٢٤١٦، ٢٤١٧) [١٢١].

(بۆ وەرگەڕاوەکەی بڕوانە ژمارە: ١٠٣٦. کەلەپێشەوە رابوورد)

## پایانی( خاتمة)

مامۆستای عەسقەلانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: نامەی قەرزکردن‌و بابەتەکانی تر کەلەگەڵیدا باس کراون هەتا ئێرە، پەنجا فەرموودەی لەخۆ گرتووە، شەشیان بێ ڕشتەن، دووبارەکانیان سیی‌و هەشت فەرموودەن، پاڵفتەکەیان (٥٠-٣٦=١٤) فەرمووده، لەتەجریدەکەدا نۆیان هاتوون. شێخی موسلیمیش هەموویانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەم ژمارانە:

١- (١٠٤٦ت= ٢٣٨٧فەتح).

٢- (١٠٤٧ت= ٢٣٨٨فەتح).

٣- فەرموودەی (لَيُّ الواجِدِ يُحِلُّ عقوبَتَهُ) بێڕشتەیە، ژمارەی نییە، وا لەپێش ژمارە: (٢٤٠١) دوە.

٤- فەرموودەی(١٠٥١ت= ٢٤١٠ف).

دەفەرموێ: دوازدە بیستراو (ئەثەر)ی هاوەڵان‌و دوا هاوەڵانی واتیادا.

(١٢١) أنظر رقم: ١٠٣٦- المترجم.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٠- نامەی دۆزراوە (كتابٌ في اللُّقطَة)

(ئەم باسە لە فیقهی ئاسان دا وا لەبەرگی/٢ل-٥٤٦ز-٢٣٨)

١٠٥٥- عَنْ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فَقَالَ: وجدتُ صُرَّةً على عهد النبيّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فيها مِائَةَ دِينَارٍ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً) فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، فَلَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً) فَعَرَّفْتُهَا فَلَمْ أَجِدْ ثُمَّ أَتَيْتُهُ ثَلاثًا فَقَالَ: (احْفَظْ وِعَاءَهَا وَعَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا) (الحديث ٢٤٢٦، أطرفُهُ في: ٢٤٣٧) [١٢٢].

ئوبەی کوڕی کەعب(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پڕیاسکەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری زێڕی تیادا بوو، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بارودۆخەکەم بۆی ڕوونکردەوە، فەرمووی: (یەك ساڵی تەواوجاری بۆ بدە) منیش وام کرد، بەڵام کەسم دەست نەکەوت کەناونیشانی شتەکەم بۆ هەڵ دا، دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (ساڵێکی تریش جاری بۆ بدەرەوە). منیش دووبارە ساڵێکی تریش جاڕم بۆ دایەوەو، دیسانەوە کەسم دەست نەکەوت کەناونیشانی بزانێ، بۆ جاری سێیەم چوومەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاگاداری پڕیاسکەکەی و ژمارەکەی و بەنی دەمبێنەکەی بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هاتەوە بیدەرەوە پێی، بەمەرجی ناسینەوەی دەنا بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرەو بیکە بەهی خۆت).

(١٢٢) أخرجه مسلم في أوائل كتاب اللقطة، رقم: ١٧٢٣.

١٠٥٦-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنِّي لأَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِي فَأَجِدُ التَّمْرَةَ سَاقِطَةً عَلَى فِرَاشِي فَأَرْفَعُهَا لآكُلَهَا ثُمَّ أَخْشَى أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً فَأُلْقِيهَا) (الحديث ٢٤٣١) (١٢٣).

ئـەبوهورەيرە(رەزای خـوای لــێ بــێ) فــەرمووی: خۆشەویــست (دروودی خـوای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (جاری وا رێدەکـەوێ کەدەچـمەوە بـۆ ماڵـەوەم، وادەبـێ کـەدەنکێ خورمـا کـەوتووە لەسـەر نوێنەکـەم، منـیش هـەڵی دەگـرم و دەمـەوێ بیخـۆم، بـەڵام دوایـی بیردەکەمـەوە دەترسـم هینـی زەکـات بـێ، ئـیتر فڕێـی دەدەم ونایخۆم!).

# پایانێ

ماموّستای ماموّستایان ئیبنوحەجـەری عەسـقەلانی (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: نامــەی دۆزراوە بیـست ویـەك فـەرموودەی واتیـادا، پێنجیـان بێڕشـتەن ئـەوانی تریـان رشـتەدارو پەیوەسـتن، واتـە: مەوصـولن، هـەژدەیان دووبارەن یا لەم نامەیـە خۆیـدا دووبـارە بوونەتـەوە، یـا لەنامـەکانی پێشیدا، پوختەکـەیان دەکاتـە (٢١-١٨=٣) سێ فـەرموودە، هـەموویان، متفـق علیـەین، پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخاری دەریهێناون. یەك بیـستراو (ئـەثـەر) یشی واتیادا. لەتەجریدەکەدا دوانیان هەن، ژمارە: ١٠٥٥و ١٠٥٦.

لـەخوا داوا دەکـەین، کـە رەحـم بـەحاڵی شـڕمان بفـەرمووێ، حوسـنی خاتمـەمان پـێ خـەڵات بفـەرموێ. (بروانـە: بـەرگی دووەم ل-٥٥٦ز-٢٣٩-فیقهی ئاسان) +(تاج/٢ ل —٣٨٧ ز -١٨٤).

---

(١٢٣) أخرجه مسلم في الزّكاة، باب: تحريم الزّكاة على رسول الله(دروودی خوای لەسەر بێ).. رقم: ١٠٧٠.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٥١-نامەی نارەوایی یەکان (كتابُ المَظالِمْ)

١٠٥٧-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الْجَنَّةِ فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الْجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا وَقَالَ يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَبُو الْمُتَوَكِّلِ) (الحديث ٢٤٤٠، طرفهُ في: ٦٥٣٥) [١٢٤].

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بڕواداران کاتێ ڕزگاریان دەبێ لەچنگی ئاگری دۆزەخ، لەسەر پردێ‌کەوا لەنێوانی بەهەشت‌و دۆزەخ دا- حەپس دەکرێن، هەتاوەکوو تۆڵەی ئەو ناهەقییانەی کەلەجیهاندا لەیەکتریان کردووە لێیان دەستێنرێ، هەتا بەتەواوی پاك‌و خاوێن دەکرێنەوە، هەقی کەسیان لەسەر کەسیان نامێنێ، ئەوجا ڕێگەیان پێ دەدرێ کەبچنە ناو بەهەشت، دەسا بەو کەسە گیانی موحەممەدی بەدەستە، دیارە کەئەو کەسەیە یەزدانی پاکە، ئەو بەهەشتیانە یەك بەیەکیان لەماڵەکانی دنیایان باشتر شارەزای ماڵەکانی خۆیانن لەناو بەهەشتا، کەئەمە یەکەم جاریانە دەچنە ناوی!) (تاج/١٠ل-٣٧٢).

١٠٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما) سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ اللّٰهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ فَيَقُولُ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ وَرَأَى فِي

---

(١٢٤) قال العسقلاني لمْ يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي سعيد: (إذا خلص المؤمنون) (ر: فتح/٥/١٢٧- خاتمة كتاب المظالم) المترجم.

نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَـكَ قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَـكَ الْيَوْمَ فَيُعْطَى كِتَـابَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيَقُولُ الأَشْهَادُ: هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِـمْ أَلا لَعْنَـةُ اللَّـهِ عَلَـى الظَّـالِمِينَ) (الحـديث ٢٤٤١، أطرافُـهُ في: ٤٦٨٥، ٦٠٧٠، ٧٥١٤)[١٢٥].

ئیبنو عومـەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم بیـستم لـەزاری پـیرۆزی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: (لـەرۆژی قیامەتـدا، لەرازێـکی نهێنـی دوو بـەدوودا، خـودای گـەورە موسـوڵمان نزیـك دەکاتـەوە، بەڕەنگێـکیوا لەپـەنای خۆیداپـەنای دەداو لەپـەنای پـەردەی میهرەبـانی خـۆی دا دەیپۆشـێ، هـەتا خەڵـکی مەحـشەر چاویان لـێ نـەبێ، ئـەوجا خـودا یەکـە یەکـە، پێـی پـێ دەنـێ لەگوناهـەکانی: پێـی دەفـەرموێ: ئایـا پـێ دەنێیـت لـەم گوناهـەو لـەو گوناهـە کـە کـردوتن، بەندەکـەش گـشت جـارێ لـەباتی جـارێ دووجـار دەڵـێ: بەڵـێ ئـەی خودای مـن! پێیـان لـێ دەنـێم‌و لـەدنیادا ئـەم تاوانانـەم هـەموو کـردوون، هـەتا بەندەکە ددان دەنێ بەهەموو ئەو گوناهانەی کەئەنجامیانی داوە..

ئـیتر بەندەکـە دەترسـێ‌و دەحەپەسـێ‌و لـەدڵی خۆیـا دەڵـێ: سـەرم تیـا دەچێ، فەرمووی: جا خوا دەفەرموێ: مەترسە! من لەجیهاندا ئەم گوناهانـەم بۆ پۆشیت، ئـەوا ئەمرۆکـەش لێـت خـۆش بـووم لـەو گوناهانـە. لـەپاش ئەمـە نامەی کردەوە باشەکانی دەدەنە دەستی راستی، ئەمە حاڵی موسوڵمانە، بـەڵام ناموسـوڵمان، چ بێـبڕوا بـێ، چ ناپـاك، جـاڕکێش لەبەرچـاوی شـایەتەکانی سەرکردەوەکانیان بانگەواز هەڵدەداو دەڵێ: ﴿ هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَـى رَبِّهِـمْ أَلا لَعْنَةُ اللَّـهِ عَلَـى الظَّـالِمِينَ ﴾ هود/١١/١٨- واتـە: ئـا ئەمانـە بـوون کـەدرۆیان بەدەم خوداوە دەکرد، بزانن کەنـەفرین‌و لەعنـەت‌و سزای سـەختی خـودا بـۆ ستەمکارانە).

---

(١٢٥) أخرجه مسلم في التوبة، باب: قبول توبة القاتل، رقم: ٢٧٦٨.

١٠٥٩- وعَنْه(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ(صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لا يَظْلِمُهُ وَلا يُسْلِمُهُ وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللّٰهُ فِي حَاجَتِهِ وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللّٰهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُبَاتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللّٰهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث ٢٤٤٢، طرفُهُ في: ٦٩٥١)[١٢٦].

**دیسان ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) لە خۆشەویستەوە(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ستەمی لێ بکا، یابیدات بەدەست ناحەزو دوژمنی خۆیەوە، یاپشتی لەزەوی بدات، هەرکەسێ مشووری کاری برایەکی ئاینی خۆی بخوات وبچێ بەدەنگیەوە، بەپێی توانا، بۆ جێ بەجێ بوونی ئەوکارە، یاریدەی بدات، خودایش مشووری کاری ئەو دەخوات و لەکاتی پێویستدا دەچێت بەدەنگیەوە، هەرکەسێ موسوڵمانێ لەتەنگانەیێ ڕزگار بکا، خودایش ئەو لەتەنگانەیەك لەتەنگانەکانی ڕۆژی ژینەوە ڕزگار دەکا، وههەرکەسێ موسوڵمانێ پۆشتە بکاتەوە بەجل و بەرگ لەشی بپۆشێ، خودایش لەڕۆژی قیامەتدا ئەو پۆشتەو پەرداخ دەکاتەوە، یا بۆ ڕەزای خواد نەنگ و نهێنی ئەو بپۆشێ، خوداش لەتۆڵەی باشی ئەودا لەقیامەتدا، نەنگ و نهێنی ئەو دادەپۆشێ!). (ریاض/ال-٢١ف-١٢/٢٣٣ز-٢٧).**

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

**بێژەی پیاو لەم جۆرە جێیەدا بۆ قەید نییە، بەڵکوو بۆ نموونەیە، کەواتە موسوڵمانی پۆشەر یا پۆشراو، جیاوازی ژن و پیاوو نێرو مێی نییە، بگرە جاری واهەیە، پۆشینی نەنگی ئافرەت خێرترە، بەتایبەتی ئەگەر**

---

(١٢٦) أخرجه مسلم في البرّ و الصلة و الآداب، باب: تحريم الظلم، رقم: ٢٥٨٠.

ئاژاوەو فەرتەنەی لێ بکەوێتەوە بەشێوەی گشتی ئەم دووخاڵە لەم جۆرە باسانەدا، رەچاو دەکرێن:

یەکەم: پۆشینی نەنگو خراپەو گوناهی بەندە، کاتێ زۆر پەسەندە کەکۆن بووبێ،و کاتی بەسەر چووبێو خاوەنەکەی لێی پەشیمان بێو وازی لەو جۆرە بێ شەرعیە هێنابێ، دەنا ئەگەر کابرا خۆی دەربەست نەبوو، وەشەرمی لەخوداو لەبەندەی خودا نەدەکردو بەردەوام بوو، لەسەر ئەو تاوانە، ئەوە پۆشینی زۆر باش نییە، چونکە سەردەکێشێ بۆ بەرەڵایی‌و بێ شەرعی زۆرتر.

دووەم: لەکاتی جەرحو تەعدیلی پیاوانی رشتەکاندا، پۆشینی ئەو نەنگانەی دەبن بەهۆی تەعدیلیان دروست نییە، بەڵکوو دەبێ بخرێنە روو تاکەس بەو راوییە دەستخەرۆ نەبێ هەروا لەکاتی شایەتی دان دا پۆشینی بەناهەق دروست نییە.

١٠٦٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَذَا نَنْصُرُهُ مَظْلُومًا فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: (تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ) (الحديث ٢٤٤٤، طرفاهُ في: ٢٤٤٣، ٦٩٥٢)[١٢٧].

پێشەوا ئەنەس (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (یاریدەی برای خۆت بدە لەسەر هەق بێ یا لەسەر ناهەق بێ!) یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لەسەر هەق بێ ئەوا جێگەی خۆیەتی کەیارمەتی بدەم، بەلام پێمان بفەرموو: ئەگەر لەسەر ناهەق بوو چۆن چۆنی یارمەتی بدەم؟ فەرمووی: (مەیەڵە ئەو ناهەقییە بکا، ئەوە باشترین یارمەتییە بۆی!). (ریاض/ال-٢١٢ف-٢٣٧ز-٢٧).

(١٢٧) والحديث من أفراده (عيني/١٢ص٢٨٩) +خاتمة كتاب المظالم —فتح/٥/١٢٧، المترجم.

١٠٦١-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث٢٤٤٧) [(١٢٨)]

ئیبنو عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆتان لەزوڵم وزۆرو ستەم بپارێزن، بەڕاستی زوڵم وزۆرو ستەم تەم‌و مژو تاریکی زۆرن لەرۆژی قیامەتداو، زۆردارەکە دەکەوێتە ناویان‌و وەك: کوێری مزمەعیل بەهیچ لایەکا سەر دەرناکا). (ریاض/ال-١٩٣ز-٢٦+تاج/٥ص١٩+ تاج/٩ل-٣٢ز-١٠)

١٠٦٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أَنْ لا يَكُونَ دِينَارٌ وَلا دِرْهَمٌ إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ) (الحديث ٢٤٤٩، طرفهُ في: ٦٥٣٤) [(١٢٩)].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) دەگێڕێتەوە لەخۆشەویستەوە(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ ناڕەواییەکی لەکەسێ کردبێ، یاهەقی کەسێکی تری لەسەر بێ، خواهی ناموس بێ، خواهی شتێکی تر بێ، بائەمڕۆ لەم جیهانەدا گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا لەو هەقە، یالەو ناڕەواییە یا بەرهەر شێوەیێ دەتوانێ، بەپێی شەرع رازی بکا لەخۆی، بەرلەوەی کەبمرێ‌و بچێ بۆ ئەو دنیاو هەقەکە بکەوێتە رۆژێکەوەکە لەو رۆژەدا دینارو درەم‌و پارەو پوول نامێنێ‌و بەدەرد ناخوا، ئەگینا ئەگەر وانەکا ئەوە حاڵ لەم دوو حاڵە بەدەرنییە: ئەگەر کردەوەی باشی هەبێ بەقەد ئەو هەقە لەکردەوە باشەکەی دەدرێ بەخاوەن هەقەکە، خۆ ئەگەر گریمان کردەوەی باشی نەبوو ئەوا

---

(١٢٨) أخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: تحريم الظلم، رقم: ٢٥٧٩.

(١٢٩) لمْ يوافقهُ مسلمٌ على إخراجهِ (فتح/٥/١٢٧) - خاتمة كتاب المظالم) المترجم.

خراپتر، چونکه لەخراپەی برادەرەکەی کەهەقەکەی لەسەریەتی هەڵ دەگیریّو فرە دەدریّتە سەر ئەو!). (ریاض/ال-١٩٧ز-٢٦+تاج/٥ص -٢٠ز-١٠).

١٠٦٣-عَنْ سَعِيدَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ ظَلَمَ مِنْ الأَرْضِ شَيْئًا طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ) (الحديث ٢٤٥٢، أطرافُهُ في: ٣١٩٨) [١٣٠]

سەعیدی کوڕی زەید(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری خۆشەویستم ژنەوتووە دەیفەرموو: (هەرکەسێ بەزۆرو ستەم بەقەد بستێ، زەوی داگیربکا، یاکەمتر، یازیاتر، لەرۆژی قیامەتدا، بەهەر حەوت چینەی زەوییەوە، وەك کەڵەمەی نیل لەملی کەڵەگادا، ئاوا دەکرێ بەتەوقو دەکرێتە ئەستۆی!) (تاج/٩ل-٣٢+ریاض/ال -١٩٤ز-٢٦).

## راڤەو شیکردنەوە:

سەعیدی کوڕی زەید کوڕی عەمری ئەل عەدەوییە(رەزای خوای لێ بێ) ، یەکێکە لەموسوڵمانە هەرە پێشینەکان، ئیمامی عومەر لەماڵی ئەودا ئیسلام بوو، سەعید مێردی فاطیمەی کچی خەطاب بوو، کەخوشکی پێشەوا عومەر بوو، سەعید یەکێکە لەعەشەرەی موبەشەرە، واتە: یەکێکە لەو دەکەسە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەژیانی خۆی دا مژدەی بەهەشتی پێ داون، ئامادەی گەلێ لەغەزاو نەبەردەکانی پێغەمبەر بووە، وەك غەزای یەرموك، بەشداری لەئازاد کردنی دیمەشق دا کردووە، سەعیدی کوڕی حەبیب دەیفەرموو: ئەم زاتانە لەخزمەت پێغەمبەردا لەیەك پلەو پایەدا بوون: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو سەعدو سەعیدو طەلحەو زوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، لەشەڕو کوشتاردا لەبەردەمیەوە بوون،

---

(١٣٠) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: تحريم الظلم و غصب الأرض، رقم: ١٦١٠.

لەنوێژدا لەپشتیەوە بوون، سەعید پیاوێکی گەنم رەنگی توکن بوو، نزای زۆر زوو گیرا دەبوو، زەیدی باوکی پیاوێکی رۆشنبیر بوو، لەسەر دینی حەزرەتی ئیبراهیم بوو (سلاوی خوای لێ بێ)، خوێنو مردارەوەبووی نەدەخوارد، هەروا گۆشتی ئاژەڵێکی نەدەخوارد کە ناوی بتو ئەنصابی لەسەر هێنرابێ، لەپێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا، بەخزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەگا، بەڵام فریای هاتنی ئیسلام ناکەوێ، ئیبنوعەبدول بەرر راگوێز دەکا: سەعیدی کوڕی زەید دەچێتە خزمەتی حەزرەت، عەرزی دەکا: قوربان! باوکم ئەوەبوو کەخۆت دیوتەو خەڵك باسی کردووە بۆت، کەواتە نزای بۆ بکەو بۆی بپاڕێرەوە کە خوا لێی خۆش بێ، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باوکت لەرۆژی قیامەتدا کە زیندوو دەکرێتەوە، بەیەك نەتەوەی تەواو دادەنرێ!).

هەندێ زەید بەصەحابی دادەنێن، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە(إصابة) دا دەفەرموێ: ئەم بۆچوونە جێگەی وردەوە بوونو سەرنجە، چونکە زەید بەپێنج ساڵ بەرلەوەی پێغەمبەر ببێ بەپێغەمبەر مردووە، سەعید سێ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، سەعید لەکۆتایی تەمەنیدا لە عەقیق دەمرێ، تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ مەدینە لەوێ بەخاکی دەسپێرن، لەساڵی (٥٥) پەنجاو پێنجی کۆچی دا دەمرێ، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، تەمەنی نزیکی حەفتاو سێ ساڵ بووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

١٠٦٤- حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ مُحَمَّدٍ أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ عَنْ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ أَخَذَ شَيْئًا مِنْ الأَرْضِ بِغَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ) (الحديث ٢٤٥٤، طرفُهُ في: ٣١٩٦) (١٣١).

---

(١٣١) لم يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (فتح/٥/١٣٧-خاتمة كتاب المظالم) المترجم.

**ئیبنــو عومــەر**(ڕەزای خــوای لــێ بــێ) **فــەرمووی: خۆشەویــست**(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) **فــەرمووی: (هەرکەسـێ بـەناڕەوا پارچـەیێ زەوی زەوت بکـات، ڕۆژی قیامـەت هەتا هـەر حـەوت تەبەقـەی زەوی ڕۆدەچـێ بـەناخی دا) (تـاج/٩ل-٣٢ف-٢ز-١٠، بڕوانە: ژمارە: ١٠٦٣).**

١٠٦٥- عَنْ جَبَلَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قال: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ فِي بَعْضِ أَهْـلِ الْعِـرَاقِ فَأَصَـابَنَا سَـنَةٌ، فَكَـانَ ابْـنُ الزُّبَيْـرِ يَرْزُقُنَـا التَّمْـرَ فَكَـانَ ابْـنُ عُمَـرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) يَمُرُّ بِنَا فَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَـنْ الإِقْرَانِ إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ أَخَاهُ). (الحديث ٢٤٥٥، أطرافُهُ في: ٢٤٨٩، ٢٤٩٠، ٥٤٤٦)[١٣٢].

**جەبەلە** - ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ - **فەرمووی: جارێ لەگەڵ وەفدێکی عێراقی دا لەمەدینە بووم، لـەو سـەردەمەدا کـە عەبـدوڵڵای کوڕی زوبـەیر**(ڕەزای خوای لێ بێ) **جێنشینی سەر مەدینە بوو، ساڵەکەی گرانیو وشکەساڵ بـوو، ئیبنـو زوبـەیر بەخورما موچەی ساڵانەی پێمـان دا، جاروبـار کـە ئیبنـو عومـەر**(ڕەزای خوای لێ بێ) **دەهات بۆ ناومان دەیفەرموو: پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **نەیی کردووە لەوە کە مرۆڤ دوو دەنك دوودەنك خورما پێکەوە بخوات، ئیبنـو عومـەر**(ڕەزای خوای لێ بێ) **دەیفـەرموو: (بـەڵام ئەگـەر هاوڕێـکانی ڕێـگەی ئـەوەی بـدەن ئـەو کاتـە دروستەو ناباشی نییە ). (تاج/٤ل-٦٨ز-٢٠ف-٥).**

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**ئەم نەیی کردنە لەجووت کردنی دوو دەنـك لـەکاتی خواردنـدابۆ هـەموو میوەیەکە، هۆی ئەم نەیی کردنەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك:**

---

(١٣٢) أخرجه مسلم في الأشربة، باب: نهي الآكل مع الجماعة عن قران تمرتين.. رقم: ٢٠٤٥.

١- ئـەدەبی خـوانو دەسـتووری نـانخواردن ئـەوە دەخـوازێ، بەتایبـەت ئەگـەر لەگەڵ کۆمەڵ دابێ.
٢- لەکاتی ئاوو نانخواردندا هەرچی هەڵپەهەڵپو زۆر خۆریو چاوچنۆکی بێ باش نییە.
٣- شـتی هاوبـەش بـەبێ مۆڵـەت وەرگـرتن لەهاوبەشـەکان، تەصـەروفێ سەربکێشێ بۆ بەکارهێنانی پتر لەبەشی خۆت ناباشە.
٤- کاتی گرانیو نەبوونی، رزقو رۆژی هاوبەش بەیەکسانی بێ باشە.

١٠٦٦ – عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الأَلَدُّ الْخَصِمُ) (الحديث ٢٤٥٧، طرفاهُ في: ٤٥٢٣، ٧١٨٨) [(١٣٣)]

حـەزرەتی عائیـشە (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (لـەلای خـودای گـەورە رەزاگـرانترین کـەس ئەوانـەن، کـەرق ئەستوورو شەڕانین!) (تاج/٣/ل-٣٢٠ز-١٢٢).

١٠٦٧ –عن أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) زَوْجَ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : أَنَّهُ سَمِعَ خُصُومَةً بِبَابِ حُجْرَتِهِ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ فَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَدَقَ فَأَقْضِيَ لَهُ بِذَلِكَ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنْ النَّارِ، فَلْيَأْخُذْهَا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا) (الحديث ٢٤٥٨، أطرافُهُ في: ٢٦٨٠، ٢٩٦٧، ٢١٦٩، ٧١٨١، ٧١٨٧) [(١٣٤)].

ئوممووسـەلەمەی هاوسـەری پێغەمبـەر (رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: دوو پیاو هاتنە لای حـەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) هەندێ کەلەپوریان هـەبوو، لەسـەری بـوو

(١٣٣) أخرجه مسلم في العلم، في الألد الخصم، رقم: ٢٦٦٨.

(١٣٤) أخرجه مسلم في الأقضية، باب: الحكم بالظاهر و اللحن بالحجة، رقم: ١٧١٣.

بوو بەناكۆكیان، لەبەردەرگای هۆدەكەی پێغەمبەردا بوو بەدەمە قاڵەیان كەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داوای رووت نەبێ، كاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گوێی لە قرەقرِیان بوو، چووە دەرەوە بۆ لایان، كاتێ لەمەسەلەكە حاڵی بوو، فەرمووی: (منیش هەر ئادەمیزادم و، وەك ئێوەغەیبزان نیم، لەبەر ئەوە بەپێی رووكاری كارەكە برِیار دەدەم، جا وادەبێ دوو هاوداوا دێن بۆلام، بۆ دادگایی، رێدەكەوێ یەكێكیان لەوی تریان بەدەموپل ترەو قسەزانترە، منیش وادەزانم كەراست دەكا، وە لەم رووەوە برِیاری بۆ دەدەم و بەظاهیر داواكە دەباتەوە، دەی بزانن: هەر كەسێ لەسەر قسەی ناڕەوای خۆی من شتێ برِیار بدەم بۆی، بەوە نابێ بەهی ئەو كەواتە باوەری نەگرێ، چونكە شتیوا بەو برِیاردانەی منە، كەلەسەر شایەتیو بەڵگەو قسەی ناڕەوای خۆی بووە، نابێ بەهی خۆی، بەڵكوو ئەوە پارچەیێ ئاگری رووتە من برِی دەدەم بۆی! ئیتر پاش ئەم روونكردنەوە: یە ئارەزووی خۆیەتی ئەو پارچە ئاگرەیە هەڵدەگرێ یا وازی لێ دێنێ!) (تاج/٣/ل-٣١٣ز-١١٨ف-٣).

١٠٦٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلا يَقْرُونَنَا فَمَا تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ) (الحديث ٢٤٦١، طرفهُ في: ٦١٣٧) [١٣٥].

عوقبەی كوری عامیر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتمان كرد: قوربان! وادەبێ تۆ دەمان نێری بۆ كارو فرمانێ، جاری واهەیە دەچینە ناو ئاواییەك، میواندرایمان پێ ناكەن،جا لەم بارەیەوە فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی پێمان: (كاتێ ئەبن بەمیوانی خەڵك، ئەگەر ئەوەی كەباوە بۆ

(١٣٥) أخرجه مسلم في اللقطة، باب: الضيافة و نحوها، رقم: ١٧٢٧.

میوان دەکرێ بۆیانکردن ئەوا لێیان قەبووڵ بکەن، دەنا ئەگەر نەیانکرد خۆتان ئەوەی مافی میوانە لێیان بستێنن!).

**راڤەو روونکردنەوە:**

پەیوەندی بەبابەتەکەوە لەو روەوەیە، کەنەدانی مافی میوان ناڕەواییە، لابردنی ناڕەوایش کارێکی بەجێیە.

١٠٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا يَمْنَعْ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي جِدَارِهِ) ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ وَاللّٰهِ لأرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ) (الحديث ٢٤٦٣، طرفاهُ في: ٥٦٢٧، ٥٦٢٨) [١٣٦].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (رێگەی دراوسێ بدەن کەسەری دەستەك و گوێسەوانە لەسەر دیواری ئێوە دابنێن). لەپاشا ئەبوهورەیرە فەرمووی: ئەوە بۆچی دەتان بینم لوتەلان لەم فەرمایشتە! دەسا بەیەزدانی پاك خۆشیتان بێ و ترشیتان بێ، من ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ دەهێنم و ئەم فەرمایشت و ئامۆژگارییانە وەك گوڵ مێخ دەکوتم بەناو شانتانا. (تاج/٢ل-٣٣٤ف —٥ز-١٥٨)

١٠٧٠-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ) فَقَالُوا: مَا لَنَا بُدٌّ إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ: (فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلاّ الْمَجَالِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا) قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: (غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الأذَى وَرَدُّ السَّلامِ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ) (الحديث ٢٤٦٥، طرفُهُ في: ٦٢٢٩).

---

(١٣٦) أخرجه مسلم في المساقاة، باب: غرز الخشب في جدار الجار، رقم: ١٦٠٩.

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەکەن لەسەرر ڕێگەوبان دابنیشن) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نییە، جێگەی ترمان نییە، کەلێی دابنیشین‌و دەمە تەقێی لێ بکەین، ئەوێ نەبێ. فەرمووی: (کەوای لێ هات، مافی ڕێگەوبان بەجێ بهێنن) گوتیان: قوربان! ئایا مافی ڕێگەوبان چییە؟ فەرمووی: (چاوی خۆتان بگرن‌و تەماشای نامووس‌و نەنگی خەڵکی پێ مەکەن‌و ئەگەر شتێکتان بەرچاو کەوت چاوپۆشی لێ بکەن‌و ئازاری کەس مەدەن‌و مەبن بەئێش‌و ئازار بۆ ڕێبوار، وەڵامی سڵاو بدەنەوەو ڕێگەی باش نیشانی خەڵك بدەن‌و جڵەو گیریی لەخراپە بکەن).(ریاض/ال-١٧٥ف-١٩٠ز-٢٣-الأمر بالمعروف و...)

١٠٧١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا تَشَاجَرُوا فِي الطَّرِيقِ بِسَبْعَةِ أَذْرُعٍ) (الحديث٢٤٧٣).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر حەوت گەز بەگەزی بەنایی داناوە بۆ پانیی ڕێگەی گشتی، ئەگەر لەسەری بووبە کێشەو بەرە).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

یاسایەکی ئوصولی هەیە دەفەرموێ: (بڕیار بەپێی ڕۆژ دەگۆڕێ) : مەبەست لەم جۆرە یاسا ئوصولیە ئەم جۆرە بڕیارانەیە، کە بەپێی کات‌و شوێن‌و سەردەم، بابەتی مەحکوموفیهیەکە دەگۆڕێ. ئەمە بۆ جاران بوو، ئێستا شەقام‌و ڕێگەوبان دەستوورو ڕێساو یاسای تایبەتی خۆی هەیە.

١٠٧٢- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ الأَنْصَارِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَهُوَ جَدُّهُ أَبُو أُمِّهِ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ) (الحديث ٢٤٧٤، طرفُهُ في: ٥٥١٦) (١٣٧).

---

(١٣٧) قال العيني: (وهذا الحديث من أفراد البخاري) ج/١٣/ص٢٥ - المترجم.

عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی ئەل ئەنصاری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەتاڵان و ڕاوو ڕووت، هەروا نەیی کردووە لەئەتك کردنی جەستەی مرۆڤو شێواندنی چ بەزیندوویی، چ بە مردوویی، وەك لووت بڕین و گوێقرتاندن و دەست وپاپەڕاندن و چاو هەڵکۆڵین. لەتاج دا، لەبەرگی هەشتەم دا، لەلاپەڕە (١٣١) دا، ئەم فەرموودەیە ئاوا کراوە بەکوردی: (پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تاڵان و بڕوو لچ و لێو کردن و ئەتك کردنی هەموو گیانداریکی قەدەغە کردووە).

١٠٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ) (الحديث ٢٤٨٠) [١٣٨].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست فەرمووی: (هەر کەسێ لەسەر ماڵی خۆی بکوژرێ ئەوە شەهیدە) (ریاض/٣ل-٩٧١ز-٢٣٥ف-٣+٤).

١٠٧٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ مَعَ خَادِمٍ بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ فَضَرَبَتْ بِيَدِهَا فَكَسَرَتْ الْقَصْعَةَ فَضَمَّهَا وَجَعَلَ فِيهَا الطَّعَامَ وَقَالَ: كُلُوا) وَحَبَسَ الرَّسُولَ وَالْقَصْعَةَ حَتَّى فَرَغُوا فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ وَحَبَسَ الْمَكْسُورَةَ) (الحديث ٢٤٨١، طرفُهُ في: ٥٢٢٥) [١٣٩].

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵی ژنێ لەژنەکانی بوو، ژنێکی تری بەکارەکەرێکی خۆیا لەگەنێ خواردەمەنی بۆ نارد، ژنەکەی تەنگە گرتی و دەستی کێشا بەلەگەنەکەداو شکاندی. جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەردوو لەتی لەگەنەکەی نوساندنەوە بەیەکەوەو

(١٣٨) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الدليل على أنَ من قصد مال غيره، رقم: ١٤١.

(١٣٩) قال العسقلاني: (لم يوافقه مسلمٌ على اخراج حديث انس في القصعة المكسورة (فتح/٥ص١٢٧) خاتمة كتاب المظالم – المترجم.

خواردەمەنییەکـەی تـێ کـردەوەو فـەرمووی: (دایکتـان تەنگـە دەیگـرێو دڵـی پـڕ بـووە، بۆیـە لەگەنەکـەی هەوێـکەیی شـکان ئێـوە بخـۆن) ئـەوانیش خواردیـان، جـا کەلەگـەنی ژنەکـەی تریـشی هـات دیـسان فـەرمووی: (بخـۆن، رابـەرو لەگەنـە شکاوەکەیـشی گـل دایـەوە، تالـێ بوونـەوە، ئەوسـا لەگەنـە ساغەکەی دا بەکارەکەرەکـەو لەگەنـە شـکاوەکەی گـل دایـەوە، بۆئـەو ژنـەی کەلەگەنی ژنەکەی تری شکاند!). (تـاج/٢/٣٤٢ز-١٦٣ف-٦).

## پایانێ(خاتمە)

مامۆستای ئیبنوحەجـەری عەسـقەلانی (رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ) دەفـەرموێ: نامەی ناڕەواییەکان (كتاب المظالم) چلو هەشت فەرموودەی واتیادا، شەشیان بێ ڕشتەن، واتـە: تـەعلیقن، بیـستو هەشـتیان دووبارەن، سـا یـا لـەم نامـەدا، دووبارە بوونەتەوە، یان لـە پێشیەوە، پاڵفتەکـەیان دەکاتـە (٤٨-٢٨=٢٠) بیـست فـەرموودە. پێـشەوا موسـلیمیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) گـشتیانی دەرهێنـاوە، واتـە: تەخریج کردووە بێجگە لەفەرموودەکەی:

١- ئەبوسەعید: (إذا خلَصَ المؤمِن) = (١٠٥٧ت= ٢٤٤٠ف).
٢- ئەنەس: (أُنصُر أخاك) = (١٠٦٠ت= ٢٤٤٤ف).
٣- ئەبوهورەیرە: (مَنْ كانتْ لهُ مَظْلَمَةٌ) =(١٠٦٢ت= ٢٤٤٩ف).
٤- ئیبنو عومـەر: (مـنْ أخَـذَ شـيئاً مـن الأرضِ) = (٢٤٥٤ف) لەتەجریدەکـەدا فەرموودەکەی سەعیدی کوڕی زەید هاتووە، کە ژمارەکەی (١٠٦٣).
٥- عەبدوڵڵای کوڕی یەزید (في النَهي عن النُهبى والمُثلَة) = (١٠٧٢ت= ٢٤٧٤ف).
٦- ئەنەس سەبارەت بە لەگەنە شکاوەکە (١٠٧٤ت= ٢٤٨١ف).

هـەروا دەفـەرموێ: حـەوت بیـستراو (ئـەثـەر) یـشی واتیـادا. لەتەجریدەکـەدا هەژدەیانی واتیادا لە(١٠٥٧) وە هەتا(١٠٧٤) ئاوا: (١٠٧٤-١٠٥٦=١٨).

(وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٢- نامەی هاوبەشی (كتابُ الشِركة)

## ١- باسی هاوبەشی لەخۆراكو خەرجیو مەصرەفی كاتی ڕێبواریو لەهەموو جۆرە كاڵاو سامانێكا

## (باب الشركة في الطّعام والنّهد والعروض)

١٠٧٥- عَنْ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ خَفَّتْ أَزْوَادُ الْقَوْمِ وَأَمْلَقُوا فَأَتَوْا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي نَحْرِ إِبِلِهِمْ فَأَذِنَ لَهُمْ فَلَقِيَهُمْ عُمَرُ فَأَخْبَرُوهُ فَقَالَ: مَا بَقَاؤُكُمْ بَعْدَ إِبِلِكُمْ؟ فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَارَسُولَ اللَّهِ: مَا بَقَاؤُهُمْ بَعْدَ إِبِلِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (نَادِ فِي النَّاسِ فَيَأْتُونَ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ) فَبُسِطَ لِذَلِكَ نِطَعٌ وَجَعَلُوهُ عَلَى النِّطَعِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَدَعَا وَبَرَّكَ عَلَيْهِ ثُمَّ دَعَاهُمْ بِأَوْعِيَتِهِمْ فَاحْتَثَى النَّاسُ حَتَّى فَرَغُوا ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ) (الحديث ٢٤٨٤، طرفُهُ في: ٢٩٨٢) (١٤٠).

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای هەوازین دا، كە ناسراویشە بەڕۆژەكەی حونەین، كە لەشەشی مانگی شەشەڵاناساڵی ئازادكرنی مەككە، لەپاش فەتحی مەككە روی دا، موسوڵمانان دوازدەهەزاربوون، سوپای هەوازینو هاوپەیمانەكانی چواردەهەزار بوون، لەشیوی حونەین دا كەوا لەنێوان مەككەو طائیف دا، شەڕەكە رووی دا، جا بەرەبەرە توێشووو نانەبەرەكانی سوپای ئیسلام هاتە كزیو هەژاریو نەداری یەخەی پێ گرتن، جا لەتاو برسێتی چوون بۆ خزمەتی حەزرەتو عەرزیان

(١٤٠) رواه مسلم في كتاب اللقطة، باب: استحباب المواساة بفضول المال صم/ج/١٢ص٣٣+ ج/١ص٢٢٢-نووي- المترجم.

کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەگەر رێگەمان پێبدەی وشترەکانمان سەر دەبڕین؟ ئەویش رێگەی پێدان، لەرێگە توشی ئیمامی عومەر بوون، لەحاڵەکە حاڵییان کرد، ئەویش فەرمووی: (ژیانی ئێوە بەستراوە بەوشترەکانتانەوە، ئەگەر ئەوان نەمێنن، خۆشتان سەرتان تیادەچێ) ، جا چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: (قوربان! وشترەکان، ژیان ومانیانە) پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی کەوایە، بەناو لەشکرەکەدا جاڕبدەنو بانگەواز هەڵبدەن کەپاشەرۆكو پاشماوەی توێشەبەرەو نانەبەرەکانیان بهێنن).

جا بۆ ئەم مەبەستە لەسەر فەرمانی خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) کەوڵیان راخست، جا ئەو بنبۆڵو پاشەڕۆکەی کە لەناو توێشەبەرەکانیانا مابوو، هێنایانو هەڵیان ڕشتە سەر کەوڵەکە، جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵساو لەسەری راوەستاو نزای پیتو فەڕی بەسەردا خوێند، ئەوسا بەفەرمانی خۆشەویست بانگەواز هەڵدرا کەئەی خەڵکە توێشەبەرەو جەواڵەکانتان بهێننو خۆراك بەرن! ئیتر پیتو فەڕێکی ئاشکرای وا کەوتە ئەو کەمە خۆراکەوە، لەشکرەکە بەلەپ لێیان دەماڵیە ناو دەفرەکانیانەوە، هەتا هەموو پڕبوون.

جا دیمەنەکە ئەوەندە شیرینو کاریگەر بوو، موعجیزەکە ئەوەندە روونو ئاشکرا بوو پێغەمبەر – سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ – بۆ تەحەدوث بەبەهرەو نازو نیعمەتی خودا شایەتمانێکی بەهەقی هێناو فەرمووی: (أشهدُ أن لاإلـه إلاّ الله وأنّ محمداً رسولُ الله: بەزمان دەڵێمو بەدڵ باوەڕ دەکەم کە تەنها خودای گەورە خودایەو بەس، وە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایش بەندەو پێغەمبەری ئەوە). (بڕوانە: تاج/٤ل-٣٤٣ز-١٠٦- باسی موعجیزەکانی پێغەمبەر).

پەوەنــدی ئــەم فەرموودەیــە بەبابەتەكــەوە لەوەدایــە، كــە پاشــەڕۆكی توێــشەبەرەكانیان لەســەر كەولــێ كــۆدەكردەوەو لــەپاش نــزای پیــت وفــەڕ خوێندن بەسەریدا، لەلایەن خۆشەویستەوە، دەستیان كرد بەلێبردنی.

١٠٧٦-عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ) (الحديث ٢٤٨٦) [(١٤١)].

ئەبو موسا(رەزای خوای لێ بێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر فــەرمووی: (ئەشعەرییەكان كــە هــۆزی ئــەبو موســای ئەشــعەرین، مەردایيــەكیان هەیــە ئەگــەر لەغــەزادا خواردنیان هاتەكزی -یاخود لەناو شارو ئاوایی دا، نــانو خــۆراكی خێزانیــان هاتە كەمی- دێــن ئــەوەی مــاوە لــەلایان، هەمووی لەیــەك دەفــرا كۆدەكەنــەوە، ئــەوجا بــەقاپێ، بەحاجــەتێ، لەبــەینی خۆیانــا وەك یــەك، یەكــسان، بەشــی دەكەن، ئەوان لەمنو من لەوانم!) (تاج/٥/ل-٢٢٨ف-٤ز-٦٣).

١٠٧٧-عَنْ رَافِعِ بن خديج رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذِي الْحُلَيْفَةِ فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ وَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَمًا وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أُخْرَيَاتِ النَّاسِ فَعَجِلُوا وذبحوا فَنَصَبُوا الْقُدُورَ فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ، فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنْ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ فطلبوهُ فأعياهُم وكانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَجُلٌبِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ ثم قَالَ: (إِنّ هَذِهِ الْبَهَائِمُ أَوَابِدُ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فَمَا غلبكم منها فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا). فَقَالَ: جَدِّي إِنَّا نَرْجُو أَوْ نَخَافُ أَنْ نَلْقَى الْعَدُوَّ غَدًا وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ فَقَالَ: (مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ)

---

(١٤١) أخرجهُ مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل الأشعريين، (رەزای خوای لێ بێ) ، رقم: ٢٥٠٠

(الحـديث ٢٤٨٨، أطرافُـهُ في: ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٨، ٥٥٠٣، ٥٥٠٦، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤)[١٤٢].

رافيعى كوڕى خەديج(ڕەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: لەذولحولەيفە لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، لەشكرەكەى پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) توشى برسێتى بوون، جا وشترو ئاژەڵى تاڵانيان وەدەست كەوت، فەرمووى: پێغەمبەر خۆى(درودى خواى لەسەر بێ) لەدواى سوپاكەوە بوو، خەڵكەكەش پەلەيان بوو، دەستيان كرد بەئاژەڵ سەربڕينو مەنجەڵيان خستە سەر ئاگر، هەتا كاتێ پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) هاتە بەرەوە، بەم حاڵەى زانى وەك تەمێ كردنێ بۆيان، فەرمانى دا مەنجەڵە گۆشت ومەرگەكانيان قلْپ كردەوە، ئەوجار پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) خۆى دەستكەوتەكەى دابەش كرد، وە دە سەر پەزى بەيەك وشتر دانا، جا لەم نێوانەدا، وشترێ بەلەسە بوو، تەرا بوو، كەوتنە شوێنى، چاريان نەكرد، ماندووى كردن لەناو لەشكرەكەدا چەند وڵاخێكى بەرزەى كەم هەبوو، جا پياوێ لەياريدەدەران تيرێكى پێوەناو خودا بەو تيرە گلى دايەوە.

ئەوجا پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) فەرمووى: (هەندێ لەم ئاژەڵانە سڵو سركن، وەك جانەوەرى كێوى سركو تۆرەن جائەگەر شتىوا رووى داو چارتان نەدەكرد، كە بەشێوەى ئاسايى سەرى ببڕن، ئەوە وەك ئەمە ئاواى لێ بكەن، ئەوە برى سەربڕينەكەى دەكەوێ) رافيع فەرمووى: گوتم: قوربان! ئەى پێغەمبەرى خودا! ئێمە لەشەڕداينو لەگەڵ دوژمن داينو دوورنيە سبەينێ بەرەنگارى يەكتر نەبين، جا ئەگەر ويستمان ئاژەڵ سەربڕين چەقۆو كێردى پێويستمان پێ نييە، ئايا بەتەڵە قاميشى تيژو چەقۆى بەردين حەيوان سەربڕين؟ فەرمووى: (گورج بەو دەستو بردى لێ بكەو بەشتى زۆر كول مردارى مەكەرەوە، ئيتر بەهەرچى سەرى دەبڕى باشە، بەمەرجێ

(١٤٢) أخرجهُ مسلم في الأضاحي، باب: جواز الذبح بكلّ ما أنهر الدم، رقم: ١٩٦٨.

فیچقه بەخوێنەکە بکاو لەکاتی سەربڕین دا، خوێنەکە پەلە میزکە ببەستیّ، وەناوی خودای لیّ ببڕیّ، وە بەمەرجیّ ئەوەش، ئەو شتەکە پێی سەردەبڕڕیّ ددان و نینۆك نەبیّ، ئیتر لێی بخۆ، چونکە ئەوە حەلاڵە، پێشت بڵێم کەلەبەرچی دروست نییە شت بەددان و بەنینۆك سەربڕیّ، چونکە ددان ئێسکەو ئێسکیش کولەو تیژ نییە، وبەزۆری مرداری دەکاتەوە.

نینۆکیش چەقۆی حەبەشییە ناموسوڵمانەکانە، ئەوان دەستووریان وایە، زۆرینەی کات ئاژەڵ بەنینۆك دەخنکێنن و دەیخۆن، دەی چاولێکردنیان لەم بیّ شەرعیەدا نادروستە).

## راڤەو شیکردنەوە:

لەم جۆرە کاتانەدا ئەگەر پاش پێکانی ئاژەڵە بەلەسە بووەکە، بەئاسانی دەتوانرا سەربڕیّ ئەوە دەبیّ بەسەربڕین حەلاڵ بکریّ، بەلاّم ئەگەر مەودای سەربڕین نەبوو ئەوە پێکانەکەی بڕێتی سەربڕین دەکەویّ و بەوە حەلاڵ دەبیّ، هەندیّ شت هەیە هەڵەیەکی بلاّوە، وەك مل هەڵکێشانی چۆلەکەو شتی تری وەك چۆلەکە، ئەوە حەرامە، بەوە حەلاڵ نابیّ.

١٠٧٨-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ أَعْتَقَ شَقِيصًا مِنْ مَمْلُوكِهِ فَعَلَيْهِ خَلَاصُهُ فِي مَالِهِ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ قُوِّمَ الْمَمْلُوكُ قِيمَةَ عَدْلٍ ثُمَّ اسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ) (الحديث ٢٤٩٢، أطرافُهُ في: ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧) [١٤٣].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بیّ) فەرمووی: (ئەوەی کەبەشی خۆی لەکۆیلەیەك ئازادبکا، لەسەریەتی لەماڵی خۆی هەمووی ئازاد بکا، ئەگەر ئەوەندەی ماڵ هەبوو کەبەشی ئەوە بکا، بەلاّم

(١٤٣) أخرجهُ مسلم في العتق، باب: ذكر سعاية العبد، وفي الأيمان، باب: من أعتق شركا.. رقم: ١٥٠٣.

ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو ئەوا هەر ئەو بەشەی ئازاد دەبێ کە ئازادکراوە، ئەوسا کۆیلەکە بەنرخی کاتی کۆیلەیی رێك دەقەبڵێنرێ، ئەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ تا ئەوەندە پەیدا دەکا، کە بیدات بەئاغاکەی‌و بەیەکجاری خۆی پێ ئازاد دەکاو، لەکۆیلەیی رزگاری دەبێ، بەڵام نابێ زەبری زیاد لەئەندازەی لێ بکرێ، بۆ پەیدا کردنی بەهای ئەو بەشەی تری کەلەسەر خۆیەتی بەکارکردن ئازادی بکات). (تاج/٣/ل-٣٧ف-١-ش/د/ت/ن).

١٠٧٩-عن النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَثَلُ الْقَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللَّهِ وَالْوَاقِعِ فِيهَا كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ فَأَصَابَ بَعْضُهُمْ أَعْلاهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنْ الْمَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكوا جَمِيعًا وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعًا) (الحديث ٢٤٩٣، طرفُهُ في: ٢٦٨٦)[١٤٤].

نوعمانی کوڕی بەشیر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (وێنەی کەسێ کەئاگای لەخۆی بێ‌و خۆی بپارێزێ لەو شتانەی کە خودا سنووری بۆ داناون،و ئەو سنوورانە نەبەزێنێ، لەگەڵ ئەو کەسەدا کەگوێ نەداتێ‌و سنوورەکانی خودا ببەزێنێ‌و بێ فەرمانی خودا بکا، وێنەی ئەم دوو جۆرە کەسەیە، وەك وێنەی کۆمەڵێ وایە کەلەناو خۆیانا لەسەر جێگەی خۆیان، لەناو پاپۆڕێکی دووقاتی دا تیروپشك بکەن، تاقمەیەکیان قاتی سەرەوەیان بەربکەوێ‌و ئەوانی تریان قاتی خوارەوەیان بەربکەوێ، ئەوانەی لەقاتی خوارەوەن بەسەر ئەوانەدا بچن بۆ ئاو کەوان لەقاتی سەرەوە، لەبەر ئەوەبڵێن: بۆچی ئێمە لەبەشی خۆمانا کونێکی تێنەکەین‌و ئیتر ئەوەندە ئازاری ئەوانەی قاتی سەرەوە نەدەین،و بەسەریانا نەچین‌و

(١٤٤) لمْ يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (خاتمة كتاب الشركة/فتح/٥ص١٣٩) المترجم.

نەیەین، جا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە وازیان لێ بێنن‌و رێگەی ئەوەیان پێ بدەن، کە کونی تێ بکەن، ئەوا پاپۆڕەکە پڕدەبێ لەئاوو نوقم دەبێ، هەموویان وەکوویەك دەفەوتێن، بەلاَم ئەگەر دەستیان بگرن‌و نەهێلن ئەو هەلّەیە بکەن، ئەوا خۆیشیان‌و ئەوانەی خوارەوەیش هەردوولا رزگاردەبن!) (ریاض/٢/ل/١٧٣ژ-١٨٧/٤ز-٢٣).

١٠٨٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ هِشَامٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذَهَبَتْ بِهِ أُمُّهُ زَيْنَبُ بِنْتُ حُمَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ بَايِعْهُ فَقَالَ: (هُوَ صَغِيرٌ) فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَدَعَا لَهُ) (الحديث ٢٥٠١، طرفُهُ في: ٧٢١٠) (١٤٥).

عەبدوڵڵای کوڕی هیشام(ڕەزای خوای لێ بێ) کەیەکێ بوو لەو هاوڕێ منالّکارانەی کەبەبچکۆلّەیی بەخزمەت پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گەیشتبوون فەرمووی: منالّکار بووم، دایکم -کە زەینەبی کچی حەمید بوو- بردمی بۆ خزمەتی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پەیمان ببەستە لەگەلّ عەبدوڵڵای کوڕم؟ ئەویش فەرمووی: (ئاخر منالّە، بچووکە کاتی پەیمان پێدانی نەهاتووە). ئەوسا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی پیرۆزی هێنا بەسەر سەری عەبدوڵڵاداو نزای باشی بۆ کرد.

١٠٨٠-(مكرر) وعنهُ(رَضِيَ اللّٰهُ عَنه) أَنَّهُ كَانَ يَخْرُجُ إِلَى السُّوقِ فَيَشْتَرِي الطَّعَامَ فَيَلْقَاهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ وَابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهم) فَيَقُولانِ لهُ: أَشْرِكْنَا فَإِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ دَعَا لَكَ بِالْبَرَكَةِ فَيُشْرِكُهُمْ فَرُبَّمَا أَصَابَ الرَّاحِلَةَ كَمَا هِيَ فَيَبْعَثُ بِهَا إِلَى الْمَنْزِلِ) (الحديث ٢٥٠٢، طرفُهُ في: ٦٣٥٣) (١٤٦).

---

(١٤٥) لمْ يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (فتح /٥ خاتمة كتاب الشركة ص١٣٩) المترجم.

(١٤٦) لمْ يوافقهُ مسلمٌ على إخراجه (المصدر السابق) — المترجم.

دیسان عەبدوڵڵای کوڕی هیشام(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار کە دەچووم بۆ بازاڕ بۆ ئاڵ و وێڵ، بۆ کڕین و فرۆشتنی دانەوێڵەو خواردەمەنی، ئیبنو عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرم پێ دەگەیشتن(ڕەزای خوای لێ بێ) پێیان دەفەرمووم: (هەرچیت کڕی ئێمەیش بکە بەهاوبەشی خۆت، چونکە مسۆگەر قازانجێ باش دەکەیت، چونکە تۆ کاتی خۆی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نزای پیت و فەڕی بۆ کردویت، منیش دەمکردن بەهاوبەشی خۆم، ئەم عەبدوڵڵایە لەپیت و فەڕی نزای پێغەمبەرەوە، خودا وا پیرۆزی خستبوە مامەڵەو سەودایەوە، جاری وادەبوو لەمامەڵەیەکدا یەك وڵاخی بارەبەری بەتەواوی قازانج دەکرد!! وەلەسەر ئەو شێوەیە کە دەیکڕی دەیناردەوە بۆ ماڵەوە!).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

یەکەم: ئەم بەهرانە لەم دوو فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- دەستهێنان بەسەر منالا.

٢- پەیمان نەبەستن لەگەڵ کەسێ ڕەسیدە نەبوو بێ.

٣- هاموشۆی بازاڕ بۆ سەوداو مامەڵەو بازرگانی و شتیوا.

٤- داواکردنی پیت و فەڕو پیرۆزی لەشتێ لەبارەی دا بێ و لەکەسێ لەشانی دا بێ.

٥- منال دەتوانێ شتی کاتی منالی بەگەورەیی بگێڕێتەوە، وەلەوەدا متمانەی پێ دەکرێ، وەئەگەر لە پێغەمبەرەوە بێ، پێی دەبێ بەهاوەڵ و صەحابە، وەئەگەر لە چینەکانی پاش پێغەمبەرەوەبێ پێی دەبێ بەیەکێ لەپەیڕەوانی ئەو چینە.

٦- بەڵگەیە لەسەر ئەوەکە ژنان منالی خۆیان بردووە بۆ خزمەت خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) هەتا بەخزمەتی بگەن و نزای باشیان بۆ بکا، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کەئەو جۆرە ژنانە زۆر هۆشمەندو دووربین و داناو زانا بوون، وەدەربەستی دوارۆژی منالی خۆیان بوون.

٧- موعجیزەیەکی گەورەی واتیا کە دوعاکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بۆ عەبدوڵلا گیرا بووە.

دووەم: ئەم فەرموودەیە ناوی چوار هاوڕێی پێغەمبەری واتیادا، کە زەینەبی کچی حومەیدو عەبدوڵلای کوڕیو ئیبنوعومەرو ئیبنو زوبەیرن، ژیاننامەی دوانیان لەپێشەوە رۆیشتووە، ئەمەیش بەکورتی ژیاننامەی ئەو دووانەکەی تریان:

عەبدوڵلای کوڕی هیشام شەش ساڵانە بوو، کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) مردووە، عەینی لێرەدا دەفەرموێ: هیشامی باوکی لەپێش ئازادکردنی مەککەدا، بە ناموسوڵمانی مردووە، عەسقەلانیش لەفەتح دا لەشەرحی ئەم فەرموودەیەدا، هەروا دەفەرموێ، کەچی لەئیصابەدا دەفەرموێ: (عەبدوڵلا خۆیو هیشامی باوکی لەهاوڕێیانی پێغەمبەرن) کەچی نەخۆیو نەئیبنو عەبدول بەرر لەئیصابەو لەئیستیعابا لەهەموو بەشەکانی پیتی (هـ) دا باسی هیشام ناکەن. لەچواری کۆچیدا لەدایك بووە، لەمەدینە ژیاوە، هەتا سەردەمی جێنشینی موعاویە ژیاوە لەبوخاری دا چوار فەرموودەی هەیە.

دایکی عەبدوڵلا ناوی زەینەبی کچی حومەیدی کوڕی زوهەیرە هاوڕێتیی پێغەمبەری بەنصیب بووە، لەفەرموودەی ساغدا ناوی چەسپاوە.

مامۆستای ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لەپایانی ئەم نامەی هاوبەشییەدا، دەفەرموێ: (ئەم نامەیە بیستو حەوت فەرموودەی واتیادا، تاقە یەکێکیان بێ ڕشتەیە، بیستو شەشەکەی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن. سیازدەیان دووبارەن، پوختەکەیان چواردەن، شێخی موسلیمیش وەك شێخی بوخاری هەموویانی دەرهێناوە، تەنیا ئەم چەند فەرموودەیەیان نەبێ، فەرموودەکەی نوعمان (مثلُ القائمِ على حدودِ الله) = (١٠٧٩ت=٢٤٩٣ف).

دووفەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی هیشام= (١٠٨٠ت=٢٥٠١ف +١٠٨٠مکرر=٢٥٠٢ف) دوو فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەرو

عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، کەوان لەناو داستانەکەی عەبدوڵلای کوڕی هیشام دا، فەرموودەکەی ئیبنوعەبباس لەفەتح ژمارەکەی (٢٥٠٦). یەك بیستراو (ئەئەر) یشی واتیادا.خودا بۆ خۆی باشتری لیٚ دەزانیٚ.

**تێبینی**:

باسی هاوبەشی لەفیقهی ئاسانا والەبەرگی دوودا، لاپەڕە: ٤٩٦ زنجیرەی: ٢١٧. تەماشاکردنی بیٚ بەهرە نابیٚ.+ (تاج /٢/ل-٣٣٦ز-١٦١).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٥٣- نامەی بارمتە (واتە: رهن) (كتاب الرّهن)

١٠٨١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الظهرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النَّفَقَةُ) (الحديث ٢٥١٢، طرفُهُ في: ٢٥١١) [١٤٧].

ئەبوهورەیرە (رەزای خوای لیٚ بیٚ) لە حەزرەتەوە(دروودی خوای لەسەر بیٚ) دەفەرموی: (وڵاخی سواری -ئەگەر لەبارمتەدا دانرابیٚ- دروستە بارمتە وەرگر سواری پیٚ بکا، ئاژەڵی شیرداریش -ئەگەر لەبارمتەدا دانرابوو- دروستە بارمتە وەرگر شیرەکەی بخواتەوە، وەمەسرەفیش لەسەر ئەو کەسەیە کەسواری ئەو وڵاخە

---

(١٤٧) لمْ يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (فتح/خاتمة كتاب الرّهن ج/٥ص١٤٦) المترجم.

دەبیّ، یاشیری ئەو ئاژەڵە دەخواتەوە!) (تاج/٢/٣٣٢/-ت/ب/د+ فیقهی ئاسان/٢/٤٧٥ز-٢٠٣-باسی بارمتە (رەهن).

## راڤەو شیکردنەوە:

عەسقەلانی دەفەرمویّت: مەبەست لەو کەسە کەمەسرەف دەکات، یەکیّکە لەم سیّ کەسە: بارمتەکارو بارمتەوەرگرو هەرکەسیّکی تر کەمەسرەفی بارمتەکراوەکە بکات، هەروا دەفەرمویّ: (وفيهِ حجَةٌ لمن قالَ يَجوزُ لِلمُرتهِنِ الإنتِفاع بالرَّهنِ إذا قامَ بمصلحتِهِ ولوْ لمْ يأذَن لهُ المالِكُ –راجع المجلد الخامس ص١٤٤ الحديث رقم: ٢٥١٢ ).

١٠٨٢ –عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) انَّ النَّبِيَّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَضَى: أَنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ) (الحديث ٢٥١٤، طرفاهُ في: ٢٦٦٨، ٤٥٥٢)[١٤٨].

ئیبنو عەبباس(رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: پیّغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بیّ) دەفەرمویّ: (بەڵگە لەسەر داواکارەو سویّندیش لەسەر داوالیّکراو) ئەمە گیّڕانەوەی تاجە. (تاج/٣/ل-٣٠٧ز-١١٤).

مامۆستا شیّخی عەسقەلان دەفەرمویّ: نامەی بارمتە نۆ فەرموودەی بەرزەکراوی واتیادا، هەموویان پەیوەستن، واتە/ مەوصولن، شەشیان دووبارەن، پوختەکەیان سیانە، پیّشەوا موسلیمیش لەدەرهیّنانی ئەو فەرموودانەدا هەماهەنگی پیّشەوا بوخاری کردووەو هەموویانی گیّڕاوەتەوە بیّجگە لەفەرموودەی ژمارە(١٠٨١ت= ٢٥١٢ف+طرفه: ٢٥١١).

هەروا دەفەرمویّ: دوو بیستراویشی واتیادا.

---

(١٤٨) وافقه مسلمٌ على تخريجه (المصدر السابق) المترجم.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٤- نامەی کۆیلە ئازادکردن (كتاب العتق)

(باسی کۆیلە ئازادکردن لە فیقهی ئاسان دا وا لەبەرگی/٣ل-٩٩٩-١٠٠٩) (لە تاج دا وا لەبەرگی /٣ ل-٣٣) دا.

١٠٨٣- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا اسْتَنْقَذَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنْ النَّارِ) (الحديث ٢٥١٧، طرفُهُ في: ٦٧١٥) [١٤٩].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (هەر پیاوێپیاوێکی کۆیلەی موسوڵمان ئازاد بکا، خودا لەجیاتی هەر ئەندامێکی ئەو کۆیلەیە، ئەندامێکی ئەو ئازادکارە، لەئاگری دۆزەخ ئازاد دەکا) (تاج/٣/٣٤ف-١-ش/ت).

١٠٨٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ) قُلْتُ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (أَعْلاهَا ثَمَنًا وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا) قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ، قَالَ: (تُعِينُ ضَايِعًا أَوْ تَصْنَعُ لأَخْرَقَ) قَالَ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ، قَالَ: (تَدَعُ النَّاسَ مِنْ الشَّرِّ فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَلَى نَفْسِكَ) (الحديث ٢٥١٨) [١٥٠].

ئەبوذەڕ(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لەخۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) : کام کارە زۆر پەسەندو زۆر باشە؟ فەرمووی: (ئیمان و باوەڕ بەخوداو خەبات و تێکۆشان و غەزاکردن لەرێگەی ئەودا) گوتم: ئەی کام جۆرە بەندەیێ ئازاد بکرێ پاداشت و خێری گەورەترە؟ فەرمووی: (ئەوەی کەبە بەها گرانەو لەلای

(١٤٩) أخرجه مسلم في العتق، باب: فضل العتق، رقم: ١٥٠٩.

(١٥٠) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان كون الإيمان بالله... أفضل.. رقم: ٨٤.

خاوەنەکەی گەڵی چاكو نایابە) عەرزیم کرد: ئەگەر ئەوەم بۆ نەکرا؟ فەرمووی: (یاریدەی پیشەسازی بدە، یادەستی ناشییو کۆڵییەك بگرەو فێری کارێ، ئیشێ، پیشەیەکی بکە) عەرزیم کرد: ئەی ئەگەر ئەویشم بۆ نەکرا چۆن؟ فەرمووی: (شەڕی خۆت لەمەردوم لادەو شەڕ بەخەڵك مەفرۆشە ئەویش هەر خێرە کە بۆ خۆتی دەکەیت) (تاج/٣/٣٥/٣-ش).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە رشتەکەی ئاوایە: ١- شێخی بوخاری: ٢- عوبەیدوڵڵای کوڕیموسا. ٣- هیشامیکوڕی عوروە. ٤- عوروەی کوڕی زوبەیر٤- ئەبوذەڕ.

مامۆستاکەی بوخاری تابیعی تابیعییە، هیشامو عوروەی باوکیو ئەبوموراویح هەرسێکیان، تابیعینو لەیەك چینن، ئەبوذەڕیش صەحابییە.

ئەم جۆرە رشتەیە گەرچی بەدیمەن لەجۆری رشتەی پتر لەسیانییە، بەڵام وا لەحوکمی (سندي ثلاثي = رشتەی سیانی) دا.چونکە دەرهێنەری فەرموودەکە، کەلێرەدا پێشەوا بوخارییە، بەسێ چین، یابڵێین: بەسێ پشت دەگاتەوە بەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە بریتین لە: ١- پەیڕەوانی پەیڕەوان. ٢- پەیڕەوان. ٣-صەحابە.=( أتباع التابعين + تابعين + صحابة).

١٠٨٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ قُوِّمَ الْعَبْدُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ) (الحديث ٢٥٢٢، أنظر: ٢٤٩٢وأطرافُهُ وانظر أيضاً: ٢٥٢١، ٢٥٢٣، ٢٥٢٤، ٢٥٢٥) [١٥١].

(١٥١) أخرجهُ مسلم في أول العتق، وفي الإيمان، باب: من اعتق شركا لهُ في عبد، رقم: ١٥٠١.

واتاکـەی لـەژمارە: ١٠٧٨ دا رابـوورد. راسـترین گوتـە لـەم شـوێنەدا بێژەی(عەبد) بۆ نموونەیە، بۆ مەرج نییە، لەبەر ئەوە لەم بڕیارەدا جیاوازی ژنو پیـاو نییـە، کۆیلـە کـەژن بـێ، یاپیـاو لـەلای جـەماوەری زانایـان هـەمان بڕیاری بۆ هەیە کە لەم فەرموودانەدا باس کراوە، لەوێنـەی بێـژەی(عەبـد) ە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿.... إِلاَّ آتِي الرَّحْمَانِ عَبْدًا﴾ مریم/١٩/٩٢.

١٠٨٦–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ قَـالَ النَّبِيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) : إِنَّ اللَّـهَ تَجَـاوَزَ لِـي عَـنْ أُمَّتِـي مَـا وَسْوَسَـتْ بِـهِ صُـدُورُهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَكَلَّمْ) (الحديث ٢٥٢٨، طرفاهُ في: ٥٢٦٩، ٦٦٦٤) [١٥٢].

ئـەبوهورەیرە(رەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (خوای گەورە چاوپۆشی دەکا لەو خوتـوڕاتو وەسوەسـەی کـە دێـت بەدڵی نەتەوەی ئیسلامی من دا، ئەوەش لەبـەر خـاتری مـن بـەڵام بەمـەرجێ بەکردەوە پیادەی نەکەن، یا بەزمان نەیڵێن!) (تاج/١/٢٤ز-٤).

## راڤەو روونکردنەوە:

مەبەست ئەوەیە ئەو خەیاڵاتو وتووێژە دەروونییەی کـە جاروبـار لـەناو دڵی مرۆڤدا روو دەدا، وەك ئەوە ژن تەڵاق دەدا، یا کۆیلە ئـازاد دەکـا، یـا خێـر بڕیـار دەدا، یـا بـیر لـە گونـاهێ دەکاتـەوەو لەدڵیـەوە پیلانـی بـۆ دادەڕێـژێ، ئـەم جـۆرە خـەیاڵو وڕێنـە دەروونییانـە بایـەخیان نییـە، نەتـەڵاقیان پـێ دەکـەوێ، نـەکڕینو فـرۆتنو سـەوداو مامەڵـەیان پـێ دا ئەمـەزرێ، بـەو دوو مەرجەی کە باسکران.

شـەرع شـەرمی نییـە: دەڵـێن: جـارێ لەمـەلایێ دەپرسـن: ئایـا دروسـتە لەکاتی کۆبوونەوەی شـەرعی لەگـەڵ حـەڵاڵو هاوسـەری خۆتـا، بـیر لەژنێـکی

(١٥٢) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: تجاوزَ اللهُ عن حديث النفسِ و الخواطر.. رقم: ١٢٧.

تری جوان بکەیتەوە؟ مەلا دەفەرموێ: (چۆن دەبێ لەرەشی خۆتی بنێیتو بیر لەسپی خەڵك بکەیتەوە!).

١٠٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ لَمَّا أَقْبَلَ يُرِيدُ الإِسْلامَ وَمَعَهُ غُلامُهُ ضَلَّ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ صَاحِبِهِ فَأَقْبَلَ بَعْدَ ذَلِكَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ هَذَا غُلامُكَ قَدْ أَتَاكَ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّهُ حُرٌّ قَالَ فَهُوَ حِينَ يَقُولُ: يَا لَيْلَةً مِنْ طُولِهَا وَعَنَائِهَا * عَلَى أَنَّهَا مِنْ دَارَةِ الْكُفْرِ نَجَّتِ) (الحديث ٢٥٣٠، أطرافُهُ في: ٢٥٣١، ٢٥٣٢، ٤٣٩٣) [١٥٣].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ویستم بچمو موسوڵمان ببم، خوڵامێکی خۆم لەگەڵدا بوو، لەڕێگە یەکتریمان گوم کرد، من لەمەدینە لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) ، پاش ئیسلام بوونم، دانیشتبووم، لەو کاتەدا خوڵامەکەم هات، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئەبوهورەیرە! ئەمە خوڵامەکەتە وائەویش هات بۆ لات). منیش گوتم: (دەی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا! بەشایەت بە کەوا ئازادم کرد). ئەمەیش ئەو دەمە بوو کە بەدەم گوتنی ئەم شیعرەوە گەیشتە ناو مەدینە:

يا لَيلةً منْ طولِها وعنائِها　　　على أنّها منْ دارَةِ الكُفرِ نجّتْ

بەشیعر لەبەحرەکەی خۆی کە طەویلی مەخروومە:

شەوێ بوو درێژ پڕ ئێشو ئازار، بەڵام بەجوانی

سوپاس بۆ خودا، رزگاری کردین لە کافرسانی!

(تاج/٥ل-٢٤٤ز-٦٨ف-٣).

(١٥٣) قال العيني: (وهذا الحديث من أفراده) ج/١٣ص-٩٠- المترجم.

١٠٨٨- عنْ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أنّهُ أَعْتَقَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ فَلَمَّا أَسْلَمَ، حَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ وَأَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ قَالَ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا يَعْنِي أَتَبَرَّرُ بِهَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ) (الحديث ٢٥٣٨، أطرافُهُ في: ١٤٣٦، ٢٢٢٠، ٥٩٩٢) (١٥٤).

**ناوەرۆكو مەبەست لەم فەرموودەیە لە ژمارە: ( ٦٨٩ت=١٤٣٦ف) دا رابوورد.**

١٠٨٩- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) : أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَغَارَ عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ وَهُمْ غَارُّونَ وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ) (الحديث: ٢٥٤١) (١٥٥).

**لەتاجی پیرۆزدا ئەم فەرموودەیە ئاوایە، بۆ روونكردنەوە: ی بابەتەكە راگوێزی دەكەین:**

**ئیبنو عەون** (رەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرمووی: نامەیەكم بۆ نافیع نووسی لەبارەی بانگەوازی پێش دەستپێكردنی جەنگەوە پرسیارم لێی كرد، ئەویش نامەی بۆ من نووسیەوە: كە ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە وابوو هەتا بانگیان نەكردنایە بۆ سەر ئیسلام و، لەپاش مل نەدان ئاگاداریان نەكردنایەتەوە، كە خۆیان ئامادە بكەن پەلاماریان نەدەدان، بەڵام لەوەپاش پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **خۆی پەلاماری تیرەی بەنی موصطەلەقی داو، ئاگاشیان لە خۆیان نەبوو لەو كاتەشدا ئاژەڵەكانیان لەسەر ئاو بوو، خەریك بوون ئاویان دەدان! جا پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **لەو شەڕەدا پیاوە جەنگاوەرەكانی كوشتنو خێزەكانی بەتاڵانی بردن، وەهەر لەو رۆژەدا بوو كە**

(١٥٤) راجع: (٦٨٩) الذي سبق — المترجم.

(١٥٥) اخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: جواز الإغارة على الكفار، رقم: ١٧٣٠.

جوويرييەی كچی حاریثی سەر كۆماری ئەو خێڵەی دەست كەوتو مارەی كرد بۆ خۆی. (تاج/٨/١١٩ف-١ز-٤٦ش/د).

١٠٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا زِلْتُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مُنْذُ ثَلاثٍ سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِيهِمْ: (هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ) قَالَ وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا) وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ فَقَالَ أَعْتِقِيهَا فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ) (الحديث ٢٥٤٣، طرفُهُ في: ٤٣٦٦) [١٥٦].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەوەتی ئەم سێ وەسپو مەدحە جوانەم لەدەمی پێغەمبەر خۆی(درودی خوای لەسەر بێ) بەگوێی خۆم بیستووە، ئیتر لەوساوە هۆزی بەنی تەمیمم خۆش دەوێ، لێم زنەوت دەیفەرموو: ئازاترینی ئۆمەتم لەئاستی جەجالْ هۆزی بەنی تەمیمن! كاتێ زەكاتەكەشیان هات، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە زەكاتی خزمانی ئێمەیە). ژنێكی بەتاڵانگیراویشیان كەنیزەكی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! ئەم كارەكەرەت ئازاد بكە، چونكە لەنەوەی ئیسماعیلی كوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە، كە باپیرە گەورەكەمانە!).

١٠٩١-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يُحَدِّثُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: لا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلايَ وَلا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ، وَفَتَاتِي، وَغُلامِي) (الحديث ٢٥٥٢) [١٥٧].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ داوای شتێ لەبەندەو كۆیلەو كەنیزەكەكانتان دەكەن پێیان

(١٥٦) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل من غفار و أسلم، رقم: ٢٥٢٥.

(١٥٧) أخرجه مسلم في الألفاظ من الأدب و غيرها، باب: حكم الطلاق.. رقم: ٢٢٤٩.

مەڵێن: أطعِمْ ربَّكَ: نان بێنە بۆ من کە ڕەببی تۆم، یان ئاوی دەستنوێژ بێنە بۆمن کە ڕەببی تۆم، یان خواردن بدە بە من کە ڕەببی تۆم!) با بەندەو کۆیلەکانتان لەکاتی گفتوگۆدا پێتان نەڵێن: ڕەببی، باپێتان بڵێن: گەورەم، سەروەرم، ئێوەش کە بانگی ئەوان دەکەن، مەڵێن: عەبدەکەم، ئەمەتەکەم، بەڵکو بڵێن: کوڕە، کچە، خوڵامەکەم. (تاج/١٠/١٦١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە ئەمەیە: کە موسوڵمان بەچاوی خوایی تەماشای خواردەستی خۆیان نەکەن، لەعەرەبیو لەهەر جۆرە زمانێکی تردا، ئەو جۆرە بێژەو ووشانە بۆ خۆیان بەکارنەهێنن، کە لەسەر ڕووی ڕاستەقینەیی هەر بۆ خوا بەکاردێن، وەك وشەی (ربّ) لەعەرەبیداو وشەی (خوداوەند) لە کوردیدا.

١٠٩٢- عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ أَوْ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلاجَهُ) (الحديث ٢٥٥٧، أطرافُهُ في: ٥٤٦٠)[١٥٨].

دیسان ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێکتان نۆکەرێ نانەکەی بۆ ئامادە دەکا، با ئەویش دەستی بگرێو لەگەڵ خۆی دایبنێ بۆ نان خواردن، ئەگەر دایشی نەنا لەگەڵ خۆی با پارویێ دووپارووی لەنانەکە بداتێ، یا بۆی بهێڵێتەوە، چونکە ئەو

(١٥٨) اخرجه مسلم، لاحظ (فتح/٥/١٩٦) خاتمة كتاب العتق، وقد أشار العيني إلى رواية مسلم في ج/٢١ص٧٩، حديث رقم: ٥٤٦٠ في الفتح — المترجم.

نۆکـەرە ئامـادەی کـردووەو ئـەرکی دروسـت کـردنو هێنانەکـەی کێـشاوە!) (تاج/٤/٦٧ز-٢٠ف-٣).

١٠٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْتَنِبْ الْوَجْهَ) (الحديث ٢٥٥٩) [(١٥٩)]

دیسان دەفـەرموێ: پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (لـەکاتی شـەڕو شۆڕدا خۆتان لە لێدانی روخساری لێدراوەکە بپارێزن، بەتایبـەتی ئەگـەر بۆ تەمێو شتیوا لەنۆکەرو منالٚو خواردەستی خۆتان دا).

بسم الله الرحمن الرحيم

## (نامەی نامەنووسی) (كتابُ المُكاتِب)

(بڕ: تاج/٣ ل —٣٨ز-١٨+ فیقهی ئاسان/٣/ل-١٠٠٦ز-٤١٢)

١٠٩٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) : أَنَّ بَرِيرَةَ (رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهـا) جَـاءَتْ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ: ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَيَـكُونَ وَلاؤُكِ لِي فَعَلْتُ فَـذَكَرَتْ ذَلِـكَ بَرِيرَةُ لأَهْلِهَا فَأَبَوْا وَقَالُوا: إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ وَيَـكُونَ وَلاؤُكِ لَنَـا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي فَإِنَّمَا الْوَلاءُ لِمَـنْ أَعْتَـقَ) قَـالَ ثُـمَّ قَـامَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا بَالُ أُنَاسٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَنْ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَلَيْسَ لَهُ وَإِنْ شَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ شَرْطُ اللَّهِ أَحَـقُّ وَأَوْثَـقُ) (الحـديث ٢٥٦٠، أطرافـهُ في: ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥) [(١٦٠)]

---

(١٥٩) أخرجه مسلم في الألفاظ من الأدب وغيرها، باب: حكم إطلاق لفظ... رقم: ٢٢٤٩.

(١٦٠) أخرجه مسلم في العتق، باب: إنما الولاء لمن اعتق، رقم: ١٥٠٤.

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (بەریرە هات بۆ لام، گوتی: خاوەنەکانم نامەنووسی (موکاتەبە) یان لەگەڵدا کردووم، لەسەر نۆ ئۆقیە بۆماوەی نۆ ساڵ کەهەر ساڵە ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆ لات کە تۆیش یاریدەیەکم بدەی؟! ئەو کاتە هیچ پشکێکی لەنامەنووسیەکەی جێ بەجێ نەکردبوو، منیش پێم گوت: برۆ بەئاغاکانت بڵێ: ئەگەر ئاغاکانت ئارەزویان هەیە، ئەوا من ئەو پارەیان بەنەختی بۆ دەژمێرمو یەکسەر ئازادت دەکەم، بەڵام بەمەرجێ کەسەرداریی (وەلاء= هەقداريي) یەکەت بۆ من بێو من ببم بەهەقدرات، جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاکانی بەڵام ئاغاکانی بەوە رازی نابنو دەڵێن: سەرداریيو هەقداریی هی خۆمانەو نایدەین بەکەس، ئەگەر عائیشە حەز دەکا، با لەبەر رەزای خودا ئەمەت بۆ بکا، بەڵام بەهەرحاڵ سەردایی (وەلاء) ەکەت هەر بۆ خۆمان دەبێ!

جا دیسانەوە هاتەوە بۆ لامو ئەم باسەو خواسەی بۆم گێڕایەوە، منیش باسەکەم عەرزی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی پێم: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکەو مەرجیش دابنێ کەسەرداری بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە بایەخی نییە، چونکە لەراستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە بەندەکە ئازاد دەکا). منیش وام کرد. جا سەر لە ئێوارەیێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵسایەوەو وتارێکی دا، سوپاسو ستایشی خودای کردو ئنجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە ئەوە بۆچی هەندێ کەس هەندێ مەرجیوا بەمەرج دەگرن، لەکاتی سەوداو مامەڵەو کردنی کارێکا، کەشتیواو مەرجیوا لەبەرنامەی خودادا، لەشەرعی خودادا نییە، دەی هەرکەسێ مەرجیوا بەمەرج بگرێ، کە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، ئەوە پووچو بەتاڵە ئەو جۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی، ئەگەر سەد مەرجیش بێ هەموویان پوچو بێ بایەخن، مەرجی خودا راسترەو مەحکەم ترو لەبارترە). (تاج/٣/ل-٣٨ز-١٨ف-١+تاج/٢/ل-٣١٠ف-٣ز-١٤٩).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم جۆرە زاراوانە: (مُکاتب) و (ولاء) لەکوردیدا واتاو بەرابەرەکەیان زۆر روون‌و ئاشکرانییە، گەلێ لە مامۆستا بەڕێزەکان هەوڵی تەرجەمەی ئەم جۆرە وشانەیان داوە، پەیڕەوکردنی ئەو زاتانە زۆر بەسوودو بەکەڵکە، دەنا زمانی کوردی، لەبابەتی وەرگەڕان‌و بەکوردیکردندا تووشی گێژاوو پاشاگەردانی‌و بێ سەرو بەرییەکی وا دەبێ، کەمانەندی نەبێ.

# پایانێ (خاتمە)

ئیبنو حەجەر (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: نامەی کۆیلە ئازادکردن‌و نامەنووسی شەست‌و شەش فەرموودەی واتیادا، سیازدەیان بێڕشتەن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن دووبارەکانیان چل‌و نۆ فەرموودەن، پاڵفتەکەیان (٦٦-٤٩=١٧) حەڤدە فەرموودەن. پێشەوا موسلیمیش گشتیانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەسیانیان: فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە، لەبارەی ئازادکردنی خولامەکەیەوە (١٠٨٧ت=٢٥٣٠ف). فەرموودەکەی ئەنەس لەبارەی داستانەکەی عەبباسەوە (٢٥٣٧ف) لەتەجریدەکەدا نییە. فەرموودەی: نامەنووسی وا لەبەرگی/٣ل/١٠٠٦ز-٤١٢ فیقهی ئاسان.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٥- نامەی بەخشینو بەهرەی شت بەخشینو دیاری

## (كتابُ الهِبَةِ والقضاء)

(بڕ: تاج/٢/ل-٣٦٧ز-١٧٦)

١٠٩٥ -عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ لا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ) (الحديث ٢٥٦٦، طرفُهُ في: ٦٠١٧) (١٦١).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دیاریی پێشکەشی یەکتری بکەن، چونکە دیاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێشێ، ئافرەتیش بۆ ئافرەتی دەراوسێی خۆی هیچ دیاریو دەسەنەو کاسە ئاوسێیەك بەکەم نەزانیو بۆی بەرێ، با لاسمی مەڕێکیش بێ) (تاج/٢/٣٦٨ف-٤-ب/ت ز-١٧٦) + (فیقهی ئاسان/٢/ل -٥٤٤ز-٢٣٦).

١٠٩٦ - عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ رحمه الله تعالى: ابْنَ أُخْتِي إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلالِ ثُمَّ الْهِلالِ ثَلاثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَارٌ. فَقُلْتُ: يَا خَالَةُ مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتْ: الأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالْمَاءُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جِيرَانٌ مِنْ الأَنْصَارِ كَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَلْبَانِهِمْ فَيَسْقِينَا) (الحديث ٢٥٦٧، طرفاهُ في: ٦٤٥٨، ٦٤٥٩) (١٦٢)

عوروەی خوشکەزای حەزرەتی عائیشەی - ڕەزای خودا لەحەزرەتی عائیشەو ڕەحمەتی خودا لەو- فەرمووی: پوورم پێی گوتم: ئەی خوشکەزام!

---

(١٦١) اخرجه مسلم في الزكاة، باب: الحث على الصدقة، ولو بالقليل، رقم: ١٠٣٠.

(١٦٢) اخرجه مسلم في الزهد الرقاق...، رقم: ٢٩٧٢.

جاری وا بووه سێ مانگی یەك شەوەمان دەبینی، كە دەق دەكاتە دوو مانگی رێك، لەماوەی ئەو دوو مانگەدا ئاگر لە ماڵی خێزانەكانی پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) نەدەكرایەوە، عوروە - رەحمەتی خودای لێ بێ- فەرمووی: منیش گوتم: پووری! ئەی باشە بەچی دەژیان؟ فەرمووی: تەنیا بەخورماو ئاوی رووتو بەس! بەڵام چەند ماڵێكی ئەنصاری هاوسای پێغەمبەر بوون، ئاژەڵی بەشیریان هەبوو، لەشیری ئەوانە بەشی پێغەمبەریان ئەدا، ئەویش ئەو شیرەی دەرخواردی ئێمە دەدا.(تاج/٩ل-٣١٦ز-٩٩-مبحث في معيشة النبي).

١٠٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ دُعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ أَوْ كُرَاعٍ لأَجَبْتُ وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ) (الحديث ٢٥٦٨، طرفُهُ في: ٥١٧٨) (١٦٣).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر خوڵكم بكەن بۆ سەر پاچەش دەچم، یاخود ئەگەر سەروپێشم بەدیاری بۆ بێنن وەری دەگرم) (تاج/٢ل-٣٦٧ز-١٧٦-باسی شت بەخشین‌و دیاری).

١٠٩٨- حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا فَأَدْرَكْتُهَا فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِوَرِكِهَا أَوْ فَخِذَيْهَا فَقَبِلَهُ قُلْتُ وَأَكَلَ مِنْهُ قَالَ وَأَكَلَ مِنْهُ ثُمَّ قَالَ بَعْدُ قَبِلَهُ) (الحديث ٢٥٧٢، طرفاهُ في: ٥٤٨٩، ٥٥٣٥) (١٦٤).

---

(١٦٣) قال العسقلاني: (لمْ يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ) (فتح/٥/٢٤٧- خاتمة كتاب الهبة) المترجم.

(١٦٤) أخرجه مسلم في الصيد والذبائح، باب: إباحة الأرنب، رقم: ١٩٥٣.

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەڕو ظەهران کەروێشکێکمان هەڵسان، پیاوگەل نیشتنە سەری تاماندوو بوون، بەلاّم من نیشتمە سەری هەتا گرتم، ئەوجا بردم بۆ ئەبوطەلحە، ئەبوطەلحە سەری بڕیو هەردوو سمتەکەی نارد بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) یا فەرمووی: هەردوو ڕانەکەی نارد بۆی- پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) وەریگرت.(تاج/٤ف/-٣ز-١)

١٠٩٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ خَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقِطًا وَسَمْنًا وَأَضُبًّا فَأَكَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ الأَقِطِ وَالسَّمْنِ وَتَرَكَ الضَّبَّ تَقَذُّرًا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَوْ كَانَ حَرَامًا مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٥٧٥، أطرافُهُ في: ٥٣٨٩، ٥٤٠٢، ٧٣٥٨)(١٦٥).

ئیبنوعەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پوورم ئومموحەفید کەخوشکی دایکم بوو، کەشكو ڕۆنو چەند بزنمژیەکی بەدیاری بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نارد، پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) هەرسێ دیارییەکانی پوورمی وەرگرت، وبەخودی خۆی لەکەشکەکەو لەڕۆنەکەی خوارد بەلاّم قێزی کردەوە لەبزنمژەکە، لەبەر ئەوە لێی نەخوارد، ئیبنوعەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (بەلاّم گۆشتی بزنمژە لەخزمەت پێغەمبەرداو لەسەر خوانی پێغەمبەر خوراوە، دەی ئەگەر خواردنی بزنمژە ئەگەر حەرام بوایە لەسەر خوانی پێغەمبەر نەدەخورا ).

١١٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ: (أَهَدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ) فَإِنْ قِيلَ: صَدَقَةٌ قَالَ

---

(١٦٥) أخرجه مسلم في الصيد و الذبائح،باب: إباحة الضب..، رقم: ١٩٤٦، ١٩٤٧.

لأَصْحَابِهِ: (كُلُوا) وَلَمْ يَأْكُلْ وَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ ضَرَبَ بِيَدِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَكَلَ مَعَهُمْ) (الحديث ٢٥٧٦) (١٦٦).

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **كاتێ خواردەمەنییەكی بۆ دەهات، لەبارەیەوە دەیفەرموو: (ئایا دیارییە یا زەكاتە؟) ئەگەر بگوترایە: هی زەكاتە، بەهاوڕێكانی دەگوت: (ئێوە بخۆن) وەخۆی لێ ی نەدەخوارد، خۆ ئەگەر عەرزیبكرایە: (كەهی دیارییە) ، ئەوا خۆشی دەستی بۆ دەبردو لەگەڵ ئەوانا دەستی دەكرد بەلێخواردنی!).**

١١٠١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلَحْمٍ فَقِيلَ: تُصُدِّقَ عَلَى بَرِيرَةَ قَالَ: (هُوَ لَهَاصَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ) (الحديث٢٥٧٧) (١٦٧).

**ئەنەسی كوڕی مالیك**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **كە بیخوات پێیان گوت: ئەم گۆشتە هی زەكاتە دراوە بەبەریرە، ئایا تۆ لێی دەخۆی؟ فەرمووی: (ئەمە بۆ ئەو زەكات بووە، بەڵام بۆ ئێمەئەبێ بەدیاریی‌و لەزەكاتی دەردەچێ!) (تاج/٢/٤٧ز-١٩ف-٣-ش-د-ن) بڕوانە ژمارە: (٧١٨ت=١٤٩٥ف).**

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

**كورت‌و پوخت، بەكوردی پەتی، زەكات‌و قوربانی‌و نەزرو خێری نەزرو سەرفترەو شتی تری لەم بابەتانە كاتێ دەدرێن بەكەسێ، وەدەبن بەماڵی، لەماڵی خاوەنی یەكەمیان، كە زەكاتدەرەكەیە، یا قوربانیكەرەكەیە، یا نەزركەرەكەیە دەردەچێ، وەدەبێ بەماڵی ئەو كەسەی كەپێی دراوە،**

---

(١٦٦) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: قبول النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) الهدية وردّه الصدقة، رقم: ١٠٧٧.

(١٦٧) قال العيني: أخرجهُ مسلم في الزكاة(ج/١٣/١٣٥) المترجم.

وەهـەموو تەصەروفێـکی کەسـی دووەم لـەو ماڵـەدا دروسـتە، کەواتـە دروستە بـەدیاری بیداتـەوە بەزەکاتدەرەکە، یان ئەگـەر قوربانیکەرەکە بـوو بەمیوانی ئەو ماڵەی کەلە گۆشتی قوربانی خۆی بەشی داون، وە ماڵەکە لەو گۆشـتەیان بۆدانـا کـەبیخوات بـۆی هەیـە، کەلـێی بخـوات چـونکە لەقوربانێتی دەرچووەو بووە بەنانی میوانی، هەروا ئەگەر ژن زەکاتی خۆی بـدات بـەمێردی خۆی، لەپاشا مێردەکەی بـۆی هەیـە لـەباتی ژیـوار (نفقـة) بیداتەوە بەخۆی واتە: بەژنەکەی.

١١٠٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّ نِسَاءَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كُنَّ حِزْبَيْنِ فَحِزْبٌ فِيهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ وَصَفِيَّةُ وَسَوْدَةُ وَالْحِزْبُ الآخَرُ أُمُّ سَلَمَةَ وَسَائِرُ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ قَدْ عَلِمُوا حُبَّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَائِشَةَ فَإِذَا كَانَتْ عِنْدَ أَحَدِهِمْ هَدِيَّةٌ يُرِيدُ أَنْ يُهْدِيَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَّرَهَا حَتَّى إِذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِ عَائِشَةَ بَعَثَ صَاحِبُ الْهَدِيَّةِ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِ عَائِشَةَ فَكَلَّمَ حِزْبُ أُمِّ سَلَمَةَ فَقُلْنَ لَهَا: كَلِّمِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُكَلِّمُ النَّاسَ فَيَقُولُ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُهْدِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَدِيَّةً فَلْيُهْدِهِا إِلَيْهِ حَيْثُ كَانَ مِنْ بُيُوتِ نِسَائِهِ.

فَكَلَّمَتْهُ أُمُّ سَلَمَةَ بِمَا قُلْنَ فَلَمْ يَقُلْ لَهَا شَيْئًا فَسَأَلْنَهَا فَقَالَتْ: مَا قَالَ لِي شَيْئًا فَقُلْنَ لَهَا: فَكَلِّمِيهِ قَالَتْ: فَكَلَّمَتْهُ حِينَ دَارَ إِلَيْهَا أَيْضًا فَلَمْ يَقُلْ لَهَا شَيْئًا فَسَأَلْنَهَا: فَقَالَتْ: مَا قَالَ لِي شَيْئًا فَقُلْنَ لَهَا: كَلِّمِيهِ حَتَّى يُكَلِّمَكِ فَدَارَ إِلَيْهَا فَكَلَّمَتْهُ فَقَالَ لَهَا: (لا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ فَإِنَّ الْوَحْيَ لَمْ يَأْتِنِي وَأَنَا فِي ثَوْبِ امْرَأَةٍ إِلاّ عَائِشَةَ) قَالَتْ: فَقَالَتْ أَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مِنْ أَذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ثُمَّ إِنَّهُنَّ دَعَوْنَ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: إِنَّ نِسَاءَكَ يَنْشُدْنَكَ اللَّهَ الْعَدْلَ فِي بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ فَكَلَّمَتْهُ: فَقَالَ: (يَا بُنَيَّةُ أَلا تُحِبِّينَ مَا أُحِبُّ) قَالَتْ: بَلَى فَرَجَعَتْ إِلَيْهِنَّ فَأَخْبَرَتْهُنَّ فَقُلْنَ: ارْجِعِي إِلَيْهِ فَأَبَتْ أَنْ تَرْجِعَ

فَأَرْسَلْنَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ فَأَتَتْهُ فَأَغْلَظَتْ وَقَالَتْ: إِنَّ نِسَاءَكَ يَنْشُدْنَكَ اللَّهَ الْعَدْلَ فِي بِنْتِ ابْنِ أَبِي قُحَافَةَ فَرَفَعَتْ صَوْتَهَا حَتَّى تَنَاوَلَتْ عَائِشَةَ وَهِيَ قَاعِدَةٌ فَسَبَّتْهَا حَتَّى إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيَنْظُرُ إِلَى عَائِشَةَ هَلْ تَكَلَّمُ، قَالَ فَتَكَلَّمَتْ عَائِشَةُ تَرُدُّ عَلَى زَيْنَبَ حَتَّى أَسْكَتَتْهَا قَالَتْ: فَنَظَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى عَائِشَةَ وَقَالَ: (إِنَّهَا بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ ) (الحديث ٢٥٨١) (١٦٨).

عائیشه (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەكانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوو بوون بەدوو دەستەوە، دەستەیەكیان عائیشەو حفصەو صفیەو سەودەی تیابوو، دەستەكەی تریشیان ئوم سەلەمەو گشت هاوسەرەكانی تری پێغەمبەری تیابوو، موسوڵمانان بەشێوەیەكی گشتی هەستیان بەوە كردبوو كەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) عائیشەی زیاتر خۆش دەوێ، جا لەبەر ئەوە كاتێك دەیانویست دیارییەك ببەن بۆ پێغەمبەر چاوەڕوانی ئەو رۆژەیان دەكرد، كە پێغەمبەر لەلای عائیشە بێ لەرۆژی سەرەی خۆی دا، لەو رۆژەدا دیارییەكەیان دەبرد بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) جاكۆمەڵەكەی ئوم سەلەمە بەئوم سەلەمەیان گوت: عەرزی پێغەمبەر بكە كە بەو خەڵكە بفەرموێ: هەركەسێ دەیەوێ دیاری ببا بۆ پێغەمبەری خودا، با جیاوازی نەكا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵی هەركامێ لەهاوسەرەكانی بوو، بادیاریەكەی بۆ ببا بۆئەوێ، چونكە ئێمەیش حەز دەكەین كە لەو خێرەمان بەر بكەوێ.

جا ئوم سەلەمە فەرمووی: كە ئەمەم عەرزی حەزرەت كرد وەرامی نەدامەوە. جا ژنەكانی تری لێیان پرسی، فەرمووی: وەڵامی بەچاك و خراپ نەدامەوە. عەرزیان كرد: دووبارە لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ دا بكە. ئوم سەلەمە فەرمووی: بۆ جاری دووەم كەسەرەی رۆژی خۆم بوو وەپێغەمبەر تەشریفی هاتەوە بۆ ماڵی من، هەمان شتم عەرزی كردەوە، دووبارە هیچ وەڵامێكی نەدامەوە، كەلێیان پرسییەوە، فەرمووی: دیسان هیچ وەڵامی

(١٦٨) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل عائشة.. رقم: ٢٤٤٢.

نەدامەوە. ئەوانیش بە ئوم سەلەمەیان گوت: ئەمجارە لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکە، وازی لێ مەهێنە هەتا وەڵامت دەداتەوە.

جا کاتێ سەرەی ئوم سەلەمە هاتەوە لەنۆرە ڕۆژی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئوم سەلەمە لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ کردەوە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی ئوم سەلەمە! لەبارەی عائیشەوە ئازارم مەدە، چونکە بەخودا نەبووە کە لەناو نوێنی ژنێ لەئێوەدابم و سرووشم بۆ بێ، جگە لە نوێنی عائیشە).

عائیشە فەرمووی: ئوم سەلەمە کە وەڵامەکەی پێغەمبەر دەبیستێ دەفەرموێ: (پەنا دەگرم بەخوا کە ئازاری دڵی تۆ بدەم ئەی پێغەمبەری خودا!). دوا ئەمە هاوسەرەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فاطیمەی کچی پێغەمبەر بانگ دەکەن و دەینێرن بۆ لای پێغەمبەر، کە پێی بڵێ: ژنەکانت داوات لێ دەکەن کەلەبەر خاتری خودا، یەکسان ڕەفتاریان لەگەڵ بکەیت و هەموویان بەیەك چاو سەیر بکەیت و جیاوازی لەنێوان ئەوان و عائیشەدا، لەم لایەنەوە نەکەیت.

جا کاتێ فاطیمە ئەم پەیامەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ڕادەگەیەنێ بە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەی کچی شیرینم! ئایا تۆش ئەوەت پێ خۆش نییە کەمن پێم خۆشە!). جا فاطیمە دەچێتەوە بۆ لایان و باسەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە، دیسانەوە پێیان گوتەوە، دووبارە بچۆرەوە بۆ خزمەتی بەڵام فاطیمە ڕازی نەبوو کە بچێتەوە بۆ سکاڵاکردن لەلای. لەبەر ئەوە ئەمجارە زەینەبی کچی جەحشیان نارد، زەینەب خۆشی هاوسەری پێغەمبەر بوو.

زەینەب کە دەچێ قسەی ڕەق دەبێ لەگەڵ پێغەمبەردا، ودەڵێ: (هاوسەرەکانت داوات لێ دەکەن کەلەبەر خاتری خودا، بەیەکسان ڕەفتاریان لەگەڵ بکەیت و جیاوازی لەنێوان ئەوان و عائیشەدا نەکەیت، تا بەرە بەرە

زەینەب پێی لێ هەڵئەبڕیو دەنگی بەرزەوە کرد، عائیشە کە لەوێ بوو، زەینەب شاڵاوی قسەی بۆ بردو جنێوی پێ دا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەم کاتەدا تەماشای عائیشەی دەکرد، لەدڵی خۆیەوە دەیفەرموو: دەبێ عائیشە وەڵامی زەینەب بداتەوە، فەرمووی: جا عائیشە هاتە قسەو بەرپەرچی زەینەبی وادایەوە دەمکوتی کرد، فەرمووی: پێغەمبەریش سەرنجێکی عائیشەی داو وەك بڵێی قسەکانی عائیشەی بەدڵ بێو بۆ پشتگیری عائیشە فەرمووی: (کچی باوکی خۆیەتی، ئەمیش وەك ئەبوبەکری باوکی دەزانێ چۆن قسە بکاو بەرامبەر دەمکوت بکات!). (تاج/٥/١٥٥ز-٣٧ف-٦).

١١٠٣-عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ لا يَرُدُّ الطِّيبَ) (الحديث ٢٥٨٢، طرفُهُ في: ٥٩٢٩).

ئەنەسی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو کەسێ بۆنی خۆشی پێشکەش بکردایە، لێی وەردەگرتو نەیدەفەرموو: نامەوێ. (تاج/٤/ل-١٦٧ز-١٥١ف-١-ش/د/ت/ن).

١١٠٤- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: أَعْطَانِي أَبِي عَطِيَّةً فَقَالَتْ عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي أَعْطَيْتُ ابْنِي مِنْ عَمْرَةَ بِنْتِ رَوَاحَةَ عَطِيَّةً فَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا؟) قَالَ: لا قَالَ: (فَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ) قَالَ: فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ) (الحديث ٢٥٨٧) [١٦٩].

نوعمانی کوڕی بەشیر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم بەخششێکی پێم داو عەمرەی کچی ڕەواحە کە دایکی منە، بەباوکمی گوت: بەوەندە ڕازی نابم کە تۆ ئەو شتەت بەخشیوە بە نوعمانی کوڕم، بۆ دڵنیایی تەواو دەبێ بیبەی بۆ

(١٦٩) أخرجه مسلم في الهبات، باب: كراهة تفضيل بعض الأولاد..، رقم: ١٦٢٣.

لای پێغەمبەرو پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بکەی بەشایەت لەسەر ئەم پێ بەخشینە، جا باوکم هەڵی گرتمو بردمی بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کوڕەم کە لەعەمرەی ژنمە خەڵاتێکم پێ بەخشیوە، عەمرە داوای لێ کردوم کە تۆ لەسەر ئەم پێ بەخشینە بکەم بەشایەت. فەرمووی: (ئایا هەموو منداڵەکانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟) باوکم فەرمووی: نەء. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەنابێ کەسێکی تر بکە بەشایەتی ئەمە من شایەتی‌وا ناڕەوا نادەم).

لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەزیش دەکەی کە هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟) باوکم گوتی: بەلێ. فەرمووی: (کەواتە نابێ) ئەوجا خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی لە خودا بترسنو بێ فەرمانی مەکەنو بەیەك چاو تەماشای هەموو منداڵەکانتان بکەن، چونکە خوا وای پێ خۆشە) فەرمووی: جا باوکم لە بەخشیشەکەی پەشیمان بووەو لەمنی سەندەوە. (تاج/٣/٢-ف-٣-ش/د/ت).

١١٠٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ) (الحديث ٢٥٨٩، أطرافُهُ في: ٢٦٢١، ٢٦٢٢، ٦٩٧٥) [١٧٠].

ئیبنو عەبباس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ دەسەنەو بەخششی خۆی دووبارە هەڵبگرێتەوە، یان بیسەنێتەوە لەو کەسە کە پێی بەخشیوە وەك ئەوە وایە کە سەگ سەر لەنوێ رشانەوەی خۆی دووبارە بخواتەوە!) (تاج/٢/٣٦٩-ش/د/ت/ن).

لە گێڕانەوەیەکی تاجا: (رەفتاری ناشیرین لەئێمەوە دوورە، وەك رەفتاری ئەو کەسەی کەلە دەسەنەو بەخششی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، ئەوە وەك سەگ وایە، کە دەرشێتەوە، کە دووبارە رشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە!).

---

(١٧٠) أخرجه مسلم في الهبات، باب: تحريم الرجوع في الصدقة.. رقم: ١٦٢٢.

١١٠٦- عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً وَلَمْ تَسْتَأْذِنْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا كَانَ يَوْمُهَا الَّذِي يَدُورُ عَلَيْهَا فِيهِ قَالَتْ: أَشَعَرْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنِّي أَعْتَقْتُ وَلِيدَتِي؟ قَالَ: (أَوَفَعَلْتِ؟) قَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: (أَمَا إِنَّكِ لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ) (الحديث ٢٥٩٢، طرفُهُ في: ٢٥٩٤) (١٧١).

مەیموونەی کچی حاریث (ڕەزای خودای لێ بێ) کە هاوسەری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، فەرمووی: کەنیزێکم بوو، ئازادم کرد، بەبێ ئاگا لێبوونی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، جا لەسەرەی ڕۆژی خۆم دا، کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەلای من دەمایەوە، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەزانی کە کەنیزکەمم ئازاد کرد؟ فەرمووی: (ئاها کردت؟) گوتم: ئەرێ. فەرمووی: (دەی ئەگەر بتدایە بەخاڵۆکانت پاداشتی گەورەتر بوو).

١١٠٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَبْتَغِي بِذَلِكَ رِضَا رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٥٩٣، أطرافُهُ في: ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەیویست بچێ بۆ سەفەرێ لەنێوانی ژنەکانی دا تیروپشکی دەکرد ناوی هەرکامیان دەربچوایە ئەوەیانی دەبرد بۆ ئەو سەفەرەی، هەریەکێ لەژنەکانی شەوو ڕۆژی خۆی بۆ دانابوو، بەسەرە لەلایان دەبوو، بەڵام سەودەی کچی زەمعە

(١٧١) أخرجه مسلم في الزّكاة، باب: فضل النفقة و الصدقة على الأقربين.. رقم: ٩٩٩.

(ڕەزای خوای لێ بێ) نۆرە ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بوو بەمن، لەنۆرە ڕۆژی سەودەیش دا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەلای من دەمایەوە، مەبەستی سەودەش لەم سەرە بەخشینە بەمن خۆشنودیو ڕەزامەندی پێغەمبەر بوو. (بڕ: ژ-٩٣٥و ١١٢١ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

سەودە (ڕەزای خوای لێ بێ) تەمەنی هەبوو، لەبەر ئەوەی نەبادا نەتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەجێ بهێنێ سەرە ڕۆژی خۆی بەخشی بە عائیشە. لەخولی نۆرە ڕۆژی پێغەمبەر لەناو هاوسەرەکانی دا، عائیشە دووڕۆژی بەش دەکەوت ڕۆژێکی خۆیو ڕۆژێکی سەودە. (بڕ: تاج/٣/١٢٨-٤).

١١٠٨- عَنْ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْبِيَةً وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ مِنْهَا شَيْئًا فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ فَقَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي قَالَ فَدَعَوْتُهُ لَهُ فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا فَقَالَ: (خَبَأْنَا هَذَا لَكَ) قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: (رَضِيَ مَخْرَمَةُ) (الحديث ٢٥٩٩، أطرافُهُ في: ٢٦٥٧، ٣١٢٧، ٥٨٠٠، ٥٨٦٢، ٦١٣٢) [١٧٢].

میسوەری کوڕی مەخرەمە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: باوکم پێی فەرمووم: کوڕم! دەڵێن: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەندێ کەوای بۆ هاتووە خەریکە دابەشیان دەکا، بابڕۆین بۆ لای، کە چووین پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەماڵەوە بوو باوکم گوتی: کوڕم!بچۆرە ژوورەوە بانگی بکە بۆم، منیش بانگم کرد بۆی، هاتە دەرەوە بۆ لای باوکم کەوایەکی دێباجی لەبەردا بوو، بەدوگمەی زێڕ

(١٧٢) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: إعطاء من سأل بفحش.. رقم: ١٠٥٨.

یەخەکەی داخرابوو فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (ئەی مەخرەمە! ئەمەمان بۆ تۆ شاردۆتەوە) فەرمووی: باوکیشم سەیری کردو بەدڵی بوو، ئەوجا فەرمووی: بەلێ قوربان بەدڵمە!. (تاج/٤/١٠٤ز-٣١ف-٢- باسی جۆرەکانی کالآ).

١١٠٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ أَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْتَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) فَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهَا وَجَاءَ عَلِيٌّ فَذَكَرَتْ لَهُ ذَلِكَ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ عَلَى بَابِهَا سِتْرًا مَوْشِيًّا فَقَالَ: مَا لِي وَلِلدُّنْيَا فَأَتَاهَا عَلِيٌّ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهَا فَقَالَتْ: لِيَأْمُرْنِي فِيهِ بِمَا شَاءَ قَالَ تُرْسِلُ بِهِ إِلَى فُلَانٍ أَهْلِ بَيْتٍ بِهِمْ حَاجَةٌ) (الحديث ٢٦١٣) [١٧٣].

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) چوو بۆ ماڵی فاطیمەی کچی (ڕەزای خودای لێ بێ)، بەڵام نەچووە ژوورەوە، کەئیمامی عەلی هاتەوە فاتیمە ئەمەی بۆیگێڕایەوە، ئیمامی عەلیش عەرزی پێغەمبەری کرد: قوربان! خێر بوو تەشریفت هێنا بوو بۆ ماڵمان کەچی تەشریفت نەچوو بووە ژوورەوە؟ فەرمووی: (چونکە بەدەرگاکەی فاتیمەوە، پەردەیەکی ڕازاوەم بینی بۆیە گەڕامەوە) ، ئەوجا فەرمووی: (من لەکوێ و جیهان لەکوێ!). ئیمامی عەلی فەرمووی: چووم حاڵەکەم بۆ فاطیمە ڕوونکردەوە، فاطیمە فەرمووی: دە عەرزی بکە پێم بفەرمووێ: چی لەو پەردەیە بکەم، فەرمووی: (با فاطیمە ئەو پەردەیە ببەخشێ بەماڵی فیسارەکەس، چونکە ماڵێکی ئاتاجن).

١١١٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَهْدَى إِلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُلَّةَ سِيَرَاءَ فَلَبِسْتُهَا فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي) (الحديث ٢٦١٤، طرفاهُ في: ٥٣٦٦، ٥٨٤٠) [١٧٤]

---

(١٧٣) لم يوافقهُ مسلم على تخريجهِ (خاتمة كتاب الهبة ج/٥/٢٤٧- فتح) المترجم.

(١٧٤) أخرجه مسلم في اللباس والزّينة، باب: تحريم استعمال إناء الذهب.. رقم: ٢٠٧١

**پێشەوا عەلی**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **دەستێ بەرگی بەدیاری پێم دا، ئاوریشمی پەتی بوو، منیش بۆ خۆم لەبەرم کرد، کەچی تەماشام کرد پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **تورە بوو،وەفەرمووی: (خۆ من بۆ ئەوە بۆتم نەناردووە کە خۆت لەبەری بکەی، بۆ ئەوە بۆم ناردویت کە پارچە پارچەی بکەی، بۆ سەرپۆش بۆ ژنانتان) منیش وام کرد. (تاج/٤/١٠٣ز-٣٠- ئاوریشمو زێڕ بۆ مێینە دروستن).**

١١١١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاثِينَ وَمِائَةً فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ؟) فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ فَعُجِنَ ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (بَيْعًا أَمْ عَطِيَّةً؟) أَوْ قَالَ: (أَمْ هِبَةً) قَالَ: لا بَلْ بَيْعٌ فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً فَصُنِعَتْ وَأَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى وَايْمُ اللَّهِ مَا فِي الثَّلاثِينَ وَالْمِائَةِ إِلاَّ قَدْ حَزَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَهُ حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهَا إِيَّاهُ وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَهُ فَجَعَلَ مِنْهَا قَصْعَتَيْنِ فَأَكَلُوا أَجْمَعُونَ وَشَبِعْنَا فَفَضَلَتْ الْقَصْعَتَانِ فَحَمَلْنَاهُ عَلَى الْبَعِيرِ) (الحديث ٢٦١٨، طرفاهُ في: ٢٢١٦، ٥٣٨٢)[١٧٥].

**عەبدوڕحمانی کوڕی ئەبوبەکر**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: سەدو سی کەس بووین، لەسەفەرێکا، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، خۆراکمان هاتەگزیو برسیمان بوو، پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (کەستان خۆراکی پێیە؟) پیاوێ مەنێ خۆراکی پێ مابوو، یا دەوری مەنێ دەبوو، ئەوجا کابرایەکی بتپەرستی قژ ئاڵۆزکاوی قووچی درێژداهۆڵ رانێکی بەرەو ئێمە هێنا بەرەو شوێنێ لێی دەخوڕی، پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرموو: (یا بەفرۆشتن، یا بەپیاوەتی ئاژەڵێکمان پێ بدە؟) یا فەرمووی: (یا بەدیاریو بەخشین)**

---

(١٧٥) أخرجه مسلم في الأشربة، باب: إكرام الضيف وفضل إيثاره، رقم: ٢٠٥٦.

کابرا گوتی: بەفرۆشتن دەتانـدەمێ، جا ئاژەڵێـکی لەڕانەکەی لـێ کـڕی، فـەرمانی فـەرموو سـەریان بـڕیو پاکیـان کـرد، پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمانی دا ناوسـکەکەیان برژانـد. سـوێندم بـەخوا ئـەو سـەدو سـی کەسـە، پێغەمبـەر خـۆی هەریەکـەی لـەو ناوسـکە پارچـەیەکی بـۆ بـڕیو دای پێـی، ئەگەر هاوەڵەکە خۆی لەوێ بوایە دەیدایە دەست خۆی، ئەگەر لـەوێ نەبوایـە بۆی هەڵدەگرت هەتا دەهاتەوەو دەیدا پێی.

جـا کـاتێ گۆشـتی مەڕەکـە کـوڵا کـردی بـە دوو قەرەوانـە، ئـەوجا هەمووومان بەدەوری ئەو دوو قەرەوانەدا دانیـشتینو هـەمووومان بەبەرەکـەتی پێغەمبەر بەدەوریانـدا جێمـان بۆوەو دەسـتمان کـرد بـەخواردن لێیـان، هـەتا تەواو تێرمـان خـوارد کەچـی هێـشتا لەبـەرمان مایـەوە، خـوا پیـتو فەڕێـکی ئاشکرای وای تـێ خـست، جا ئەوەنـدە مـابوو بارمـان کـرد لەوشـترێ. یـا وەك راوی خۆی گوتی.

## راڤەو شیکردنەوە:

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباسەکەوە لەوەدایە، کـە پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) داوای دیاریو بەخشینی لەبێ بـڕوا کـردووە، ئـەوەش بەڵـگەی ئەوەیـە کـەدیاریو بەخـشینو دەسـەنەی بـێ بـڕوا دروسـتەو هـەروا وەرگـرتنو لێخواردنیشی دروستە.

١١١٢- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: إنّ أمّي قادمةٌ وَهِيَ رَاغِبَةٌ أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: (نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ) (الحديث ٢٦٢٠، أطرافُهُ في: ٣١٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩) [١٧٦]

---

(١٧٦) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل النفقة و الصدقة على الأقربين.. رقم: ١٠٠٣.

ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەدینە قەتیلەی دایکم هات بۆ لام، کات سەردەمی پێغەمبەر بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم هاتووە بۆ سەردانم بەتەمای ئەوەیشە کەیارمەتی بدەم و دیاری و دەسەنەی بدەمێ، جا ئایا سیلەی ڕەحمی دایکم بەجێ بهێنم یا نا؟ فەرمووی: (بەلێ، سیلەی ڕەحمی دایکت بەجێ بهێنە، گەرچی ناموسوڵمانیشە، بەلام لەبەر ئەوەی کە دایکتە مافی ئەوەی هەیە کەسیلەی ڕەحمی بەجێ بهێنی).

١١١٣- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عُبَيْدِ اللّٰهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَنَّ بَنِي صُهَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ جُدْعَانَ ادَّعَوْا بَيْتَيْنِ وَحُجْرَةً أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَى ذَلِكَ صُهَيْبًا فَقَالَ مَرْوَانُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكُمَا عَلَى ذَلِكَ قَالُوا: ابْنُ عُمَرَ فَدَعَاهُ، فَشَهِدَ لأَعْطَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صُهَيْبًا بَيْتَيْنِ وَحُجْرَةً فَقَضَى مَرْوَانُ بِشَهَادَتِهِ لَهُمْ) (الحديث ٢٦٢٤) (١٧٧).

عەبدوڵلاکوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی ئەبومولەیکە، فەرمووی: کوڕەکانی صوهەیبی ڕۆمی کە ئازادکراوی عەبدوڵلای کوڕی جەدعان بوو ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێ، داخوازی ئەوەیان هەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوو ماڵ و هۆدەیەکی بەخشیوە بەصوهەیبی باوکیان، مەڕوانی کوڕی حەکەمیش کە ئەو کاتە فەرمانڕەوای موعاویە بوو، لەسەر شاری مەدینە، بەکوڕەکانی صوهەیبی فەرموو: کێ شایەتتانە لەسەر ئەم داوایەتان؟ گوتیان: عەبدوڵلای کوڕی عومەر. جا ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر ئەم شێوەیە شایەتی دا: سوێندم بەخودا، پێغەمبەری خودا دوو ماڵ و هۆدەیەکی بەخشی بە صوهەیب، ئیتر مەڕوان لەسەر شایەتییەکەی ئیبنو عومەر، بڕیاری دوو ماڵ و هۆدەکەی دا بۆیان.

(١٧٧) لم يوافقهُ مسلمٌ على تخريجهِ (فتح/٥/٢٤٧- خاتمة كتاب الهبة) المترجم.

## راڤەو شیکردنەوە:

صوهەیبی کوڕی سنانی کوڕی خالیدی موصلی، پاشان ڕۆمی، پاشان مەککەیی، پاشانتر مەدینەیی، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە لەپێناوی خواو پێغەمبەرو ئیسلاما، ئەشکەنجەو ئازاری زۆری چەشتووە، صوهەیب بەڕەگەز عەرەبە، بەڵام بەمناڵی ڕۆم دیلی دەکەن لەبەر ئەوە زمانی ئەوان باشتر فێردەبێ. باوکی صوهەیب یا مامەی کاربەدەستی کیسرا دەبێ، لەسەر (الأبلة) هەوارگەیان لەخاکی موصل بوو، سوپای ڕۆم هێرش دەبەنە سەر ناوچەکە صوهەیب دیل دەکەن، جا لەناو ڕۆما پەروەردە دەبێ،جا لەبەر ئەوە زمانی ئەوان باشتر فێر دەبێو ناو دەردەکا بەصوهەیبی ڕۆمی، هەتا هۆزی کەلب دەیکرنو دەیهێنن بۆ مەککە، لەوێ عەبدوڵلای کوڕی جەدعان دەیکڕیو ئازادی دەکا، لەگەڵی دا لەمەککە نیشتەجێ دەبێ هەتا ئیبنو جەدعان دەمرێ، ئەوجا صوهەیب(ڕەزای خوای لێ بێ) کۆچ دەکا بۆ مەدینە، لەمانگی ڕەبیعی یەکەما لەقەباء، بەرلەوە بچێتە ناو مەدینە بەخزمەت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەگات، وە ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕگەکانی پاش بەدریش لە خزمەت پێغەمبەردا دەبێ.

واقیدی دەفەرموێ: صوهەیبو عەمماری کوڕی یاسیر، لەیەك ڕۆژدا موسوڵمان بوون. دەڵێن: صوهەیب زۆر سوورکەلە بووە، مووی زۆروو پڕبووە کەمێ کورتە بنە بووە. صوهەیب دەفەرموێ: لەپێش پێغەمبەریش دا هاوڕێی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بووم، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەسێ باوەڕی تەواوی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، باوەك چۆن مناڵی خۆی خۆش دەوێ، ئاوا صوهەیبی خۆش بوێ). لەتەمەنی حەفتاساڵیدا، لەمەدینە مردووە، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی دەکا، کوڕەکانی صوهەیب ئەمانەن: حەمزە، سەعد، صاڵح، صەفی، عباد، عوثمان،

حەبیب، محمد، هەموویان فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە — رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموویان بێ -.

١١١٤-عَنْ جَابِرٍ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَضَى النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْعُمْرَى أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ) (الحديث ٢٦٢٥).

جابیر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ شتێ ببەخشێ بەکەسێ، پێی بڵێ: کە هەتا ماوی ئەم شتە بۆ تۆبێ، ئەوە دەبێ بەهی ئەو کەسە کە پێی بەخشراوە، پاش مردنیشی ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنی پێشووی، بەڵکو دەبێ بەهی کەلەپوور گرانی پێبەخشراوەکە. (تاج/٢/٣٧١-ز-١٧٩-باسی عومراو روقبا).

١١١٥- عنْ عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ أَيْمَنَ رحمهُ الله تعالى قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) وَعَلَيْهَا دِرْعُ قِطْرٍ ثَمَنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ فَقَالَتْ ارْفَعْ بَصَرَكَ إِلَى جَارِيَتِي انْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهَا تُزْهَى أَنْ تَلْبَسَهُ فِي الْبَيْتِ وَقَدْ كَانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا كَانَتْ امْرَأَةٌ تُقَيَّنُ بِالْمَدِينَةِ إِلاَّ أَرْسَلَتْ إِلَيَّ تَسْتَعِيرُهُ). (الحديث ٢٦٢٨)(١٧٨).

عەبدولواحیدی کوڕی ئەیمەن (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) کراسێکی جاوی لەبەردا بوو، بایی پێنج درەم، فەرمووی: ئەی ئەیمەن! سەیرکە! کەنیزەکەکەم لەماڵەوەش بێزی نایەو دەعیەی نایەنێ، ئەمە لەبەر بکا، لەسەردەمی پێغەمبەریش دا (دروودی خوای لەسەر بێ) ، کراسێکم لەمانە هەبوو، هەر ئافرەتێ لە مەدینەدا کەدەچوو بەبووکیو خۆی دەڕازاندەوە بۆ زاوا، دەینارد بۆلام ئەو کراسەی لێ دەخواستم بۆ شەوی بووکێنییەکەی، کەچی ئێستا

(١٧٨) قال العلامة العيني: (والحديث تفرد به البخاري) المترجم.

دەعیە وا زل بووە کارەکیش بێزی نایەت لەبەری بکا. (تاج/٢/٣٤٠/٢-ز-١٦٢-
باسی عاریەو خواستەمەنی)

١١١٦-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الْمَدِينَةَ مِنْ مَكَّةَ وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ يَعْنِي شَيْئًا وَكَانَتْ الأَنْصَارُ أَهْلَ الأَرْضِ وَالْعَقَارِ فَقَاسَمَهُمْ الأَنْصَارُ عَلَى أَنْ يُعْطُوهُمْ ثِمَارَ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ وَيَكْفُوهُمْ الْعَمَلَ وَالْمَئُونَةَ وَكَانَتْ أُمُّهُ أُمُّ أَنَسٍ أُمُّ سُلَيْمٍ كَانَتْ أُمَّ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ فَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِذَاقًا فَأَعْطَاهُنَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلَاتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ) (الحديث ٢٦٣٠، أطرافُهُ في: ٣١٢٨، ٤٠٣٠، ٤١٢٠) (١٧٩).

ئەنەسی کوڕی مالیك(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کۆچکاران لەمەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، هیچیان بەدەستەوە نەمابوو، ئەوسامانەی کە هەیان بوو، لەمەککە بەجێ مابوو، وە یاریدەدەران -أنصار- یش خاوەنی زەوی‌و زارو باخ‌و رەز بوون، جا یاریدەدەران کۆچکارەکانیان کرد بەهاوبەشی خۆیان لەبەروبوومی باخ‌و رەزو داهاتی سامانەکانیان دا، بەمەرجێ ئەوانیش لەباتی خۆیان سەرەوکاری باخ‌و دێبەرو سامانەکانیان بکەن‌و سالانە بەرهەمیان بهێنن‌و بنکەکان بۆ خاوەنەکانیان بن، بەلام لەبەروبوومەکەیان هەردوولا هاوبەش بن (وەك لەژمارە: ١٠٢٣ دا رابوورد) دایکیشم - کە ناودرابوو بە ئوم سولەیم، کە دایکی عەبدوللای دایك برام بووکە کوڕی ئەبو طەلحەی مێردی دایکم بوو- بەری چەند دارخورمایەکی خۆی بەخشیبوو بەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) بەری ئەو دارخورمایانەی بەخشیبوو بە ئوم ئەیمەنی ئازادکراوی خۆی، کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەید بوو!.

(١٧٩) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: ردّ المهاجرين إلى الأنصار.. رقم: ١٧١١.

١١١٦- (مكرر) وعَنْهُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتالِ أَهْلِ خَيْبَرَ فَانْصَرَفَ إِلَى الْمَدِينَةِ رَدَّ الْمُهَاجِرُونَ إِلَى الأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمْ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ فَرَدَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أُمِّهِ عِذَاقَهَا وَأَعْطَى رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ(١٨٠).

دیسان ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەكوشتاری خەڵكی خەیبەر لێ بۆوە، وگەڕایەوە بۆ مەدینە، بەهۆی ئەو هەموو باخو ڕەزو زەویو زارە زۆرەی كەلە خەیبەر دەستیان كەوت، ئەو بەروبوومەی كە یاریدەدەران بەخشیبوویان بەكۆچكاران، لەبەروبوومی ساڵانەی ڕەزو باخەكانیان، گێڕایەوە بۆیان كەئیتر لەوەدوا باخەكانیان هەر بۆخۆیان بێ. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) بەری ئەو چەند دارخورمایانەی كە بەخشیبووی بە ئوم ئەیمەنی دایەنی، لێی سەندەوەو دایەوە بەدایكم، چونكە لەبنەڕەتدا هی دایكم بوون ئەو بەخشیبوونی بە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و پێغەمبەریش بەخشیبوونی بەئوم ئەیمەن، وەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەباخەكەی خۆی هەقی ئەوەی بۆ ئوم ئەیمەن كردەوە. (بڕوانە: ژ ١٠٢٥+ ١٠٢٩).

## ڕاڤەو شیكردنەوە:

ئوم ئەیمەن (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەلەو دایەنی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بووە، ناوی بەرەكە بووە، كەنیزی ئامینەی دایكی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بووە، كاتێ پێغەمبەر گەورە بوو ئازادی كردو مارەی كرد لە زەیدی كوڕی حاریثە، كە زەیدیش ئازادكراوی خۆی بوو، جا ئوم ئەیمەن لەزەید ئوسامەی

(١٨٠) ئەمیش بەشێكە لەفەرموودەی ژمارە (١١١٦) وەرگێڕ.

بوو، ئەیمەن‌و ئوسامە برای دایکین. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەئوم ئەیمەنی دەفەرمویٚ: دایە! وە دەیفەرمووو: (بەرەکە لەدوای دایکم ئەو دایکمە) ، لەپاش مەرگی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەپێنج مانگ ئوم ئەیمەنیش دەمرێ — رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ -.(بڕوانە: تاج/١٦٣/٥ز-٤٢-چاکێتی ئوم ئەیمەن).

١١١٧- عَنْ عَبْدَ اللّهِ بْنَ عَمْرِو (رَضِيَ اللّهُ عَنهما) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) : (أَرْبَعُونَ خَصْلَةً أَعْلاهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ مَا مِنْ عَامِلٍ يَعْمَلُ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجَاءَ ثَوَابِهَا وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللّهُ بِهَا الْجَنَّةَ ). (الحديث ٢٦٣١).

عەبدوڵلای کوڕی عەمر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ (رۆحم بەقوربانی بێ) : (چل کاری باش هەن هەرەگەورەکەیان بزنەبەدۆخەیە، هەر کەسێ یەکێ لەم ئیشە باشانە بکات بەهیوای پاداشی باشی، وە لەهەمان کاتدا باوەڕی بەو بەڵێنە هەبێ کە خودا داویەتی، لەبارەی ئەو ئیشەوە، ئەوە بێگومان کە خوا دەیباتە بەهەشت). (تاج/٢/٦١ز-٢٣-هاندان لەسەر خێرکردن).

## پایانیٚ(خاتمة)

شێخی عەسقەلان (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرمویٚ: نامەی بەخشین‌و پاشکۆکانی نەوەدو نۆ، سەد یەك کەم، فەرموودەی واتیادا، بیست‌و سێ‌یان بێڕشتەن، واتە: تەعلیقن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: مەوصوولن، دووبارەکانیان شەست‌و هەشتن، پوختەکەیان (٩٩-٦٨=٣١) دەکاتە سی‌و یەك فەرموودە، موسلیمیش وەك ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خودایان لێ بێ) گشتیانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەمانەیان:

١- (١٠٩٧ت=٢٥٦٨ف)

٢- (٢٥٨٠ف) لەتەجریدەکەدا نییە.

٣- (١١٠٣ت=٢٥٨٢).

٤ - (٢٥٨٥ف) لەتەجریدەکەدا لەم شوێنەدا نییە.

٥- تەعلیقەکەی ئیبنوعەبباس: (مَنْ أُهدِيَتْ لَهُ هَدِيَةٌ فَجُلَساؤُهُ شُرَكاؤُهُ) وا لەپێش ژمارە: (٢٦٠٩ف) دا لە تەجریدەکەدا نییە.

٦- (١١٠٩ت=٢٦١٣ف).

٧- (١١١٣ت=٢٦٢٤ف).

٨- (١١١٥ت=٢٦٢٨ف).

٩- (١١١٧ت=٢٦٣١ف).

هەروا دەفەرموێ: (سیازدە بیستراوی هاوەڵان و زانایانی پاش ئەوانیشی واتیادا. بیستراو = أثر ).

بسم الله الرحمن الرحيم

لێرەدا بەدەق ئەمەم نووسیوە، وا بۆ یادگارو پیتو فەڕو پیرۆزی روونووسی دەکەمەوە بەبێ دەستکاری وەك خۆی: (جزمی یەکەم تەواو لەسەعات حەوت رۆژی ١٣٩٣/١/١٥هـ: رێکەوتی سەعات یەکی رۆژی ٩٧٣/٢/١٨ لەوەرگێڕانی جزمی یەکەمی نامەی (تەجریدو صەریح) لێ بوومەوە. وەبەپشتی خوا وەرم گێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی. وەرگێڕ: نوری فارس.

**تێبینی**:

باسی (بەخشین) لە فیقهی ئاسانا وا لە لاپەڕە /٥٤٤ز-٢٣٦. باسی عاریە (خواستەمەنی) وا لە ل-٥٠٩ز-٢٢٢.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٦- نامەی شایەتیدان (كتابُ الشهاداتِ)

١١١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ) (الحديث ٢٦٥٢، أطرافُهُ في: ٣٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٥٩، ٦٤٢٩، ٦٦٥٨) (١٨١).

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود**(ڕەزای خوای لێ بێ) **دەفەرموێ: خۆشەویست**(دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (باشترینی مەردوم چینی هاوچەرخی منە، کە چینی هاوەڵانە، کەناودارن بە چینی سەحابەی پێغەمبەر - درودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەوان بێ-، ئەجا چینی دوای ئەوان کە چینی دووەمی موسوڵمانن، کە ناودارن بەتابیعین، ئینجا چینی سێیەمی موسوڵمانن کەوان لەدوای چینی دووەمەوە، کە پێیان دەگوترێ: تابیعی تابعین – ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ – لەپاشان هۆزێ پەیدا دەبن، کۆناکەنەوە لەشایەتیو سوێند خواردن، وتێکەڵو پێکەڵیان دەکەن بەسەر یەکدا).**
**(تاج/٣١١/٣-٣ز-١١٧- باسی هەڕەشەکردن لەشایەتی درۆ +تاج/٥/٤ف-١ش/د/ت).**

## هەڕەشەکردن لەشایەتی درۆ

١١١٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ) ثَلاثًا، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ) وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَقَالَ: (أَلا وَقَوْلُ الزُّورِ) قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ) (الحديث ٢٦٥٤، أطرافُهُ في: ٥٩٧٦، ٦٢٧٣، ٦٢٧٤، ٦٩١٩) (١٨٢).

---

(١٨١) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل الصحابة ثمّ الذين يلونهم، رقم: ٢٥٣٣.

(١٨٢) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان الكبائر وأكبرها، رقم: ٨٧.

ئەبوبەكرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەدی، ئاگادرابن، گوێبگرن با پێتان بڵێم کە گوناهی گەورە چییە؟) گوتیان: بفەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! گوێمان لێتە، فەرمووی: (هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوای تاك وتەنیاو دڵڕەنجاندنی باوكو دایك) حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) لەم کاتەدا شانی دادا بوو، جا بۆ گرنگی دان بەمەیان ڕاست دانیشتو فەرمووی: وەشایەتی درۆ.ئیتر ئەم ووشەیەی ئەوەندە دووبارەکردەوە هەتا بەزەییمان پیادا هاتەوەو مەترسی ئەوەمان هەبوو کە ماندووی بکا، لەبەر ئەوە لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت خۆزگە بێ دەنگ دەبوو. (تاج/٣/٣١٠-از-١١٧-ش/ت).

## شایەتی کوێرو بانگو سەوداو مامەڵەیو شتی تری وای کە پەیوەندی بەدەنگەوە بێ دروستە

١١٢٠-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) قَالَتْ سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يَقْرَأُ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ رَحِمَهُ اللّٰهُ: لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وَكَذَا آيَةً أَسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا). (الحديث ٢٦٥٥، أطرافُهُ في: ٥٠٣٧، ٥٠٣٨، ٥٠٤٢، ٦٣٣٥).

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵی من بوو، خەریکی شەو نوێژ بوو، پیاوێکیش لەناو مزگەوتا شەونوێژی دەکردو قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گوێی لەدەنگی قورئانخوێندنەکەی بوو، لەمنی پرسی: (ئەی عائیشە! ئەمە دەنگی عەببادی کوڕی بیشرە؟) گوتم: بەڵێ ئەوە دەنگی ئەوە، فەرمووی: (ڕەحمەتی خودای لێ بێ، ئەم پیاوە فیسارە ئایەتی لەفیسارە سوورەت یادخستمەوە، کەئەو ئایەتەم لەیاد برابۆوە). (تاج/٥/٢٨٣-٤-ش/د).

چۆنێتی بەڵگەیەتی ئەم فەرموودەیە، لەسەر بابەتەکە، لەوەدایە، کەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) اعتمادی لەسەر دەنگی عەببادکردووە، بەبێ

ئەوەی چاوی لەخۆی بێ، وەك چۆن كوێریش هەروایە، هەر دەنگی كەسەكە دەبیستێ، خۆی نابینێ.

+ وعَنْها (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) قَالَتْ تَهَجَّدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِي فَسَمِعَ صَوْتَ عَبَّادٍ يُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ أَصَوْتُ عَبَّادٍ هَذَا) قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: (اللَّهُمَّ ارْحَمْ عَبَّادًا) واتاكەی رابوورد. باسی شایەتی دا، لە فیقهی ئاسان دا وا لەبەرگی سێیەم ل-٩٨٨ز-٤٠٠.

## داستانی هەلاتو بوختانە گەورەكە (حديثُ الإفك)

١١٢١- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزَاةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ سَهْمِي فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنْ الْمَدِينَةِ آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ فَلَمَسْتُ صَدْرِي فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدْ انْقَطَعَ..

فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ فَأَقْبَلَ الَّذِينَ يَرْحَلُونَ لِي فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنْ الطَّعَامِ فَلَمْ يَسْتَنْكِرْ الْقَوْمُ حِينَ رَفَعُوهُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ فَاحْتَمَلُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ فَجِئْتُ مَنْزِلَهُمْ وَلَيْسَ فِيهِ أَحَدٌ فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونَنِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ غَلَبَتْنِي عَيْنَايَ فَنِمْتُ وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ

الْحِجَابِ فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَوَطِئَ يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُعَرِّسِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الإِفْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيّ ابْنُ سَلُولَ.

فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ بِهَا شَهْرًا وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لا أَرَى مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَمْرَضُ إِنَّمَا يَدْخُلُ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ: (كَيْفَ تِيكُمْ؟). لا أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى نَقَهْتُ فَخَرَجْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ مُتَبَرَّزُنَا لا نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِي الْبَرِّيَّةِ أَوْ فِي التَّنَزُّهِ فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ بِنْتُ أَبِي رُهْمٍ نَمْشِي فَعَثَرَتْ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْتِ أَتَسُبِّينَ رَجُلاً شَهِدَ بَدْرًا فَقَالَتْ: يَا هَنْتَاهْ أَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالُوا فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا عَلَى مَرَضِي فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمَ فَقَالَ: (كَيْفَ تِيكُمْ؟) فَقُلْتُ: ائْذَنْ لِي إِلَى أَبَوَيَّ قَالَتْ: وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَيْتُ أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لأُمِّي: مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ؟ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَى نَفْسِكِ الشَّأْنَ فَوَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتْ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا وَلَهَا ضَرَائِرُ إِلاَّ أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا فَقُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَلَقَدْ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ بِهَذَا قَالَتْ فَبِتُّ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ.

ثُمَّ أَصْبَحْتُ فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ يَسْتَشِيرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِالَّذِي يَعْلَمُ فِي نَفْسِهِ مِنَ الْوُدِّ لَهُمْ فَقَالَ أُسَامَةُ أَهْلُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلا نَعْلَمُ وَاللَّهِ إِلاَّ خَيْرًا وَأَمَّا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ يُضَيِّقْ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ وَسَلْ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) بَرِيرَةَ فَقَالَ: (يَا بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْتِ فِيهَا شَيْئًا يَرِيبُكِ؟) فَقَالَتْ: بَرِيرَةُ لا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنْ رَأَيْتُ مِنْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنْ الْعَجِينِ فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ يَوْمِهِ فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيِّ ابْنِ سَلُولَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ يَعْذُرُنِي مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِي فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ خَيْرًا وَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلاً مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْرًا وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ مَعِي).

فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا وَاللَّهِ أَعْذُرُكَ مِنْهُ إِنْ كَانَ مِنْ الأَوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنْ الْخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا فِيهِ أَمْرَكَ. فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَهُوَ سَيِّدُ الْخَزْرَجِ وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلاً صَالِحًا وَلَكِنْ احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ لا تَقْتُلُهُ وَلا تَقْدِرُ عَلَى ذَلِكَ فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ وَاللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنْ الْمُنَافِقِينَ فَثَارَ الْحَيَّانِ: الأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَلَ فَخَفَّضَهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ وَبَكَيْتُ يَوْمِي لا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ فَأَصْبَحَ عِنْدِي أَبَوَايَ وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا حَتَّى أَظُنُّ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي قَالَتْ فَبَيْنَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي إِذْ اسْتَأْذَنَتْ امْرَأَةٌ مِنْ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي.

فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَلَسَ وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مِنْ يَوْمِ قِيلَ فِيَّ مَا قِيلَ قَبْلَهَا وَقَدْ مَكَثَ شَهْرًا لا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي شَيْءٌ قَالَتْ: فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ) فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً وَقُلْتُ لأَبِي: أَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لأُمِّي: أَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا قَالَ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَاأَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنْ الْقُرْآنِ فَقُلْتُ إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ سَمِعْتُمْ مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ وَوَقَرَ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَبَرِيئَةٌ لا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ وَلَئِنْ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً إِلاّ أَبَا يُوسُفَ إِذْ قَالَ: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ).

ثُمَّ تَحَوَّلْتُ عَلَى فِرَاشِي وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يُبَرِّئَنِي اللَّهُ وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا ظَنَنْتُ أَنْ يُنْزِلَ فِي شَأْنِي وَحْيًا وَلأَنَا أَحْقَرُ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يُتَكَلَّمَ بِالْقُرْآنِ فِي أَمْرِي وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ فَوَاللَّهِ مَا رَامَ مَجْلِسَهُ وَلا خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنْ الْبُرَحَاءِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنْ الْعَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَضْحَكُ فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ لِي: (يَا عَائِشَةُ احْمَدِي اللَّهَ فَقَدْ بَرَّأَكِ اللَّهُ) فَقَالَتْ لِي أُمِّي: قُومِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: لا وَاللَّهِ لا أَقُومُ إِلَيْهِ وَلا أَحْمَدُ إِلاّ اللَّهَ.

فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ الآيَاتِ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) : وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وَاللَّهِ لا أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ مَا قَالَ لِعَائِشَةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَلا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا إِلَى قَوْلِهِ غَفُورٌ رَحِيمٌ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ بَلَى وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ الَّذِي كَانَ يُجْرِي عَلَيْهِ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْأَلُ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي

فَقَالَ: (يَا زَيْنَبُ مَا عَلِمْتِ مَا رَأَيْتِ؟) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي وَاللّٰهِ مَاعَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلاّ خَيْرًا قَالَتْ: وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي فَعَصَمَهَا اللّٰهُ بِالْوَرَعِ) (الحديث ٢٦٦١، أطرافُهُ سبقت في: ١١٠٧ تجريد).

عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق –دایکی موسوڵمانان- (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ دەڕۆیشت بۆ سەفەرێ، لەنێوانی خێزانەکانی دا تیروپشکی دەکرد، ئیتر بەناوی هەرکامێکیانەوە پشك دەربچوایە، ئەو ژنەیانی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو سەفەرە، وەلەسەر ئەم یاسایە جارێ پشکی خست لەناوماندا، دەیویست بچێ بۆ غەزای بەنی موصطەلەق، وارێکەوت پشك بەناوی منەوە دەرچوو، وەمن لەخزمەتیدا چووم بۆ ئەو غەزایە، ئەم سەفەرەیش پاش ئەوە بووکە ئایەتی حیجابو حیجاب گرتنەوە هاتبوە خوارەوە، دەربارەی هاوسەرەکانی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) لەبەر ئەوە من بەبەرگی حیجابەوە لەناو کەژاوەیەکدا هەڵیان دەگرتم،و دەیانخستمە سەر پشتی وشترەکەمو هەر بەکەژاوەکەوە لەوشترەکە دایان دەگرتم، ڕۆیشتین هەتا حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) لەغەزاکەی لێ بۆوەو گەڕایەوەو گەیشتینە نزیکی مەدینە، لەوێدا لەشەودا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری دا، کە بکەونە ڕێو بەرەو مەدینە بجمێن..

منیش لەوکاتەدا کە خەڵکەکە خەریکی بارکردن بوون، هەستام چووم بۆ سەراوو دوورکەوتمەوە لەقەرەباڵغی سوپاکە، کاتێ سەراوەکەم تەواو کرد، هاتمەوە بۆ لای شوێنەکەی خۆم، تەماشام کرد، گەردانەیەکی بەردەشەوەی ظەفارم هەبوو، پسابوو، وەچەن دانەیەکی لێ داکەوتبوو، منیش بەڕێگەکەی خۆما گەڕامەوەو گەڕام بۆ ملەوێنکەکەم جا ئەم گەڕانو خەریکبوونە درەنگی بەسەرهێنامو لەکەژاوەکەم بێ ئاگا بووم، تومەز ئەوانەی کەخزمەتی ئێمەیان دەکردو وشترەکەیان بۆم کۆپان دەکرد، هاتبوون کەژاوەکەی منیان

بـەخاڵێتی هەڵـگرتووەو ناویانەتـە سەرپـشتی وشـترەکەم، بـەبیری خۆیـان وایانزانیوە کە مـن وام لەناویـدا، ئـەو سـەردەمەش هێشتا ئافرەتـان سوکەڵە بـوون‌و قەڵەوو گۆشـتن‌و قـورس نـەبوو بـوون، چـونکە خواردنیـان کـەم بـوو، بەقەد بەرکولـێ دەبوو نـەدەبوو، سـەرەڕای ئەمـەیش مـن خۆیـشم ئـەو حەلـە هێشتا کچۆڵە بووم‌و کەنیشکێـکی مناڵـکار بـووم‌و تـەواو سـووکەڵە بـووم، ئـیتر لەبەر ئەم هۆیانەو دیارە چارەنووسی خودایی وابووە، کـاتێ پیاوەکـان کـەژاوە خاڵییەکـە هەڵـدەگرن‌و دەینـێن لەوشـترەکەی ژێـر مـن، هەسـت بەسـووکی‌و چۆڵییەکەی ناکەن‌و یەکسەر وشترەکە هەڵدەستێنن‌و دەڕۆن..

کاتێ ملەوانکەکەم بەتەواوی دۆزییـەوە ڕۆیـشتمەوە بـۆ شـوێن هەوارگـەی سـوپاکە، تەماشـام کـرد کەسـی لـێ نـەماوە، ئـیتر ڕۆیـشتم بـۆ سـەر شـوێنە پێشووەکەی خۆم‌و بەناچاری لـەوێ دانیـشتم، بـەهیوای ئـەوە کـە هاوڕێـکانم درەنگ یا زوو ئاگادار دەبن لـەوە کـە مـن لەکەژاوەکـەدا نـیم‌و هەڵـەی خۆیـان بـۆ دەردەکـەوێ، کـە کەژاوەکـە بەتاڵـەو مـن لەبـەر هـەر هـۆیێ بـێ ون بـووم‌و دەگەڕێنەوە بەشوێنما کەمێ مامەوە لەوشوێنەدا خەوم پیاکەوت..

کەچـاوم کــردەوە صــەفوانی کــوڕی موعــەطــەلی ســولەمی ذەکــوانی، کە لەپاش سوپاکەوە بوو هـات، صـەفوان لەبەرەبـەیانا سـەرخەوێ دەشـکێنی‌و لەپاشا شەو لـەناو شـەو دەگرێ بەدەمـەوەو دەکەوێتـە ڕێ‌و، لـەدەمی بەیانـدا گەیشتە لای من، صەفوان عادەتی وادەبـێ هـەمو جارێ لەسـوپاکە دوادەکـەوێ تادەڕۆن، ئەوجار بەشوێنەواری سـوپاکەدا تێدەپـەڕێ ئەگـەر شتێ لەسـوپاکە، داکـەوتبێ هـەڵی دەگرێتــەوەو شـوێنیان دەکـەوێ، کـەنزیك دەبێتــەوە لـەمن لەدوورەوە ڕەشایی‌و تارمایی مـرۆڤێکی نووستوو دەبینـێ، کـە دێتـە پێـشەوەو دەگاتە سەرم، تەماشام دەکا دەمناسـێتەوە، چـونکە لـەپێش ئـەوەدا کەپەچـەو چارشـێو گرتنـەوە دابـێ‌و بـەرگی حیجـاب پەیـدا بـبێ، ئـەو منـی دەدی، کـە دەمناسێتەوە دەست دەکا بەگوتنی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾.

ئیتر لەدەنگی ئەم وشەیە خەبەرم بۆوە، کە چاوم کردەوە صەفوان دەیگوت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾. ئیتر من خۆم یەکسەر داپۆشی‌و گورج چارشێوەکەی خۆمم دا بەڕوی خۆم دا، بەزاتی خودا یەك وشە چییە، قسەی تری لەگەڵ نەکردم، جگە لەو ئایەتە زیاترم لێ نەبیست، ئەوەنەبێ کەکێشای بەدەستی وشترەکەیداو، ییخی داو منیش بەبێ یاریدەی ئەو کەباڵم بگرێ، یاقاچم هەڵ ببڕێ، سواربووم، جا کەوتە ڕێ‌و جڵەوی وشترەکەی بۆ رادەکێشام، هەتا لەسەر ئەم حاڵەتە گەیشتینەوە بەسوپاکە. کە لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا بۆ وچان لایان دابوو.

جا ئیتر سەبارەت بەمن تیاچوو ئەوەی تیاچوو، وەك دەڵێن: باوێلکە، بایەکی بەسە، داخ لەدڵەکانیش ئەمەیان بەهەل زانیو قۆستیانەوەو بەنیازی ئابڕوو بردنی حەزرەت‌و تانەدان لە خانەوادەی پاك‌و مەردو داوین پاکی وێستیان، خەنجەرە کۆڵ‌و کولەکەی خۆیان، هەتا مشتووە رزیوەکەی، بدەن لەکۆڵەی ئیسلام، بۆیەکا سەرۆکی ناپاکەکان، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی، کەپێشی دەگوترێ: عەبدوڵلای کوڕی سەلول، چونکە دایکی ناوی سەلوولە، ئەو سەرچۆپی گۆبەنی هەلات‌و بوختانە زلەکەی دەکێشاو، خۆش خۆش ئاگری ئاژاوەکەی بەدەستە چیلە خۆش دەکرد، کاتێ گەیشتینەوە مەدینەی نازدار وارێکەوت من یەك مانگی رەبەق نەخۆش کەوتم.

ئیتر لەبەر ئازاری خۆم ئاگام لەو خەڵکە نەبوو، کە لەناو خۆیانا باسی ئەو بوختانە دەکەن، کە دەستەی هەلاتبازەکان هەڵیان بەستبوو بۆ من، وەکردبویان بەبنێشتە خۆشەی خۆیان، سەرەڕای ئێش‌و ئازاری نەخۆشیەکەشم من لەکراسی خۆما پاك بووم، هیچ ئاگام لەم کەینو بەینە نەبوو، بەڵام لەوە دوو دڵ بووم کە پێغەمبەر -دروودی خودای لەسەر بێ‌و رەزای خودا لەگشت هاوسەرەکانی بێت— لەو نەخۆشینەمدا وەك نەخۆشینی جاران نازی نەدەگرتم،و ئەو میهرەبانی جارانەی نەمابوو لەگەڵما، جار جار

دەهاتە بەر دەرگای هۆدەکەم‌و سڵاوی لێ دەکردین‌و دەیفەرموو بەدایکم کە بۆ چاودێری لە لام بوو: (نەخۆشەکەتان چۆنە؟) ئیتر دەڕۆیشت، بەس لەمە دوو دڵ بووم، بەڵام هەستم بەشتی خراپ نەدەکرد، تا رۆژێ پاش ئەوەی تۆزێ بووژامەوەو کەمێ چاك بوومەوە، لەگەڵ دایکی میسطەحا – کە پوورزای باوکم بوو- چوومەدەرەوە بۆ مەناصیع، کە جێگەی سەراومان بوو، شەواو شەو نەبوایە دەرنەدەچووین، ئەوکاتە هێشتا ئاودەستمان لەنزیك ماڵەکانمانەوە دروست نەکرد بوو، لەسەر عادەتی عەرەبە پێشینەکان لەچۆڵەوانی سەراومان دەکرد، چونکی ئەوسا ئاودەستی لای ماڵ ئازاری دەدایین بەبۆنی ناخۆشی! جا کاتێ لە ئیشی خۆمان بووینەوەو گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە دایکی میسطەح لەڕێگە قاچی لەعاباکەی گیراو پێی هەڵکەوت و، نزایەکی خراپی لەمیسطەحی کوڕی کرد، گوتی: میسطەح سەرەنگرێ بێ‌و لەناو بچێ!؟

ئەم دایکی میسطەحە ناوی سەلما بوو، کچی ئەبو ڕەهمی کوڕی موطەلیبی کوڕی عەبدومەناف بوو، دایکی سەلماش کچی صەخری کوڕی عامیر بوو، پووری هەقی ئەبوبەکری صدیق بوو، میسطەحی کوڕی سەلماش کوڕی ئوثاثەی کوڕی عەببادی کوڕی موطەلیب بوو، کەواتە میسطەح: پورزازای ئەبوبەکری صدیقە، کە ئەو دوعایە شەڕەی لە میسطەح کرد پێم گوت: بۆ نزای شەڕی لێ دەکەی؟ میسطەح لەبەشدارانی جەنگی بەدرەو پیاوی باشە، قسەی خراپ هەڵناگرێ؟ ئەویش گوتی: ئەی هینە! هەی گێلە! تۆ نازانی ئەو چی گوتووە؟ گوتم: بۆ چی گوتووە؟ جا بەدوورو درێژی باسی داستانی بوختانەکەی بۆ گێڕامەوە.

ئیتر نەخۆشینەکەم لێ زیندوو بوەوەو بارم گرانتر بوو، کە چوومەوە بۆ ماڵەوە کاتێ حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) هاتەوە بۆ لام‌و وەك جاران سڵاوی کردو فەرمووی: ئەوەکەتان چۆنە؟ واتە نەخۆشەکەتان چۆنە؟ عەرزیم کرد:

ڕێگەم دەدەی بڕۆمەوە بۆلای باوك‌و دایكم؟ عائیشە دەیگوت: مەبەستم ئەوەبوو كە ئەم دەنگوباسە لەلای ئەوان ڕوون بكەمەوەو بچمە بنج‌و بنەوانی، جا حەزرەت (درودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ دام‌و منیش ڕۆیشتمەوە بۆ لای باوك‌و دایكم، جا عەرزی دایكمم كرد: دایەكە ئەو قسانە چین، خەڵكی دەیانكەن؟ ئەویش گوتی: كچەكەم لەسەرە خۆبەو گوێی مەدەرێ، پەتی درۆ كورتە، زوو دەردەكەوێ، بەخوا بەدەگمەن ڕێدەكەوێ كە ژنێ شۆخ‌و شەنگ‌و جوان بێ ولەلای مێردەكەی نازدارو خۆشەویست بێ‌و، هەوێبار بێ، وەك حاڵی حازری ئێستای تۆ، بەڵام لەپلارو زمان‌و توانج‌و دەمی هەوێكانی‌و كەسانی سەربەهەوێكانی ڕزگاری ببێ‌و قسەی زۆری بۆ هەڵنەبەستن.

منیش گوتم: سوبحانەڵڵا لەم سەیرە! ئایا شتی‌وا ڕێی تێ دەچێ كە ئەو خەڵكە ئەوەندە دەربەستی ڕەزای خوداو پێغەمبەر نەیەن‌و قسەی وا ناڕەوا بكەن؟! ئیتر شەو كردی‌و من كردم ئەوشەوە تاشەبەقی دا هەر گریام‌و فرمێسكم وشك نەبۆوەو خەو نەچووە چاوم! وەهەتا سبەی سەرومڕ دەگریام جالەبەر ئەوەی كە لەو كاتەدا سرووش نەدەهات بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەم لایەنەوەو درەنگ هات، حەزرەت عەلی كوڕی ئەبوطالیب‌و ئوسامەی كوڕی زەیدی بانگ كرد، وە بۆ جیابوونەوە لەهاوسەری خۆی كەمنم ڕاوێژی پێكردن، ئوسامە(ڕەزای خوای لێ بێ) زۆر بەجوانی ئەوەی كەدەیزانی لەپاكی‌و پاكیزەیی‌و مەردایەتی‌و داوێنپاكی خێزانەكەی پێغەمبەرەوە، ڕوونی كردەوە بۆی، بەهۆی ئەو دۆستی‌و دڵسۆزییەی كەلەناو دەروون‌و ناخی خۆیدا هەستی پێ دەكرد، بەرابەر بەخێزانەكانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەهۆی ئەوەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خێزانی خێزانی تۆ بێ، خراپ نابێ هەر قابیل بەخۆتەو دڵت چەكەرە نەكا، ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان ئەوەی باش نەبێ لێمان نەدیوە.

بەڵام عەلی(ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: قوربان! خۆ خودا دەرووی ژنهێنانی لێ نەبەستوی‌و ژنی تریش زۆرن لەدونیادا، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەنەبێ لەم

قسەیە مەبەستم ئەوەبێ خوانەخواستە من دلم لەئاستی رەوشی بەرزی عائیشە گەردی گرتبێ، یاحەزم لەوەبێ کەتۆ دەست بەرداری ببیت، نەء، مەبەستم ئەمە نییە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کەتۆ بەهەرحالێ خۆت بەباشی دەزانی فەرامۆشیت بۆبێ، دەنا ئەگەر حەز دەکەی بەباشی لەحاڵەکە حاڵی ببی، ئەوا من لەتۆ باشتری لێ نازانم، بۆ ئەمە ئەگەر پرسیار لەبەریرە بکەی کە کەنیزیەتیو لەگەڵی هەڵسوکەوت دەکا، ئەو قسەی راستت بۆ دەکات.

دەڵێ: جا پێغەمبەر بەریرەی بانگ کردو فەرمووی: ئەی بەریرە! هیچت لەعائیشە دیوە، کە جێگەی گومان بێ؟ بەریرە پێی گوت: سوێندم بەو کەسەی تۆی بەراستی ناردووەو کردویتی بە پێغەمبەری راستو دروست هیچی وام لێ نەدیوە، کە خوانەخواستە مایەی سووکی بێ بۆ پایەو شانو شوێنو جێگەی ئەو، تەنیا ئەوەنەبێ کەکەنیشکێکی مناڵکارە، هێشتا هەڵسوکەوتی لەمناڵ دەکا، چونکی جاروبار کە هەویر دەشێلێ بەسەر هەویرەکەوە خەوی لێ دەکەوێ، گەلێ جار ئاژەڵی ناومالێ دێن هەویرەکەی دەخۆن!

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە تۆزێ دڵی ئارام بوو، هەر ئەو رۆژە رۆیشت بۆ مزگەوتو تەشریفی رۆیشتە سەر مینبەرو سکاڵای حاڵی کرد لەدەست سەرۆکی ناپاکەکان: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! کێ هەقم دەداتێو یارمەتیم دەدا، لەسەرم دەکاتەوە ئەگەر بچم بەگژ ئەم پیاوە ناپیاوەدا، کەشەرمو شکۆ لەخودا ناکاو بەخوتو خۆڕایی ئازار بەخۆمو خێزانم دەگەیەنێو بووە بەدرکی مەمو زین لێمان، دەسا بەزاتی خودا من بەش بەحاڵی خۆم، کە پێغەمبەری خودامو لەقسەی راستو لەشایەتی هەق بەموو لانادەم، شایەتی دەدەم بۆ خێزانی خۆم ئەوەی باشەو چاکە نەبێ، لەو خێزانەی خۆمە نەمدیوەو، لەگەڵ خۆشم دانەبێ سەری بەماڵی مندا نەکردووە.

جا سەعدی کوڕی موعاذ مەردانە هەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مـن یارمـەتیت دەدەمو هـەقت دەدەمـیّو لەسـەر تـۆ دەچـم بەگژیـدا، ئەگەر ئەو نامەردە گێرەشێوێنە لەهۆزی ئەوسە، کە خۆم سەرۆکیانم ئـەوا بـەس تـۆ فـەرمان بفـەرموو، هـەتا بـدەم لەگـەردنی خـۆ ئەگـەر لـەبرا خەزرەجییەکانمانە ئەوا چیمان لەبارەیەوە فەرمان پیّ بفەرمووی دەیکەین!

کەچی لەوێدا سـەعدی کـوڕی عوبـادەی سـەرۆکی خێڵـی خـەزرەج، تەنگـە گرتـیو راسـتەوە بـوو، بەرپەرچـی سـەعدی کـوڕی موعـاذی دایـەوەو گـوتی: درۆت کرد! بەزاتی خودا نایکوژیو ناتوانی بیکوژی!

عائیشە (رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: سەعد لەوەبەر پیاوێـکی باش بـوو، بـەڵام لـەو کاتـەدا دەمـارو تەنگـە گرتبـووی، جـا لەوێـد ئوسـەیدی کـوڕی حـوضیر راستەوە بوو، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعـاذ بـوو، گوتی بەسـەعدی کـوڕی عوبادە: تۆ درۆ دەکەی! سا بەگەورەیی خوا دەیکوژین، بەراستی تـۆ لـەناپاکو مونافیقـانی، ئـەوەتانیّ بەئاشـکرا لەسـەر ئـەوان دەکەیتـەوەو پاسـی ناپاکـان دەکەی (چۆن موسوڵمان پشتی پێغەمبەر بەردەداو پشتی دژەکەی دەگـریّ، تـۆ چاو بکەرەوە، ئەی موسوڵمانی خودا! دەزانی قسەکەت کویّ دوگرێتەوە؟).

جـا لەوێـدا هـەردوو هـۆزی ئەوسـو خـەزرەج هـوروژان، نزیـك بـوو کـە بقەومیّو بچن بەگژی یەکتریداو، پـەلاماری یـەکتری بـدەن، حـەزرەتیش هـەر لەسەر مینبەرەکە راوەستا هـەر لـەوێوە بەفەرمایشتی شـیرین، خـەریك بـوو هێدی دەکردنەوە، هەتا بەرەبەرە خاوی کردنـەوەو، بیّ دەنـگو ئارام بـوونو خۆشی واتە: پێغەمبەر خۆشی خامۆشو ئارام بوو.

عائیـشە —سـەد هـەزار جـار رەزامەنـدی خـودای لەسـەربیّ— کـە خـودا کردوویـە بـەهۆی ئـەم هـەموو ئایـەتو فەرمایـشتە شـیرینو بەسـوودانە، کەبەزمانی پیرۆزی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، فەرمووی: ئـەو رۆژەیـش کەئـەم هەرایە رووی دا، دیسانەوە سەرومڕ گریامو خەو نەچووە چاوم و، فرمێسکم

وشك نەكردەوە، وەباوكو دايكم لەدڵسۆزى خۆيان لەوباوەڕەدا بوون، كەمن لەبەر گريان سوێم دەبێتەوەو گريان جگەرم لەت لەت دەكا، جا لەو كاتەدا كەباوكو دايكم لەلام دانيشتبوونو من لەسەر ئەو حاڵە دەگريام، ژنێكى ئەنصارى ئيذنى خواست كەبێ بۆلام، منيش رێگەم پێ دا، ئەويش هات دانيشت لەگەڵما، دەستى كرد بەگريان!!

عائيشە (رەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: لەم كاتەدا كە لەسەر ئەم حاڵە بووين، تەماشام كرد پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) هاتەماڵەوە، بۆلامانو سڵاوى كردو دانيشت، لەو رۆژەوە كە ئەو قسەو قسەلۆكانە دەربارەى من كرابوون، ئەوە يەكەم جار بوو لەلاى من دابنيشێت، ئەوا بوو بوو بەمانگێكى رەبەقيش كە لەم بارەيەوە نيگاى بۆ نەهاتبوو، جا حەزرەت لەپاش دانيشتن شايەتمانى هێناو فەرمووى: (لەپاش سوپاسو ستايشى خودا، ئەى عائيشە! دەربارەى تۆ هەندێ قسەى ناشايستەم بيستۆتەوە، ئەگەر تۆ پاك بىو لەوانە بەدووربى ئەوا خودا بەزويى پاكى تۆ ئاشكرا دەكات، ئەگەر قەرەى گوناهێكيش كەوتووى ئەوا تەوبەى لێ بكەو، داواى لێبوردنو لێخۆشبوون لەخودا بكە، چونكە خودا ميهرەبانە لەگەڵ بەندەى خۆى دا، هەركاتێ بەندەيێ گوناهێ بكاو تەوبەى لێ بكا، وەپێ لەگوناهى خۆى بنێ، ئيتر خوداى گەورە تەوبەو پەشيمانى لێ گيرا دەكا).

عائيشە (رەزاى خواى لێ بێ) فەرمووى: كاتێ حەزرەت(درودى خواى لەسەر بێ) فەرمايشتەكەى خۆى تەواو كرد، فرمێسك لەچاوما قەتيس ماو وشك بوو، هەستم بەتنۆكێ ئەشك نەكرد، (چونكى خەفەتو پەژارە كەزۆرى هێنا، دەرگاى فرمێسك دەبەستێ! ئەوكاتە دڵ تك تك خوێنى لێ دێ) جا بەباوكمم گوت: بابا! تۆ لەباتى من وەڵامى پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) بدەرەوە بۆ ئەم قسەيە كە دەيفەرموێ، باوكم فەرمووى: بەخوا نازانم وەڵامى چى بدەمەوە، جا گوتم بەدايكم: ئەى دايكە! تۆ وەڵامى پێغەمبەر(درودى خواى لەسەر بێ) بدەرەوە، ئەويش فەرمووى: نازانم چى عەرزى حەزرەت بكەم.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من ئەو كاتە كەنیشكێ منالـكار بووم زۆریشم لەقورئان نەخوێندبوو، لەبەر ئەوە لەبەر پەرێشانی دڵی خۆم ناوی حەزرەتی یەعقوبی باوكی حەزرەتی یوسفم لەبیر چوو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودای گەورە سەری خستم، كە بەگوساخی وەڵامی حەزرەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بدەمەوە..

بۆیەكا گوتم: بەخودا من باش باش دەزانم كە ئێوە ئەوەندە ئەم قسەو باسە چووە بەگوێچكەتانا لەدڵتانا چەسپیوەو، باوەڕتان پێ كردووە، جا ئەگەر من پێشتان بڵێم كە من پاكو بەریو بێ ئاگاو بێ گەردم لەم بوختانە، ئێوە باوەڕ بە من ناكەن هەرچەندە خودا بەو بانی سەرەوە بۆ خۆی دەزانیو باش باش ئاگادارە كە من لەگوڵ پاكترمو لەمنالی ساوا بێ تاوانترم، بەڵام ئەگەر بەدرۆ پێ بنێم لەكردنی تاوانێ كەنەمكردووە. ئەوا ئێوە باوەڕم پێ دەكەن، باوەڕ بەراستەكەم ناكەن، باوەڕ بەدرۆكەم دەكەن!

بەڵام سەبووریم بەوەدێ كە خودا بۆ خۆی ئاگادارەو دەزانێ كەمن وەك دەنكی تەرزە پاكو بێ گەردم، سوێندم بەخودای بانی سەر لەم هەڵوێستە ناسكەدا، كەجەنگەی خەمو خەفەتو پەژارەیەو، خورپەم لێ كەوتووە لەتاو هێرشی بوختانو شاڵاوی ناهەق، سوێندم بەخوا لەئاوا هەڵوێستێكا باشترین داستانێ كە بیكەم بەسەر مەشقو كەبشێ بۆ بەیانی حاڵی منو حاڵی ئێوە فەرمایشتەكەی باوكی حەزرەتی یوسفە، كە كوڕەكانی پیلانیان لەیووسفی برایان كردووە، بەدرۆ پاكانەیان بۆ باوكیان كردو گوتیان: كوڕەكەت گورگ خواردویەتی، سەرەڕای ئەوەش ئەوان تانەی ئەوەیان لەباوكیان دەدا، كە گوایە ئێمە قسەی راستت بۆ دەكەینو تۆ لەبەر ئەوەی دڵت پیسە لەئێمە بڕوامان پێناكەی، ئەویش لەم حاڵەدا، لەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا، كە لەدوو لاوە جەرگی داخ كرابوو، وەك ئەم حاڵەی ئێستای من، كاری خۆی سپارد بەخوداو فەرمووی: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ یوسف/١٢/١٨ واتە:

بەش‌و بارەی من سەبرو ئارامیێکی جوانە لەبەر باری خودای گەورەدا، هەر خودایە داوای یارمەتی لێ دەکرێ‌و دەتوانێ کە سەبووری دڵم بداو تەوانایيم پێ ببەخشێ بۆ هەڵگرتنی ئەم بارە قورسەی کەئێوە دەیڵێن.

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیتر لەو شوێنە هەستام ورۆیشتمەوە بۆ سەر نوێنەکەی خۆم‌و لەسەری پاڵ کەوتمەوە! عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: من هەر ئەو کاتە زۆر باش دەمزانی کەمن پاکم و، دەمزانی کە خودا پاکی‌و پاکیزەیی من بەیان دەکات، زوو یادرەنگ ئەو تۆمەتە ناهەقە بەدرۆ دەخاتەوە، من ئەمەم بەباشی دەزانی بەڵام بەخودا زەینم بۆ ئەوە نەدەچوو کە خودا ئایەتی قورئان لەشانی مندا بنێرێتە خوارەوەو ئەو ئایەتانە، لەناو قورئانی پیرۆزدا بمێنن‌و هەتا هەتایە ئەو ئایەتانە دەوربکرێنەوە لە هەموو لایێ!

بەڵام هیوام وابوو کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەخەودا خەوێ ببینێ‌و حاڵی بکرێ کەمن بەدوورم لەشتی واناشایستە، فەرمووی: جا سوێندم بەخودا ئیتر هەر لەوێدا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر شوێنی خۆی نەبزووت، وەکەسیش لەدانیشتوانی ناو کۆڕەکە لەماڵ دەرنەچوون، هەتا (نیگا=سروش) هاتە خوارەوە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) حاڵەتی هاتنی سرووش دایگرت، وەك هەموو جارێ کە سرووشی بۆ دەهات، ئەمجارەش ئاوا قورسی باری سرووش دایگرت، وەك تایەکی گران، وەجەستەی پیرۆزی نیشتە سەر ئارەق، تەنانەت دڵۆپی ئارەق دانەدانە وەك گۆی مرواری بەروخساری پیرۆزو جەستەی نازداریا، بەرو دوا دڵۆپ دڵۆپ دەهاتە خوارێ! ئەوەش لەبەر زەبرو قورسی وەحی‌و سرووشەکە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئێمە لەهەرەتی سەرمای زستاندا بووین‌و رۆژەکەشی رۆژێکی تۆفی تووشی سارد بوو.

جا کاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرامۆشی بۆ هات‌و سرووشەکەی وەرگرت‌و هاتەوە سەر بارودۆخی ئاسایی خۆی، لەپێش هەموو شتێکا لەخۆشیاندا پێکەنی‌و فەرمووی: ئەی عائیشە! موژدەبێ، ئەوا خودای

گەورەی خاوەن شکۆ دەری خست کە تۆ پاك‌و دووری لەو تاوانە! جا دایکم فەرمووی: ئەی عائیشە! هەڵسە بچۆ بۆ لای حەزرەت – دروودی خوای لەسەر بێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست بەقوربانی خاکی ژێر پای بێ- لەخزمەتیدا دانیشە، لەخۆشی ئەم مژدە خۆشەیە. منیش گوتم: بەخودا ناچم بۆلای‌و سوپاسی خودا نەبێ سوپاسی کەس ناکەم، کەبە میهرەبانی‌و گەورەیی خۆی ئاڵای سەربەرزی بۆ من هەڵکرد.

ئیتر خوای گەورەو سەروەر ئەم دە ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنكُمْ﴾ هەتا ﴿وإنَّ الله رؤوفٌ رحيمٌ﴾ – نور٢٤ /١١-٢٠- واتە: ئەو کەسانە کە ئەو هەلاتە هەرە گەورەیان هەڵبەست تاقمەیێ بوون لەخۆتان، وەلێ ئیشی خوا بێ سرپنییەو کاری خودا بێ حیکمەت نییە، کەواتە بەهەڵەدا مەچن‌و گومان مەبەن کەئەم درۆو بوختانە شەڕ بووە بۆ ئێوەو زەرەر لەقەلای قایمی ئیسلام دەدا، بەڵکوو خودا کردی بەمایەی خێرو خۆشی بۆ ئێوەو بۆ هەموو گەلی ئیسلام، لەلایەکەوە بوو بەکەفارەتی گوناهو لەلایەکەوە بوو بەهۆی هاتنەخوارەوەی هەژدە ئایەتی پیرۆزی قورئان، کەشتی‌وا قەت خێرو نرخی تەواو نابێ، ئەو هەلاتبازانەیش هەرکەسەیان بەپێی بەشداری خۆی لەدروستکردنی ئەم تاوانە هەڵبەستەدا سزای رەوای تاوانی خۆیان وەردەگرن، بەتایبەتی عەبدوڵلای کوڕی سەلول کە کێشی تاوانەکەی هاوێشتە سەر شانی خۆی.

ئەی موسوڵمانینە! دەبوو هەر لەسەرەتاوە کە ئەم هەلاتەتان بیست، گورج پیاوو ژنتان بتانگوتبایە، درۆیە کەلەکێشا نەبێ، عەقڵ نایگرێ، ئەم بوختانە گەورەیە، کەبە حەرەمی پێغەمبەری خودا کراوە، ئێمە کە موسوڵمانین، باوەڕمان وایە کەخودا بێ ڕێزی نایەنێ بەشانی موحەممەدداو، ئابڕوو نامووسی خۆی‌و خانەوادەی‌و کەس‌و کاری لەهەموو گەردو لکەو نەنگێ دەپارێزێ، کەواتە: ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە، ئەو درۆ هەڵبەستانە کوا

شایەتیان، كوا بەڵگەو نیشانیان، ئەگەر راست دەكەنو درۆناكەنو درۆزن نین، با چوار شایەت لەسەر داواكەیان راست بكەنەوە، جا مادەم شایەتیان نییە، دیارە مەبەستییان گێرەشێوێنیو رووخاندنی قەڵای ئیسلامە، وەخوا بۆ خۆی باش دەزانێ كە ئەوانە درۆ دەكەنو ئەوانە بەدرۆزن لەقەڵەم دراون. لە فەضلو سایەی خواوە بوو، بەسۆزو رەحمەتی بێ پایانی خۆی، لەدنیاو دوارۆژدا پاراستی، دەنا لەتۆڵەی ئەم وتی وتییەدا، كەسەرتان تێ كردبوو، دەمتان تێ ژەندبوو، سزایەكی گەلێ گەورە چزرەی لێ هەڵ دەستاندن!

بەتایبەتی لەگەرمەی ئەو كاتەدا كە ئەم درۆیەتان كردبوو بەبنێشتە خۆشەی بن ددانتان، واتان دەزانی كە ئەمە شتێكی سووكو ئاسانو ئاساییە، گەستنی ناموسی موسوڵمانانو زامارکردنی هەستو دڵو دەروونو ناموسیان هەروا بەدەم خۆشە، بەڵام شتیوا لەیاسای خودادا بەتاوانێكی گەلی گەورە دادەنرێ. دەبوو هەر لەیەكەم جارەوە باوەڕتان پێ نەكردایەو بەدرۆتان بخستایەتەوەو بتانگوتبایە: خوانەكا كە ئێمە قسەی وا ناڕەوا بەسەر زمانمانا بێ، سوبحانەڵلا لەم درۆ عەنتیكەیە! دەڵێی شاخو گوێی هەیە ئەوەندە هەلاتێكی زلو گەورەیە، بەراستی درۆ هەروا دەبێ، بوختانی رووتی بێ بەڵگەو نیشانو شایەت هەروا دەبێ!

خودا لەڕووی سۆزو میهرو جەرگسۆزییەوە تەمێو ئامۆژتان دەكا: كە جارێكی تر هەڵەی وا نەكەنەوەو، هەتا هەتایەو بڕای بڕای نەبن بەكۆمەكی، بۆ بەكرێگیراوانی شەیتان بۆ بڵاوكردنەوەی تۆوی ئاژاوەنانەوە بەناو گەلی ئیسلاما، ئەگەر ئێوە بەراستی خاوەنی ئیمانو باوەڕی ساخن.

خودا هەمیشە وەك مامۆستایەكی میهرەبانی دڵسۆز گوێ لەدەورو دەرستان دەگرێ، بەنەزاكەت هەڵەتان بۆ راست دەكاتەوە، یاساو نیشانەو ئایەتو حوكمی خۆیتان بۆ روون دەكاتەوە، چونكە خودا دانایە بەحاڵو زانایە لەكاری خۆیا، دەزانێ شانی بەندەی خۆی چی هەڵدەگرێ.

کەسانێ کە حەزدەکەن قاوی ناشیرین دابکەوێو ئابڕووی موسوڵمانان بەخوتو خۆڕایی لکەدار بکەن و، بەدرۆو بەراست شەنو کەوی باسو خواسی ناشیرین بکەن، لەهەردوو جیهانا سزای سەختی خۆیان وەردەگرن، خودا خۆی هەموو شتێ بەباشی دەزانێ، بەڵام ئێوە گەلێ شت هەیە لەخۆتانەوە نایزانن، مەگەر کەسێ تر فێرتانی بکا، قسەی پوختو پاڵفتەی فەرمایشت ئەمەیە: لەسایەو فەزڵو رەحمەتی خوداوەو لەبەر خاتری بوونی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەناوتانا، لەبەر ئەمانە ئەمجارە لەم قۆرتو سەخڵەتییە رزگارتان بوو، وەخودا لەوانە خۆش بوو کەلەبەر ساویلکەییو کەمتەرخەمی، ئەم دەنگوباسە پیسەیان دەماو دەم دەقۆستەوە، دەنا کەستان لەسزای سەختی ئەم تاوانە قوتارتان نەدەبوو.

کاتێ خودای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردەخوارێ بۆ دەربڕینی پاکیو بێ تاوانی من، باوکم ئەبوبەکری صدیق(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا، چونکە مەستەح ئەوەی بەعائیشەی کچم گوتووە، ئیتر نابێ کە هیچ خەرجو مەسرەفێکی بۆ بکەم، بۆیە وایگوت چونکە لەوەبەر مووچانەی دەدا بەمەستەح، لەبەر ئەوە کەهەم خزمی بوو هەم هەژاربوو، تا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَلاَ يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ نور/٢٢.

واتە: باخاوەن پایەی ئایینیو خاوەن مایەی جیهانی ئێوە، بەهۆی ئەم رووداوە ناخۆشەوە لەخێرکردنو پیاوەتی کردن، دڵیان سارد نەبێتەوە، سوێندخواردنو شتیوا نەکەن بەمەهانە بۆ ئەوەی مووچەو بەراتی خزمو خوێشو هەژارانو ئەوانەی لەمەککەوە لەبەر رەزای خودا کۆچیان کردووە بۆ مەدینە ببڕن، لەناو خۆتانا بەحەوصەڵەو نەرمو نیان بن،چاوپۆشیتان هەبێ، لێبووردنتان هەبێ نابێ لەسەر هەموو شتێ دەست بدەنە شیرو تیر

لەیەکتری ساوین، گەلێ شت هەیە لەسەرەوە تاڵە لەژێرەوە شیرینە، ئێوەیێ کەئەوەندە رق ئەستوور بن، نەتانەوێ لەکەسێ خۆش ببن کەهەڵەیەکتان لەگەڵ دەکات، ئیتر بەچ روویەکەوە لەخودا داوا دەکەن کە لەتاوانتان خۆش ببێ، دەی باش باش بزانن کە خودا هەم تاوانپۆشەو هەم بەرەحمو میهرەبانە، کەواتە ئێوەش رەفتارتان رەفتاری رەحمان بێو، دوور بن لەهەنگاوەکانی شەیتان، کەپەخشەوەکردنی رقو کینەو دەغەزو دوژمنایەتییە لەناوتان دا.

جا ئەبوبەکر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵێ بەخودا حەزدەکەم کە خودا لەگوناهم خۆش بێ. ئیتر ئەو خەرجیو مەسرەفەی دەیکرد بۆ میستەح گەڕاندیەوە بۆیو فەرمووی: بەخودا ئیتر ئەم خەرجیو مەسرەفەی هەتا سەر دەدەمێو هەتا ماوم قەت نایبڕم.

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ مەسەلەکەی من، پرسیاری لەزەینەبی کچی جەحشیش کرد، فەرمووی: ئەی زەینەب! چی لێ دەزانیت؟ یا چیت دیوە؟ زەینەب (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەگوێی خۆم هیچی خراپم لەم ئافرەتە نەبیستووە، وەبەچاوی خۆم هیچی ناشیرینم لێ نەدیوە، ئیتر لەخۆمەوە درۆی چی بکەم، کەواتە گوێو چاوی خۆم لەدرۆو بوختانو ئاگری دۆزەخ دەپارێزم! من خێرو چاکەنەبێ هیچم لە عائیشە نەدیوە.

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەناو خێزانەکانی حەزرەتدا(دروودی خوای لەسەر بێ) هەر زەینەب هەبوو کەهاوتای من بکاو وەك من لەلای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نازو خاتری هەبێو بەجوانی خۆی لەلای حەزرەت بنازێو، شان لەشانی من بدا، بەڵام خوا هەقەو خودا بەهۆی دینداریو لەخودا ترسیی خۆیەوە پاراستیو باشی گوتو خراپی نەگوتو قسەی هەقی کرد، بەڵام حەمنەی خوشکی وەك ئاگری بن کا لەخۆیەوە لەسەر زەینەب شەڕی بەمن

دەگێڕاو، ئاگری ئاژاوەکەی خۆش دەکرد، تا لەسەر حیسابی من پایەی خوشکەکەی بەرز بکاتەوە، ئەوەبوو ئەویش تیاچوو لەگەڵ ئەوانەدا کەتیاچوون، وەداری حەددی بوختانی لێ درا لەگەڵ چەند کەسێکی تردا).
تاج/٧/٦٩-٣-ش/ت. واتە: ئەم فەرمووده پیرۆزەیە بوخاریو موسلیمو تەرمذی گێڕاویانەتەوە، (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ). ( (لە تاجا وا لەبەرگی /٧ لاپەڕە/٦٩ فەرموودەی سێیەم).

١١٢٢- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضيَ اللهُ عنهُ قَالَ أُثْنِي رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ مِرَارًا ثُمَّ قَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ فُلانًا وَاللَّهُ حَسِيبُهُ وَلا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ) (الحديث ٢٦٦٢، طرفاهُ في: ٦٠٦١، ٦١٦٢) [١٨٣]

ئەبوبەکرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەلای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) باسی پیاوێ کرا، پیاوێکی تریش وەسپی چاکیو باشیی ئەوی کرد، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ ئەستۆی هاوڕێکەتت شکاند!) وەچەند جارێ لەسەریەك ئەو رستەیەی دووبارە کردەوە.

ئەوجار فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان هەر چاری نەبوو کەویستی وەسپی کەسێ بکا، با جەزمی پیادا نەنێو بیخاتە خانەی بۆچوونەوە بلێ: وادەزانم ئەو پیاوە واباشە، ئەمەیش بەمەرجی ئەوە ئەو کابرایە رێی تێ بچێ کەوەك ئەو دەڵێ وابێ، نەوەك مەتحەکەی درۆی رووت بێ، ئیتر خودا بۆ خۆی ئاگای لەدڵیەتیو بەپێی نیازی دڵی پاداشی دەداتەوە، بەڵام بەهیچ جۆر نابێ بڕیار بداو بلێ فیسارە کەس لەلای خودا پاکە، چونکە شتیوا بەس خودا بۆ خۆی دەیزانێ). ( تاج/٩/٥٨-٢ز-١٩-ش/د-باسی زمانلووسیو دەمتەڕیو...).

---

(١٨٣) أخرجه مسلم في الزهد والرقاق، باب: النهي عن المدح إذا كان.. رقم: ٣٠٠٠

١١٢٣-عَنْ ابْنُ عُمَرَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَرَضَهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي ثُمَّ عَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي) (الحديث ٢٦٦٤، طرفُهُ في: ٤٠٩٧)[١٨٤]

ئینوعومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی غەزای ئوحود چواردە ساڵ بووم، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تەماشای کردم تابزانێ بەکەڵکی جەنگ دێم یان نا، بەڵام پاش هەڵسەنگاندنم لەبەر بچووکی تەمەنم بەگەندی نەکردم، وەلێ رۆژی غەزای خەندەق پازدەساڵ بووم، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بۆ هەمان مەبەست تەماشای کردم وڕێگەی غەزاکردنی پێ دام. لەتاجا ئەمەی پترە:

نافیع - رەحمەتی خوای لێ بێ- فەرمووی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز -جێنشین(خلیفه) بوو، چووم بۆ سەردانیو ئەم فەرموودەیەم بۆیگێڕایەوە، جا عومەر گوتی: ئەم سەرگورشتەیە رادەی جیاکردنەوەی بچووكو گەورەیە لەیەکتری، جا بۆیە نامەی نووسی بۆ سەرکارەکانی: کە ئەوەی پازدەساڵی تەواوە بەشی بۆ دابنێنو لەخێرو لەشەڕدا بەپیاوی تەواو دایبنێن، ئەوەیشی تەمەنی لەوە کەمتربێ، دایبنێن بەوردە خێزانو لەچاك وخراپا حاڵی مناڵە. (تاج/١/٢٠٧ز-٥١. باسی مەرجەکانی نوێژ).

## راڤەو شیکردنەوە:

پەیوەندی ئەم فەرموودەیەو فەرموودەکەی پێشی بەباسەکەوە، کە شایەتی دانە، لەم دوو رووەوەیە:

١- تەزکییە، شایەتییە، دەبێ ئەوپەڕی دووربینی تیادا بکرێ.

٢- شایەتی مناڵ دادەمەزرێ یا نا؟

(١٨٤) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: بيان البلوغ، رقم: ١٨٦٨

١١٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَرَضَ عَلَى قَوْمٍ الْيَمِينَ فَأَسْرَعُوا فَأَمَرَ أَنْ يُسْهَمَ بَيْنَهُمْ فِي الْيَمِينِ أَيُّهُمْ يَحْلِفُ) (الحديث ٢٦٧٤) (١٨٥).

**ئەبوهورەيرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **پێشنیاری کرد بۆ هۆزێ کە لەرووداوێکا سوێند بخۆن، ئەوانیش هەموویان پەلاماریان دا کەسوێند بخۆن، ئەویش فەرمانی فەرموو کە تیرو پشك بکەن لەناو خۆیانا، تاکێ ناوی دەرچوو ئەوە سوێند بخوا. (تاج/٣/٣١٤ز-١١٨).**

١١٢٥- عَنْ ابن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ). (الحديث ٢٦٧٩، أطرافُهُ في: ٣٨٣٦، ٦١٠٨، ٦٦٤٦، ٦٦٤٨).

**ئیبنوعومەر**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (هەرکەسێ ویستی سوێند بخوا با یابەخوا سوێند بخوا، یا بەغەیری خودا سوێند نەخواو بێدەنگی لێ بکا). (بڕوانە: تاج/٣/ ٣٢٢ز-١٢٣- باسی سوێند).**

# پایانی(خاتمة)

**مامۆستای ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لێرەدا دەفەرمووی: نامەی شایەتیەکانو ئەو بابەتانەی خراونەتە تەکیان، حەفتاو شەش فەرموودەی بەرزەوەکراوەی واتیادا، یازدەیان بێڕشتەن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن. دووبارەکانیان چلو هەشت فەرموودەن، پوختەکەیان: (٧٦-٤٨=٢٨) بیستو هەشت فەرموودەن.**

(١٨٥) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة في الإستهام في اليمين (ج/٥/٢٩٦-خاتمة كتاب الشهادات) المترجم.

پێشەوا موسلیمیش، وەك پێشەوا بوخاری ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ هەموویانی گێڕاوەتەوە، جگە لەمانەیان:

١- (كانَ الناسُ يُؤْخذونَ بالوحي=٢٦٤١ف) لەتەجریدەكەدا نییە.

٢- (فەرموودەكەی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر، ریوایەتی تایبەت بەخۆی، ئەم ریوایەتەی لێرەدایە موسلیمیش گێڕاویەتەوە).

٣- (مورسەلەكەی القاسم بن محمد لەبارەی حەدیثی ئیفكەوە).

٤- (١١٢٤ت=٢٦٧٤ف)

٥- فەرموودەی ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ): (يامعشَرَ المسلمينْ كيفَ تسألونَ أهلَ الكتاب=٢٦٨٥ف) لەتەجریدەكەدا نییە.

هەروا دەفەرموێ: حەفتاو سێ بیستراو -أثر- یشی واتیادا، وەخوا بۆ خۆی لەهەموو شتێ باشتر دەزانێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٧-نامەی ڕێكەوتن (سوڵح) (كتاب الصلح)

## ١- سەبارەت بەنێوان ڕێكخستنو ناوبژی كردن

١١٢٦- عَنْ أُمِ كُلْثُومِ بِنْتَ عُقْبَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِي خَيْرًا أَوْ يَقُولُ خَيْرًا) (الحديث ٢٦٩٢) [١٨٦].

ئوممو كولثومی كچی عوقبە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەحەزرەت خۆی دەیفەرموو: (بەو كەسە ناگوترێ درۆزن كەمیانەی خەڵك ڕێك دەخاو

(١٨٦) أخرجه مسلم في البرّ و الصلة و الآداب، باب: تحريم الكذب، رقم: ٢٦٠٥.

قسەی باش لەنێوانیاندا دێنێ و دەبا، بەنیازی نێوان رێك خستنیان و نێوان خۆش بوونیان، با ئەو قسانەش كە لەو بەینەدا دەیانكات، خۆی دروستی بكات). (ریاض/١/٢١٩ز-٣١ف-٢٤٩- باسی ناوبژیكردن+تاج/٣/ل-٣٢١ز-١٢٢- باسی رێك كەوتن (صولَح) + فیقهی ئاسان/٢/ل-٤٨١ز-٢١٠).

ئوم كولثومی كچی عوقبە، خوشكی دایكی ئیمامی عوثمانە (ڕەزای خودایان لێ بێ) دایكی ناوی ئەروای كچی كەریزە، یەكێكە لە موسوڵمانە هەرەپێشینەكان لەساڵی رێكەوتنی حودەیبییەدا، بەتەنیا بەپێ، لەمەككەوە كۆچی كرد بۆ مەدینە، ئەو كاتە كچ بوو شووی نەكردبوو، لەمەدینە شووی كرد بەزەیدی كوڕی حاریثە، لەپاش شەهیدبوونی زەید شووی كرد بەزوبەیری كوڕی عەوام، لەپاش ئەو بەعەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف، كە مرد شووی كرد بەعەمری كوڕی عاص، مانگێ لەلای مایەوەو فەرمانی هەقی بەجێ هێناو مرد. یەكێكە لەو ژنە كۆچكارانە كەپەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەستووە.

یەك فەرموودەی لە صەحیحی بوخاری دا هەیە، كە ئەم فەرموودەیە كەواین لەخزمەتیدا. چەند منالێكی بووە، زەینەب لەزوبەیری كوڕی عەوام، ئیبراهیم و حەمید لە عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف – ڕەزاو رەحمەتی خودایان لەهەموویان بێ -.

١١٢٧–عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَهْلَ قُبَاءٍ اقْتَتَلُوا حَتَّى تَرَامَوْا بِالْحِجَارَةِ فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذَلِكَ فَقَالَ اذْهَبُوا بِنَا نُصْلِحُ بَيْنَهُمْ) (الحديث ٢٦٩٣، أطرافُهُ تقدّمت في: ٣٨٥ت=٦٨٤ف) [١٨٧].

سەهلی كوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ خەڵكی قوباء لەناوخۆیان بوو بەشەڕیان، هەتا گەیشتە شەڕە بەرد، كەئەمەیان عەرزی

---

(١٨٧) راجع الحديث رقم: (٣٨٥ تجريد= ٦٨٤ فتح) المترجم.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: (با بڕۆین بۆ لایان ئاشتیان بکەینەوەو نێوانیان ڕێك بخەینەوە). (ریاض/١/٢٢١ز/٣١).

١١٢٨-عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ اعْتَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ذِي الْقَعْدَةِ فَأَبَى أَهْلُ مَكَّةَ أَنْ يَدَعُوهُ يَدْخُلُ مَكَّةَ حَتَّى قَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يُقِيمَ بِهَا ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فَلَمَّا كَتَبُوا الْكِتَابَ كَتَبُوا هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ فَقَالُوا: لا نُقِرُّ بِهَا فَلَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ مَا مَنَعْنَاكَ لَكِنْ أَنْتَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: (أَنَا رَسُولُ اللَّهِ وَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ) ثُمَّ قَالَ: (لِعَلِيٍّ امْحُ رَسُولَ اللَّهِ) قَالَ: لا وَاللَّهِ لا أَمْحُوكَ أَبَدًا فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْكِتَابَ فَكَتَبَ: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ لا يَدْخُلُ مَكَّةَ سِلاحٌ إِلاَّ فِي الْقِرَابِ وَأَنْ لا يَخْرُجَ مِنْ أَهْلِهَا بِأَحَدٍ إِنْ أَرَادَ أَنْ يَتَّبِعَهُ وَأَنْ لا يَمْنَعَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ أَرَادَ أَنْ يُقِيمَ بِهَا).

فَلَمَّا دَخَلَهَا وَمَضَى الأَجَلُ أَتَوْا عَلِيًّا فَقَالُوا قُلْ لِصَاحِبِكَ اخْرُجْ عَنَّا فَقَدْ مَضَى الأَجَلُ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَبِعَتْهُمْ ابْنَةُ حَمْزَةَ يَا عَمِّ يَا عَمِّ فَتَنَاوَلَهَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَأَخَذَ بِيَدِهَا وَقَالَ لِفَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلام دُونَكِ ابْنَةَ عَمِّكِ احْمِلِيهَا فَاخْتَصَمَ فِيهَا عَلِيٌّ وَزَيْدٌ وَجَعْفَرٌ فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا وَهِيَ ابْنَةُ عَمِّي وَقَالَ جَعْفَرٌ: ابْنَةُ عَمِّي وَخَالَتُهَا تَحْتِي وَقَالَ زَيْدٌ: ابْنَةُ أَخِي فَقَضَى بِهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : لِخَالَتِهَا وَقَالَ: (الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ) وَقَالَ لِعَلِيٍّ: (أَنْتَ مِنِّي وَأَنَا مِنْكَ) وَقَالَ لِجَعْفَرٍ: (أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي) وَقَالَ لِزَيْدٍ: (أَنْتَ أَخُونَا وَمَوْلانَا) (الحديث ٢٦٩٩) [188].

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە، کە ناموسوڵمانەکان ڕێگەی پێغەمبەرو یارانیان نەدا کە بچن بۆ عەمرە، ئەوە بوو پێغەمبەرو هاوڕێکانی لەمانگی ناوجەژنانا، لە مەدینەوە

(١٨٨) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: صلح الحديبية في الحديبية، رقم: ١٧٨٣.

کەوتنەڕێ بۆ مەککە بۆ عەمرە کردن. بەڵام لەئەنجاما خەڵکی مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) لەحودەیبییە، کەناوی بیرێکە لەمەککەوە قۆناغێ دوورە، رێکەوتن لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و هاوڕێکانی ئەمساڵ کە ساڵی شەشی کۆچییە عەمرە نەکەن و بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو ساڵی ئاییندە بێنەوە بۆ عەمرە بۆ مەککە، لەوێ سێ رۆژ بمێننەوە.

جا کاتێ پەیمانەکەیان نووسی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بە ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێ بێ) فەرموو: مەرجەکە لە نێوانمانا لەسەر ئەم شێوەیە بنووسە: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو رێکەوتن نامەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خودا رێك کەوتووە لەسەری.... ناموسوڵمانەکان گوتیان: شتیوا ناسەلێنین چونکە ئەگەر ئێمە بزانین کە تۆ پێغەمبەری خودا یت ئیسلام دەبین و پەیڕەویت دەکەین، نەوەکوو قەدەغەمان دەکردی لەعەمرە. کەواتە شتیوا نابێ، بەڵام بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا تۆ لەلای ئێمە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای وبەس. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من پێغەمبەری خوداشم و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵاشم).

ئەوجا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەعەلی فەرموو: (وشەی پێغەمبەری خودا بکوژێنەوەو لەشوێنی ئەوە وشەی (کوڕی عەبدوڵڵا بنووسە) عەلی فەرمووی: نا، بەخودا هەرگیز شتیوا ناکەم و تۆ ناسڕمەوە، جا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەعەلی فەرموو: جێگەکەیم پێنیشان بدە من خۆم دەیکوژێنمەوە، ئەویش پێی نیشان دا، جا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نامەکەی وەرگرت و (پێغەمبەری خوای) کوژاندەوەو، ئەوجا فەرمانی بەعەلی فەرموو: نووسی: (ئەمە ئەوەیە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا لەگەڵ قورەیشدا لەسەری رێکەوتوون: لەساڵی ئاییندەدا کە موحەممەدو هاوەڵەکانی دێنەوە بۆ عەمرە، دەبێ کە دێنە ناو مەککەوە چەکەکانیان لەکێلانا بێ لەناو هەبگەدا، وەهەر کەسێکیش لەخەڵکی مەککە ویستی شوێنی بکەوێ نابێ

بیبات، وەهەر کەسێکیش لەشوێنکەوتوانی موحەممەد ویستیان لە مەککە بمێننەوە نابێ ڕێگەی ئەوەی لێ بگرێ).

جا لەساڵی ئاییندەدا بەپێی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنە لە مانگی ناوجەژنانا پێغەمبەرو هاوەڵانی هاتنەوە عەمرەیان بەجێ هێناو سێ ڕۆژ لەناو مەککەدا مانەوە. لەسەری ڕۆژی سێیەم دا خەڵکەکە بەعەلییان گوت: بەپێی مەرجەکە هاوڕێکەت ئەمڕۆ دواڕۆژیەتی، دەی پێی بلێ بابڕوا، عەلیش پێی گوت، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ باشە!) ئەوجا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) خۆی و سوپاکەی لەشار دەرچوون و بەرەو مەدینە گەڕانەوە.

کچەکەی حەمزەی مامی پێغەمبەریش کە لەغەزای ئوحوددا شەهید بوو، بەمامە مامە دوایانکەوت، عەلیش پەلاماری داو دەستی گرت و دایە دەست فاطیمەی هاوسەری، پێی گوت: کچی مامەت بگرەو هەڵی بگرە.

جا عەلی و زەیدو جەعفەر لەسەر ئەم کچە کەهی کامیانە، بوو بەکێشەو بەرەیان، عەلی دەیگوت: کچی مامەو بەمن لەپێشترە، جەعفەریش دەیگوت: کچی مامەی منیشەو پووریشی ژنمە، خوشکی دایکی خێزانی منە، زەیدیش فەرمووی: هی منە چونکە باوکی بەپێی بەیاننامەی برایەتی بەستن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردوویەتی بەبرای من، کەواتە ئەم کچۆڵەیە برازای منەو هی خۆمە.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بڕیاری دا کە بەر پوورەکەی دەکەوێ و شەرع دەیدا بەو، وەفەرمووی: (پور لەجێگەی دایکە) وەبەعەلی فەرموو: (تۆ لەمنی و من لەتۆم) بەجەعفەریشی فەرموو: (تۆ هەم لەشێوەداو هەم لەرەفتاری بەرزدا لەخۆم دەکەیت). وەبەزەیدیشی فەرموو: (تۆ هەم برامانی و هەم دۆستی ئازادکراومانی!). (تاج/٨/١٨١ز-٧٦. باسی ڕێکەوتن+تاج/٥/١٠٥ز-١٨).

١١٢٩- عنْ أَبي بَكْرَةَ رضيَ اللهُ عنها رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَلّٰى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ وَالْحَسَنُ بْنُ عَلِيّ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يُقْبِلُ عَلَـى النَّـاسِ مَـرَّةً وَعَلَيْـهِ أُخْرَى وَيَقُولُ: (إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِـنَ الْمُسْلِمِينَ ) (الحديث ٢٧٠٤) (١٨٩).

ئەبوبـەكرە(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لەسـەر دوانگە، پێغەمبـەرم بەچاوی خۆم بینی حەسـەنی کوڕی عـەلی، کچەزای خۆی لەتەنیـشتیەوە بـوو، جارێ سەیری خەڵکەکەی دەکردو جارێ سەیری حەسـەن، لەم حاڵەدا لێم ژنـەوت دەیفـەرموو: (ئـەم کـوڕەی مـن سـەییدە، واتـە سـەرگەورەو سـەرومرە، ئومێـدە لەکاتێـکی زۆر ناسك‌و هەستیاردا خودای گەورە بیکات بەمایـەی رەحمـەت بـۆ ئۆمـەتم،و لـەنێوانی دوو کۆمەڵـەی لـەناوخۆیانا نـاکۆکی، لەموسـوڵمانان پـێ ڕێـك بخا، کەلـەبارو دۆخـی جـەنگ‌و هـەرادا دەبـن). لـە گێڕانـەوەیـەکی تـاجـا، کەدەبێ بە هۆی ئـەم گێڕانـەوەی ئێـرە، ئاوایـە: (ئـەم کـوڕەی مـن لەسـەردارو سـەروەرە، کەسـەر دەسـتی ئـەم دا، خـودا ناوبـژی دوو کۆمەڵـەی گـەورە لـە موسوڵمانان دەکاو، نێوانی تێکچوویان ڕێـك دەخاتەوە).

## ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:

وەك دەزانرێ لەپاش شەهید بوونی ئیمامی عوثمان، دەوڵەتی ئیسلام بوو بەدوو بەشەوە، موعاوییە لەشام‌و عەلی لەحیجازو عێـراق، وەچـەندین شـەڕی گەورە گەورە لەنێوانیاندا رووی دا، هەتا بەکوشتنی ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێ بێ) ئیمـامی حەسـەن لەجێـگەی دانیـشت‌و بـوو بەجێنـشین، بـەڵام شـەڕو شۆڕو ئـاژاوە هـەر بـەردەوام بـوو، سـەرەنجام ئیمـامی حەسـەن لەگـەڵ موعاوییـەدا ڕێـك کـەوتو وازی لەجێنـشینی هێنـا، بـۆ بەرژەوەنـدی یـەکێتی موسـوڵمانان. وەفەرمووی: من بەگوێی خۆم ئەم فەرموودەیەی پێغەمبـەرم لەئەبوبـەکرەوە

(١٨٩) من أفراد البخاري (فتح/٣١١/٥) — خاتمة كتاب الصلح- المترجم.

بیستووه، ئێستاوا بەکردەوە پیادەی دەکەم، وەکردی، وە بۆ ماوەیەکی زۆر دەوڵەتی ئیسلام یەکی گرتەوە!.

ئەمەش پوختەی ئەم باسەیە بۆ کەسی خۆی بێ بەهرە نابێ: (لەمانگی رەمەزانی ساڵی چل‌و یەکی کۆچیدا، ئیمامی عەلی بەدەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجەمی مورادی، شەهید کرا، لەهەمان مانگ‌و هەمان ساڵا ئیمامی حەسەن لەشوێنی باوکی بوو بەجێنشین، لەپاش وتو وێژێکی دوورو درێژ، لەنێوانی هەردوولادا، لەپاش شەش مانگ ئیمامی حەسەن دەستی لەجێنشینی هەڵگرت‌و تەسلیمی بەموعاویە کرد).

١١٣٠-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) تَقُولُ سَمِعَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَوْتَ خُصُومٍ بِالْبَابِ عَالِيَةٍ أَصْوَاتُهُمَا وَإِذَا أَحَدُهُمَا يَسْتَوْضِعُ الآخَرَ وَيَسْتَرْفِقُهُ فِي شَيْءٍ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللّٰهِ لا أَفْعَلُ فَخَرَجَ عَلَيْهِمَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (أَيْنَ الْمُتَأَلِّي عَلَى اللّٰهِ لا يَفْعَلُ الْمَعْرُوفَ؟) فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَلَهُ أَيُّ ذَلِكَ أَحَبَّ) الحديث٢٧٠٥ (١٩٠).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) گوێی لەقیرەقیرێ بوو لەپشت دەرگاکەوە هاوداواکان کردبوویان بەهەراو زەنا، قەرزارەکە داوای لەخاوەن قەرزەکە دەکرد، کە دڵی بەحاڵی بسووتێ وە هەنێ لەقەرزەکەی سەری بۆ دابشکێنێ، ئەویش دەیگوت: بەخودا نایکەم، حەزرەتیش (درودی خوای لەسەر بێ) دەرچوو بۆ لایان‌و فەرمووی: ئەوە کێیە بەخودا سوێند دەخواو دەیکا بەبیانوو بۆ ئەوەی کە چاکە نەکا؟ خاوەن قەرزەکەش گوتی: ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خودا! کەواتە هاوڕێکەم چۆن حەز دەکا با وابێ‌و چەندەم لەقەرزەکەم دەداتەوە کەیفی خۆیەتی. (ریاض/١/٢١٩ف-٢٥٠ز-٣١- باسی ناوبژی کردن‌و نێوان ڕێکخستن-ش).

---

(١٩٠) اخرجه مسلم في المساقاة، باب: استحباب الوضع من الدين، رقم: ١٥٥٧.

## پایـــانیّ

ماموّستای ئیبنو حەجەری عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)لەم پایانەدا دەفەرموێ: نامەی ڕێکەوتن(صوڵح) سیی‌و یەك فەرموودەی واتیادا، نۆزدەیان بێڕشتەن، واتە: تەعلیقن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: مەوصولن، پوختەکەیان (٣١-١٩=١٢) دوازدەن موسلیمیش هەموویانی گێڕاوەتەوە ئەم سیانە نەبێ:

١- (١١٢٩ت=٢٧٠٤ف).

٢- فەرمووده بێڕشتەکەی عەوفی کوڕی مالیك: (ثمَ تكونُ هدنَةٌ بينكم وبينَ بني الأصفرِ). وا لەپێش ژمارە: ٢٧٠٠ف.

٣- فەرمووده بێڕشتەکەی میسومر: (لقد رأيتنا يوم أبي جندَلَ) وا لە دوا بێڕشتەکەی عەوفی کوڕی مالیکەوە.

سێ بیستراو -أثر- ی هاوەڵان‌و کەسانی پاش ئەوانیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٥٨- نامەی مەرجەکان (كتابُ الشروط)

١١٣١ -عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَااسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ) (الحديث ٢٧٢١، طرفُهُ في: ٥١٥١) [١٩١].

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕەواترین مەرجێ کەشایەنی ئەوەبێ جێبەجێی بکەن، ئەو مەرجانەن کەژنانتان لە خۆتان پێیان حەلاڵ کردووە، وەك مارەیی‌و شتی‌وا).

(١٩١) أخرجه مسلم في النكاح، باب: الوفاء بالشروط في النكاح، رقم: ١٤١٨.

**راڤەو شیکردنەوە:**

مەبەستی سەرەکی لەم جۆرە مەرجە تەنیا ئەو مەرجە رەوایانەیە کە پەیوەندییان بەژنمارەبڕینەوە هەیەو بەس.

## مەرجێ کە شەرعی نەبێ پووچە

١١٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّهُمَا قَالا إِنَّ رَجُلاً مِنْ الأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْشُدُكَ اللَّهَ إِلاّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللَّهِ فَقَالَ الْخَصْمُ الآخَرُ وَهُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ نَعَمْ فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ وَأْذَنْ لِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (قُلْ) قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي: أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا) قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُجِمَتْ) (الحديث ٢٧٢٤، أطرافـه في: ٢٦٩٥، ٢٧٢٤، ٦٦٣٣، ٦٨٢٧، ٦٨٣٣، ٦٨٣٥، ٦٨٤٢، ٦٨٩٥، ٧١٩٣، ٧٢٥٨، ٧٢٦٠، ٧٢٧٨). (الحديث ٢٧٢٥+، أطرافـه في: ٢٦٤٩، ٢٦٩٦، ٢٧٢٥، ٦٦٣٤، ٦٨٢٨، ٦٨٣١، ٦٨٣٦، ٦٨٤٣، ٦٨٦٠، ٧١٩٤، ٧٢٥٩، ٧٢٧٩).

ئەبوهورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی(رەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت حەزرەتو عەرزی کرد: قوربان! ئەی رەوانەکراوی خودا! تۆبیتو خودا ئەگەر بەپێی نامەی خودا، بڕیارم بۆ نەدەی! هاوداواکەیشی کە وادیاربوو لەو زرنگتر بوو گوتی: بەڵێ باشە، بەپێی

نامەی خودا حوکم بکە لەنێوانماناو دادگاییمان بۆ بکە، ومرێگەیشم بدە تامن لەپێشا قسە بکەم.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی پێ داو فەرمووی: (ئادەی بڵێ) گوتی: کوڕێکی من لەلای ئەمە رەنجبەر بوو، ژنەکەی خراپ کردووە، داوێنپیسی لەگەڵ دا کردووە، بەمنیان گوت: گوایە کوڕەکەم دەبێ بەردەباران بکرێ تادەمرێ، جا من لەتۆڵەی کوڕەکەما سەد سەر مەڕم پێ دا لەگەڵ کەنیزێکا، لەپاشا کاتێ لەزانایانی شەرعم پرسی، فەرموویان: کە کوڕەکەی من سەد داری حەددی لێ دەدرێو ساڵێ دوور دەخرێتەوە، وەژنەکەی ئەمیش بەردەباران دەکرێ.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسەی گیانی منی والەدەسا، بەپێی فەرمانی نامەی خودا بڕیاردەدەم لە نێوانتانا، کەنیزەكو سەد مەڕەکە دەدرێتەوە بەتۆ، کوڕەکەت سەد داری حەددی لێ دەدرێو ساڵێ دوور دەخرێتەوەو رەهەندە دەکرێ. ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆ لای ژنەکەی ئەمە ئەگەر هاتوو چووە ژێرىو دانی بەئیشەکەدا نا، ئەوا بەردە بارانی بکە. جا کە ئونەیس چوو بۆ لای، ژنەکە پێی لێ ی نا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی دا، سەنگە ساریان کرد). (تاج/٣/٢٣٨ف-٤ز-٩٢-باسی تۆڵەی شەرواڵپیسی).

١١٣٣- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ لَمَّا فَدَعَ أَهْلُ خَيْبَرَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَامَ عُمَرُ خَطِيبًا فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عَامَلَ يَهُودَ خَيْبَرَ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَقَالَ: (نُقِرُّكُمْ مَا أَقَرَّكُمْ اللَّهُ) وَإِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ خَرَجَ إِلَى مَالِهِ هُنَاكَ فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنْ اللَّيْلِ فَفُدِعَتْ يَدَاهُ وَرِجْلاهُ وَلَيْسَ لَنَا هُنَاكَ عَدُوٌّ غَيْرَهُمْ هُمْ عَدُوُّنَا وَتُهْمَتُنَا وَقَدْ رَأَيْتُ إِجْلاءَهُمْ فَلَمَّا أَجْمَعَ عُمَرُ عَلَى ذَلِكَ أَتَاهُ أَحَدُ بَنِي أَبِي الْحُقَيْقِ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَتُخْرِجُنَا وَقَدْ أَقَرَّنَا مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَامَلَنَا عَلَى الأَمْوَالِ وَشَرَطَ ذَلِكَ لَنَا؟ فَقَالَ عُمَرُ: أَظَنَنْتَ أَنِّي نَسِيتُ قَوْلَ

رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (كَيْفَ بِكَ إِذَا أُخْرِجْتَ مِنْ خَيْبَرَ تَعْدُو بِكَ قَلُوصُكَ لَيْلَةً بَعْدَ لَيْلَةٍ) فَقَالَ: كَانَتْ هَذِهِ هُزَيْلَةً مِنْ أَبِي الْقَاسِمِ. قَالَ: كَذَبْتَ يَا عَدُوَّ اللَّهِ فَأَجْلاهُمْ عُمَرُ وَأَعْطَاهُمْ قِيمَةَ مَا كَانَ لَهُمْ مِنَ الثَّمَرِ مَالاً وَإِبِلاً وَعُرُوضًا مِنْ أَقْتَابٍ وَحِبَالٍ وَ غَيْرِ ذَلِكَ ) (الحديث ٢٧٣٠) (١٩٢).

ئیبنوعومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خەڵکی خەیبەر عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان گۆد کرد، عومەر هەڵسایەوەو وتارێکی دا، فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) جوولەکەکانی خەیبەری کردبوو بە جوتیاری سەر سامان و باخ و زەوی و زارەکانیان، کەبە نیوەیی بەرهەمیان بهێنن، وەك لە فەرموودەکەی ژمارە: (١٠٢٥ت=٢٣٢٨ف داو، لەژمارە: ١٠٢٩ت=٢٣٣٨ف) دا رابوورد. عومەر لە وتارەکەی دا ئەو مەرجەی روونکردەوە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کاتی خۆی بۆ ئەم مەسەلەی مانەوەی جولەکەکان لەخەیبەری دانابوو، کە ئەم مەرجەیە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: (تەنیا ئەوەندە مۆڵەتتان دەدەین، کەبەنیوەیی ئەم زەوی و زارانە بەرهەم بهێنن، کەخوا مۆڵەتتان بدا) وەك لەژمارە: (١٠٢٩ت=٢٣٣٨) دا روونکراوەتەوە.

ئەوجا عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش چووە بۆ خەیبەر، بۆ سەر ماڵی خۆی و بەشەو دەستدرێژیان لێ کردووە، وەهەردوودەست و هەردوو قاچی گۆج کراون، وەلەوان زیاتر لەوێ دوژمن گومان نابەم، هەر ئەوان دوژمنی ئێمەن و جێگەی گومانی ئێمەن!

وە من وابەباش دەزانم کە کاتی ئەوە هاتووە کە خەیبەربەم جولەکانە چۆڵ بکەم، جا عومەر(رەزای خوای لێ بێ) کاتێ بڕیاری کۆتایی ئەوەی دا، یەکێك لە کوڕەکانی ئەبولحەقیق هات بۆلای پێشەوا عومەر، گوتی: ئەی فەرمانڕەوای

---

(١٩٢) ينظر رقم: ١٠٢٩ت =٢٣٣٨ف - المترجم

موسوڵمانان! چۆن شتیوا دەکەی؟ خۆ ئێمە کاتی خۆی موحەممەد خۆی دایناوین، وەکردوینی بەسەرکاری باخ‌و رەزو سامانەکانمان، وە ئەو مەرجەی بۆ داناوین کە لەجێگەی خۆمان بمێنینەوە. عومەریش فەرمووی: لەتۆ وایە من مەرجنامەکەم لەیاد نەماوە، بەتایبەتی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کەبە ئێوەی کوڕەکانی ئەبولحوقەیقی فەرموو، کە خۆتان بەسەرۆکی جولەکەکان دەزانن: (دەبێت حاڵت چۆن بێت ئەوکاتەی کە لەخەیبەر وەدەردەنرێیت، کە وشترە پشوو درێژەکانت شەوانی دوورو درێژ دوورت دەخەنەوە لەولاتی حیجازو لەولاتی دورگەی عەرەب) ، کوڕەکەی ئەبولحەقیقیش گوتی: ئەوە ئەبولقاسم بەگاڵتەی بوو! عومەر فەرمووی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خودا! جا عومەر پێی چۆڵ کردن، وە نرخی ئەو بەروبوومەی ئەوساڵە کەدەیان کەوت دای پێیان، وە قەبلاندی بەوشترو کەلوپەل‌و کۆپانی وشترو گوریسو شتی واو دای پێیان.

## باسی مەرج لەغەزاداو ڕێکەوتن لەگەڵ دوژمن‌و دەستەی جەنگ دا

١١٣٤-عَنْ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ رحمه الله تعالى يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا حَدِيثَ صَاحِبِهِ قَالا: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بِالْغَمِيمِ فِي خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةٌ فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِينِ) فَوَاللَّهِ مَا شَعَرَ بِهِمْ خَالِدٌ حَتَّى إِذَا هُمْ بِقَتَرَةِ الْجَيْشِ فَانْطَلَقَ يَرْكُضُ نَذِيرًا لِقُرَيْشٍ وَسَارَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى إِذَا كَانَ بِالثَّنِيَّةِ الَّتِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ فَقَالَ النَّاسُ: حَلْ حَلْ فَأَلَحَّتْ فَقَالُوا: خَلأَتْ الْقَصْوَاءُ خَلأَتْ الْقَصْوَاءُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَا خَلأَتْ الْقَصْوَاءُ وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ)

ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللَّهِ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا) ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَتْ قَالَ: فَعَدَلَ عَنْهُمْ حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصَى الْحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ الْمَاءِ يَتَبَرَّضُهُ النَّاسُ تَبَرُّضًا فَلَمْ يُلَبِّثْهُ النَّاسُ حَتَّى نَزَحُوهُ وَشُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَطَشُ فَانْتَزَعَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهُ فِيهِ فَوَاللَّهِ مَا زَالَ يَجِيشُ لَهُمْ بِالرِّيِّ حَتَّى صَدَرُوا عَنْهُ.

فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ جَاءَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الْخُزَاعِيُّ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ خُزَاعَةَ وَكَانُوا عَيْبَةَ نُصْحِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَهْلِ تِهَامَةَ فَقَالَ إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيٍّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيٍّ نَزَلُوا أَعْدَادَ مِيَاهِ الْحُدَيْبِيَةِ وَمَعَهُمْ الْعُوذُ الْمَطَافِيلُ وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنْ الْبَيْتِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ وَلَكِنَّا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ وَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ نَهِكَتْهُمْ الْحَرْبُ وَأَضَرَّتْ بِهِمْ فَإِنْ شَاءُوا مَادَدْتُهُمْ مُدَّةً وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ فَإِنْ أَظْهَرْ فَإِنْ شَاءُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا وَإِلاَّ فَقَدْ جَمُّوا وَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي وَلَيُنْفِذَنَّ اللَّهُ أَمْرَهُ).

فَقَالَ بُدَيْلٌ: سَأُبَلِّغُهُمْ مَا تَقُولُ قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قُرَيْشًا قَالَ إِنَّا قَدْ جِئْنَاكُمْ مِنْ هَذَا الرَّجُلِ وَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ قَوْلاً فَإِنْ شِئْتُمْ أَنْ نَعْرِضَهُ عَلَيْكُمْ فَعَلْنَا فَقَالَ سُفَهَاؤُهُمْ: لا حَاجَةَ لَنَا أَنْ تُخْبِرَنَا عَنْهُ بِشَيْءٍ وَقَالَ ذَوُو الرَّأْيِ مِنْهُمْ: هَاتِ مَا سَمِعْتَهُ يَقُولُ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا فَحَدَّثَهُمْ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَامَ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ أَلَسْتُمْ بِالْوَالِدِ؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: أَوَلَسْتُ بِالْوَلَدِ: قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَهَلْ تَتَّهِمُونِي؟ قَالُوا: لا قَالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي اسْتَنْفَرْتُ أَهْلَ عُكَاظَ فَلَمَّا بَلَّحُوا عَلَيَّ جِئْتُكُمْ بِأَهْلِي وَوَلَدِي وَمَنْ أَطَاعَنِي؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَإِنَّ هَذَا قَدْ عَرَضَ لَكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ اقْبَلُوهَا وَدَعُونِي آتِيهِ قَالُوا: ائْتِهِ.

فَأَتَاهُ فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَحْوًا مِنْ قَوْلِهِ لِبُدَيْلٍ فَقَالَ عُرْوَةُ عِنْدَ ذَلِكَ أَيْ مُحَمَّدُ أَرَأَيْتَ إِنْ اسْتَأْصَلْتَ

أَمْرَ قَوْمِكَ هَلْ سَمِعْتَ بِأَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ اجْتَاحَ أَهْلَهُ قَبْلَكَ وَإِنْ تَكُنِ الأُخْرَى فَإِنِّي وَاللَّهِ لأَرَى وُجُوهًا وَإِنِّي لأَرَى أَوْشَابًا مِنَ النَّاسِ خَلِيقًا أَنْ يَفِرُّوا وَيَدَعُوكَ فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: امْصُصْ بِبَظْرِ اللاَّتِ أَنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ وَنَدَعُهُ؟ فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ قَالُوا: أَبُو بَكْرٍ قَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلا يَدٌ كَانَتْ لَكَ عِنْدِي لَمْ أَجْزِكَ بِهَا لأَجَبْتُكَ قَالَ: وَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكُلَّمَا تَكَلَّمَ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ وَالْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ فَكُلَّمَا أَهْوَى عُرْوَةُ بِيَدِهِ إِلَى لِحْيَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ وَقَالَ لَهُ: أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فَقَالَ: أَيْ غُدَرُ أَلَسْتُ أَسْعَى فِي غَدْرَتِكَ؟

وَكَانَ الْمُغِيرَةُ صَحِبَ قَوْمًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقَتَلَهُمْ وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ ثُمَّ جَاءَ فَأَسْلَمَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَمَّا الإِسْلامَ فَأَقْبَلُ وَأَمَّا الْمَالَ فَلَسْتُ مِنْهُ فِي شَيْءٍ) ثُمَّ إِنَّ عُرْوَةَ جَعَلَ يَرْمُقُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَيْنَيْهِ قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا تَنَخَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نُخَامَةً إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ وَإِذَا أَمَرَهُمْ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا لَهُ فَرَجَعَ عُرْوَةُ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ أَيْ قَوْمِ وَاللَّهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى الْمُلُوكِ وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ وَاللَّهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكًا قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُحَمَّدًا وَاللَّهِ إِنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ وَإِذَا أَمَرَهُمْ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ وَإِذَا تَوَضَّأَ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيمًا لَهُ وَإِنَّهُ قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ فَاقْبَلُوهَا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَةَ دَعُونِي آتِيهِ فَقَالُوا ائْتِهِ.

فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابِهِ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (هَذَا فُلانٌ وَهُوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ فَابْعَثُوهَا لَهُ) فَبُعِثَتْ لَهُ وَاسْتَقْبَلَهُ النَّاسُ يُلَبُّونَ فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ مَا يَنْبَغِي لِهَؤُلاءِ أَنْ يُصَدُّوا عَنْ الْبَيْتِ فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ قَالَ رَأَيْتُ الْبُدْنَ قَدْ قُلِّدَتْ وَأُشْعِرَتْ فَمَا أَرَى أَنْ يُصَدُّوا عَنْ الْبَيْتِ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهُ مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ فَقَالَ دَعُونِي آتِيهِ فَقَالُوا ائْتِهِ فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (هَذَا مِكْرَزٌ وَهُوَ رَجُلٌ فَاجِرٌ) فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَيْنَمَا هُوَ يُكَلِّمُهُ إِذْ جَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ مَعْمَرٌ: فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ عَنْ عِكْرِمَةَ أَنَّهُ لَمَّا جَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ).

قَالَ مَعْمَرٌ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: فِي حَدِيثِهِ فَجَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ: هَاتِ اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابًا فَدَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْكَاتِبَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) قَالَ سُهَيْلٌ: أَمَّا الرَّحْمَنُ فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا هُوَ وَلَكِنْ اكْتُبْ: بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ كَمَا كُنْتَ تَكْتُبُ فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: (وَاللَّهِ لا نَكْتُبُهَا إِلاّ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَ) ثُمَّ قَالَ: (هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ) فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللَّهِ لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ مَا صَدَدْنَاكَ عَنْ الْبَيْتِ وَلا قَاتَلْنَاكَ وَلَكِنْ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (وَاللَّهِ إِنِّي لَرَسُولُ اللَّهِ وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي) اكْتُبْ: مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَذَلِكَ لِقَوْلِهِ: (لا يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُمَاتِ اللَّهِ إِلاّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا) فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَنَطُوفَ بِهِ) فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللَّهِ لا تَتَحَدَّثُ الْعَرَبُ أَنَّا أُخِذْنَا ضُغْطَةً وَلَكِنْ ذَلِكَ مِنْ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فَكَتَبَ فَقَالَ سُهَيْلٌ وَعَلَى أَنَّهُ لا يَأْتِيكَ مِنَّا رَجُلٌ وَإِنْ كَانَ

عَلَى دِينِكَ إلاّ رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا قَالَ الْمُسْلِمُونَ سُبْحَانَ اللَّهِ كَيْفَ يُرَدُّ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَقَدْ جَاءَ مُسْلِمًا فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو يَرْسُفُ فِي قُيُودِهِ وَقَدْ خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ حَتَّى رَمَى بِنَفْسِهِ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ سُهَيْلٌ هَذَا يَا مُحَمَّدُ أَوَّلُ مَا أُقَاضِيكَ عَلَيْهِ أَنْ تَرُدَّهُ إِلَيَّ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنَّا لَمْ نَقْضِ الْكِتَابَ بَعْدُ) قَالَ: فَوَاللَّهِ إِذًا لَمْ أُصَالِحْكَ عَلَى شَيْءٍ أَبَدًا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (فَأَجِزْهُ لِي) قَالَ: مَا أَنَا بِمُجِيزِهِ لَكَ قَالَ: بَلَى فَافْعَلْ قَالَ: مَا أَنَا بِفَاعِلٍ قَالَ مِكْرَزٌ: بَلْ قَدْ أَجَزْنَاهُ لَكَ.

قَالَ أَبُو جَنْدَلٍ: أَيْ مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ أُرَدُّ إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَقَدْ جِئْتُ مُسْلِمًا أَلا تَرَوْنَ مَا قَدْ لَقِيتُ وَكَانَ قَدْ عُذِّبَ عَذَابًا شَدِيدًا فِي اللَّهِ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: فَأَتَيْتُ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: أَلَسْتَ نَبِيَّ اللَّهِ حَقًّا؟ قَالَ: (بَلَى) قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: (بَلَى) قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ: (إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ وَلَسْتُ أَعْصِيهِ وَهُوَ نَاصِرِي) قُلْتُ: أَوَلَيْسَ كُنْتَ تُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي الْبَيْتَ فَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: (بَلَى فَأَخْبَرْتُكَ أَنَّا نَأْتِيهِ الْعَامَ؟) قَالَ: قُلْتُ: لا قَالَ: فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ قَالَ: فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا بَكْرٍ أَلَيْسَ هَذَا نَبِيَّ اللَّهِ حَقًّا؟ قَالَ: بَلَى قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ قَالَ: بَلَى قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذًا؟ قَالَ: أَيُّهَا الرَّجُلُ إِنَّهُ لَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَيْسَ يَعْصِي رَبَّهُ وَهُوَ نَاصِرُهُ فَاسْتَمْسِكْ بِغَرْزِهِ فَوَاللَّهِ إِنَّهُ عَلَى الْحَقِّ قُلْتُ: أَلَيْسَ كَانَ يُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي الْبَيْتَ وَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: بَلَى أَفَأَخْبَرَكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ الْعَامَ؟ قُلْتُ: لا قَالَ: فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: قَالَ عُمَرُ: فَعَمِلْتُ لِذَلِكَ أَعْمَالاً قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الْكِتَابِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَصْحَابِهِ: قُومُوا فَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا قَامَ مِنْهُمْ رَجُلٌ حَتَّى قَالَ ذَلِكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ فَلَمَّا لَمْ يَقُمْ مِنْهُمْ أَحَدٌ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَذَكَرَ لَهَا مَا لَقِيَ مِنْ النَّاسِ فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ

أَتُحِبُّ ذَلِكَ اخْرُجْ ثُمَّ لا تُكَلِّمْ أَحَدًا مِنهُمْ كَلِمَةً حَتَّى تَنْحَرَ بُدْنَكَ وَتَدْعُوَ حَالِقَكَ فَيَحْلِقَكَ فَخَرَجَ فَلَمْ يُكَلِّمْ أَحَدًا مِنهُمْ حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ نَحَرَ بُدْنَهُ وَدَعَا حَالِقَهُ فَحَلَقَهُ فَلَمَّا رَأَوْا ذَلِكَ قَامُوا فَنَحَرُوا وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضًا حَتَّى كَادَ بَعْضُهُمْ يَقْتُلُ بَعْضًا غَمًّا ثُمَّ جَاءَهُ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾.

فَطَلَّقَ عُمَرُ يَوْمَئِذٍ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا لَهُ فِي الشِّرْكِ فَتَزَوَّجَ إِحْدَاهُمَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ وَالأُخْرَى صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ ثُمَّ رَجَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْمَدِينَةِ فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ وَهُوَ مُسْلِمٌ فَأَرْسَلُوا فِي طَلَبِهِ رَجُلَيْنِ فَقَالُوا الْعَهْدَ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى بَلَغَا ذَا الْحُلَيْفَةِ فَنَزَلُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ.

فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ وَاللَّهِ إِنِّي لأَرَى سَيْفَكَ هَذَا يَا فُلانُ جَيِّدًا فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ فَقَالَ أَجَلْ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَجَيِّدٌ لَقَدْ جَرَّبْتُ بِهِ ثُمَّ جَرَّبْتُ. فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْهِ فَأَمْكَنَهُ مِنْهُ فَضَرَبَهُ حَتَّى بَرَدَ وَفَرَّ الآخَرُ حَتَّى أَتَى الْمَدِينَةَ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ يَعْدُو فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ رَآهُ: (لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْرًا) فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قُتِلَ وَاللَّهِ صَاحِبِي وَإِنِّي لَمَقْتُولٌ فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ قَدْ وَاللَّهِ أَوْفَى اللَّهُ ذِمَّتَكَ قَدْ رَدَدْتَنِي إِلَيْهِمْ ثُمَّ أَنْجَانِي اللَّهُ مِنْهُمْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (وَيْلُ أُمِّهِ مِسْعَرَ حَرْبٍ لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ).

فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ الْبَحْرِ قَالَ وَيَنْفَلِتُ مِنْهُمْ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلٍ فَلَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ فَجَعَلَ لا يَخْرُجُ مِنْ قُرَيْشٍ رَجُلٌ قَدْ أَسْلَمَ إِلاّ لَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ فَوَاللَّهِ مَا يَسْمَعُونَ بِعِيرٍ خَرَجَتْ لِقُرَيْشٍ إِلَى الشَّأْمِ إِلاَّ اعْتَرَضُوا لَهَا فَقَتَلُوهُمْ وَأَخَذُوا أَمْوَالَهُمْ.

فَأَرْسَلَتْ قُرَيْشٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُنَاشِدُهُ بِاللَّهِ وَالرَّحِمِ لَمَّا أَرْسَلَ فَمَنْ أَتَاهُ فَهُوَ آمِنٌ فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيْهِمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ حَتَّى بَلَغَ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَكَانَتْ حَمِيَّتُهُمْ أَنَّهُمْ لَمْ يُقِرُّوا أَنَّهُ نَبِيُّ اللَّهِ وَلَمْ يُقِرُّوا بِـ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ وَحَالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْبَيْتِ ) (الحديث ٢٧٣١، ٢٧٣٢، سبقت أطرافُهُا في رقم: ٧٩٩ت = ١٦٩٤، ١٦٩٥ف)[١٩٣].

میسوەری کوڕی مەخرەمە (رەزای خوای لێ بێ) و مەروانی کوڕی حەکەم - رەحمەتی خوای لێ بێ- فەرموویان: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەسەردەمی غەزای حودەیبییەدا، لەمەدینەوە لەگەڵ نزیکەی هەزارو چوار سەد کەس لەهاوەڵانی بەرەو مەککە بەنیازی عەمرە، لەسەرەتای مانگی ناوجەژنانا، لەساڵی شەشی کۆچی دا کەوتەڕێ، هەتا گەیشتە ئەستێڵی ئەشتاط، لەوێ بەیارانی خۆی فەرموو: (خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ بڕکەیێ سواردا، وان لەغەمیم قەرەوڵی قورەیشن، لای راستی ئەوان بگرن‌و بڕۆن با پێمان نەزانن).

فەرمووی: بەخوا ئیتر خالید هەستی پێ نەکردن، هەتا تەپ‌و تۆزی سوپاکەی پێغەمبەریان دی، ئنجا خالید رای کردو وشترەکەی غارداو، خەڵکی مەککەی هۆشیار کردەوە، کەوا پێغەمبەرو سوپاکەی هاتوون بۆ سەرتان‌و وان لە ئەنییەتولمیرار، کەدەڕوانێ بەسەر حودەیبییەدا، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) خۆی‌و سوپاکەی رۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر ئەو ملەیەی کەلەوێوە بەسەر ئەوانا شۆڕدەبنەوە، لەوێ وشترەکەی ژێر پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کە ناوی قەصواء بوو پاڵ کەوت‌و نەرۆیشت. مەردومەکەش تێیان خوڕی‌و دەستیان کرد بەهەچچە هەچچە، وشترەکەیش مانی گرت‌و هەڵنەسا، مەردومەکەش گوتیان: قەصواء مانی گرتووە! قەصواء مانی گرتووە!

(١٩٣) راجع صح/١٢ص١٣٥ إلى ص١٤١ — المترجم.

پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەقەصواء مانی گرتووە!، نەخووشی وایە کەمان بگرێ، بەڵام ئەم پاڵ کەوتنەی هۆیەکی تری هەیە، کە ئەوەیە: ئەوەی کاتی خۆی بەری فیلەکانی لەشکری ئەبرەهەی حەبەشی گرت، کەنەیهێشت ئەو سوپایە بڕواتە ناو مەککەوە، هەر ئەوەش کە فریشتەی خوایە، بەری قەصوای گرتووەو ناهێڵێ بڕواتە ناو مەککەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەو کەسە کەگیانی منی بەدەسە، کەخوای تاكو تەنهایە، هەر پلانو پێشنیارێکی وام لێ داوا بکەن، کە رێزی رێزدارانی خودای تیادابێو ببێ بەهۆی کپ کردنی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگ، قەبووڵی دەکەم).

ئەوجا خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەیی لە قەصواء کردو تێی خوڕی، ئیتر قەصواء راپەڕی، فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کەمێ گەڕایەوە دواوەو لەسەر کوێرە کانییەکی کەم ئاو لەو پەڕی حودەیبییەوە، خۆیو سوپاکەی دابەزینو بارو بنەیان خستو سوپاکە بەمشتو بەلوێچو نەختە نەختە ئاویان لێ دەگرت، ئەوەندەی نەبرد کە هەموویان هەڵگۆزیو هیچیان تیا نەهێشتو چۆڕیان لێ بڕی، وەچون بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) سکاڵای بێ ئاویو تینوێتیان لەلاکرد، ئەویش تیرێکی لە تیردانەکەی خۆی دەرهێناو فەرمانی پێیان کرد کە داینێن لەناو کوێرە کانییەکەدا، سوێندبێ بەخوا ئیتر سەرومڕ کفارەی ئاوی دەهاتو کانییەکە تەقی، هەتا هەموو تێرئاو بوونو تەکیان دایە دواوەو پەڕیان لێ گرت.

جا لەم کاتانەدا ئەوەندەیان زانی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعیو کۆمەڵێ تر لەهۆزی خوزاعە پەیدا بوون، کە هۆزی خوزاعە هەرچەند ئەو کاتە ناموسوڵمان بوون، بەڵام ئەمیندارو دڵسۆزی پێغەمبەرو موسوڵمانان بوون لەناو خەڵکی تیهامەدا (کە بریتییە لە مەککەو دەوروبەری).

جا بودەیل لەسەر شێوەی ئامۆژگاری دۆستانە، عەرزی پێغەمبەری کرد: قورەیش خۆیان ئامادە کردووە بۆ جەنگین لەگەڵ تۆ کە من هاتم بۆلای تۆ بەلای سوپای هۆزی کەعبی کوڕی لوئەی‌و عامیری کوڕی لوئەی دا، هاتم کە گەورەترین دوو هۆزی قورەیشن، لەسەر سەرچاوەکانی ئاوەکانی حودەیبییەدا دابەزیون، بەتەواوی خۆیان ئامادە کردووە بۆ جەنگ تەنانەت وشتری تازە زاوو وشتری گوێرەکە لەبەریان پێیە، هەتا زیاتر سوورو مجێزبن لەسەر شەڕو بیر لە هەڵهاتن نەکەنەوە! جا مسۆگەر کە ڕێگەت نادەن بچیت بۆ بەیت، ئەگەر بەشەڕیش بووە قەدەغەت دەکەن لە دێنی خانەی خودا.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئێمە بۆ جەنگ‌و شەڕو شۆڕ نەهاتووین، هەرامان لەگەڵ کەسێ نییە، بەڵام هاتووین بەئاشتی عەمرە بکەین‌و بەس، قورەیشیش جەنگ شەکەت‌و کفتی کردوون، هەموو ڕۆژێ شەڕ شەڕ! زیانی گەورەی لێیان داوە، جا ئەگەر ئەوان حەزبکەن کە شەڕ نەکەن من پێم خۆشە، وەئاگر بەستێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەبەستین‌و ڕادەگەیەنین، وەلەماوەی ئەو شەڕ وەستانەدا بائەوان هەقیان بەسەر منەوە نەبێ، من لەگەڵ ئەو خەڵکەی تردا خەریك دەبم، جا ئەگەر من سەرکەوتم‌و ئەو خەڵکەی ترم موسوڵمان کرد، ئەوا ئەوان سەرپشك بن: حەزیانکرد، با ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر بێنە سەر ئایینی من‌و ئەوەی خەڵکی قەبووڵیان کردووە، ئەوانیش قەبوڵی بکەن، خۆ ئەگەر حەزیان لەمە نەبوو ئەوا هیچ نەبێ لەوماوەیەدا بۆ خۆیان وچانێ، پشوویێ دەدەن!!.

بەڵام ئەگەر هەر وازیش ناهێنن، دەسا بەو کەسە کە گیانی منی وا لەدەسا، لەسەر ئەم ئایینەم، تادوا هەناسەو تا دوا دڵۆپی خوێنم دەجەنگم لەگەڵیانا، وەتا دەدرێ لەگەردنم لەسەر کاری خۆم دەڕۆم، وەکێ تریش بادۆست‌و دوژمن هەموو بزانن، من خوام لەگەڵە زوو یادرەنگ خوا ئەم ئایینەی من سەردەخات، کەواتە: هەر کەسێ شەڕ لەگەڵ من بکا، شەڕی خۆتڕێن دەکا!).

بودەیل(ڕەزای خوای لێ بێ) کە لەوەودوا لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بوو، کە لەخزمەت پێغەمبەردا ئامادەی حونەین و طائیف و تەبوك بووە، کە هەر لەژیانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) وەفاتی کردووە، فەرمووی: (چیت فەرمووە من دەچم بۆیان دەگێڕمەوە). قسەبەر (ڕاوی) فەرمووی: لەپاشا بودەیل چوو بۆ ناویان بە قورەیشی وت: ئێمە لەلای ئەو پیاوەوە کە موحەممەدە هاتووین بۆ لاتان و قسەیەکی ئەومان بیستووە، جا ئەگەر حەزدەکەن ئەوا بۆتان دەگێڕینەوە، دەنا نا، جا گەوج و نەفامەکانیان یەکسەر گوتیان: کارمان بەهیچی ئەو نییە، قسەیێ قسەی ئەوبێ مەیگێڕەوە بۆمان، بەڵام هۆشیارو خاوەن ڕاکانیان گوتیان: ئادەی چیت لێ بیستووە بیلێ، گوتی: موحەممەد ئاوا وا دەڵێ، وە هەموو قسەکانی پێغەمبەری گێڕایەوە بۆیان.

جا عوروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی(ڕەزای خوای لێ بێ) کە لەپاش ئەم ڕووداوە موسوڵمان بوو،، وەگەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی بانگەوازی لێ کردن بۆ سەر ئیسلام، بەڵام کوشتیان، هەڵسا گوتی: ئەی گەل! ئێوە لەجێگەی باوك و دایك نین بۆ ئێمە لەڕووی دڵسۆزی و خۆشەویستیەوە؟ گوتیان: با، وایە. گوتی: ئەی منیش بۆ ئێوە لەجێگەی منالی خۆتان نیم بۆ ڕێزو قەدر زانی؟ گوتیان: با، وایە. گوتی: خۆ هیچ گومانێکی خراپتان لەمن نییە؟ گوتیان: نەء. گوتی خۆ خۆشتان زۆر چاك دەزانن کە من چەند دڵسۆزم بۆ ئێوە، ئەوە بوو ئەو جارە کە دوژمن شەڕی پێ دەفرۆشتن، من عەشاماتەکەی بازاڕی عوکاظم وروژان کە بین بەهاوارتانەوە، بەڵام کەئەوان نەهاتن بەدەنگمەوەو نەهاتن بۆ فریاکەوتنی ئێوە، من بەخۆم و ماڵ و منالّ و کەسوکارم و بەوانەی کە بەگوێیان کردم لەهۆزەکەم هاتین بەهاوارتانە. گوتیان: بەلێ ئەمەی دەیڵێی وایەو ڕاستە. گوتی: دەسا، پیاو ڕاست بڵێ، ئەم پیاوە نەخشەو پێشنیارێکی زۆر دروستی پێشنیار کردووە، کەواتە قەبووڵی بکەن و ڕێگەی من بدەن کەبچم بۆلای؟ گوتیان: بڕۆ بۆلای.

ئـــەویش هـــات بـــۆلای پێغەمبـــەر(دروودی خـوای لەسـەر بێ) و دەســـتی کـــرد بەگفتوگۆکردن لەگەڵ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێغەمبەریش چی فەرموو بەبودەیل، هەمان شتی بە عوروەش فەرموو. عوروە لەوێدا کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (... بـەڵام ئەگـەر هـەر وازیـش نـاهێنن... تـادوا دڵۆپ خوێنم دەجەنگم لەگەڵیانا...) عوروە لەم کاتەدا گوتی: ئەی موحەممەد!ئایا پـێم بلـێ: ئەگـەر تـۆ قەڵاچـۆی گەلەکـەی خـۆت بکـەیت ولـەڕەگو ریـشەوە هەڵیان بکەنیت، ئـەوە بەکارێـکی بـاش دەزانـی؟؟ ئایـا بیستووتە کـە لـەپێش تۆدا کەسێ لەعەرەب کاری ناباشی وای کردبێ لەگەڵ کەسوکاری خۆی دا، خۆ ئەگـەر شـەڕ بەبارەکـەی تـردا بـسوڕێ، قورەیش سـەربکەون‌و شـەڕ بقـەومێ لەنێوانتانا، بەخوا هەرچەندە ناودارانیش دەبینم لەناو سوپاکەی تـۆدا، بـەڵام زۆربـەی مەردومەکـەی لەگـەڵ تۆدایـە، وەك مـن دەبیـنم هـەموو خـوێڕی‌و هەرچی‌و پەرچی‌و ڕەمـەکین، هەرکەسـەی هـی لایـەکن، شـەڕ بەمانـەناکرێ بەڵکوو شایانی ئـەوەن، کـە هـەر لەسـەرەتاوە هـەڵبێن‌و رابکـەنو دەورت چۆڵ بکەن، واتە: شەڕەکە یا هۆزەکەتی تیادەچێ یا سوپاکەت. ئەبوبـەکریش پێـی فـەرموو: قیتکـەی لات بمـژە! ئێـوە دەوری لات دەگـرن بـەڵام ئێمـە دەوری موحەممەد چۆڵ دەکەین، قسەی وادرۆی رووتە.

عوروە گوتی: ئەمە کێیـە؟ گوترا: ئەبوبـەکری صـدیقە، گـوتی: دەی بـەو کەسەی کە گیانی منی وا لەدەسا، ئەگەر ئـەو چاکەیەت بەسـەرمەوە نەبوایـە کەهێـشتا تۆڵـەیم بـۆت نەکردۆتـەوە،وەڵامـی ئـەم قـسە تاڵـەم دەدایتـەوە، فـەرمووی: وەدەسـتی کـردەوە بـە قـسە کـردن لەگـەڵ پێغەمبـەردا، وەهـەموو جـارێ کـە قـسەی دەکـرد ریـشی پێغەمبـەری دەگـرت، وە موغـەیرەی کـوڕی شـــوعبەیش بەشمـــشێرەوە بـــەدیار ســـەری پێغەمبـــەرەوە راوەســـتابوو، هـەموو جـارێ کەبـەدەم قـسەکردنەوە عـوروە دەسـتی دەبـرد بـۆ ریـشی پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) موغـەیرە بـەنوکی کێلانـی شمیێرەکـەی دەیمـاڵی بەدەستی دا، وەپێی دەگوت: دەستت لابە.

موغەیرە برازای عوروە بوو، بۆ ئەوەی مامەی نەیناسێتەوە زریەو کڵاو زریەی پۆشیبوو، بۆیە عوروە گوتی: ئەمە کێیە کە دەماڵێ بەدەستی من دا؟ گوتیان: موغەیرەی کوڕی شوعبەیە، گوتی: ئەی بێ ئەمەکی بێوەفا! خۆ من هێشتا رزگارم نەبووە لەدەست چارەسەری ئەو گۆبەندەی تۆ ناوتەتەوە، چیرۆکی ئەم گۆبەندە ئاوا دەبێ: موغەیرە لەسەردەمی نەفامی دا لەگەڵ کۆمەڵێ پیاوا لەهۆزی ثەقیف دەچن بۆلای موقەوقەس، کە دەگەڕێنەوە لەڕێگە مەیو بادە دەنۆشنو سەرخۆش دەبنو موغەیرە هەر سیازدەیان دەکوژێو هەموو ماڵو سامانەکەشیان دەباو، دەڕوا بۆ مەدینە لەخزمەت پێغەمبەردا ئیسلام دەبێ، عوروەی مامەیشی بۆی تێ دەکەوێو خوێنی سیازدە پیاوەکە دەدا بەهۆزی ثەقیف.

پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ موغەیرە لەسەر ئەم حاڵە دێ بۆ خزمەتی دەفەرموێ: (موسوڵمان بوونت قەبووڵ دەکەم، بەڵام ئەو ماڵو سامانەی کە هێناوتە، چونکە بە بەدنمەکی پەیدات کردووە من هەقم نییە بەسەریەوە).

ئەوجا عوروە هەرچاوێکی کرد بەدوو چاوو بەهەرچوارلادا دەستی کرد بەتەماشاو سەرنجدانی هاوڕێیانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) عوروە دەیگوت: بەو خودایە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەر بەڵغەمێکی هەڵ دەدا یەکسەر دەکەوتە دەستی یەکێ لەهاوڕێیەکانیەوە، کەلەدەوری بوون، جا بۆ پیرۆزیو مووفەڕکی دەیسویی لەدەموچاوی خۆی، کاتێ فەرمانێکی پێ دەکردن، گورج ئەو فەرمانەیان دەقۆستەوەو پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر جێ بەجێ کردنی، کاتێ دەستنوێژی دەشۆرد لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی خەریك بوون ببێ بەهەرایان لەناوی خۆیانا، کەبەئاوە چۆڕاوەکەی خۆیان پێ پیرۆزو مووفەڕك دەکرد، کاتێ کە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەستو بەقوربانی گەردی بەر ئاستانەکەی بێ) قسەی دەفەرموو

هاوڕێیـانی دەنگـی خۆیـان کـپ دەکـردو نقـەیان نـەدەکردو گوێیـان بـۆ فەرمایشتەکەی ئەو شل دەکرد، وەئەوەنـدە ڕێزیان لەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەگرت‌و سامی هەبوو لەبەر چاویان بەوردی سەرنجیان نەدەدا.

جـا عـوروەیش پاشـان گەڕایـەوە بـۆلای کۆمەڵەکـەی خـۆی‌و گـوتی: ئـەی خزمینـە! بـەخوا بەنوێنـەری چـوومەتە لای زۆر لەگـەورەپیاوان‌و پادشـایان، چوومەتە لای قەیسەری پادشای ڕۆم‌و کیـسرای شـای ئێـران‌و نەجاشـی پاشـای حەبەشـە، بـەزاتێ کـەزاتی خودایـە، ئـەو ڕێـزەی کـە یـارانی موحەممـەد لـە موحەممەدی دەگرن، هەرگیز لەدەست‌و پێوەندی هـیچ پاشـایەکم نـەدیوە کـە لەپادشای خۆیانی بگرن، سوێندم بە خوا هەر بەڵغـەمێ هـەڵ دەدا یەکێـکیان دەیگرێتەوەو هەڵی دەسوێ لەڕوومەتی خۆی‌و پێـستی خـۆی پـێ پیرۆز دەکا، کـاتێ فـەرمانیان پـێ دەکـا بـەزوویی فەرمانەکـەی دەقۆزنـەوەو جـێ بـەجێی دەکەن، کاتێ دەسـتنوێژ دەگـرێ لەسـەر چۆڕاوگەی ئـاوی دەسـتنوێژەکەی کـە خۆیانی پێ موفەرك‌و پیرۆز بکەن، وەختە ببێ بەشـەڕو هـەرایان! کـاتێ قـسە دەکا ئیتر ئەوان کـپ‌و خـامۆش دەبـن، وەئەوەنـدە بەسامە لـەلایان‌و ئەوەنـدە ڕێزی دەگرن زەق زەق تەماشای ناکەن، بەڵکوو بەشەرمەوە سەیری دەکەن.

ئەمە لەلایێ وەکوو تـریش نەخـشەو پێشنیارێـکی دروسـتیشی پێشکەش کردوون، من رام وایە کە ئەو نەخـشەیە قـەبوول بکـەن. پیاوێـکی کینانـەیش –کەناوی حولەیـسی کوڕی عەلقەمـە بـوو- گـوتی: لـەمنیش بگـەڕێن بابـچم بۆلای‌و بـوار تـاقی بکەمـەوە. گوتیـان: بـڕۆ بـۆلای. کـاتێ حولـەیس نزێـکەوە بوو، پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بـەیارانی فـەرمووو: (ئەمـە حولەیـسە لـەهۆزی کینانەیە، کە ڕێزی بـەیت‌و دیـاری بـەیت‌و حوشـتری دیـاری بـەیت‌و قوربـانی دەگـرن، دەی بـەزوویی ئـەو قوربـانی‌و دیـاری بەیتانـەی وا پێمـان هـەڵیان بسێنن، باحولەیس بەچاوی خۆی بیانبینێ‌و بزانێ ئێمە بۆ عەمرە هـاتووین، نەك بۆ شەڕ) ، جا ئەوانیش گاوو وشتره دیـاری بەیتـەکانیان هەڵسان،هـەموو

تیغ درابوو له دوگیان‌و گوڵەنگ بۆ نیشانە کرابووە ملیان، وەخەڵکەکەش بەتەلبیە کردنەوە چوون بەپیریەوەو پێشوازیان لێ کرد.

جا کاتێ حولەیس ئەمەی دی گوتی: سوبحانەڵڵا! کارێکی زۆر ناشایستەیە کە ئەمانە، کەهاتوون بۆ عەمرە، لەدێنی بەیت قەدەغە بکرێن، جا کاتێ گەڕایەوە بۆ ناویان، گوتی: خۆم گاو وشتری دیارییەکانی بەیتم بەچاوی خۆم دی، هەموو سۆڵ کراوە بەگوڵنگ‌و کراوەتە ملیان‌و دووگی وشترەکان بەدەمە تیغ زامار کراون، بۆ نیشانەی ئەوە کە ئەم ئاژەڵانە دیاری بەیتن، تا هەموو کەس بزانێ دەسا من رام وانییە کەرێگە لەمانە بگیرێ کە دێنی خانەی خودا بەجێ بهێنن!

پیاوی تریان -کەناوی میکرەزی کوڕی حەفص بوو- هەڵسا گوتی: وازم لێ بێنن بامنیش بچم بۆلای، گوتیان بڕۆ بۆلای، جا کاتێ لەموسوڵمانەکان نزیکەوە بوو، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوا میکرەز هات بەراستی پیاوێکی بەدکارە).

کاتێ میکرەز لەگفتوگۆدا بوو لەگەڵ پێغەمبەردا، لەوکاتەدا سوهەیلی کوڕی عەمریش پەیدا بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (واکارەکەتان نەختێ ئاسان بوو! چونکە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەناوی سوهەیل نوقڵانەی باشەی لێ داو، تەفائولی بەخێر کرد، چونکە سوهەیل واتە: نەختێ ئاسان! جا کاتێ سوهەیل هات لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) پاش گفتوگۆیەکی تەواو گەیشتنە ئەوە کەرێکەوتن نامە مۆرکەن‌و بۆ ماوەی دەساڵ شەڕو شۆڕ رابگرن، جا سوهەیل گوتی: بێنە رێکەوتن نامەیەك بنووسە لەنێوانی ئێمەو ئێوەدا، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) نووسەری بانگ کرد، کە ئیمامی عەلی بوو، وەپێی فەرموو: بنووسە بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، سوهەیل گوتی: بەخوا نازانم (رەحمان=میهرەبان) چییە بەڵام وەك جاری جاران بنووسە: (باسمك اللهم: بەناوی تۆ ئەی خودایە!).

بەڵام موسوڵمانەکان فەرموویان: بەخوا هەر بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان دەنووسین، پێغەمبەریش فەرمووی: (بنووسە: بەناوی تۆ ئەی خودایە!) ئەوجا فەرمووی: بنووسە: (موحەممەدی پێغەمبەری خودا لەسەر ئەمە بڕیاری داوە). سوهەیلیش گوتی: ئەگەر بزانین کە تۆ پێغەمبەری خودایت نە لەبەیت قەدەغەمان دەکردی نەدەچووین بەگژتا، بەڵام بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا. (بڕوانە: ژ-١١٢٨ت=٢٦٩٩ف).

پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەخوا من پێغەمبەری خوام، با ئێوەش باوەڕم پێ نەکەن، بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا).

ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەمەی کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەقسەی سوهەیل نامەکەی دەگۆڕی بەپێی ئەو فەرمایشتەیەتی کە فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای تاکو تەنیایە هەر پلانو پێشنیارێکی وام لێ داوا بکەن، کە ڕێزی ڕێزدارانی خودای تیادابێو... قەبووڵی دەکەم.

ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا بڕیاری داوە لەگەڵ قورەیش دا: لەسەر ئەوە کەئەوان ڕێگەی ئێمە بدەن کەسەردانی خانەی خودا بکەینو لەسەرر شێوەی تایبەتی ئایینی بەدەوریدا هەڵسوڕێین، سوهەیلیش گوتی: بەخودا نابێ، ئەگینا عەرەب تانەمان لێ دەدەنو پێمان دەڵێن: کە ئێمە زۆر بگیرکراوین، لەبەر ئەوە شتیوا قەبووڵ ناکەین، بەڵام ئەم برگەیە بۆ ساڵی ئایندە، ئەویش وای نووسی کەلەساڵی ئاییندەدا، موحەممەدو هاوڕێکانی دێنەوە بۆ عەمرە).

سوهەیل گوتی: لەسەر ئەوەیش کەهەر پیاوێ لەئێمە هات بۆ ناو ئێوە، بالەسەر ئایینی ئێوەش بێ، نابێ وەری بگرن دەبێ بیدەنەوە دەست ئێمە. موسوڵمانانیش گوتیان: سوبحانەڵڵا لەم قسەیە! ئەو کە بە موسوڵمانی هاتبێ بۆ ناو ئێمەی موسوڵمان، ئیتر چۆن تەسلیم دەکرێتەوە بە ناموسوڵمانان!

جا ئالەم دەمەدا بوو کە لەپڕ، ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر، بەکۆت و زنجیرو پێوەندەکەیەوە خۆی کرد بەژووردا، وەهەلی دەست کەوتبوو لەخوارووی مەککەوە خۆی دەرباز کردبوو، تا لەسەر ئەو حاڵەتە خۆی کرد بەناو کۆمەڵەی موسوڵمانانا و چەسپاندی کە هەڵهاتووە! سوهەیل گوتی: ئەی موحەممەد! ئەمە یەکەم کەسە کەبەپێی ئەم بڕگەیە لێتی داوادەکەم، وە دەبێت بیدەیتەوە پێم. پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خۆ هێشتا ئێمە ڕێکەوتن نامەکەمان نەتەواو کردووەو نەمۆرمان کردووە، کەواتە ئەم داوای تۆیە جێگەی خۆی نییە) سوهەیل گوتی: بەخوا ئەگەر ئەم راکردووەم تەسلیم نەکەیتەوە، ئیتر لەسەر هیچی تر لەگەڵتا ڕێ ناکەوم.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبی بەخشە بەمن) گوتی: نایبەخشم پێت، فەرمووی: (با، بیبەخشە) گوتی: نەمکردووەو نایکەم، میکرەز گوتی: باشە وابەخشیمان بەتۆ بەڵام سوهەیل قاییل نەبوو، ئەبوجەندەل گوتی: ئەی گەلی موسوڵمان! چۆن دەمدەنەوە دەست ناموسوڵمانان ؟ ئایا سەیر ناکەن کە لەپێناوی ئیسلاما چیم بەسەر هاتووە؟! لەراستیدا لەپێناوی خودادا سزاو ئەشکەنجەیەکی توندو سەختیان دابوو.

قسەبەر دەڵێ: عومەری کوڕی خەطاب لەم بارودۆخە زۆر نیگەران بوو، خۆی فەرمووی: چوومە خزمەت حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) و عەرزیم کرد: دیارە کەتۆ بەبێ گومان پێغەمبەری هەقی خودای، فەرمووی: بەڵێ وایە، گوتم: دیارە ئێمە لەسەر هەقین و ئەوان لەسەر ناهەق، فەرمووی: (بەڵێ وایە) گوتم: جا کەوایە ئیتر بۆ سووکی ئایینی بەسەر خۆمان بهێنین و ئەم هەمکە مەرجە ناقۆڵایەی ئەوان قەبووڵ بکەین؟

خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من شت بەهەوەس ناکەم، من فروستادەی خودام، خودا خۆی چۆنم ئاراستە دەکا، لەفەرمانی دەرناچم و

فەرمانی ناشكێنم، دڵنیاشم لەوە كەسەرم دەخا لەكات وشوێنی دیاریكراودا) ، گوتم: قوربان! ئەی تۆ جاران بەئێمەت نەدەفەرموو: بەزوویی دەچینە سەردانی خانەی خوداو تەوافی دەكەین؟ فەرمووی: (با، بەڵام ئایا من پێم گوتن كەئەم ساڵ دەچین؟) گوتم: نەء، فەرمووی: (دە دڵنیابە بەزوویی دەچیتو تەوافی بەیتیش دەكەی).

فەرمووی: لەتاو پەرێشانی دڵو دەروونی خۆم، چوویشم بۆ خزمەتی ئەبوبەكری صدیق(رەزای خوای لێ بێ) ، پێم گوت: ئەی ئەبوبەكر خۆ گومانی تیادا نییە كەئەم پیاوە پێغەمبەری راستو درووستی خودایە، فەرمووی: بەلێ، وایە، گوتم: دەی ئایا ئێمە لەسەر دروستی نینو دوژمنان لەسەر هیچو پووچ، فەرمووی: با، وایە. گوتم: كەواتە بۆچی سووكیی ئایینی بەسەر خۆمان بهێنین؟

فەرمووی: كابرا ئەوە پێغەمبەری خودایە نافەرمانی پەروەردگاری خۆی ناكا، لەهێڵی ئاماژەی ئەو دەرناچێ دڵنیام كەخودا یاریدەریەتیو سەری دەخا، دەی نەكەی لامنجیو شتیوا بكەی لەفەرمانی، بەڵكوو دەست بگرە بەكەمەندیو رشتەی پتەوی ئایینە پیرۆزەكەی بگرە دەگەی بەئاوات، سا بەخودای گەورە پێغەمبەری خودایەو لەسەر هەقە، گوتم: باشە ئەی ئەوە نەبوو قسەی ئەوەی بۆ دەكردین كە دەچینە خزمەتی بەیتو لەدەوری هەڵدەسوڕێین؟ فەرمووی: با، بەڵام خۆ ئەو نەیفەرموو: كە ئەمساڵ ئەوە ئەنجام دەدەی. گوتم: نەء، ئەوەی نەفەرموو، فەرمووی: دڵنیابە كەدەچیت بۆ سەردانی خانەی خوداو بەدەوریدا لەسەر شێوەی خواپەرستی هەڵدەسوڕێیت.

عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەكەفارەتی ئەم لێكۆڵینەوەو تەحقیقاتەدا، چەند كارێكی خەیرم ئەنجام دا تا خودا لێم نەگرێو لێم ببووری.

قسەبەر(راوي) دەفەرموێ: کاتێ لە نووسینی نامەکە بەتەواوی لێ بوونەوە، چەند پیاوێ لەهەردوولا گران بەشایەت لەسەر ئەم رێکەوتنە، جاپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەهاورێیانی فەرموو: (دەئیتر هەستن بڕۆن دیارییەکانی بەیت سەربڕن، ئەوجا سەرتان بتاشن‌و ئیحرام بشکێنن). فەرمووی: بەخوا تاسێ جار پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم فەرمانەی دووبارەکردەوە، بەڵام کەسیان هەڵنەسان‌و فەرمانەکەیان بەجێ نەهێنا، ئەوەندە لەباری شانیان گران بوو (بڕوانە: تاج/٧ل-١٤٥ف-٤ز-٣١. سوورەتی فەتح). جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەم هەڵوێستەیان نیگەران‌و ناڕەحەت بوو، رۆیشت بۆلای ئوم سەلەمەی هاوسەری، سکاڵای ئەم حاڵەی بۆیکرد، ئوم سەلەمەش زۆر بەدانایانە تەگبیری بۆی کرد، فەرمووی: قوربان! ئەگەر حەز دەکەی لەفەرمانت دەرنەچن تەشریفت بەرە، قسە لەگەڵ کەسیانا مەکە، هەتا دیارییەکانی بەیتت سەردەبڕیت‌و ئەوجا سەرتاشەکەت بانگ بکەو، لەبەر چاوی ئەوان سەری خۆت بتاشە، ئیتر ئەوانیش چاریان نامێنێ‌و وادەکەن!

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەپێی ئامۆژگارییەکەی ئوم سەلەمەی کرد، شتەکانی بەرودوا ئەنجام دا، ئیتر هاورێیانیش بەناچاری هەڵسان فەرمانەکانی پێغەمبەریان ئەنجام دا، بەڵام ئەوەندە پەست‌و غەمبار بوون‌و کارەکەیان نابەدڵ بوو، وە ئەوەندە سەرجەنجاڵ بوون‌و بەیەکا دەهاتن‌و دەچوون، خەریکبوون ببن بەژێر پێی یەکتریەوەو یەکتری بکوژن!

جا لەوەپاش لەماوەی رێکەوتنەکەدا هەرپیاوێ دەهات، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەیدایەوە پێیان بەپێی مەرجی رێکەوتنەکە، بەڵام لەو ماوەیەدا کۆمەڵێ ژنی موسوڵمان کۆچیان کردو هاتن بۆ مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) جا خودای گەورە سەبارەت بەو ژنانە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمْ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لاَ هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلاَ هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنفَقُوا وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلاَ تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾ — مومتەحینە١٠/٦٠.

واتــە: ئــەی کەســانێ کــەباوەڕی ســاغتان بــەخوداو بەپێغەمبــەری خــودا هێناوە! کاتێ ژنە خاوەن باوەڕەکان کۆچیان کردو هاتن بۆ ناو ئێوە، ئەوە لەپێشا تاقیان بکەنەوە کە هەر بۆ ڕەزای خودا کۆچیان کردووەو پەنایان هێناوە بۆلای ئێوە، نەوەك لەبەر دڵداری‌و شتی تری وا، هەرچەندە خودا بۆ خۆی ڕاستی هەموو ڕوداوێ زۆر بەباشی دەزانێ‌و، ئاگای لەباوەڕو ئیمانی ئەوانە، جا ئەگەر بۆتان دەرکەوت کە ئەوژنانە لە دەستی کوفر کۆچیان کردووەو موسوڵمانن، ئیتر مەیاندەنەوە بەمێردە بێبڕوا ناموسوڵمانەکانیان، چونکە نەئەمانە حەڵاڵن بۆ ئەوان‌و نەئەوان حەڵاڵن بۆ ئەمان، بەڵام نەفەقەو خەرجی‌و مارەیی‌و شتی‌وا بدەنەوە بەمێردەکۆنەکانیان، لەبەر ئەوەی کە ئیسلام بەیەکجاری جیای کردوونەوە لەمێردەکانیان، گوناهتان لەسەر نییە کەلەو ژنە کۆچکارانە مارەبکەن بۆ خۆتان، بەڵام دەبێ مارەیی خۆیان پێ بدەن، هەر ئەوە بەس نییە کەداوتانە بەمێردەکانیان، لەهەمان کاتا پەیوەندی ژن‌و مێردی ببڕن لەگەڵ ژنی بێبڕوای ناموسوڵمانا، چونکە لەڕۆژی موسوڵمان بوونی ئێوەوە، مادەم ئەوان لەگەڵتانا، موسوڵمان نەبوون، پەیوەندی‌و گرێبەندی ژن‌و مێردیتان پچڕاوەو ئەوان لەژنی ئێوە دەرچوون. (بڕ: تاج/٧ل-١٩٤ز-٤٣ سوورەتی مومتەحینە).

جا لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە، پێشەوا عومەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەو سەردەمە دوو ژنی هەبوو، هی سەردەمی نەزانی بوون، موسوڵمان نەبوو بوون، لەمەککە مابوونەوە، هەردووکیانی تەڵاق دا، یەکێکیان ناوی قەریبە بوو، موعاویە مارەی کرد، هەردوو لایان بتپەرست بوو ن لەو کاتەدا،

ئەویتریان ئوم کلثومی کچی عەمری ئەل خوزاعی بوو، دایکی ئیبنوعومەر بوو، خزمێکی خۆی مارەی کرد ناوی ئەبوجەهم بوو، ئەو سەردەمە هەردوو لایان ناموسوڵمان بوون. (بڕوانە: عەینی/١٣ص ٢٩١) بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ئەویتریان شوویکرد بەصەفوانی کوڕی ئومەییە.

ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆیو هاوڕێیانی گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، ئەبوبەصیر، کەپیاوێکی قورەیشی موسوڵمان بوو هات بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، ئەوانیش نامەیەکیان بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نووسیو دووپیاویان بەونامەیەوە نارد بەشوێن ئەبوبەصیردا، گوتیان: داوای ئەوەت لێ دەکەین کەلەم بارەیەوە ئەو پەیمانەی داوتە بەئێمە جێ بەجێی بکەی. پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەبوبەصیری دایە دەست دووپیاوەکەو بردیانو گەڕانەوە بەرەو مەککە، دەڕۆن هەتا دەگەنە ذولحولەیفە، لەوێ لادەدەنو خورمایان پێ دەبێو دادەبەزنو دەست دەکەن بەخورما خواردن.

ئەبوبەصیریش بۆ تەفرەدانو بەرتیلە قسە، بەپیاوێکیان دەڵێ: ئەی فیسارە کەس! بەخوا دەبینم شمشێرەکەت نایابە! ئەویش بەمە فش دەبێتەوەو لەکێلانەکەی هەڵی دەکێشێو دەڵێ: بەلێ، ئەرێ بەخوا، زۆر نایابە، چەندین جار تاقیم کردۆتەوە لەشەڕە شمشێردا. ئەبوبەصیر دەفەرموێ: ئادەی نیشانمی بدە باسەیرێکی بکەم، ئەویش دەیداتێ، ئەبوبەصیریش هەر لەگەڵ دەستی لەشمشێرەکە گیر دەبێ، بەشیر دای دەکوتێ هەتا ساردی دەکاتەوەو تەواو دەیکوژێ دەنیشێتە سەر ئەوی تریشیان هەتا ناو مەدینە، بەهەڕاکردن خۆی دەکا بەناو مزگەوتا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە دەیبینێ دەفەرموێ: (بەڕاستی ئەم کابرایە مەترسی گەورەی بەچاوی خۆی دیوە، ئەوەتا تۆقاوە!).

جا کابرا هەر لەگەڵ گەیشتە پێشەوە بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، وەك شێت هاواری لێ هەڵسا: بەخوا هاوڕێکەم ئەبوبەصیر کوشتی، ئەوەتا بەدوامەوە فریام نەکەون خۆشم دەکوژێ! جا ئەبوبەصیر هات، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا بەراستی خودا پەیمانەکەی تۆی بردەسەر، تۆ منت دایەوە پێیان و خوداش رزگاری کردم لەدەستیان. پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ماڵی دایکی وێران بێ، وەی لەم خانە خراپە چۆن جەربەزەیەکە، ئای لەم کۆڵەوژی تەندووری جەنگە، ئەگەر کەسێ هەبێ بۆی بسەنێتەوە ئاگری جەنگی لەگەڵ خۆش بکات!).

کاتێ ئەبوبەصیر ئەمەی لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بیست، زانی کە دووبارە دەیداتەوە دەستیان ئیتر دووبارە هەڵهاتەوەو رۆیشت هەتا گەیشتە شوێنێ ناوی عەیص بوو، دەکەوێتە سەر قەراخی دەریا، رێگەی خەڵکی مەککە کەدەچن بۆ شام لەوێوە دەڕوا. فەرمووی: لەلایەکی تریشەوە، واڕێدەکەوێ ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلیش لەدەستیان فرتە دەکا،و دەچێ دەنیشێ بەئەبو بەصیرەوە تا بوون بەتاقمەیەکی بەهێزی گەورە، ژمارەیان لەچل تێدەپەڕی، ئیتر بەخودا بوون بەملۆزم لەکاروانی قورەیش، هەرکەدەیان بیست واکاروانی قورەیش دەرچووەو دەچێ بەرەو شام، بۆسەیان بۆ دادەناو رێگەیان پێ دەگرت و ئەوەی دەیانکوشت و، ماڵ و سامانەکەشیان بەتاڵانی دەبرد بۆ خۆیان!

ناچار قورەیش وەفدیان نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گوتیان: یەکەم لەبەر خواو، دووەم لەبەر خزمایەتی، ئەمانەمان لەکۆڵ بخە، بنێرە بەشوێنیانا بابێنەوە بۆ لای تۆ بۆ مەدینە، ئێمە داوایان ناکەینەوە هەقمان نییە بەسەریانەوە. ئەوجا پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) ناردی بەشوێن ئەبوبەصیرو کۆمەڵەکەی دا هەموو هاتن بۆ مەدینەی نازدار، ئەوجا خودای پاك و پیرۆز ئەم چەند ئایەتەی لەسوورەتی فەتح ناردە خوارەوە:

﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ هەتا دەگاتە ﴿ إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ -فەتح ٤٨ /٢٤-٢٦-.

واتە: خودا ئەو خودایەیە کەبەری دەستی ناموسوڵمانەکانی قورەیشی گرت لە دەست درێژی کردنە سەر ئێوەو بەری دەستی ئێوەشی لەهێرش کردنە سەر ئەوان بەهۆی نەهیەوە گرت، لەکاتی رێکەوتنی حودەیبییەدا، کەجێگەیەکە وا لەناو خاکی بەست (حرم) ی مەککەدا، لەپاش ئەو سەرکەوتنەوە کەخوا بەنسیبی ئێوەی کرد، لەدژی ئەوان کەلەشکرەکەی خالید، کەلەشکری ئیسلام بوو، لەشکرەکەی عیکرەمەی شکاندو هەتا ناو مەککە هەڵی فڕاندن، خودا بۆخۆی زۆر باش بەوەی دەیکەن زاناو بەئاگایە، بەراستی ئەوانە هۆزێکی بێ باوەڕن‌و سەرکەشن‌و دژی هەق‌و راستین، بۆیە رێگەی ئێوەیان نەدا کەلەساڵی رێکەوتنی حودەیبییەدا عەمرەکەتان تەواو بکەن‌و سەردانی خانەی خودا، بەهێمنی‌و ئاشتی بکەن وەدیارییەکانی بەیتیان حەپس کردو نەیانهێشت بگەنە جێگەی سەربڕینی ئاسایی خۆیان، کەخاکی مینایە، لەراستیدا ئەگەر لەبەر خاتری ئەو کۆمەڵە موسوڵمانە نەبوایە، کە هێشتا تێکەڵیان ماوە لەگەڵ ئەو ناموسوڵمانانە شەڕفرۆشانەدا، کە ئەو کۆمەڵە موسوڵمانانە، هەیانە پیاوە، هەیانە ژنە، کەئێوە نایانناسن‌و لەبەر ئەوە بۆتان جیاناکرێنەوە لەوان، وەدووریش نییە کەبەبێ مەبەست‌و بەبێ ئاگا ببن بەژێر پێوەو تووشی ئێش‌و ئازار ببن‌و ئێوەش لەم رووەوە بەهۆی ئەوانەوە، تووشی گوناهو رەنج‌و کێشەو بەرەو ناخۆشی ببن، وەك دانی خوێنبایی‌و کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە.

لەراستیدا ئەگەر لەبەر ئەم دوو مەبەستە نەبوایە، بەری دەستی ئێوەمان لەکوشتاریان نەدەگرت، هەتا ئەم بەری دەستگرتنەش ببێ بەهۆی ئەوەی هەتا حەزی خودا لەسەر هەرکەسێ بێ بەهۆی ئیسلام بوونەوە

بەهۆی باوەڕی جوانەوە بەر ڕەحمەتی خۆیان بخات، ئەگەر گریمان پاك‌و پیس بکرانایە موسوڵمان لەناموسوڵمان بەباشی جیاوەبووایە، ئەوە جەزرەبەیەکی باشی ناموسوڵمانەکانمان ئەدا، بەتایبەتی لەو دەمەدا ئەم جەزرەبەیەمان دەدان، تووشی لوتبەرزی‌و تەنگەگرتنی سەردەمی نەفامی‌و نەزانی بوو بوون و، لەبەر کینەو دەغەزو لوتبەرزی بێزو فیزی سەردەمی نەزانی، بێزیان نەدەهات پێ لەهەق بنێن‌و هەر شانازیان بەمیراتی پوچی باوباپیرانیانەوە دەکرد.

دەفەرموێ: حەمیەت‌و لوتبەرزی‌و تەنگەگرتنەکەیان ئەوەبوو: کە ددانیان بەوەدا نەنا کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، وەقەبووڵیان نەکرد کە لەسەرەتای پەیماننامەکەوە (بسمِ اللهِ الرحمنِ الرحيم) بنووسن، وە نەیان هێشت لەو ساڵەدا سەردانی خانەی خودا بکەن.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

١- ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەفەرموودە هەرە درێژەکانی صەحیحی بوخاری.

٢- ئەم فەرموودەیە دادەنرێ بەدوو فەرموودە، کە گێڕانەوەی میسوەرو گێڕانەوەی مەروانە، بۆیە دوو ژمارەی (٢٧٣١) و(٢٧٣٢) ی بۆ دانراوە لەکۆتاوە، کەواتە: هەردوو فەرموودەیە لەچەند کەسەوە بێ، ڕیوایەتی هەر کەسێ لەوان بەفەرموودەیە دادەنرێ.

٣- پوختەیەکی کورتی ژیاننامەی میسوەرو مەروان، لەبەرگی دووەمدا لەلاپەڕە(٢١٦) دا، لەژمارە (٧٩٩) دا ڕابوورد.

٤- ئەم فەرموودەیە بڕیارو زانیاری‌و سەرباس‌و بابەتی زۆری واتیادا، لەبەر ئەوە بۆ زۆر شت‌و زۆر بابەت دەست دەدا، وەسوودو بەهرەکانی لەژمارە نایەن، پێویستی بە شەرحێکی تەواوە، کەبەرگێکی گەورە دەردەچێ.

٥- ئەم فەرموودەیە دادەنرێ بەمورسەل، واتە: بەرەڵا، چونکە نەمیسوەرو نەمەروان ئامادەی ئەم باسو خواسانە نەبوون، چونکە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەوان زۆر منداڵ بوون، تەمەنیان لەدەوری شەش حەوت ساڵان دا بوو، بەڵام ئەم فەرموودەیان لەکۆمەڵێ صەحابەوە وەرگرتووە، کەخۆیان ئامادەی سەرگوزەشتەکە بوون، وەك عومەرو عوثمانو عەلیو موغەیرەی کوڕی شوعبەو سەهلی کوڕی حەنیفو ئوموسەلەمەو کەسانی تریش. چونکە لەشوێنەکانی تر، مەروانو میسوەر، ئەم فەرموودەی ئێرەیان لەچەند کەسێ لەهاوڕێیانی موحەممەدەوە گێڕاوەتەوە، وەك لێرەدا هەندێکی لەعومەرەوەیە.

٦- بەڵگەی ئەوەی تیادایە کەهەندێ گیاندار، لەهەندێ کاتدا، بۆ مەبەستی تایبەتی لەخوداوە، ئاراستە دەکرێن، کەهەندێ شت بکەن بۆ ئاگادارکردنەوەی مەردوم، وەك لێرەدا قەصواء پاڵکەوتو بەرەو مەککە نەڕۆیشت. وەشتیوا هەموو کاتێ روودەدا، لەبەر ئەوە کارپێکردنی دروستە. گەلێ جار دیومەماین، یارەشە وڵاخ، یاگوێرێژو هێستر، لەهەندێ کاتدا مان دەگرن یا ناچنە ناو ماڵو ژوورەوە، واباشە لەو کاتانەدا دووربینی بکرێو ناوی خودا بهێنرێ.

٧- دانەر ئەم فەرموودەیەی لەچەند شوێنێ لەصەحیحی بوخاری دا گێڕاوەتەوە. بەڵام هیچ شوێنێ وابەدرێژی وەك ئێرە دەری نەهێناوە، وەئەم فەرموودەیە دادەنرێ بەدرێژترین فەرموودە لە بوخاری پیرۆزدا.

٨- لەم فەرموودەدا بڕیاری زۆری واتیادا، وەك: نوقڵانەی باشو نووسینەوەی بیسمیلا لەسەرەتای نامەو شتیواوە، وەك: پاکێتی چڵمو تفو بەڵغەمو موو خۆ پیرۆزکردن بەشوینەواری پیاوچاکانو صوڵح لەگەڵ ناموسوڵمان.

٩- فەزڵی ئەبوبەکرو عومەرو ئوم سەلەمەی واتیادا.

١٠- لەم فەرموودەیەدا راوێژکردن بەژن و گوێ لێ گرتنی و بەقسەکردنی لەراوێژی باشا هەیە کە سوننەتە. ئەوەی هەندێ کەس دەیڵێن لەم بارەیەوە ناڕاستە.

١١- زۆر داب و نەریتی کۆنی عەرەبەکانی واتیادا.

١٢- دروستە متمانە بەهەواڵی ناموسوڵمان بکرێ و باوەڕی پێ بکرێ و کاری پێ بکرێ، بەمەرجێ قەرینەو نیشان هەبێ لەسەر راستی و دروستی ئەو هەواڵە. کەواتە: ئەمڕۆ گوێگرتن و کارکردن و باوەڕکردن بەهەواڵی ئاژانس و میدیا نا ئیسلامیەکان دروستە، بەنموونە: ئەگەر ئاژانسێکی راستگۆ هەواڵی هاتنی رەمەزان یا جەژنی راگەیان باوەڕی پێ دەکرێ و کاریشی پێ دەکرێ.

١٣- سوێند خواردن دروستە لەوانەیە هەندێ جار باشیش بێ، بەمەرجێ سوێندی درۆ نەبێ، لەعەینی دا دەفەرموێ: (وەك دەزانرێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی زیاتر لەهەشتا بۆنەدا سوێندی خواردووە).

١٤- جاروبار موسامەحە لەکاروباری ئایینی دا دروستە، وەك مەسەلەکەی ئەبوجەندەل و ئەبوبەصیر.

١١٣٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلاَّ وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ) (الحديث ٢٧٣٦، أطرافُهُ في: ٦٤١٠، ٧٣٩٢) (١٩٤).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: : خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەد یەك کەم هەرکەسێ لەبەریان بکاو، رەفت و کار بەچەمك ومەبەستیان بکا، دەچێتە بەهەشت، خودا خۆی تاقەو حەز لەتاك دەکا) (تاج/٩/١٥٣ز-٥٩ف-١ش/ت).

(١٩٤) أخرجه مسلم في الذكر والدعاء والتوبة، باب: في أسماء الله تعالى و فضل من احصاها، رقم: ٢٦٧٧.

# پایانێ

ماموستای ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لێرەدا دەفەرمووی: نامەی مەرجەکان چلو حەوت فەرموودەی بەرزەوە بوو -مرفوع- ی واتیادا، پوختەکەیان پێنج فەرموودەن ئەوانی تریان دووبارەن، بێرشتەکانیان بیستو حەوتن، هەموویان پێشەوا موسلیمیش (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەریهێناون، بێجگە لەبەلاغەکەی زوهری (٢٧٣٣). دەفەرموێ: یازدە بیستراو- ئەثەر- ی هاورێیانو کەسانی پاش ئەوانیشی واتیادا.

پوختەکە هەر پێنجەکەیان لەتەجریدەکەدا هەیە: (١١٣١، ١١٣٢، ١١٣٣، ١١٣٤، ١١٣٥).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٥٩-نامەی راسپێری (وەسێت) (كتاب الوصايا)

(باسی وەسێت لەفیقهی ئاساندا وا لەبەرگی دووەم ل-٥٩٥ز-٢٥١) + (تاج/٣ل-٢ز-١).

١١٣٦-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ ) (الحديث ٢٧٣٨) (١٩٥).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ شتێکی هەبێ کە بیەوێ راسپێریی(وەسێت)ی بۆ بکا، هەق وایەدووشەوی بەسەردا تینەپەڕێ هەتا وەسێتنامەکەی بەنووسراوەیی لەلای خۆی دا دەنێ). (تاج/٣/٢٥-ز-١١-ش/د/ت ن.باسی راسپێری).

(١٩٥) أخرجه مسلم في أول كتاب الوصية، رقم: ١٦٢٧.

١١٣٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ خَتَنِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخِي جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ قَالَ مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلا دِينَارًا وَلا عَبْدًا وَلا أَمَةً وَلا شَيْئًا إِلاَّ بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ وَسِلاحَهُ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً) (الحديث ٢٧٣٩، أطرافه في: ٢٨٧٣، ٢٩١٢، ٣٠٩٨، ٤٤٦١) (١٩٦).

عەمری کوڕی حاریث(ڕەزای خوای لێ بێ) ، کە ژنبرای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بوو، کەبرای جوەیرییەی کچی حاریثی هاوسەری پێغەمبەرە – دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر ئەو خوشكو برایە بێ – فەرمووی: کاتێ کەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، نەپوول نەپارە نەزیوو نەزێڕو نەکۆیلەو نەکەنیزەكو نەڕانەمەڕو نەهیچی لەپاش بەجێ نەما، تەنیا هێسترێکی سپی هەبوو، لەگەڵ چەکەکەی، پارچەیێ زەویشی هەبوو، کردبووی بەوەقف.(تاج/٣/٢٤-ا ز-١٠-ش/د/ن).

## راڤەو شیکردنەوە:

(بڕوانە: ژمارە: ٩١٦بەرگی دووەم) بۆ ژیاننامەی جوەیرییەی کچی حاریث لەوێ نوسراوە، عەمری کوڕی حاریث (ڕەزای خوای لێ بێ) ژنبرای پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێ) ، چونکە برای جوەیرییەی کچی حاریثە، کە هاوسەری پێغەمبەرە، موستەلیقییە، لەهۆزی بەنی موصطەلیقە. لەبوخاریدا یەك فەرموودەی هەیە.

١١٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْصَى فَقَالَ: لا فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ أَوْ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ) (الحديث ٢٧٤٠، طرفاه في: ٤٤٦٠، ٥٠٢٢) (١٩٧).

---

(١٩٦) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٥/٤١٤) -خاتمة كتاب الوصايا – المترجم.

(١٩٧) أخرجه مسلم في الوصية، باب: ترك الوصية لمن ليس له شيئ يوصي فيه، رقم: ١٦٣٤.

لەعەبدوللای کوڕی ئەبو ئەوفایان پرسی: ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وەسێتی کرد بۆ پاش مەرگی؟ فەرمووی: نەء، گوترا: ئەی باشە ئەی چۆن وەسێتی لەسەر خەڵکی تر داناوە؟ فەرمووی: وەسێتو راسپێری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەوەبوو: کە کار بەنامەی خودا بکەن. بڕوانە تاجول ئوصول، بەرگی یەکەم لاپەڕە/٥٩ز-٩ف-١٣+١٤+تاج/٥/٢٥٧ز-٧٤+ل-٢٧٨ف-١٥ز-٧٦+ل-٩٩ف-٣ز-١٦. بۆ تێگەیشتنی تەواو لەچۆنێتی ئەم راسپێرییەی پێغەمبەر.

١١٣٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ حَرِيصٌ تَأْمُلُ الْغِنَى وَتَخْشَى الْفَقْرَ وَلا تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ قُلْتَ لِفُلانٍ كَذَا وَلِفُلانٍ كَذَا وَقَدْ كَانَ لِفُلانٍ) (الحديث ٢٧٤٨، طرفُهُ في: ١٤١٩)[١٩٨].

وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی لەبەرگی دووەمدا، لەلاپەڕە /١٠٥ژ-٦٨٠دا رابووورد.

١١٤٠- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ لا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا) (الحديث ٢٧٥٣، طرفاهُ في: ٣٥٢٧، ٤٧٧١)[١٩٩].

---

(١٩٨) اخرجه مسلم في الزكاة، باب بيان أن أفضل الصدقة صدقة الصحيح.. رقم: ١٠٣٢.

(١٩٩) اخرجه مسلم في الإيمان باب: في قوله تعالى: ﴿وانذر عشيرتكَ الأقربين﴾، رقم: ٢٠٤.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ - الشعراء٢٦/٢١٤-.

واتە: ئەی موحەممەد! خزمە هەرە نزیکەکانت هۆشیار بکەرەوەو بیانترسێنە لەقارو غەزەبی خودا، کاتێ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆیشت لەسەر تەپۆڵکەی صەفا راوەستاو، بەدەنگی بەرز، فەرمووی: ئەی هۆزی قورەیش نەفسی خۆتان لەخودای گەورە بکڕنەوە، من لەلای خودا هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنم، ئەی نەوەی عەبدومەناف! من لەلای خودا هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنم، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب! ئەی مامەی پێغەمبەر! من لەلای خودا هیچ سوودێ بە تۆ ناگەیەنم، ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەری خودا! من لەلای خودا هیچ سوودێ بە تۆ ناگەیەنم، ئەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر! ئەگەر داوای ماڵی دنیا دەکەی ئێستا بیکە، هەتا بەشت بدەم دەنا لەقیامەتدا من هیچ سوودێ بەتۆ ناگەیەنم. (تاج/٧/٧٤ف-٣ز-٩، ریاض/١/٣٢٩ل-٢٦٤ز-٤٠).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم جۆرە فەرموودەیە لەسەر ئەم شێوە رەهایە، کەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەقیامەتدا دەسەڵاتی هیچی نەبێ بۆکەس، چ خزم، چ بێگانە، جۆرە کێشەو دژایەتییەك، لەگەڵ چەند فەرموودەی تری صەحیحا دروست دەکا، چونکە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدنیاو قیامەتا رەحمەتە بۆ هەموان، بەتایبەتی لەرۆژی دوارۆژدا گەورەترین پشتو پەنایە -لەپاش خودا- بۆ باوەڕداران، خاوەنی شەفاعەتی کوبرایە، بەتکای ئەو بەمەلایین تاوانبار عەفو دەکرێن، بەمەلایین، پایەو پلەی موسوڵمانانو باوەڕداران بەرزەوە دەبێ، کەواتە:

١- ئەمە بەر لەوەبوو کەخودا ئاگاداری بکاتەوە کەلە قیامەتدا خاوەنی شەفاعەتول کوبرایە، وەهەروەها لەدونیادا سوودی زۆری جۆراو جۆری بۆ موسوڵمانان هەیە.

٢- یا مەبەست هەڕەشەو چاوترساندنو هۆشیار کردنەوەیە.

٣- یا مەبەست ئەوەیە کەئەگەر باوەڕ نەهێنن سوودی نابێ بۆیان.

٤- بۆ ئەوەی بەهێزیی فەرموودەکانی پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە بزانی کە بەڵگەی روونو ئاشکران لەسەر سوودی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەهەردوو جیهاندا بۆ باوەڕداران فەرموو بڕوانە:

أ- بەرگی دووەم، لاپەڕە/١١١ف-٦٧٨+ل-٩٥ف-٦٧٠+ل-١٤٧ مەسەلەی نوێژی قەزای حاجەو کردنی پێغەمبەر بەتکاکار لەلای خودا، بەڵکوو گشت باسەکە بەتەواوی.

ب- تاج/١٠/٣٨٨ زنجیرەی/١٢٩بەتەواوی باسی تکا کردنی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا، هەروا زنجیرەی /١٣٠. لەلاپەڕە /٣٨٩ وە هەتا(٤٠٩) هەروا زنجیرە/١٣١ل-٤٠٩ هەتا/٤٢٠+تاج/٥ص٣٨٣.

ج- ریاض الصالحین/١ل-٢١٧ز-٣٠+ریاض/٤ل-١٣٦١ف-٥٩.

د- عمدة القاري/ج/٢٥ص١٢٧+١٣٠+١٢٣حدیث/٦٥.

هـ- فتح الباری ج/١٣ص٤٧٣ حدیث رقم: ٧٥٠٩+٧٥١٠+ ٧٥١٧ص٤٥٢-ص٤٦١.

**تێبینی**:

(ص و ج) نیشانەی ئەصلە عەرەبیەکانی (تاجو ریاضو تەجریدو فیقهی ئاسان) ە. ج= جلد، ص= صەحیفە، ل= لاپەڕە، نیشانەی وەرگەڕاوە کوردییەکەیانە. ز= زنجیرە، ژ= ژمارە. ئەمە لەهەموو شوێنێ وایە.

١٠٤١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّ عُمَرَ تَصَدَّقَ بِمَالٍ لَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ يُقَالُ لَهُ ثَمْغٌ وَكَانَ نَخْلاً فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي اسْتَفَدْتُ مَالاً وَهُوَ عِنْدِي نَفِيسٌ فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (تَصَدَّقْ بِأَصْلِهِ لا يُبَاعُ وَلا يُوهَبُ وَلا يُورَثُ وَلَكِنْ يُنْفَقُ ثَمَرُهُ) فَتَصَدَّقَ بِهِ عُمَرُ فَصَدَقَتُهُ تِلْكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَفِي الرِّقَابِ وَالْمَسَاكِينِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَلا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ بِالْمَعْرُوفِ أَوْ يُوكِلَ صَدِيقَهُ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ بِهِ) (الحديث ٢٧٦٤).

**ئیبنوعومەر**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: عومەر**(رەزای خوای لێ بێ) **زەوییەکی دەست کەوت، لەبەرابەر مەدینە بوو، ناوی ثەمغ بوو، بری بوو لەباخە خورمایێ، کات سەردەمی پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **بوو، ڕۆیشتە خزمەتی، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ماڵێکی زۆر چاکم دەست کەوتووە، دەمەوێ بیکەم بەخێرو، تۆ دەفەرمووی کە بیکەم بەچی؟ فەرمووی: (ئاوا بیکە بەوەقف: جێ زەویەکە خۆی وەقف بێ، نەدەفرۆشرێ، نەدەبەخشرێ، نەبە کەلەپوور دەگیرێ، بەڵام دەرامەتەکەی دەبەخشرێ بەپێشیاوانی).**

**ئیتر عومەریش لەسەر ئەو شێوەیەی کەپێغەمبەر پیشانی دا: جێ زەوییەکەی کرد بەوەقفو دەرامەتو دەسکەوتەکەی کرد بەخێر، وەئەو خێرەش بۆ ئەم چەشنانە - واتە: سینفانە- بێ: بۆ خەباتگێڕانو تێکۆشەرانی ڕێگەی خوداو، بۆ ئازادکردنی کۆیلەو بۆ نەداراو هەژارانو بۆ میوانو، بۆ ڕێبوواران و، بۆ خزمانو خوێشانێ پێشیاو، وەئەو کەسەیشی کەسەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکا، کە پێی دەگوترێ: (متولي) گوناهی لەسەر نییە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەوا خۆی لێی بخوا، یا دەرخواردی دۆستو برادەری خۆی بدا، بەمەرجێ لێ ی نەکا بەهی خۆیو نەیکا بەماڵو پاشەکەوتی بکا.** (تاج/٢/٣٧٥ف-٢ز-١٨٢. باسی وەقف + ز-١٨١) + (فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، ل-٥٤١، باسی وەقف ز-٢٣٥).

١١٤٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاتِ) (الحديث ٢٧٦٦، طرفاهُ في: ٥٧٦٤، ٦٨٥٧) (٢٠٠).

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **لە خۆشەویستەوە**(دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (خۆتان دووربگرن لەحەوت تاوانی کوشندە) **یاران**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرموویان:** قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو حەوتە چیو چین؟ فەرمووی: (یەکەم: شیركو هاوبەش پەیداکردن بۆ خودای تاكو تەنیا، دووەم: سیحرو جادووبازی، سێهەم: کوشتنی کەسێ کە خودا رەزای لەسەر نەبێ، چوارەم: سوود خۆری، پێنجەم: خواردنی ماڵی هەتیو، بەبێ فەرمانی شەرع، شەشەم: هەڵهاتنو پشت هەڵکردن لەدوژمنی دین لەرۆژی هێرش هێنانی دوژمنانا، حەوتەم: بوختانی داوێنپیسی هەڵبەستن بۆ ژنی داوێنپاکی بێ ئاگای موسوڵمان) (تاج/٣/٢٠٤ف-٨-ش/د/ن).

١١٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَارًا مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمَئُونَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ) (الحديث ٢٧٧٦، طرفاهُ في: ٣٠٩٦، ٦٧٢٩) (٢٠١).

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست**(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسو کاری من -لەپاش مردنی من- پارەو پوول دابەش ناکەن، هەرچیم لەپاش بەجێما خێرو خێراتە، تەنیا ژێواری ژنەکانمو ئازووخەی سەرکارەکەمی لێ دەرچێ) (تاج/٢/٢٤ز-١٠. باسی ماڵی پێغەمبەر لەپاش خۆی بۆ نەتەوەکەیەتی. نەك بۆ کەلەپووربەرانی).

---

(٢٠٠) أخرجه مسلم في الإيمان باب: بيان الكبائر و أكبرها، رقم: ٨٩.

(٢٠١) أخرجه مسلم في الجهادو السير، باب: (لا نورث ما تركناه صدقة) رقم: ١٧٦٠.

١١٤٤- عـنْ عُثْمَـانَ (رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ) حِـينَ حُوصِـرَ أَشْـرَفَ عَلَـيْهِمْ وَقَالَ أَنْشُدُكُمْ اللّٰهَ وَلا أَنْشُدُ إِلاّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) : أَلَـسْتُمْ تَعْلَمُـونَ أَنَّ رَسُـولَ اللّـهِ (صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: (مَـنْ حَفَـرَ رُومَةَ فَلَهُ الْجَنَّةُ) فَحَفَرْتُهَا أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ قَـالَ: (مَـنْ جَهَّـزَ جَـيْشَ الْعُـسْرَةِ فَلَـهُ الْجَنَّةُ) فَجَهَّزْتُهُمْ قَالَ: فَصَدَّقُوهُ بِمَا قَالَ) (الحديث ٢٧٧٨) [(٢٠٢)].

ئەو رۆژانەی کە پێشەوا عوثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) لەماڵەکەی خۆیدا لەلایەن ئاژاوەگێڕەکانەوە گەمارۆ درابوو، کەلەمیسرەوە هاتبوون، لەبانێژیەکەوە گفتوگۆی لەگەڵیانا کردو فەرمووی: (سوێندتان دەدەم بەخودای گەورە، تەنیا ئەو بەڕێزانەیشتان سوێند دەدەم کە هاوڕێی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوون، چونکە ئەوان هەمیشە شایەتی هەق دەدەن: ئایا ئاگاتان لێ نییە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ بیری رۆمە هەڵکەنێ بەهەشتییە) منیش لەسەر مەسرەفی خۆم هەڵم کەند؟ ئایا ئاگاتان لێ نییە کەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ جەیشولعوسرە تەدارەك بکا بەهەشتییە) منیش ئەو جەیشەم تفاق خست؟ قسەبەر (راوي) فەرمووی: هاوڕێیانی پێغەمبەریش، فەرموویان: بەلێ ئەم قسانەی عوثمان راستە) (تاج/ ٢/ ٣٧٧ف-٢از-١٨٣ وەقف +تاج / ٤٩/٥ز-٨ - فەزڵی عوثمان).

١١٤٥-عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما) قَالَ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ مَعَ تَمِـيمٍ الـدَّارِيِّ وَعَـدِيِّ بْـنِ بَـدَّاءٍ فَمَـاتَ الـسَّهْمِيُّ رضـي الله عنـهُ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ فَلَمَّا قَدِمَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامًا مِنْ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا مِنْ ذَهَبٍ فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ وُجِدَ الْجَامُ بِمَكَّةَ فَقَالُوا: ابْتَعْنَاهُ مِـنْ تَمِـيمٍ وَعَـدِيٍّ فَقَـامَ رَجُـلانِ مِـنْ أَوْلِيَائِـهِ فَحَلَفَـا لَـشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَإِنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ.

---

(٢٠٢) لم يوافقه مسلم على تخريجه، (فتح/٥/٤١٤- خاتمة كتاب الوصايا) - المترجم.

قَالَ: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ تَحْبِسُونَهُمَا مِنْ بَعْدِ الصَّلاَةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لاَ نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَلاَ نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَمِنَ الآثِمِينَ۝فَإِنْ عُثِرَ عَلَى أَنَّهُمَااسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَمِنَ الظَّالِمِينَ۝ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَى وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَنْ تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ المائدة/١٠٦-١٠٨-٥) (الحديث ٢٧٨٠) [٢٠٣].

ئیبنو عەبباس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی بەنی سەهمی لەگەڵ تەمیمی داریو عەدی کوڕی بەداءدا، دەچن بۆ ڕەوتەنی(سەفەر) بۆ بازرگانی بۆ شام، کابرای بەنی سەهمی لەرێ دمرێ، لەشوێنێ دەمرێ موسوڵمانی تیادا نابێ، کاتێ دوو پیاوەکەی هاوڕێی کەلەپوورەکەیان هێنایەوە بۆ کەسووکارەکەی، جامێکی زیوین دیارنەبوو، کەبەوێنە لەسەر شێوەی پەلکە خورمای زێڕین نەخشابوو، جا کاتێ بوو بەداواو داواکاری، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەردووکیانی سوێنددا، کەئاگامان لەو جامە نییە.

دوایی جامەکە لەمەککە بەسەر گیرایەوە، ئەوانەی جامەکەیان لەلا دۆزرایەوە گوتیان: لەتەمیمی داریو عەدی کوڕی بەداءمان کڕیوە، دیسانەوە بۆوە بەکێشە، جا ئەمجار دوو کەس لەخزمانی یارۆی سەهمی کوژراو هەڵسان سوێندیان خواردو گوتیان: بەخوا شایەتییەکەی ئێمە راست ترە لەشایەتییەکەی ئەو دووانە، وەجامەکە جامی خزمەکەمانە.

(٢٠٣) لم يوافقه مسلم على تخريجه (المصدر السابق) - المترجم.

ئیبنو عەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەم ئایەتە سەبارەت بەوان دابەزی کەدەفەرموێ: ﴿یاأیها الذین آمنوا...﴾ تا کۆتایی، کەئێستا خوێندرایەوە. واتە: ئەی نەتەوەی ئیسلام! یەکێ لەبڕیارەکانی ئیسلام ئەمەیە: کاتێ کەسێکتان لەسەرەمەرگا ویستی وەسێتو ڕاسپێری شەرعی بکات،با دووپیاوی دادپەروەر لەخۆتان ئامادەی ئەو ڕاسپێرییە ببنو ببن بەشایەت لەسەریو لەکاتی پێویست دا، ئەو شایەتییە بدەن، یا دووپیاوی تری ناموسوڵمان بکەن بەشایەت لەسەر ئەو ڕاسپێرییە.

ئەم جۆرە شایەتییە بۆ کاتی سەفەرە، ئەگەر کەسێکتان کارەساتی مەرگ یەخەی گرت لەسەفەردا، ئەو دوو شایەتە لەپاش نوێژی عەسر، کەخەڵک لەو کاتەدا کۆدەبنەوە، ئەگەر لێیان کەوتنە گومانەوە ڕابگرن، ئاوا سوێند بخۆن: سوێند دەخۆین بەخودای پاکو پیرۆز ئەم شایەتییەی کەدامان ڕاستەو درووستەو، مەبەستمان پێی خزمەتی ڕاستییە، نەوەك شتێ تر، وەبەجێ بەجێ کردنی ئەم شایەتییە مەبەستمان ئەوەنییە کەبەهایەکی کەمی جیهانی پێ بەدەست بهێنین، باخاوەن پەیوەندی سوودوەرگر لەم شایەتییەی ئێمە خزمیش بێ، ئەو شایەتییەی خودا خستوویەتیە ئەستۆمان زایەی ناکەینو حەشاری نادەین... تا کۆتایی.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

تەمیمی داری (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێشا مەسیحی بوو، لەساڵی نۆی کۆچیدا موسوڵمان بوو، موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، غەزای لەخزمەت پێغەمبەردا کردووە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) داستانی جەساسەو جەجاڵی لەوەوە گێڕاوەتەوە، وەئەوە دادەنرێ بەگەورەترین شانازی بۆی.(بڕ: تاج/١٠ل-٣٠٥ف-١از-١١٠).

یەکەم کەس بوو کەچرای لەمزگەوت داگیرساند، یەکەم کەسیش بوو کەچیرۆك و داستانی گێڕایەوە، بەشەو شەونوێژی زۆری دەکرد، رووداني ئەم داستانەی وا لەم فەرموودەیەدا، سەبارەت بەم جامە لەپێش ئیسلام بوونی تەمیما بووە. جاری وا دەبوو لەیەك ركات شەوبنوێژدا هەموو قورئانی خەتم دەكرد! هەمیشە شەونوێژێکی زۆر زۆری دەکرد شەوێ تابەیانی هەر بەم ئایەتە شەونوێژی دەكرد، لەهەموو رکاتێکا لەپاش فاتیحەوە دووبارەی دەکردەوە:

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ -جاثية ٤٥/٢١-.

واتە: بابێ باوەڕان کە ئەو هەموو کوفرو بەدکاریو خراپەیان تێ گوشیوە، کەچی باوەڕیشیان وایە: کەئەوانو موسوڵمانان کە ئەو هەموو کردەوە باشانەیان کردووە، لەدنیاو قیامەتدا بەیەك چاو تەماشایان بکەین؟! با بێ باوەڕان خۆیان بەمجۆرە بۆچوونە هەڵەیە دەستخەڕۆ نەکەن بەراستی ئەمە بڕیارێکی زۆر خراپو هەڵەو چەوتە. لەپاش کوشتنی عوثمان تەمیم رۆیشت بۆ شام، وە لەوێ مرد، گۆڕی والە بەیت جەبرین، لەوڵاتی فەلەسطین، حەزرەتی عومەر زۆر رێزی دەگرت.

## پایانێ (خاتمة)

نامەی راسپێریو پاشکۆکانی هەتا ئێرە،شەست فەرموودەی بەرزەوە بووی واتیادا، هەژدە رێگەیان بێ ڕشتەن، ئەوانی تریان پەیوەستن، چلودوویان دووبارەن، پوختەکەیان هەژدە فەرموودەن، پێشەوا موسلیمیش هەموویانی دەرهێناوە، بێجگە لەمانەیان:

١- فەرموودەکەی عەمری کوڕی حاریث: (١١٣٧ت = ٢٧٣٩ف).

٢- فەرموودەكەی ئیبنوعەبباس: (كـان المـالُ للوَلَـدِ = ٢٧٤٧ف) لـە (ت) نییە.

٣- فەرموودەكەی ئیبنوعەبباس: (١١٤٥ت=٢٧٨٠ف).

٤-فەرموودەكەی ئیبنوعەبباس: (هُما واليانِ=٢٧٥٩ف) لە (ت) نییە.

٥- حديث: (الدَّين قبلَ الوصيّةِ=٢٧٨١ف) لە تەجریدەكەدا نییە.



# ٦٠-نامەی خەبات وتێكۆشان و غەزاو ژیننامە

# (كتابُ الجهادِ والسِّير)

## ١-باسی گەورەیی خەبات و غەزاكردن و ژیننامە

(باسی خەبات و تێكۆشان وا لەسەرەتای بەرگی هەشتەمی تاجول ئوصولەوە، بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم ل-٨٦٥ ز-٣٤٦- باسی غەزاو تێكۆشان).

١١٤٦- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ قَالَ: ( لا أَجِدُهُ) قَالَ: (هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ فَتَقُومَ وَلا تَفْتُرَ وَتَصُومَ وَلا تُفْطِرَ؟) قَالَ: وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ ). (الحديث ٢٧٨٥) (٢٠٤).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی كرد: قوربان! چی كارێكی باشی تر هاوتای تێكۆشان لەڕێگای خودای گەورەدا دەكا؟ فەرمووی: (كاری وا گومان نابەم). ئەوجا بەپیاوەكەی فەرموو: (ئایا دەتوانیت ئەو كاتەی كەخەباتكار دەڕوات بۆ

---

(٢٠٤) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: فضل الشهادة في سبيل الله تعالى، رقم: ١٨٧٨.

خەباتكاری، تۆیش بچیتە ناو نوێژگەکەت‌و سەرو مڕ نوێژو شەونوێژ بکەیت بەبێ ساردبوونەوە بەرۆژیش هەر بەرۆژوو بی‌و یەك رۆژی لێ نەخۆی) پیاوەکە گوتی: جا کێ شتی‌وا دەتوانێ؟. (تاج/٨/٤٧ف-٣-ش/ت/ن) +(ریاض/٣ل-٩٤٨ز-٢٣٤ باسی جیهاد).

١١٤٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ) قَالُوا: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنْ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللّٰهَ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ). (الحديث ٢٧٨٦، طرفُهُ في: ٦٤٩٤)[٢٠٥].

ئەبوسەعیدی خودری(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) : چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی کە بەگیان‌و سامان‌و بەسەرو بەماڵ لەڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ) گوتیان: ئەی دوای ئەو کێ چاکترین کەسە؟ فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی کە لەپەنایەکا سەری خۆی کز دەگری‌و، بەجوانی خودای خۆی دەپەرستێ، وەلە خودای گەورە دەترسێ‌و ئازاری کەس نادات. (تاج/٨/٤٩-٦-ش/د/ت).

١١٤٨-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَاللّٰهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ وَتَوَكَّلَ اللّٰهُ لِلْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِهِ بِأَنْ يَتَوَفَّاهُ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرْجِعَهُ سَالِمًا مَعَ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ). (الحديث ٢٧٨٧)[٢٠٦].

---

(٢٠٥) أخرجه مسلم في الإمارة باب: فضل الجهاد والرباط... رقم: ١٨٨٨.

(٢٠٦) أخرجه مسلم (فتح/٦ص ١٩٥- خاتمة كتاب الجهاد ) - المترجم.

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە خۆشەویستی خودا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (وێنەی کەسێ لە ڕێگەی خودادا بچێ بۆ خەبا تو کۆشش و،ببێ بە تێکۆشەر لە ڕێگەی خودادا، وەك وێنەی ئەو کەسە وایە کە هەتا ئەو دەگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی،ئەویش سەرو مڕ هەر نوێژ بکا و، هەمیشە بەڕۆژو بێو،یەك دەم چی یە لە نوێژو ڕۆژو سارد نەبێتەوە.

وە خودا بووە بە دەستەبەر ی خەباتکاری ڕێگەی خودا،کە یەکێ لەم دووبەهرە گەورەی بۆ دا بین‌و مسۆگەر بکات: ئە گەر خودا لەو کاتی خەباتەدا گیانی کێشا یەکسەر بیباتە ناو بە هەشت،ئەگەر بە بێوەیش‌و بەساغی گەڕانیەوە یەکێ لەم دوو بەهرەیە یا بەلایەنی کەمەوە بەهرەیەکیانی دەست بخات: پاداشتی باشی پێ خەلات بکات،یا پاداشت‌و دەسکەوتی تالانی پێ خەلات بکات).

١١٤٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَصَامَ رَمَضَانَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ هَاجَرَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلا نُنَبِّئُ النَّاسَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ) (الحديث ٢٧٩٠، طرفُهُ في: ٧٤٢٣) [٢٠٧].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) - فەرمووی (هەر کەسێ بڕوای بەخوداو، بە پێغەمبەری خودا هەبێ، نوێژ بکاو، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، دەبێ بە ماف لەسەر خودا کە بیباتە ناو بە هەشت، ئیتر چی

(٢٠٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (المصدر السابق) – المترجم.

خەباتو غەزا لە ڕێگەی خودادا بکات، یا لەو خاکەی تیایدا لەدایك بووە دانیشێو نەچێ بۆ غەزا).

هاوڕێیان(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئەم مژدە خۆشە لە ناو مەردوومدا پەخشەوە نە کەین، وە پێیان ڕابگەیەنین ئەگەر دەریش نەچن بۆغەزا، مادام باوەڕیان هەیەو نوێژ دەکەنو ڕۆژو دەگرن، خودا بەهەشتیان پێخەلات دەفەرموێ؟ خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕاستە ئەمە وایە، بەلام لەوە گەلێ باشتر هەیە کە ئەوەیە: لە بەهەشتدا سەد پلەی بەرێزی بەرز هەیە کە نێوانی هەموو دووپلەیەکی بە قەد نێوانی ئاسمانو زەوی دەبێ، خوودای گەورە ئامادەی کردوون بۆ تێکۆشەرانو غەزاکاران لەڕێگەی خودادا،دەی کاتێ لە خودای گەورە داوای جێگە لە بەهەشتا دەکەن داوای فیردەوسی هەرە بالای لێبکەن، کە نایابترینو بەرزترین شوێنە لە بەهەشتدا، سابەشکو بە هۆی نزاو پاڕانەوەوە فیردەوس بۆ خۆتان بپچڕن، گەرچی خۆی لە بنەڕەتدا بۆ غەزاکاران دانراوە، وە لە ژوور فیردەوسەوە بارە گای (عەرش) ی خودای گەورەو بەخشندەو میهرەبانە، وە لەبن فیردەوسەوە هەرچوار ڕووبارە گەورە ناودارەکانی بە هەشت هەڵدە قوڵێن) (بڕوانە: تاج/٤٩/٨-٨-ز-١١+تاج/٤٢٩/١٠ز-١٣٣هەتا لاپەڕە /٤٨٦ باسەکانی بەهەشت) +(ریاض ٩٥٠/٣ف ز –١٦. باسی جیهاد).

١١٥٠–عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا) (الحديث٢٧٩٢، طرفُهُ في: ٢٧٩٦، ٦٥٦٨) [٢٠٨].

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ( تاقێ کۆششو تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا –چی تاقی

(٢٠٨) أخرجه مسلم في الإمارة باب: فضل الغدوة و الروحة في سبيل الله، رقم: ١٨٨٠.

بەیانی بۆو،چی تاقی ئێوارە بێ، لە هەموو سامانو موڵکی جیهان چاکترە) (تاج/٨/٤٨ز-١١ف-٤) +(ریاض/٣/ل-٩٤٣ف-٤,٦).

١١٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لَقَابُ قَوْسٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ) وَقَالَ: (لَغَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ) (الحديث ٢٧٩٣، طرفُهُ في: ٣٢٥٣) (٢٠٩).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەقەی جێ کەوانێ لەبەهەشتا لەهەموو جیهان باشترە، وە فەرمووشی: تاقێ کۆشش‌و غەزاو تێکۆشان لەرێگەی خودادا -چی تاقی بەیانی بۆو چی تاقی ئێوارە بێ- لەهەموو سامانو موڵکی جیهان چاکترە!). (تاج/٨/٤٨/٤ز-١١-ش/ت/ن).

## باسی پەرییە چاو بەڵەکانو چۆنیەتی شێوەی شیرینیان

١١٥٢- عنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ علَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ لأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلأَتْهُ رِيحًا وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا) (الحديث: ٢٧٩٦) (٢١٠).

لەئەنەسەوە(رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر بێتو ئافرەتێ لەدانیشتوانی بەهەشت خۆی نیشانی دانیشتوانی سەر زەوی بدا، لەبەر شەوقی ئەو نێوانی بەهەشتو زەوی هەمووی رۆشن دەبێتەوە،

(٢٠٩) أخرجه مسلم في الإمارة باب: فضل الغدوة.. في سبيل الله، رقم: ١٨٨٢.

(٢١٠) لم يوافقه مسلم على تخريجه – المترجم.

وەپڕی دەبێ لەنوورو بۆنو بەرامەی خۆش! سەرپۆشی سەری ژنی بەهەشتی باشترە لەجیهانو هەرچی وا لە جیهانا!). (تاج٨/٤٨/٥ز-١١).

١١٥٣-عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ فَلَمَّا قَدِمُوا قَالَ لَهُمْ خَالِي: أَتَقَدَّمُكُمْ فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِلاَّ كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا فَتَقَدَّمَ فَأَمَّنُوهُ فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَطَعَنَهُ فَأَنْفَذَهُ فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ فَقَتَلُوهُمْ إِلاَّ رَجُلاً أَعْرَجَ صَعِدَ الْجَبَلَ قَالَ هَمَّامٌ فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلام النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ فَكُنَّا نَقْرَأُ: (أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ فَدَعَا عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لَحْيَانَ وَبَنِي عُصَيَّةَ الَّذِينَ عَصَوْا اللَّهَ تعالى وَرَسُولَهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٨٠١، أطرافُهُ سبقت في: ٥١٥)[٢١١].

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) حەفتا کەسی نارد بۆ ناو بەنی ریعلو بەنی ذەکوانو بەنی عوصەییە، چەند پیاوێکی بەنی سولەیمیان تێدا بوو، جا کاتێک دەگەنە پێشەوە، جا حەرامی کوڕی میلحانی خاڵۆم پێیانی فەرموو: ئێوە لێرە چاوەڕوان بن من خۆم لەپێشا دەڕۆم بۆ ناویان، دەمو دوویان تاقی دەکەمەوە جا ئەگەر ئەمانیان پێ دام، ئەوا نامەکەی پێغەمبەریان پێ رادەگەیەنم لەگەڵ پەیامەکەی دا، خۆ ئەگەر ناپاکیشیان لێ کردم، ئەوا ئێوە لەنزیکمەوەبن، بەشتەکە دەزانن ئیتر بەپێی هەڵوێست یاکۆمەکی من دەکەن، یا هەر هیچ نەبێ هەڵدێنو رادەکەنو ئێوە قوتارتان دەبێ.

---

(٢١١) أخرجه مسلم في الإيمان باب: ثبوت الجنة للشهيد، رقم: ٦٧٧

جا كاتێ خالّم چووه پێشەوه بەدرۆ بەفێل ئەمانیان پێ دا، وەدەستی کرد بەڕاگەیاندنی کاغەزو پەیامەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەناو خۆیان دا، ئاماژەیان لەپیاوێکیان کرد رمێکی لەپشتەوه لێ دا، لەسنگیەوه دەرچوو. جا خالّم فەرمووی: اللهأكبر! گەورەیی هەر بۆ خودایە، بەخودای گەورە، بەخاوەنی کەعبە، شادبووم بەشەهید بوون،و گەیشتم بەئاواتی خۆم و پیرۆز بووم، ئەوجا هۆزی بەنی عامر دەنیشنە سەر تاقمەکەی حەرام و هەر حەفتایان دەکوژن، تەنیا پیاوێکی شەلیان نەبێ کە هەڵدەزنێ بەکێوەکەداو خۆی دەگەیەنێتە لوتکەی کێوەکە. جا جوبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ) هەواڵی بەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دا، کە ئەو شەهیدانە گەیشتوون بەخزمەتی خودای خۆیان و خودا لەوان رازییەو، ئەوانیش رازی کردووه.

جا خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئەمەی نارده خوارەوه، وەتا ماوەیێ لەناو قورئاندا ئەمانخوێند، تادوایی خودا سڕیەوەو نەسخی کردەوه، ﴿أنْ بلّغوا قَومَنا، أنْ قدْ لقِينا ربَّنا فرضيَ عنَّا وأرضانا﴾ واتە: خودایە! هەواڵی حاڵمان رابگەیەنە بەگەلی ئیسلام، کەوا ئێمە شادبووین بەدیداری پەروەردگارمان، وەخوا لێمان رازییەو رازیشی کردوین.

جا لەوەدوا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) چل بەیانی نزای شەڕی لەناو قونوتا، لەم هۆزانە کرد: لە ریعل و لەذەکوان و لەبەنی لەحیان و لەبەنی عوصەییە، کەئەوانەن لەم رووداوەدا لە خوداو لەپێغەمبەری خودا یاخی بوون. (بڕوانە: تاج/٨/٢٥٤ف١+٢ز-١٠٢ هەناردنی حەفتاکەسە قورئانخوێنەکان + ریاض/٣/٩٥٧ف-٣٢ز-٢٣٤. باسی خەبات و...).

١١٥٤ - عَنْ جُنْدَبِ بْنِ سُفْيَانَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي بَعْضِ الْمَشَاهِدِ وَقَدْ دَمِيَتْ إِصْبَعُهُ فَقَالَ: هَلْ أَنْتِ إِلاّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ مَا لَقِيتِ ) (الحديث ٢٨٠٢) [٢١٢].

---

(٢١٢) أخرجه مسلم في الجهاد والسير باب: ما لقي النبي(درودی خوای لەسەر بێ) من أذى المشركين، رقم: ١٧٩٦.

جوندوبی كوڕی سوفیان(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووم لەغەزایەكا لەناو ئەشكەوتێكا، پەنجەیەكی حەزرەت زامار بوو، خوێنی لێ هات پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) بۆ دڵدانەوەی پەنجەی، هەتا ئۆقرە بگرێ لەسەر ئێش‌و ئازارەكەی فەرمووی:

هلْ أنتِ إلاّ إصبعٌ دميْتِ        وفي سبيلِ اللهِ مالَقيتِ

واتە بەشیعر لەدەریاكەی خۆی كە رەجەزە:

ئەی پەنجە وایە پایەو شوێنت        لەڕێی خودادا وارژا خوێنت

مەبەستی خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) ئەوەیە، كە لەسەر شێوەی موعجیزە دڵی پەنجەی خۆی بداتەوەو، تێی بگەیەنێ ئەو ئێش‌و ئازارەی كە پێی گەیشتووە لە چاو هی تردا هەر زۆر كەمە لەگەڵ ئەوەشدا بەخۆڕایی ناڕوا، خوا بۆی حسێب دەكا بەتێكۆشان لەڕێگەی خۆیدا. (بڕوانە: تاج/٧/٢٥٥ز-٧٦-سورەتی ضوحی. ف-٢ +تاج/١٠/١٧٢ز-٦٩ف-١)

جوندوبی كوڕی سوفیان ناوی تەواوی جوندوبی كوڕی عەبوڵڵای كوڕی سوفیانی بوجەیلییە، بەدوو شێوە گێڕانەوەی لێوە دەكرێ: جوندوبی كوڕی عەبدوڵڵا بەناوی باوكیەوە، جوندوبی كوڕی سوفیان بەناوی باپیریەوە. ئەم جۆرە وردەكارییانە پەیوەندی زۆری بەزانستی فەرموودەوە هەیە. كورتەیەكی كەمیش لەژیاننامەی جوندوب لە ژمارە: (٦٤٨) دا رابوورد.

١١٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ إِلاّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ) (الحديث ٢٨٠٣، سبق طرفاهُ في رقم: ١٧٠ في المجلد الأول) [٢١٣].

(٢١٣) اخرجه مسلم في الجهاد باب: فضل الجهاد (صح/١٣ص٢١. وقال العسقلاني: وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٦/١٩٦- خاتمة كتاب الجهاد) - المترجم.

واتاو مەبەست لەم فەرموودەیە لەژمارە (١٧٠) دا رابوورد (ریاض/٣/٩٤٦).

١١٥٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ غَابَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قَاتَلْتَ الْمُشْرِكِينَ لَئِنْ اللَّهُ أَشْهَدَنِي قِتَالَ الْمُشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ مَا أَصْنَعُ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ وَانْكَشَفَ الْمُسْلِمُونَ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلَاءِ يَعْنِي أَصْحَابَهُ وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلَاءِ يَعْنِي الْمُشْرِكِينَ.

ثُمَّ تَقَدَّمَ فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ: يَا سَعْدُ بْنَ مُعَاذٍ الْجَنَّةَ وَرَبِّ النَّضْرِ إِنِّي أَجِدُ رِيحَهَا مِنْ دُونِ أُحُدٍ قَالَ سَعْدٌ: فَمَا اسْتَطَعْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا صَنَعَ قَالَ أَنَسٌ: فَوَجَدْنَا بِهِ بِضْعًا وَثَمَانِينَ: ضَرْبَةً بِالسَّيْفِ أَوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ أَوْ رَمْيَةً بِسَهْمٍ وَوَجَدْنَاهُ قَدْ قُتِلَ وَقَدْ مَثَّلَ بِهِ الْمُشْرِكُونَ فَمَا عَرَفَهُ أَحَدٌ إِلاَّ أُخْتُهُ بِبَنَانِهِ قَالَ أَنَسٌ: كُنَّا نُرَى أَوْ نَظُنُّ: أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَشْبَاهِهِ: ﴿مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾. إِلَى آخِرِ الآيَةِ (الحديث ٢٨٠٥، طرفاهُ في: ٤٠٤٨، ٤٧٨٣).

وَقَالَ إِنَّ أُخْتَهُ وَهِيَ تُسَمَّى الرُّبَيِّعَ كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ امْرَأَةٍ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْقِصَاصِ فَقَالَ أَنَسٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لا تُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا فَرَضُوا بِالأَرْشِ وَتَرَكُوا الْقِصَاصَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ) (الحديث ٢٨٠٦) [٢١٤].

ئەنەسی کوڕی مالیک(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مامەم ئەنەسی کوڕی نەضر(رەزای خوای لێ بێ) ئامادەی غەزای بەدر نەبوو، لەبەر ئەوە عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکەم جەنگێ کە تۆ لەگەڵ بێباوەڕاندا کردت بەنسیبم نەبوو، کە هاوبەشی ئەو جەنگە پیرۆزەیە بکەم،

(٢١٤) أخرجه مسلم في القسامة باب: إثبات القصاص في الأسنان وما في معناها، رقم: ١٦٧٥، الإمارة، باب: ثبوت الجنة للشهيد، رقم: ١٩٠٣.

جا ئەگەر خودا فرسەتی دامو ئامادەی جەنگی تر بووم لەئاییندەدا لەگەڵ کافرەکانا، ئەو کاتە خودای گەورە دەمبینێ کەچۆن جەنگێ دەکەم، جا کاتێ رووداوی ئوحود هاتەپێش زۆربەی موسوڵمانەکان شکانو دەوری حەزرەتیان چۆڵ کرد، مامەم فەرمووی: خودایە! من پۆزش خواهی دەکەمو عوزر دەهێنمەوە بۆ تۆ لەوەی کە ئەم موسوڵمانانە کردیان،و بەداخەوە ئەم هاوڕێ نازدارانەی من لەم جەنگەدا کەشەڕی مانو نەمانو تێکشکانە هەڵهاتن!

وەبەرێو بەدووریشم لەخزمەتی تۆدا لەم کارە ناشیرینو نامەردییە کە ئەم کافرانە دەربارەی پێغەمبەری تۆ کردیان، پاش ئەمە شێرانە هەڵمەتی بردو چووە پێشەوە بۆ ناو کۆڕی شەڕو دەستی کرد بەجەنگینو شەڕێکی دلێرانەی کردو نەبەزیو وازی نەهێنا هەتا کوژراو شەهید کرا.

جا لەکاتی هێرش برندا سەعدی کوڕی موعاذ، رووبەرووی دیو بەرەودوا رادەکا، مامەم پێی دەڵێ: ئەی سەعدی کوڕی موعاذ! بەهەشتم دەوێ ئەڵهای بەهەشت دەکەم، سوێندم بەخودای نەضری بابم، لەلای ئوحودەوە بۆنو بەرامەی بەهەشت دێ بەسەرم دا!!

سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا!ئەوەی ئەو کردی لەتوانای من دا نەبوو، ئەنەسی برازای فەرمووی: هەشتاو ئەوەندە جێی دەمەشێرو شوێن رمو جێگەتیرمان پێوە دۆزییەوە، کاتێ دۆزیمانەوە کوژرابوو، کافرەکان ئەتکیان کردبوو، جەستەیان شێواند بوو، کەس نەیناسییەوە روبەیعی خوشکی نەبێ، کەپووری من بوو، ئەویش بەسەرە پەنجەکانیا ناسیەوە.

ئەنەس فەرمووی: بەبۆچوون وبیروباوەڕی ئێمە لەوو لەوێنەی ئەودا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کەبەیان حاڵی ئەوی واتیادا، کە دەفەرموێ: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً﴾.

ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو خوشکەی مامە ئەنەسم کەمن بەناوی ئەوەوە ناونراوم، کەئەو خوشکەی ناوی روبەییع بوو، ددانە دووینەی ژنێکی شکاند بوو، کاتێ بوو بەشکاتو شکاتکاریو سکالا برایە لای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەستووری دا بەتۆڵە سەندنەوەو فەرمووی: دەبێ لەبریتی ئەوە ددانی روبەییعیش بشکێنرێ. ئەنەسی براشی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەو کەسەی کە تۆی بەراستی کردوە بەپێغەمبەری خۆیو بەم ئایینە راستو دروستەوە رەوانەی کردووی، پشت بەکەرەمی خودا ددانی ئەم خوشکەم ناشکێنرێ. جا لەپاش هەوڵو کۆششی ئاشتیانە، کەسوکاری ژنەکە بەخوێنی ددانەکە قاییل بوون،و وازیان لەتۆڵە سەندنەوە هێنا.

پێغەمبەریش بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (خودای گەورە بەندەی باشی وای هەیە، ئەگەر ورك لەخودا بگرێو سوێندی لێ بخوات، کەدەبێ فیسارە ئیشم بۆ بکەیت، خودا دڵی ناشکێنێو ئیشەکەی بۆ دەکات، وەك ئەم سوێندەی ئەنەس خواردی کە ددانی خوشکەکەی ناشکێنرێ). (بڕوانە تاج/٧/ل-٨٩-٤-سوورەتی ئەحزاب ز-١٦+بەرگی ٨/٢١٢+تاج/٨/١٠٨-٣ز-٣٥) + (ریاض/١/١١٢ف-١٠٩+٣ل-٩٥٨).

## راڤەو شیکردنەوە:

مامۆستا ئەحمەد کوڕی عەلی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی – ڕەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ - دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە ئەم بەهرانەی واتیادا: خۆبەخت کردنو گیان کردن بەقوربانی لەکاتی غەزاو جەنگی بێباوەڕاندا کارێکی رەواو پەسەندە، تەنانەت دەبێ بەبەڵگەو نیشانەی دامەزراندنی باوەڕی تەواو. وەبەر ئەو نەهیە ناکەوێ کە کراوە لەخۆفڕێدانە ناو سەرتیاچوونەوە. کە دەفەرموێ: ﴿ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكةَ﴾.

١١٥٧- عنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ نَسَخْتُ الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ فَفَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ بِهَا فَلَمْ أَجِدْهَا إِلاَّ مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ الَّذِي جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَهَادَتَهُ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ وَهُوَ قَوْلُهُ: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾. (الحديث ٢٨٠٧، أطرافُهُ في: ٤٠٤٩، ٤٦٧٩، ٤٧٨٤، ٤٩٨٦، ٤٩٨٨، ٤٩٨٩، ٧١٩١، ٧٤٢٥) (٢١٥).

زەیدی کوڕی ثابیت(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو کاتە، کەلەسەر فەرمانی حەزرەتی عوسمان، کە قورئانمان کۆکردەوەو چەند دانەیەکمان لێ ڕوونووس کرد، لەسوورەتی ئەحزاب ئایەتێکم لێ بزر بوو، من خۆم لەبەرم بوو،چونکە گەلێ جار لەپێغەمبەرم دەبیست کەلە ژیانییدا دەیخوێند، جا کاتێ بۆی گەڕاین لەلای خوزەیمەی کوڕی ثابیتی ئەنصاری دۆزیمانەوە، کە ئەم خوزەیمەیە ئەوەندە پیاوێکی حەقانیو ڕاستو دروست بوو، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) شایەتی ئەوی لەباتیی شایەتیی دووپیاو قەبوولْ دەکرد. (تاج/٧-٩٠ف-٥ز-١٦+تاج /٥/٣٣٤- ٢ز-٩٤).

١١٥٨- عنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ مُقَنَّعٌ بِالْحَدِيدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُقَاتِلُ أَوْ أُسْلِمُ؟ قَالَ: (أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ) فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ فَقُتِلَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (عَمِلَ قَلِيلاً وَأُجِرَ كَثِيرًا). (الحديث ٢٨٠٨) (٢١٦).

بەرائی کوڕی عازیب(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەجەنگی ئوحوددا پیاوێ زرێی ئاوادامانی پۆشیبوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من جارێ لەپێشا دەجەنگم لەگەلْ ئێوەدا لەدژی

---

(٢١٥) وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٦/١٩٥- خاتمة كتاب الجهاد) المترجم.

(٢١٦) رواه مسلم في الجهاد، باب: ثبوت الجنة للشهيد (صم/١٣ص٤٣+٤٤) - المترجم.

دوژمنانتان، لەپاشا کەشەڕ تەواو بوو موسوڵمان دەبم؟ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەء، ئەوە نابێ، بەڵام لەپێشا موسوڵمان ببە، ئەوجا بجەنگێ) ئەویش موسوڵمان بوو، وەدەستی کرد بەشەڕکردن هەتا کوژرا.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (کارێ کەمی کردو پاداشێ زۆری برد!) (ریاض/٣/٩٥٣ف-٢٦ز-٢٣٤-باسی جیهاد).

## راڤەو روونکردنەوە:

ئەم پیاوە شەهیدە ناوی عەمری کوڕی ثابیتی ئەشهەلییە، نازناوی ئەصرەمە، ئەم رووداوە گەلێ جار دەکرێ بەمەتەڵو دەگوترێ: (بەبێ ئەوەی یەك سوژدەی بۆ خودا بردبێ دەچێتە بەهەشت!) — رەزاو رەحمەتی خودا لەم شەهیدە بێ -.

١١٥٩- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أُمَّ الرُّبَيِّعِ بِنْتَ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ا وَهِيَ أُمُّ حَارِثَةَ بْنِ سُرَاقَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَتَتْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَلا تُحَدِّثُنِي عَنْ حَارِثَةَ – وَكَانَ قُتِلَ يَوْمَ بَدْرٍ أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرْبٌ – فَإِنْ كَانَ فِي الْجَنَّةِ صَبَرْتُ وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ اجْتَهَدْتُ عَلَيْهِ فِي الْبُكَاءِ؟ قَالَ: (يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي الْجَنَّةِ وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الأَعْلَى) (الحديث ٢٨٠٩، أطرافُهُ في: ٣٩٨٢، ٦٥٥٠، ٦٥٦٧)[٢١٧].

ئەنەسی کوڕی مالیك(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو روبەییعی کچی بەڕاء، کەدایکی حاریثەی کوڕی سوراقە بوو،کە حاریثەی کوڕی لەغەزای بەدردا بەتیرێکی وێڵ شەهید بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگەم باسی حاڵی حاریثەی کوڕمت

---

(٢١٧) وافقه مسلم على تخريجه (فتح/٦/١٩٥- خاتمة كتاب الجهاد) المترجم.

بۆم دەکرد: ئەگەر جێگەی باش بێ و لەبەهەشتا بێ ئەوا سەبووریم دێ و ددان بەخۆما دەگرم، خۆ خوا نەخواستە ئەگەر حاڵی باش نەبێ و جێگەی خراپ بێ، ئەوا هەتا وزەم لێ دەبڕی هەر بۆی دەگریم!

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی دایکی حاریثە! خۆی بەهەشت لەناو بەهەشتەو وان لەناو بەهشتی بەرین دا، لەسایەی رەحمەتی خوداوە بەهۆی شەهید بوونی کوڕەکەتەوە، کوڕەکەی تۆ بەهەشتی هەرەباش و هەرە باڵای بەرکەوتووە، کە ناودارە بەفیردەوسی ئەعلا) (ریاض/٣/ل-٩٥٩ز-٢٣٤. باسی جیهاد).

١١٦٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ الرَّجُلُ: يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) (الحديث ٢٨١٠، أطرافُهُ سبقت في رقم: (١٠٢ت=١٢٣ف) [(٢١٨)].

ئەبو مووسا (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوی وا هەیە بۆ تاڵان و دەستکەوت شەڕ دەکا، پیاوی واهەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕ دەکا، پیاوی واهەیە تا شوێنی دیار بێ و بڵێن ئازایە، لەبەر ئەوە شەڕ دەکا، ئەمانە کامەیان لەبەر رەزای خودایە؟ فەرمووی: (هەرکەسێ شەڕ بکا هەتا شەریعەتی خودا سەربکەوێ ئەوە لەبەر رەزای خودایە) (تاج/٨/ل-٧٢-ش/د/ت/ن ز-١٧).

## خۆ شۆردن سوننەتە لەپاش شەڕو لەپاش تۆز

١١٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا رَجَعَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَوَضَعَ السِّلاحَ وَاغْتَسَلَ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ وَقَدْ عَصَبَ رَأْسَهُ

(٢١٨) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا.. رقم: ١٩٠٤.

الْغُبَارُ فَقَالَ: وَضَعْتَ السِّلاحَ فَوَاللَّهِ مَا وَضَعْتُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (فَأَيْنَ؟) قَالَ: هَا هُنَا وَأَوْمَأَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ قَالَتْ: فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث: ٢٨١٣)(٢١٩).

**عائیشه** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **لەغەزای خەندەق گەڕایەوەبۆ ناو شاری مەدینە چەكی داناو خۆی شۆرد، كەچی جوبرائیل** (سەلامی خوای لێ بێ) **تەشریفی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر، تەپوتۆز وەك سەرپێچ لەسەری نیشتبوو،عەرزی پێغەمبەری كرد: دیارە تۆ چەكت داناوە، دەی بەخودا هێشتا من چەكم دانەناوە، زووبە بڕۆ بۆ سەریان. پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: بچم بۆ سەر كێ؟ جوبرائیل بەنی قورەیظەی پێنیشان داو فەرمووی: بڕۆ بۆ سەر ئەم بێ پەیمانانە. ئیتر پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **بەخۆیو لەشكرەكەیەو دەچێ دەورەیان دەگرێ... تاد. (تاج/٥/١٧٥ز-٤٥ف-٤ + تاج/٨/٢٢٠ف-١ز-٨٩ غەزای بەنی نەضیر).**

## ئیسلام بوونو شەهیدبوون هەموو تاوانێ دەشۆرنەوە

١١٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ يَدْخُلانِ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ) (الحديث٢٨٢٦) (٢٢٠).

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (كاری ئەم دوو پیاوە ئەوەندە عەنتیكەیە، خودای گەورە بۆ خۆی پێكەنینی پێیان دێ، ئەوەندە كەیفی بەكارەكەیان دێ، یەكێكیان ئەوی تریان دەكوژێ،**

---

(٢١٩) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: جواز قتال من نقض العهد صم/١٢ص٩٤- المترجم.

(٢٢٠) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: بيان الرجلين يقتل أحدهما الآخر يدخلان الجنة، رقم: ١٨٩٠.

کەچی هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت، لەپێشا یەکێکیان لەڕێگەی خودادا دەجەنگێ هەتا بەدەستی ئەویتریان دەکوژرێ، لەپاشا بکوژەکەش تەوبە دەکاو خودا پەشیمانی لێ گیرا دەکاو، ئەویش شەهید دەکرێ لەئەنجام دا، کوژراوی یەکەم و بکوژەکەی کەئەویش شەهید کراوە، هەردوولا پێکەوە دەچنە بەهەشت!) (تاج/٨/٤٩ز-١١-ش).

١١٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ بِخَيْبَرَ بَعْدَ مَا افْتَتَحُوهَا فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَسْهِمْ لِي فَقَالَ بَعْضُ بَنِي سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: لا تُسْهِمْ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ هَذَا قَاتِلُ ابْنِ قَوْقَلٍ فَقَالَ ابْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: وَاعَجَبًا لِوَبْرٍ تَدَلَّى عَلَيْنَا مِنْ قَدُومِ ضَأْنٍ يَنْعَى عَلَيَّ قَتْلَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْرَمَهُ اللَّهُ عَلَى يَدَيَّ وَلَمْ يُهِنِّي عَلَى يَدَيْهِ ) (الحديث ٢٨٢٧) [(٢٢١)].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (چوم بۆلای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەخەیبەر بوو، لەپاش ئازادکردنی خەیبەر، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پشکم لە دەستکەوتی ئەم غەزایە بۆ دابنێ، ئیبانی کوڕی سەعدی کوڕی عاصیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پشکی بۆ دامەنێ خۆ ئەمە بەشداری لەئازادکردنی خەیبەردا نەکردووە.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منیش گوتم: ئەمە بکوژی نوعمانی کوڕی قەوقەلە، کەلەغەزای ئوحوددا شەهید کرا، ئیبانیش بەرپەرچی دامەوە، گوتی: ئای کە سەیرە! تەماشای ئەم چالەکەیە ناکەن، لەقەدوم ضەئنەوە داباریوە بەسەرماناو خۆی لێ کردوین بەشت و توانجی کوشتنی پیاوێکی موسوڵمان لەمن دەدا، کە لەسەر دەستی من لەغەزای ئوحوددا خودا شەهیدی بەنسیب کردووەو، بەوە ئەو پەڕی رێزی لێ گرتووە، وەخوا رەحمی بەمن کردووەکەشتەکە بەپێچەوانەوە نەبووە، ئەو منی نەکوشتووە لەو شەڕەدا، دەنا ئەوپەڕی سووکی و بێ ڕێزی بەسەر من دەهات، چونکە ئەو کاتە ناموسوڵمان بووم ).

---

(٢٢١) لاحظ ما جاء في خاتمة كتاب الجهاد/فتح/٦/١٩٥، المترجم.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەسەر باسەکەوە لەوەدایە، کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تەقریری قسەکەی ئیبانی کرد، لەبارەی ڕێزگرتنی ئیبنو قەوقەل لەسەر دەستی ئەودا بەشەهید بوونو بێ ڕێزی بەسەر ئیبان نەهێناوە، ئەگەر کارەکە بەپێچەوانە بوایەو مۆڵەتی داوە تا خودا ئیسلام بوونی بەنسیب کردووەو ئەویش وەك ئیبنو قەوقەل دینی ئیسلامی بەنسیب بووەو بەوە شاد بووە بەوپەڕی ڕێزلێنانی پەروەردگاری.

## کەسانێ کە لەهەندێ کاتا غەزایان پێ باشترە لەڕۆژووی سوننەت

١١٦٤- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ لاَيَصُومُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَجْلِ الْغَزْوِ فَلَمَّا قُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ أَرَهُ مُفْطِرًا إِلاَّ يَوْمَ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى) (الحديث ٢٨٢٨) [٢٢٢].

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەبوطەلحە ڕۆژووی سوننەتی نەدەگرت، بەڵام کاتێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی هەقی بەجێهێناو مرد، ئیتر ئەبوطەلحە لەبەرغەزا سەرومڕ، ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو دەبوو، چل ساڵی ڕەبەق لەپاش مەرگی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ، ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو بوو، نەمدیوە ڕۆژوو بشکێنێ لەو ماوەیەدا، مەگەر لەیەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو لەڕۆژی جەژنی قوربانا.

## شەهید بوون جۆری زۆرە

١١٦٥-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ) (الحديث ٢٨٣٠، طرفهُ في: ٥٧٣٢) [٢٢٣].

---

(٢٢٢) (الحديث من أفراد البخاري – عيني/١٤ص١٢٦) -المترجم.

دیسان ئەو فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی بەهۆی تاعوونەوە بمرێ شەهیدە).

## خاوەنی عوزر بەقەد تێکۆشەران خێریان بۆ دەنوسرێ

١١٦٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ أَنَّهُ قَالَ رَأَيْتُ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ فَأَقْبَلْتُ حَتَّى جَلَسْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَأَخْبَرَنَا أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمْلَى عَلَيْهِ ﴿لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ قَالَ فَجَاءَهُ: ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنْ تَرُضَّ فَخِذِي ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾) (الحديث ٢٨٣٢، طرفُهُ في: ٤٥٩٢) [٢٢٤].

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: مەروانی کوڕی حەکەم پێی فەرمووم: زەیدی کوڕی ثابیت فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خەریکبوو کە ئەم ئایەتەی بۆ دەخوێندمەوە تابینووسمەوە: ﴿لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾. لەم کاتەدا ئیبنو ئوممی مەکتووم(ڕەزای خوای لێ بێ) هاتە خزمەتیو فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ڕەوانەکراوی خودا!: یارسول الله!، بەخودا بەیەزدانی پاك، ئەگەر توانای غەزاو تێکۆشانو خەباتگێڕانم دەبوو، منیش درێغیم نەدەکردو تێدەکۆشامو غەزام دەکردا).

(٢٢٣) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: بيان فضل الشهداء، رقم: ١٩١٦.

(٢٢٤) قال العيني: (والحديث من افراده) عيني /١٤ص١٣٠ — المترجم.

ئیبنو ئوممی مەکتووم پیاوێکی کوێر بوو: لەو کاتەدا رانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر رانی من بوو، دەستبەجێ خودا لەم بارەیەوە سرووش (وەحی) بۆ نارده خوارێ، لەکاتی هاتنی سرووشەکەدا رانی پێغەمبەر لەسەر رانم وا قورس بوو، وەختە بوو رانم لەژێر رانی پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) وردو خاش بێ لەپاشا کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرامۆشی بۆ هات، خودای بالاّ دەستو شکۆمەند، بەسرووش ئەم وشەی بۆ نارد: ﴿غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ﴾.

واتە لەپاش هاتنی ئەم وشەیە ئایەتەکە هەم بڕیارەکەیو هەم شێوەکەیو نەظمو هۆنینەوەکەی گۆڕاو ئاوای لێ هات: ﴿لاَيَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ -غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ- وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ﴾ -النساء-٤/٩٥-.

واتە: وەك یەك نین لەپاداشو تۆڵەی باش دا، ئەو موسوڵمانانە کەدانیشتوونو بەبێ بەهانەیەکی رەوا، وەکوو شەلیو کوێریو نەخۆشی تەرکی غەزاو خەباتیان کردووە، لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەدا کە خەبات دەگێڕنو تێ دەکۆشن لەرێگەی خودا دا. (تاج/٦/١١٠ف-٢٠ز-٥).

## خەندەكو سەنگەر هەڵکەندن سوننەتن لەکاتی شەڕدا

١١٦٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) يَقُولُ خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْخَنْدَقِ فَإِذَا الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ فَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَبِيدٌ يَعْمَلُونَ ذَلِكَ لَهُمْ فَلَمَّا رَأَى مَا بِهِمْ مِنَ النَّصَبِ وَالْجُوعِ قَالَ:

اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ     فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

فَقَالُوا مُجِيبِينَ لَهُ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا     عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدَاً

(الحديث ٢٨٣٤، أطرافُهُ في: ٢٨٣٥، ٢٩٦١، ٢٧٩٥، ٢٧٩٦، ٤٠٩٩، ٤١٠٠، ٦٤١٣، ٧٢٠١)[٢٢٥].

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كاتێ دەرچوو بۆ غەزای خەندەق، ڕوانی وا كۆچكارو یاریدەدەران (موهاجرینو ئەنصار) بەو بەیانییە ساردە خەندەك هەڵدەكەنن، بەدەوری شاری مەدینەدا، ئەو سەردەمە بەندەو كۆیلەیان نەبوو، كە ئەو جۆرە كارەیان بۆ بكا لەبەر ئەوە خۆیان ئەنجامیان دەدا، جا كاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەو حاڵی شەكەتیو برسێتییە بینینی، فەرمووی:

اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

واتە:

ژین ئەو ژینەیە لەبەهەشتا بێ لەگەڵ كۆچكارو یاریدەردا بێ!

ئەوانیش بەم هۆنراوەی تر وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

واتە:

پەیمانەو دەیكەین لەگەڵ موحەممەد

خەبات دەگێڕین تا بەردی ئەڵحەدا!

(تاج/٥ل/١٧٢ف-١٧ز-٤٤- باسی گەورەیی یاریدەدەران) .

١١٦٧-(مكرر) وعنهُ في روايةٍ قَالَ: جَعَلَ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ الْخَنْدَقَ حَوْلَ الْمَدِينَةِ وَيَنْقُلُونَ التُّرَابَ عَلَى مُتُونِهِمْ وَيَقُولُونَ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى الإِسْلامِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

---

(٢٢٥) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: غزوة الأحزاب وهي الخندق، رقم: ١٨٠٥، انظر: رقم: (٢٦٤تجريد= ٤٢٨فتح).

وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُجِيبُهُمْ وَيَقُولُ:

اللَّهُمَّ إِنَّه لا خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَةْ فَبَارِكْ فِي الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةْ ) (الحديث ٢٨٣٥) [(٢٢٦)].

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کۆچکاران و یاریدەدەران (ڕەزای خودایان لێ بێ) کاتێ خەریکی هەڵکەندنی خەندەکەکە بوون، بەدەوری شاری مەدینەدا لەکاتی غەزای خەندەقا، وەبەکۆڵ خۆڵەکەیان دەگواستەوە بۆ دەرەوەی خەندەکەکە، بەدەم سۆز کردنەوە ئەم هەڵبەستەیان دەخوێندەوەو دەیانگوت:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى الإِسْلامِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

واتە:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد

ئیسلام پەروەر بین، تا بەردی ئەڵحەدا!

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وەڵامی دەدانەوەو دەیفەرموو:

ژین تەنیا ژینی دوارۆژە خوایە!

ڕێزی ئەنصارو کۆچکاری تیایە!

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە چەندین فەرموودەی تر لەم بابەتە نیشانەو بەڵگەی ئەوەن کەشیعری جوان، کەخزمەتی مەبەستێکی ڕەوا بکا، درووستە، بەڵکوو وتنیشی لەسەر شێوەی سۆزو سروودی دڵهەژێن کارێکی باشە.

---

(٢٢٦) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: غزوة الأحزاب وهي الخندق — المترجم.

١١٦٨-عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الأَحْزَابِ يَنْقُلُ التُّرَابَ وَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ وَهُوَ يَقُولُ:

وَاللهِ لَوْلا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا وَلا تَصَدَّقْنَا وَلا صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتْ الأَقْدَامَ إِنْ لاقَيْنَا
إِنَّ الأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا

(الحديث ٢٨٣٧، أطرافُهُ في: ٢٨٣٦، ٣٠٣٤، ٤١٠٤، ٤١٠٦، ٦٦٢٠، ٧٢٣٦)(٢٢٧).

بۆ تێگەیشتنی تەواو، بۆ روونکردنەوە: ی ئەم گێڕانەوەیە، ئەم گێڕانەوەی تاجول ئوصول راگوێز دەکەین، کە دەفەرموێ: بەراء(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا کە پێشی دەگوترێ: غەزای ئەحزاب، چونکە لەو غەزایەدا ناموسوڵمانەکان عێلجاڕیان کردبوو، گەلە کۆمەیان لە موسوڵمانەکان کردبوو، پێغەمبەرم(درودی خوای لەسەر بێ) دی لەگەڵ ئێمەدا بەکۆڵ خۆڵی دەگواستەوەو لە خەندەکەکە دووری دەخستەوە، خۆڵو تەپو تۆز سپێتیی سەر سینگی داپۆشیبوو، لەو حەلەدا خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) بەسۆزەوە لەسەرشێوەی سروود خوێندنەوە دەیفەرموو:

وَاللهِ لَوْلا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا وَلا تَصَدَّقْنَا وَلا صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتْ الأَقْدَامَ إِنْ لاقَيْنَا
إِنَّ الأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا

بەشیعر لەبەحرەکەی خۆی کەرەجەزە، واتە:

خودا بە تۆ قەسەم، لەفەضلی تۆیەوا
نێژو زەکاتو خێر دەکەین و رێی رەوا

---

(٢٢٧) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: غزوة الأحزاب وهي الخندق، رقم: ١٨٠٣.

دەگرینەبــەر کە بوو بەشەڕ ئاسایشت
بکەینە بەر، وەکوو سوپەر، یاسەرکەوا
قەت نایەڵــین قین لەدلــی ئاژاوە گــێڕ
دووبەرەکی بــەرپا بــکا لەنــێــوا!

**بــەراء**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فــەرمووی: پێغەمبــەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **لــەکۆتایی شیعرەکاندا، لەبــەر خۆیــەوە دەنگی لەئاخر ســەروا بــەرز دەکردەوەو خــۆش خۆش دەیفەرموو: (ئەبەینا... ئەبەینا = قــەت نایــەڵین قــەت نایــەڵین... تــاد) (تاج/٨/٢١٨ف-٣ز-٨٨. غەزای خەندەق).**

## راڤەو شیکردنەوە:

**راســتر ئەوەیــە کــە ئــەم چــەند هەڵبەســتەی کــەوان لــەم فەرموودەیــەدا هــی هەســتیار عەبــدوڵڵای کــوڕی ڕەواحەیــە. بــۆ زانینــی حــوکمی شــیعرو گــوتنیو خوێندنەوەی لەلایەنی پێغەمبەرەوە. (بڕوانە: تاج/١٠/١٧٠-ز-٦٨ هەتا ز-٧١ل-١٨٠).**

**١١٦٩ – عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي غَــزَاةٍ فَقَــالَ: (إِنَّ أَقْوَامًــا بِالْمَدِينَــةِ خَلْفَنَــا مَــا سَلَــكْنَا شِــعْبًا وَلا وَادِيًــا إِلاَّ وَهُــمْ مَعَنَــا فِيــهِ حَبَــسَهُمْ الْعُــذْرُ) (الحــديث ٢٨٣٩، طرفــاهُ في: ٢٨٣٨، ٤٤٢٣)[٢٢٨].**

**ئەنــەس**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فــەرمووی: پێغەمبــەر** (درودی خوای لەسەر بێ) **لەغەزایــەکا دەفەرموێ: (لەشاری مەدینە کۆمەڵێ لەئێمە بەجێمانو نــەهاتوون لەگــەڵمان بــۆ ئــەم غەزایە، لەگــەڵ ئەوەشدا ئێمــە بــۆ هــەر کوێ چووینو هەرشیوو دۆڵێــکمان بــڕی، ئــەوان بــەدڵ لەگــەڵمان بوون، لەبــەر ئــەوە لەپاداشیــشا هاوبــەشمانن، بەقــەد ئێمە خێریان بۆ دەنوســرێ، بــەبێ ئــەوەی لــەخێری ئێمــە کــەم بکەنــەوە، ئــەوانیش**

(٢٢٨) أخرجه مسلم عن جابر (صم/١٣ص٥٦) المترجم.

مەهانــەی ڕەوا لەماڵــەوە گلــی داونەتــەوە، وەك نەخۆشــیو شــەلیو كــوێری).
(ریاض/١/١١-٤ +تاج/٤/٣٤٢. العربی + تاج/٨/٧٧ز-٢٠ف-٢).

١١٧٠-عَـنْ أَبِـي سَـعِيدٍ الْخُـدْرِيِّ (رَضِـيَ اللَّــهُ عَنْــهُ) قَــالَ سَـمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) يَقُـولُ: (مَـنْ صَـامَ يَوْمًـا فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ بَعَّـدَ اللَّـهُ وَجْهَهُ عَنْ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا) (الحديث ٢٨٤٠).

ئەبوســەعیدی خــودری(ڕەزای خــوای لــێ بــێ) فــەرمووی: لەپێغەمبــەرم بیــست دەیفــەرموو: (هــەر كەســێ ڕۆژێ بــەڕۆژووبێ لەرێــگەی خــودادا، خــودا ڕووی حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە).

## خێرو پاداشی سامان خەرج كردن لەرێگەی خودادا

١١٧١- عنْ زَيْدُ بْنُ خَالِد الجهني (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَـدْ غَـزَا وَمَـنْ خَلَـفَ غَازِيًـا فِـي سَبِيلِ اللَّهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا) (الحديث ٢٨٤٣).

زەیدی كوڕی خالید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی لەبــەر خــوا خــەباتگێڕێ تــەدارەك بكاو، چەكو تفاقی پێبدا، ئەوە وەكوو ئەوە وایە كە خۆی بچێ بۆ غەزا). (تاج/٨/٧٠ز-١٦).

١١٧٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَـكُنْ يَــدْخُلُ بَيْتًــا بِالْمَدِينَــةِ غَيْــرَ بَيْــتِ أُمِّ سُــلَيْمٍ إِلاَّ عَلَــى أَزْوَاجِــهِ فَقِيــلَ لَــهُ فَقَالَ: إِنِّي أَرْحَمُهَا قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي) (الحديث ٢٨٤٤)[٢٢٩].

ئەنــەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فــەرمووی: پێغەمبــەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەمەدینــەی نازدار، بێجگە لەژنەكانی خۆی، بــۆ مــاڵی ژنــی تــر نەدەچوو، بــۆ مــاڵی ئوممو

---

(٢٢٩) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل أم سليم.. رقم: ٢٤٥٥.

سولەیمی دایکم نەبێ، بەڵام بۆلای ئەو دەچوو بۆماڵەوە، کە لەم لایەنەوە پرسیاری لێ کرا، فەرمووی: دڵم پێی دەسوتێ بەزەییم پێیدا دێتەوە، چونکە براکەی کە حەرامی کوڕی مەلحان بوو، لەشەڕی بیری مەعوونەدا، لەپێناوی ئیسلاماو لەپێناوی جێ بەجێ کردنی فەرمانی منا کوژراوە. (تاج/٨ل-١٦٤ف-١ز-٤٣).

## خۆ بۆنخۆشکردن بەر لەدەستپێکردنی شەڕ

١١٧٣- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنْ مُوسَى بْنِ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (وَذَكَرَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ قَالَ أَتَى أَنَسٌ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ وَقَدْ حَسَرَ عَنْ فَخِذَيْهِ وَهُوَ يَتَحَنَّطُ فَقَالَ يَا عَمِّ مَا يَحْبِسُكَ أَنْ لا تَجِيءَ قَالَ: الآنَ يَا ابْنَ أَخِي وَجَعَلَ يَتَحَنَّطُ يَعْنِي مِنْ الْحَنُوطِ ثُمَّ جَاءَ فَجَلَسَ فَذَكَرَ فِي الْحَدِيثِ انْكِشَافًا مِنْ النَّاسِ فَقَالَ: هَكَذَا عَنْ وُجُوهِنَا حَتَّى نُضَارِبَ الْقَوْمَ مَا هَكَذَا كُنَّا نَفْعَلُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِئْسَ مَا عَوَّدْتُمْ أَقْرَانَكُمْ) (الحديث ٢٨٤٥)[٢٣٠].

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی ڕووداوی یەمامە، کەموسوڵمانان لەجەنگێکی بێ سامانا، ئابلۆقەی موسەیلەمەی کەذذابیان دابوو، چووم بۆلای ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس، هەردوو ڕانی خۆی هەڵماڵیبوون و خەریکبوو بۆنی گیراوەی کفنی مردووانی دەدا لەخۆی، وەك کەسێ خۆی بۆ مردن و شەهید بوون ئامادە بکا (وەك چۆن هەندێ کەس ئێستا کەدەچن بۆ شەڕ کفن لەبەر دەکەن) عەرزیم کرد: مامە! ئەوە لەبەرچی دواکەوتووی و بۆ پەلامار نادەی؟ فەرمووی: (ئەی کوڕی برام واهاتم، دیسان دەستی کردەوە بەحەنوط، لەخۆدان، کە ئەو بۆنە

(٢٣٠) قال العيني: (والحديث من أفراده) ج/١٤ص١٣٩ - المترجم.

تایبەتییەیە، کەدەدرێ لەکفن‌و لەلەشی مردوو، ئەوجا هات لەناو ریزی جەنگاوەرەکاندا دانیشت، کەخۆیان ئامادەکردبوو بۆ جەنگین).

ئەنەس لەفەرموودەیەکدا باسی رەوینەوەو شکستێکی موسوڵمانانی کرد، جا ثابیت هەڵساو گوتی: ئادەی دڕبدەن بۆ هێرشی ئێمە، هەتا لەگەڵ دوژمندا بەرەنگاری یەکتر ببین‌و دەست بکەین بەلێدانی یەکتر، ئێمە کاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) کەشەڕمان دەکرد ریزەکانمان دڕیان نەدەدا بۆ دوژمن، بەراستی شتێکی بەدتان فێری هاوڕاکانتان کردووە.

## راڤەو شیکردنەوە:

ثابیتی کوڕی قەیس(رەزای خوای لێ بێ) مامی ئەنەسی کوڕی مالیك نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوە پێی دەڵێ مامە کەلەخۆی گەورەترەو بۆ رێزلێنان، ثابیت لەم شەڕەدا شەهید بوو، زریەیەکی گرانبەهای دزرابوو، پیاوێ لەخەویدا دەیبینێ، ثابیت پێی دەڵێ: زریەکەم وا لەناو مەنجەڵێکا، والەژێر کورتانێکا، وا لەوشوێنەدا، وەچەند راسپێریەکی تریشی دەکا، جا چۆنی فەرموو بوو زریەکە لەوێدا بوو دۆزیانەوە، وەراسپێریەکانی تریشیان جێ بەجێ کرد.

# سووسەکردن‌و کۆکردنەوەی هەواڵی دوژمن

١١٧٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ يَوْمَ الأَحْزَابِ؟) قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا ثُمَّ قَالَ: (مَنْ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟) قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ) (الحديث ٢٨٤٧) [٢٣١].

---

(٢٣١) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل طلحة و الزبير.. رقم: ٢٤١٥.

جابير(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا، پێغەمبەر(درוودی خوای لەسەر بێ) ویستی سووسەکارێ بنێرێ سووسەی هەواڵی دوژمنی بۆ بکا، فەرمووی: (ئای بۆ پیاوێ بچێ هەواڵی دوژمنم بۆ بێنێ؟) زوبەیر فەرمووی: من دەچم. دووبارە هەمان فەرمایشتی فەرموو، دیسان زوبەیر فەرمووی: من دەچم. هەواڵی دوژمنت بۆ دەزانمو بۆت دەهێنم.

پێغەمبەر(درוودی خوای لەسەر بێ) ئەم هەڵوێستەی زوبەیری زۆر پێ خۆش بوو فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ لەسەردەمی خۆیدا، لەکاتی ژیانی دا، یارو یاوەرو دۆستێکی گیانی بەگیانی بووە، یارو یاوەرو دۆستی گیانی بەگیانی منیش زوبەیرە). (تاج/٥ل-٧٩ف-١+٢).

## خێرو خۆشی لەناوچەوانی وڵاخی بەرزە گرێدراوە

١١٧٥- عَنْ عُرْوَةُ الْبَارِقِيُّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ) (الحديث ٢٧٥٠، أطرافُهُ في: ٢٨٥٢، ٣١١٩، ٣٦٤٣)[٢٣٢].

عوروەی بارقی(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درוودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاکۆڵو یاڵی ماییـنو ئەسپ خێرو خۆشی گرێدراوە هەتا رۆژی قیامەت: کە ئەو خێرو بێرە بریتیە لەپاداشی باشی قیامەتو، لەماڵی تالانی حەڵاڵ لەم دنیایەدا) (تاج/٨/٨٨ف-١ز-٢٦).

عوروەی کوڕی جەعدی بارقی(رەزای خوای لێ بێ) کۆمەڵێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە(درוودی خوای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، پێغەمبەر نزای بۆ کردبوو کەخوا پیتو فەڕ بخاتە مامەڵەیەوە، خۆی دەفەرموێ: ئیتر لەوەدوا ئەگەر خۆڵم بکڕیبایە قازانجم دەکرد

(٢٣٢) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: الخيل في نواصيها الخير. رقم: ١٨٧٣.

(تاج/٢/ل/٣٣٨ف-٨ز-١٦١) لەفەتحەكانی شام دا لەوێ ئامادە بوو لەوێ دادەنیشت، دوایی پێشەوا عوثمان ناردی بۆ كووفە، فەرموودەكانی لای خەڵكی كووفە هەن، عوروە دەوری حەفتا مایینی راگرتبوو بۆ غەزا.

١١٧٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ). (الحديث ٣٦٤٥) [٢٣٣].

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیتو فەڕو پیرۆزیی وا بەناوچەوانی ماینەوە!).

١١٧٧- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِيمَانًا بِاللَّهِ وَتَصْدِيقًا بِوَعْدِهِ فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث ٢٨٥٣) [٢٣٤].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ وڵاخی بەرزە — واتە ماینو ئەسپ - لەرێگەی خودادا رابگرێ بۆ خۆیو ساخ لەبەر رەزای خودا تەرخانی بكا بۆ غەزا، دیارە بۆیە ئەمە دەكا چونكە باوەڕی هەیە بەخوداو، بەو بەڵێنەی كە ئەو لەم بارەیەوە داویەتی بەخەباتگێڕانو ئەو بەڵێنە بەراست دەزانێ، هەركەسێ ئاوا بكا، ئەوە لەڕۆژی قیامەتا، خواردنو خواردنەوەو تەرسو گمێزی ئەو وڵاخە هەمووی، لەتای خێری تەرازووی خاوەنەكەیدا دادەنرێ) (تاج/٨/٨٨ف —٢ز-٢٦- باشیو نیشانەی رەسەنی وڵاخی بەرزە) + (ریاض الصالحین بەرگی/٣/ل/-٩٦٢ف-٤٦ز-٢٣٤).

١١٧٨-عنْ سَهْلِ بنْ سعد (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَائِطِنَا فَرَسٌ يُقَالُ لَهُ اللُّحَيْفُ قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ وَقَالَ بَعْضُهُمْ اللُّخَيْفُ) (الحديث ٢٨٥٥) [٢٣٥].

---

(٢٣٣) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: الخيل في نواصيها الخير. رقم: ١٨٧٤.

(٢٣٤) لاحظ ما جاء في خاتمة كتاب الجهاد /فتح/٦/١٩٥ — المترجم.

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەسپێکی هەبوو، ناوی لوحەیف بوو، لەناو حەساری باخەکەی ئێمەدا بوو. بوخاری دەفەرموێ: هەندی لەفەرموودەگێڕەوەکان دەفەرموێ: ناوی لوخەیف بوو. واتە بەخێی نوختەدار. (تاج/٨/٩٥ز-٣٠).

١١٧٩- عَنْ مُعَاذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ فَقَالَ: (يَا مُعَاذُ هَلْ تَدْرِي حَقَّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ؟) قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: (فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَحَقَّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لا يُعَذِّبَ مَنْ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلا أُبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ قَالَ: (لا تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا). (تقدّم في رقم: ١٠٤ من المجلد الأول ص١٣١). (الحديث ٢٨٥٦، أطرافُهُ في: ٥٩٦٧، ٦٢٦٧، ٦٥٠٠، ٧٣٧٣) (٢٣٦).

موعاذی کوڕی جەبەل(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەپاشکۆی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لەسەر بێ)، سواری گوێدرێژێ بووم ناوی عوفەیر بوو، فەرمووی: (ئەی موعاذ! ئایا دەزانی کەمافی خودا لەسەر بەندەکانی چییە؟ وە مافی بەندەکان لەسەر خودا چییە؟) گوتم: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن. فەرمووی: (مافی خودا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کەبەجوانی بیپەرستن،وە هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن، وەمافی بەندەکانیش لەسەر خودا ئەوەیە کەسزای ئەو کەسە نەدا کەهاوەڵی بۆ بڕیار نەدا) جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەم مژدە خۆشە بدەم بەو خەڵکە هەتا خۆشیان تێ بکەوێ؟ فەرمووی: (نەء، ئەم مژدەیان مەدەرێ، دەنا پشت بەم مژدە دەبەستن و

---

(٢٣٥) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على حديث سهل في أسماء الخيل، راجع: (فتح/٦/١٩٥- خاتمة كتاب الجهاد) المترجم.

(٢٣٦) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الدليل على أن من مات على التوحيد... رقم: ٣٠.

لەكردنی كردەوەی باش سارد دەبنەوەو، پشتی لێ دەكەنەوە). ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە رابوورد، لەلاپەڕە (١٣١) بەرگی یەكەم، ژمارە (١٠٤).

## راڤەو شیكردنەوە:

لەبەر ئەوەی كەژیاننامەی موعاذ لەمەوپێش نەنووسرا بوو، لەم شوێنەدا بەسەری دەگرینەوە: موعاذی كوڕی جەبەل، خەزرەجییە، ئەنصارییە، یەكێكە لەو حەفتا ئەنصارییەی كە ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون، موعاذ زانایەكی گەورە بوو، پێشەوایەكی گەورەیە لە زانستی حەڵاڵو حەرام دا، كۆمەڵێ فەرموودەی زۆری لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، گەورە پیاوانی صەحابەو تابیعین فەرموودەكانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئیبنوعەبباسو ئیبنو عومەرو جابیرو ئەنەسو كەسانی تریش فەرموودەكانی پێغەمبەریان لەدەمی ئەوەوە گێڕاوەتەوە.

ئامادەی بەدرو هەموو شەهیدگاكانی تری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بووە، منالی قەت نەبووە، ئەنەسی كوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (موعاذ یەكێكە لەو چەند كەسە كەمانەی كەبەسەرینیی پێغەمبەر خۆی(دروودی خوای لەسەر بێ) هەموو قورئانیان لەبەر بووە). پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (قورئان لەم چوار كەسەوە فێربن) كە یەكێكیان موعاذی كوڕی جەبەل بوو، كەئامادەی غەزای بەدر بوو، تەمەنی بیستو یەك ساڵ بوو، كە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كردی بە فەرمانڕەوا لەیەمەن.

لەباشترینو جوانترینی لاوانی یاریدەدەران (أنصار) بوو، لاوێكی جوانی قۆزی سپیو سووری چاوقەوی چاوڕێژراوی رەشی سوورمەیی باڵا بەرز بوو. دوعاو نزای زۆر گیرا دەبوو، هەرچی لەخودا داوا دەكرد پێی دەبەخشی، كاتی پەیمانی برایەتی بەستن لەناو هاوڕێیانا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كردی

بەبرای ئیبنومەسعوود، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەرۆژی قیامەتدا پێشەنگی زاناکانە!).

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) موعاذی کرد بەقازی (الجند) لەیەمەن، خەڵکەکەی فێری قورئانو سوننەتو شەریعەتی ئیسلام دەکرد، وەدادگاییشی لەناوا دەکردن.

موعاذ لەدەوری تەمەنی (٣٣)ساڵیدا، لەشام، بەتاعوونەکەی عەمووس، لەساڵی هەژدەی کۆچی دا کۆچی دوایی کردووە، عامووس گوندێکە وا لەنێوانی رەملەو بەیتولمەقدیسدا.

١١٨٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: (كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَسًا لَنَا يُقَالُ لَهُ مَنْدُوبٌ فَقَالَ: (مَا رَأَيْنَا مِنْ فَزَعٍ وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْرًا) (الحديث ٢٨٥٧، أطرافُهُ في: ٢٨٢٠، ٢٨٧٢، ٢٨٦٦، ٢٨٦٧، ٢٩٠٨، ٢٩٦٨، ٢٩٦٩، ٣٠٤٠، ٦٠٣٣، ٦٢١٢)[٢٣٧].

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەدینە قاوەو شەڵەژانیو ترسو تۆقینێ رووی دا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەسپێکی لەئێمە خواست ناوی مەندوب بوو، بەسواری ئەو ئەسپە چوو بەسۆراخی کارەکەوە، چەند کەسێکی تریش بەرەو سەرچاوەی هۆی شەڵەژانەکە رۆیشتن، لەولاوە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەرەنگاریان بوو، دەگەڕایەوە دەیفەرموو: (مەشڵەژێن، هیچی وامان نەدی کەببێ بەهۆی ترسو بیم، بەڵام بەڕاستی ئەم ئەسپە وەك شەپۆلی دەریا وایە، ئەوەندە خێرایە) (تاج/٤/٢٧٠-٧ز-٩٠).

## شوومیو بەدبوومیو هەندێ باسی تری وڵاخی سواری

١١٨١-عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاثَةٍ فِي الْفَرَسِ وَالْمَرْأَةِ

---

(٢٣٧) أخرجه مسلم في فضائل النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) (عيني/١٤/١١٧) – المترجم.

وَالدَّارِ) (الحديث ٢٨٥٨، طرفُهُ في: ٩٥٢ت=٩٩٠٢ف) (٢٣٨).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەدەمی پیرۆزی پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: (نە نەخۆشی تەنینەوە هەیە، نەنوقلانەی خراپ بایەخی هەیە، شوومی‌و بەدبوومی ئەگەر لەشتێکدا هەبێ، لەم سێ شتەدا هەیە: لەماییین‌و ئەسپدا و، لەژنداو لەخانوودا) (تاج/٤/٢٣١-ز-٧٧-باسی شوومی).

١١٨٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَعَلَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَلِصَاحِبِهِ سَهْمًا) (الحديث ٢٨٦٣، طرفُهُ في: ٤٢٢٨) (٢٣٩).

ئیبنوعومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەستکەوتی جەنگی دابەش کرد لەسەر ئەم شێوەیە: دوو پشکی دانا بۆ ماییین‌و یەك پشکی دانا بۆ خاوەنەکەی، واتە: سێ پشکی دانا بۆ سواری ماییین‌و ئەسپ، پشکێ بۆ خۆی‌و دوو پشك بۆ ماییینەکەی!. (تاج/٨/١٣٧ف-٦-ز-٥٦-باسی دەستکەوتی جەنگ).

١١٨٣- قَالَ رَجُلٌ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَفِرَّ إِنَّ هَوَازِنَ كَانُوا قَوْمًا رُمَاةً وَإِنَّا لَمَّا لَقِينَاهُمْ حَمَلْنَا عَلَيْهِمْ فَانْهَزَمُوا فَأَقْبَلَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى الْغَنَائِمِ وَاسْتَقْبَلُونَا بِالسِّهَامِ فَأَمَّا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَفِرَّ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ وَإِنَّهُ لَعَلَى بَغْلَتِهِ الْبَيْضَاءِ وَإِنَّ أَبَا سُفْيَانَ آخِذٌ بِلِجَامِهَا وَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ:

---

(٢٣٨) قال العيني: (الحديث أخرجه مسلم في الطب) ج/١٤/١٤٩ — المترجم.

(٢٣٩) قال: (رواه الأربعة =ب، م، د، ت) تاج الأصول-ج/٤/ص٣٧٦ أخرجه مسلم في كتاب الجهاد باب: حكم الفيئ صح/١٢/ص٨٢ - المترجم.

أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ

(الحديث ٢٨٦٤، أطرافُهُ في: ٢٨٧٤، ٢٩٣٠، ٣٠٤٢، ٤٣١٥، ٤٣١٦، ٤٣١٧)[(٢٤٠)]

پیاوێ عەرزی بەرائی کوڕی عازیبی کرد: ئەی ئەبو عومارە! ئایا راستە ئێوەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەرۆژی غەزای حونەین دا هەڵهاتوون و دەوری پێغەمبەرتان چۆڵ کردووە؟ فەرمووی: ئەگەر ئێمە هەموو هەڵهاتبین دیارە پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵمان بووە، نەبە خودا شتی وا نەبووە، نەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەڵهات و نەئێمە لەدەوری هەڵهاتین، بەڵام مەسەلەکە خۆی ئاوا بوو:

(جەهێڵ و هەرزەکارە بێ ئەزموونەکان لەیاران و هاوڕێیانی پێغەمبەر – درودی خودا لەپێغەمبەر و رەزای خودا لەیاران بێ – بەدەستی رووتی بێ چەك هاتبوون بۆ ئەو شەڕە سەختە جا لەناکاو لووتیان تەقی بەلووتی کۆمەڵەی لەشکری هەوازین و بەنی نەسرەوە، ئەوانیش هۆزێکی تیرئەدازی چاك بوون، دەست راست بوون، مەگەر بەدەگمەن تیریان بەهەڵە بچوایە و نیشانی نەپێکایە، دەنا تیریان لەزەوی نەدەدا، ئیتر لەپڕ بوو بەشەڕ، ئێمە لەسەرەتاوە هەرکەپێیان گەیشتین شاڵاومان بۆ بردن و هێرشمان بردنە سەریان ئیتر ئەوان شکان، بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوی پەکیان بکەوێ، موسوڵمانەکان ئاڵان بەتاڵان کۆکردنەوە، ئیتر ئەوانیش هەلیان بۆ رەخساو لەپڕ تیربارانێکی وایان کردین، مەگەر چۆنها دەنا تیریان بەزایە نەدەچوو، ئیتر ئەمە بوو بەهۆی ئەوە کە لەپاش ئەو سەرکەوتنە سەرەتاییە، لەشکرەکەی پێغەمبەر– درودی خودا لەپێغەمبەر و رەزای خودا لە لەشکرەکەی بێ – شکست بهێنن.

---

(٢٤٠) أخرجه مسلم في الجهاد، باب: غزوة حنين (صم/١٢/ص١١٧) - المترجم.

بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و زۆرێ لەیارانی خۆیان راگرتو نەبەزین و هەڵنەهاتن، حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەعەبباسی مامەی، بەو دەنگە گەورەی خۆی بانگی یاران بکاتەوە بۆلای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەوجا یاران و موسوڵمانان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەرو لەدەوری کۆبوونەوە، وەهەڵمەتی شێرانەیان بردە سەر ناموسوڵمانەکان،و لەگەڵیاندا پێك هەڵپڕژان، لەودەمەدا بەچاوی خۆم خودی پێغەمبەرم دی، بەسواریی هێسرە ماچە سپیەکەی خۆی بوو، هەر باکی لەکافران نەبوو، ئەوەندە پشتی بەسەرکەوتنی خوایی ئەستوور بوو، وەئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی عەبولموطەلیب کە ئامۆزای خۆی بوو، وەبرای شیریشی بوو جڵەوی وڵاخەکەی بۆ رادەکێشا، جا حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) دابەزی و پاڕایەوە داوای پیرۆزی و سەرکەوتنی لەخودا کرد،و مشتێ چەوی هەڵگرت و وەشاندی بەڕووی ناموسوڵمانەکانداو فەرمووی: (شاهتِ الوُجوهُ: روویان بشێوێ) ئەوجا خۆش خۆش دەیفەرموو:

أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِبْ        أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ

واتە:

من پێغەمبەرم، نەوەك درۆزن        عەبدولموطەلیبە بابەگەورەی من!

فەرمووی: ئینجا هاوڕێکانی خۆی ریز کردەوەو سەرلەنوێ هەڵمەتی شێرانەیان بردەوەو دوژمنیان تێك و پێك شکاند) (تاج/٨/١٢٥ز-٤٩ +ل-٢٣٨ز-٩٦. غەزای حونەین).

١١٨٤– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لا تُسْبَقُ قَالَ حُمَيْدٌ أَوْ لا تَكَادُ تُسْبَقُ فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حَتَّى عَرَفَهُ فَقَالَ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ أَنْ لا يَرْتَفِعَ شَيْءٌ مِنْ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ ) (الحديث ٢٨٧٢، أطرافُهُ في: ٢٨٧١، ٦٥٠١) [٢٤١].

---

(٢٤١) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أنس في العضباء لاتسبق (فتح/٦/١٩٥) خاتمة كتاب الجهاد – المترجم.

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وشترە مێنگەیەکی هەبوو، ناوی عەضباء بوو، واتە: گوێ قەڵەشاو، بەرایی بەهیچ نەدەدا ئەوەندە خێرا بوو، وڵاخ نەبوو پێشی بکەوێ، ڕۆژێ عەرەبێکی دەشتەکی بەسوواری وشترێکی تۆڕی بەربار لەولاوە هاتو وەپێشی عەضباء کەوت، موسوڵمانانیش ئەوەیان لەبەر گران بوو، کاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەستی بەوەکرد فەرمووی: (ڕەوایەو بەڵێنە لەسەر خودا کەهەر شتێ لەم دنیا بێ بەقایە لووتی بەرزەوە بوو، سەری بەرزەوە کرد خودا بدا لەلووتی، وەلەئەنجامدا سەری نەوی بکاتەوە کەواتە جێگەی سەرسووڕمان نییە، کە ئەو بارگیرە پێش عەضباء بکەوێ) (تاج/٨/١٠٣-٢ز-٣٣. باسی پێشبڕکێ بەوڵاخ).

## هاوبەشیو بەشداری کردنی ژن لەبەرەی جەنگا

١١٨٥- عَنْ عُمَر بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَسَمَ مُرُوطًا بَيْنَ نِسَاءٍ مِنْ نِسَاءِ الْمَدِينَةِ فَبَقِيَ مِرْطٌ جَيِّدٌ فَقَالَ لَهُ بَعْضُ مَنْ عِنْدَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَعْطِ هَذَا ابْنَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّتِي عِنْدَكَ يُرِيدُونَ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عَلِيٍّ فَقَالَ عُمَرُ: أُمُّ سَلِيطٍ أَحَقُّ وَأُمُّ سَلِيطٍ مِنْ نِسَاءِ الأَنْصَارِ مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ عُمَرُ فَإِنَّهَا كَانَتْ تَزْفِرُ لَنَا الْقِرَبَ يَوْمَ أُحُدٍ ) (الحديث ٢٨٨١، طرفُهُ في: ٤٠٧١).

ثەعلەبی کوڕی ئەبومالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) کۆمەڵێ شاڵینەی بەسەر ژنانی مەدینەدا دابەش کرد، شاڵینەیەکی چاك مابوو، یەکێ لەدانیشتوانی خزمەتی عەرزی کرد: قوربان! ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەم چارۆکەیەش بدە بەکچەزاکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە هاوسەری خۆتە، مەبەستی ئومموکولثومی کچی

ئیمامی عەلی بوو، کە لەفاطیمەی کچی پێغەمبەر بووە، عومەریش فەرمووی: (ئوممومسەلیط شایانترە بەم چارۆکەیە، کەیەکێ بوو لەژنانی یاریدەدەران (أنصار) کە پەیمانی دابوو بەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، عومەر فەرمووی: لەرۆژی غەزای ئوحوددا ئەم ئوممومسەلیطە بەکوندە، بەکۆڵ ئاوی دەگێڕا بەسەر جەنگاوەرەکاندا لەبەرەی شەڕدا).

١١٨٦-عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَسْقِي الْقَوْمَ وَنَخْدُمُهُمْ وَنَرُدُّ الْجَرْحَى وَالْقَتْلَى إِلَى الْمَدِينَةِ) (الحديث ٢٨٨٢، طرفاهُ في: ٢٨٨٣، ٥٦٧٩).

روبەییعی کچی موعەوویذ (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (جاران ئێمەی ژنان لەگەڵ پێغەمبەرو سوپاکەی دا دەچووین بۆ غەزا، ئەم جۆرە کارانەمان بەزۆری ئەنجام دەدا: ئاومان دەدا بەخەباتگێڕەکانو خزمەتی ترمان دەکردن،و زامارمان دەگواستەوەو کوژراومان دەبرد بۆ ناوشاری مەدینە! ) (تاج/٨/٨٠ف-٢+٣+٤ز-٢١).

## ئێشك گرتنو خزمەت کردنو ئەم جۆرە بابەتانە لەغەزادا

١١٨٧- عنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) تَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَهِرَ فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ قَالَ: (لَيْتَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِي صَالِحًا يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ سِلاحٍ) فَقَالَ: (مَنْ هَذَا؟) فَقَالَ: أَنَا سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ جِئْتُ لأَحْرُسَكَ وَنَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٨٨٥، طرفُهُ في: ٧٢٣١) [٢٤٢].

عائیشە دایکی باوەڕداران (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەو سەردەمەدا کە حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ مەدینە شەوێ خەوی لێ زڕا، فەرمووی:

(٢٤٢) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: في فضل سعدبن أبي وقاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) رقم: ٢٤١٠.

(خۆزگا ئەم شەو، پیاوێکی باش لەهاوڕێیانی خۆم ئێشکی دەگرتم) عائیشە فەرمووی: زۆری پێ نەچوو گوێمان لە خرەی چەك بوو، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) فەرمووی: منم سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصم، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆچی هاتووی؟) فەرمووی: مەترسیم لەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەبوو کەسێ دەستدرێژی لێ بکا، هاتووم ئەمشەو ئێشکت دەگرم. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پاڕایەوەو نزای باشی بۆی کرد، ئەوجا بەدڵنیاییەوە خەوت. (تاج/٨/٨٧-٢ز-١٢-فضائل سعد).

١١٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ تَعِسَ وَانْتَكَسَ وَإِذَا شِيكَ فَلا انْتَقَشَ طُوبَى لِعَبْدٍ آخِذٍ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَشْعَثَ رَأْسُهُ مُغْبَرَّةٍ قَدَمَاهُ إِنْ كَانَ فِي الْحِرَاسَةِ كَانَ فِي الْحِرَاسَةِ وَإِنْ كَانَ فِي السَّاقَةِ كَانَ فِي السَّاقَةِ إِنْ اسْتَأْذَنَ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ وَإِنْ شَفَعَ لَمْ يُشَفَّعْ) (الحديث ٢٨٨٧، طرفاهُ في: ٢٨٨٦، ٦٤٣٥)[٢٤٣].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوی پارەپەرست وپوولەکی داوەشێ عەمری نەمێنێ، هەر خەریکی چڵکاو خواردنو شرەخۆرییە، بەندەیی خودای لەبیر نییە، دەڵێی نۆکەری ئەڵقە بەگوێی قەیفەو گووروو نییە، هەرچاوی لە بەرژەوەندی خۆییە، گوێ لەمستی نەوسنییە، بەشی بدرێ مەمنونییە، بەشی نەدرێ لەگەڵ دوژمنییە. داوەشێو سوێی بێتەوە ئەگەر دڕکێکی تێ هەڵچەقێ، بەمووکێشیش دەرنەیەتەوە!

خۆشی لەوبەندەیەی خودا، کەبەسەری ئاڵۆزکاوی، بەپێی تۆزاوی، لەرێگەی خودادا جڵەوی مایینەکەی خۆی دەگرێ ئەگەر بوو بەپاسەوان،

(٢٤٣) من المتفق عليه على ما قرّره العسقلاني في خاتمة كتاب الجهاد – المترجم.

ئەوا پێی رازییەو بەجوانی پێی هەڵدەستێ‌و، لەهێڵی یەکەمی جەنگا بەرابەر دوژمن ئێشکی سوپای ئیسلام دەگرێ، ئەگەر بوش بەپاشدارەی سوپا ئەوادیسان پێی رازییەو بەجوانی بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵدەستێ‌و، هەمیشە فەرمانبەرەو سەرپێچی لە فەرمانی فەرمانڕەواکەی ناکات، ئەگەر رێخوازی بکا تا بچێ بۆلای کەسێ، لەبەر بێ نازی رێی پێ نادرێ، ئەگەر تکا بۆ کەسێ بکا، لەلای مرۆڤێ تکای ناگرێ!) (تاج/٩/٢٩٢-١٦از-٩٤).

١١٨٩- عَنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى خَيْبَرَ أَخْدُمُهُ فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاجِعًا وَبَدَا لَهُ أُحُدٌ قَالَ: (هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ) (الحديث ٢٨٨٩، طرفُهُ في: ٢٣٥ت=٣٧١ف) [(٢٤٤)].

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) دەرچووین بۆ غەزای خەیبەر، خۆم لەو غەزایەدا لەخزمەتیدا بووم، خزمەتیم کرد، جا کاتێ گەڕاینەوە بۆ مەدینە، کە لەکێوی ئوحود نزیک بووینەوە، ئوحود لەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەرکەوت، فەرمووی: (ئەم چیایە ئێمەی خۆش دەوێ، ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ).

١١٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكْثَرُنَا ظِلاً الَّذِي يَسْتَظِلُّ بِكِسَائِهِ وَأَمَّا الَّذِينَ صَامُوا فَلَمْ يَعْمَلُوا شَيْئًا وَأَمَّا الَّذِينَ أَفْطَرُوا فَبَعَثُوا الرِّكَابَ وَامْتَهَنُوا وَعَالَجُوا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ) (الحديث ٢٨٩٠) [(٢٤٥)].

---

(٢٤٤) راجع رقم: ٢٣٥ — المترجم.

(٢٤٥) اخرجه مسلم في الصيام، باب: أجر المفطر في السفر.. رقم: ١١١٩.

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، لەسەفەرێکا بووین، گەیشتینە شوێنێ سێبەر نەبوو، ئەوەمان سێبەری گەورەی هەبوو کە عەبای پێبوو، لەباتی چاتوڵ دەیکرد بەسێبەر بۆ خۆی! ئەوانەشی کە لەو رەوتەنییەدا بەرۆژوو بوون هیچ خزمەتێکیان پێ نەکرا، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەوانەی کە بەرۆژوو نەبوون، هەموو کارەکان ئەوان کردیان، وڵاخەکانیان برد بۆ لەوەڕو بۆ سەرئاو، دەستیان کرد بەخزمەت کردنو نانو ئاویان بۆ ئامادەکردین.

پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) کە حاڵەکەی بینی فەرمووی: (پاداشی هەرە گەورە ئەمڕۆ ئەوانە بردیان کە بەرۆژوو نەبوون!).

١١٩١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ الْغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا) (الحديث ٢٨٩٢، أطرافُهُ في: ٢٧٩٤، ٣٢٥٠، ٦٤١٥، ٢٧٩٢، ٢٧٩٦، ٦٥٦٨) [٢٤٦]

(بڕوانە: ژمارە: ١١٥٠ت = ٢٧٩٢ف).

سەهلی کوڕی ئەل ساعیدی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (یەك رۆژ پاسەوانی سەر سنوور لەرێگەی خودادا لەهەموو موڵكو سامانی جیهان باشترە، بەقەد جێگەی شوێن قەمچییەك لە قەمچییەکانی ئێوە لەبەهەشتا، لەهەرچی وا لەسەر زەوی چاکترە، تاقێ کۆششو تێکۆشان لەرێگەی خودادا، چی تاقی بەیانی بێ، چی تاقی ئێوارە بێ، لەهەموو سامانو دەسەڵاتی جیهان چاکترە).

(٢٤٦) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: فضل الغدوةء الروحة.. رقم: ١٨٨١.

# پیتو فەڕی نزاو پاڕانەوی زەبوونان یەکێکە لەهۆی سەرکەوتن

١١٩٢- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ رحمهُ اللهُ تعالى قَالَ: رَأَى سَعْدٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاّ بِضُعَفَائِكُمْ). (الحديث ٢٨٩٦، طرفُهُ في: ٣٥٩٤، ٣٦٤٩) [٢٤٧].

موصعەبی کوڕی سەعد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم بۆی گێڕامەوە فەرمووی: خۆم بە گەورەتر دەزانی لەچاو کەسانی لەخۆم خوارترا، لەیارانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاری وا ناجوانە، چونکە لەڕاستی دا خودا کە ئێوە بەسەر دوژمنو ناحەزی خۆتان دا سەرتان دەخا، یارزقو ڕۆژیتان دەدا، لەبەر خاتری هەژارانو لازەبوونەکانتانە، بەهۆی نزاو پاڕانەوی بەکوڵی ئەوانەوەیە).

١١٩٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَأْتِي زَمَانٌ يَغْزُو فِئَامٌ مِنْ النَّاسِ فَيُقَالُ فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ فَيُفْتَحُ) (الحديث ٢٨٩٧، أطرافُهُ في: ٣٥٩٤، ٣٦٤٩) [٢٤٨]

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەردەمێ دادێ کۆمەڵێ خەڵك دەڕۆن بۆغەزا، دەڵێن: کەستان تیاهەیە کە هاوڕێتیی پێغەمبەری کردبێ، هەتا بەبەرەکەتی ئەوەوە خودا

(٢٤٧) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٦/١٩٥ خاتمة كتاب الجهاد) — المترجم.

(٢٤٨) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل الصحابة ثمّ الذين يلونهم.. رقم: ٢٥٣٢.

سەرتان بخات؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا لەو غەزایەدا زاڵیان دەکا،و سەردەکەون و ئەو شوێنە ئازاد دەکەن.

لەپاشا سەردەمێ تر دادێ عەشاماتێ تر دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەستان هەیە کە هاوڕێیەتی هاوڕێیانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخا.

لەپاشا سەردەمێ تریش دادێ، عەشاماتێ دەچن بۆ غەزا، دەڵێن: ئایا کەستان واتیا کە هاوڕێیەتی هاوڕێیانی یارانی پێغەمبەری کردبێ؟ دەڵێن: بەڵێ هەیە، ئیتر خودا ئەوانیش زاڵ دەکاو سەریان دەخاو، ئەو وڵاتەیش ئازاد دەکەن) (تاج/٥/٥ف-٤ز-١-ش. باسی گەورەیی هاوڕێیانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ).

١١٩٤- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ بَدْرٍ حِينَ صَفَفْنَا لِقُرَيْشٍ وَصَفُّوا لَنَا: (إِذَا أَكْثَبُوكُمْ فَعَلَيْكُمْ بِالنَّبْلِ) (الحديث ٢٩٠٠، طرفاهُ في: ٣٩٨٤، ٣٩٨٥) [(٢٤٩)].

ئەبوئوسەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەرۆژی بەدردا، لەوکاتەدا کەئێمەو لەشکری دوژمن بەرابەر یەکتری وەستاین،و ریز بووین بەرابەری یەکتر، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ نزیکەوە بوون لێتان، نیشانیان دا، ئەوحەلە تیربارانیان بکەن) (تاج/٨/١٠٦-٤ز-٣٤- باسی تیرئەندازیی).

ئەبوئوسەید ناوی مالیکی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی بەدنە، ئەنصارییە، ئامادەی غەزای بەدرو ئوحودو شەهیدگاکانی تر (مشاهد)ەکانی تر بووە، لەرۆژی ئازادی (فەتح)ی مەککەدا ئاڵای هۆزی بەنی ساعیدە بەو بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، لەسەر فەرمایشتی هەدی

---

(٢٤٩) لم يوافقه مسلم على حديث ابي أسيد: (إذا اكثبوكم) (فتح/٦/١٩٥خاتمة كتاب الجهاد) -المترجم.

ساری موقەددیمەی فەتحولباری، چواردە فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، کە دیارە ئەمە یەکێکیانە.

ئەم زاتانە فەقێی بوون: کوڕەکانی خۆی: حەمیدو زوبەیرو مونزیر، هەروا عەلی کوڕی عوبەیدو ئەبو سەعید کەئازادکراوی خۆی بوون، لەهاوڕێیان: ئەنەس و سەهلی کوڕی سەعد، لەپەیڕەوان (تابیعین = چینی دووەمی موسوڵمانان) : عەباسی کوڕی سەهل و عەبدول مەلیکی کوڕی سەعیدی کوڕی سووەیدو ئەبو سەلەمەو کەسانی تریش، پێشەوا واقیدی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (کورتە باڵایەکی سەرسپی ریش سپی، تووکن بوو) لەکۆتایی تەمەنیدا چاوی نەمابوو. شەش فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە. لەتەمەنی دەوری حەفتاو پێنج ساڵی دا، لەمەدینەی نازدار کۆچی دوایی کردووە، دواهەمین کەس بووە لەبەدریەکان کە مردووە. (رمزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ). (بڕ: تاج/٥/١٨٧ز-٤٨، باسی چاکی موعاذی کوڕیجەبەل).

## باسی هەندێ کەرەستەی جەنگ و هەندێ وردە بابەتی تری کاتی جەنگ

١١٩٥-عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّا لَمْ يُوجِفْ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاصَّةً وكان يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ مِنْهَا نَفَقَةَ سَنَتِهِ ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ) (الحديث ٢٩٠٤، أطرافُهُ في: ٣٠٩٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٥٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥) [٢٥٠]

---

(٢٥٠) أخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: حكم الفيئ، رقم: ١٧٥٧

عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەو ماڵو تالآنییە کە لەماڵی هۆزی بەنی‌نەضیری جولەکە دەستی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کەوت خودا خۆی دەستی پێغەمبەری(دروودی خوای لەسەر بێ) خستبوو، موسوڵمانان بەتاودانی ماینو ئەسپو بەغاردانی وشتر و، بەجەنگ پەیدایان نەکردبوو، وەئەو ماڵو تالآنییە بەر بڕیاری ئەم ئایەتە دەکەوێ ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلا رِكَابٍ﴾: ئەوەی کە خودا دەست پێغەمبەری خۆی خست، لەماڵی مفتی بێ ئارەقی هۆزی بەنی نەضیر، ئێوە — ئەی لەشکری ئیسلام! — بۆ بەدەستهێنانی ئەو ماڵو سامانە، هیچ ئەسپو وشترێکتان تاونەدابوو، بەڵکوو خودا بەبەخششی خۆی ڕەخساندبووی بۆی.

عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا لەبەر ئەوە ئەو ماڵو سامانە بەتایبەتی بوو بوون بەهی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئازوقەو مەسرەفو خەرجی ساڵێکی خێزانو کەسو کای خۆی لێ دادەناو، هەرچی لەوە دەمایەوە، دایدەنا بۆ ئیشو کارو پێویستی موسوڵمانانو خەرجی دەکرد بۆ ئامادەکردنی جەنگو تفاقی جەنگو ولآخ، لەڕێگەی خودادا، دەیکرد بەکەرەستەی جەنگ. (تاج/٧/١٨٨ف-٣ز-٤٢-سوورەتی حەشر-ش/د/ت/ن).

١١٩٦- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُفَدِّي رَجُلاً بَعْدَ سَعْدٍ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي) (الحديث ٢٩٠٥، أطرافُهُ في: ٤٠٥٨، ٤٠٥٩، ٦١٨٤) (٢٥١).

ئیمامی عەلی(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بۆ سەعدی کوڕی مالیك نەبێ، پێغەمبەرم نەدیوە باوكو دایکی پێکەوە بکا بەقوربانی کەسێ، بەڵام لەڕۆژی غەزای ئوحوددا خۆش خۆش بەسەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی دەفەرموو: (دەی تیریان پێوەنێ، باوكو دایکم بەقوربانی ئەو دەستو نیشانەت بێ! ئەی

(٢٥١) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضل سعد بن أبي وقاص، رقم: ٢٤١١.

ڕۆڵەی نەبەردی چاونەترسی جەربەزە) (تاج/٨٦/٥ز-١٢-گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص).

١١٩٧-عنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه يَقُولُ: لَقَدْ فَتَحَ الْفُتُوحَ قَوْمٌ مَا كَانَتْ حِلْيَةُ سُيُوفِهِمْ الذَّهَبَ وَلا الْفِضَّةَ إِنَّمَا كَانَتْ حِلْيَتُهُمْ الْعَلابِيَّ وَالآنُكَ وَالْحَدِيدَ) (الحديث ٢٩٠٩) [٢٥٢].

ئەبو ئومامە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە چییە دەبینم هەندێکتان مشتووی شمشێرەکانتان بەزێڕو زیو ڕوو کەش کردووە! شتی وا لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبووە، ئەوانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەرو هاوڕێکانی ئەودا، کە ئەو هەموو وڵاتانەیان ئازاد کرد، هیچیان خشڵی شمشێرەکانیان زێڕو زیو نەبوو، بەڵام ئەوان خشڵی چەكو شمشێرەکانیان شاڕەگی ملی وشترو سیرمەو قورقوشمو ئاسن بوو.

١١٩٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي قُبَّةٍ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ الْيَوْمِ) فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ وَهُوَ فِي الدِّرْعِ فَخَرَجَ وَهُوَ يَقُولُ: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ بَلْ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾) وَفِي روايةٍ: يَوْمَ بَدْرٍ) (الحديث ٢٩١٥، أطرافُهُ في: ٣٩٥٣، ٤٨٧٥، ٤٨٧٧) [٢٥٣].

ئیبنو عەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەڕۆژی غەزای بەدردا، لەناو چاتۆڵێکا بوو، کاتێ لەشکری موسوڵمانانو لەشکری نا موسوڵمانانی هەڵسەنگاند، خەمو پەژارە دایگرت لەبەر کەمی خۆیانو زۆریی ئەوان، جا لەبەر ئەوە زۆر بەکوڵو بەدڵ دەستی کرد بەنزاو پاڕانەوەو

---

(٢٥٢) لم يوافقه على حديث أبي أمامة في حلية السيوف (فتح/٦/١٩٥) المترجم.

(٢٥٣) اخرجه مسلم في غزوة بدر، (صح/١٢ص٨٤) - المترجم.

فەرمووی: (اللهمَّ إنّي أنشدكَ عهدَكَ وَوَعدَكَ، اللهمَّ إنْ شئتَ لمْ تعبَدْ بعدَ اليومِ) : ئەی خودای من! تو خوا! ئەو پەیمانو بەڵێنەی کە داوتە پێم، بۆمی بەجێ بێنەو بیهێنەرە دی بۆمو سەرم بخە، بەسەر ئەم دوژمنانەدا، خودایە! خۆت باش باش دەزانی ئەگەر منو ئۆمەتم لەم شەڕی مانو نەمانەدا، بەدەستی ناموسوڵمانەکان لەناو بچین، ئیتر کەسێ نامێنێ لەسەر رووی زەوی کە لەسەر شێوەیەکی رەوا تۆ بپەرستێ، کەوایە: ئەگەر خۆت هەوەست هەیە ئەوا ئیتر لەپاش نەمانی ئێمە کەس تۆ ناپەرستێ!).

هەتا ئەبوبەکر چوو دەستی گرتو فەرمووی پێی: قوربان! ئیتر بەسە بەراستی ورکی تەواوت لە پەروەردگاری خۆت گرت، بێگومان کە خودا دێت بەهاوارتەوە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کە لەم کاتەدا زریەی لەبەردا بوو، جا لەچاتۆڵەکە هاتە دەرەوەو مژدەی دا بەهاوارێیانیو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ﴾ ئەنفال ٥٤/٥٤ – واتە: بزانن کە بەم زوانە ئەو کۆمەڵەی کە ئێوە پێیانەوە دەنازن دەشکێنو پشتیان دەشکێو بەشکانێکیوا دەشکێن، قوشقنە قەومت بەرەودوا هەڵدێنو کونە مشکیان لێ دەبێ بەقەیسەری.(تاج/٦/١٨١ز-٩ سوورەتی ئەنفال ف-٣-).

١١٩٩ –عَنْ أَنَس أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصٍ مِنْ حَرِيرٍ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا) (الحديث ٢٩١٩، أطرافُهُ في: ٢٩٢٠، ٢٩٢١، ٢٩٢٢، ٥٨٣٩) (٢٥٤).

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی عەبدو ڕەحمانی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوامی دا، کە ئاوریشم لەبەر بکەن، چونکە ئاڵۆشو خوروکەیێ لە لەشیان هەبوو. (تاج/٤/١٠٠ف-٨ز-٢٩- نامەی جلو بەرگ – ش/د/ت).

---

(٢٥٤) أخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: اباحة لبس الحرير للرجل...، رقم: ٢٠٧٦.

لەگێڕانەوەیەکا ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەورەحمانی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوام، لەغەزایەکا، لەدەست ئەسپێ سکالآیان لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) کرد، ئەویش ڕێگەی دان کە کراسی ئاوریشمین لەبەر بکەن، وە لەو غەزایەدا لەبەریان کرد. (تاج/٤/١٠١ف-٩).

## شەڕ لەگەڵ هەندێ نەتەوەدا

١٢٠٠- عنْ أُمِّ حَرَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) أَنَّهَا سَمِعَتْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا) قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا فِيهِمْ؟ قَالَ: (أَنْتِ فِيهِمْ) ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ مَغْفُورٌ لَهُمْ فَقُلْتُ: أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا) (الحديث ٢٩٢٤، أطرافُهُ في: ٢٨٠٠، ٢٨٧٨، ٢٨٩٥، ٢٩٢٤، ٦٢٨٣، ٧٠٠٢ راجع: ٢٧٩٩، ٢٨٧٧، ٢٨٩٤، ٦٢٨٢، ٧٠٠٢) [٢٥٥].

ئوم حەرام (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەپێغەمبەرم ژنەوت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (یەکەم سوپا لەئۆمەتم، کە لەدەریاوە غەزا دەکەن، بەهەشتیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە). ئوم حەرام فەرمووی: گوتم: قوربان! منیان تیام؟ فەرمووی: (بەلێ تۆیان تیای) لەپاشا فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (یەکەم سوپا لەئۆمەتم، کەشارەکەی قەیسەری ڕۆم غەزا دەکەنو ئازادی دەکەن، کەشاری قەسطە نطینیەیە، خودا لێیان خۆش دەبێ). گوتم: قوربان! ئایا منیان تیام؟ فەرمووی: (نەء).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئوم حەرام (رەزای خودای لێ بێ) کچی میلحانە، خوشکی ئوم سولەیمی دایکی ئیمامی ئەنەسە، ژنی عوبادەی کوڕی صامیتە، لەگەڵ مێردەکەی دا چوون بۆ

(٢٥٥) اخرجه مسلم في الجهاد (عيني/١٤ص٨٥) - المترجم.

غەزای قیبرس، کە لەقەراخ دەریا دابەزی، ولآخێکیان بۆ هێنا سورای بێ، ولآخەکە خستیە خوارەوەو مرد، لەخاکی قیبرص نێژراوە، ئەمەیش لەساڵی بیستو حەوتی کۆچیدا بوو، موعاویە (رەزای خوای لێ بێ) فەرماندەی ئەو غەزایە بوو، ئیمامی عوسمان جێنشینی سەردەم بوو، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە (ڕەزای خودای لێ بێ).

١٢٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (تُقَاتِلُونَ الْيَهُودَ حَتَّى يَخْتَبِيَ أَحَدُهُمْ وَرَاءَ الْحَجَرِ فَيَقُولُ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ) (الحديث ٢٩٢٥، طرفُهُ في: ٣٥٩٣) [٢٥٦].

ئەم فەرموودەیە لەتاج دا ئاوایە کە دەفەرموێ: بوخاریو موسلیمو تەرمەزی گێڕاویانەتەوە، (بڕوانە ژمارە ١٢٠٢ت=٢٩٢٦ف) :

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ، هەتا موسوڵمانان دەچن بەگژ جوولەکەدا، جوولەکە شەڕتان لەگەڵ دەکەن، تا لەئەنجامدا خودا ئێوە زاڵ دەکا بەسەر ئەواندا، کاتێ موسوڵمانەکان دەست دەکەن بەکوشتاریان جوولەکەکان وادەشکێن، لەبن بەردو دارو بنچكو دەوەندا خۆیان پەنا دەدەنو خۆیان دەشارنەوە، بەردو دارو درەختو دەوەنەکە دەڵێن: ئەی کاکەی موسوڵمان! ئەی بەندەی باشی خودا! ئەی عەبدی خاسی خوا! ئەمە جوولەکەیەکە لەپشتمەوە خۆی حەشارداوە، وەرە ئەم دوژمنی خودا بکوژە، تەنیا داری درگەزی وانالێ، چونکە ئەمە لەدرەختی جوولەکەیە، راستییان لێ نالێ). (تاج/١٠ل-٢٨٥ف-١٤ز-١٠٥- باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت).

---

(٢٥٦) رواه مسلم في الفتن وأشراط الساعة، (صم/ ١٨ص٤٤) - المترجم.

١٢٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا الْيَهُودَ حَتَّى يَقُولَ الْحَجَرُ وَرَاءَهُ الْيَهُودِيُّ يَا مُسْلِمُ هَذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ) (الحديث ٢٩٢٦) [٢٥٧]

وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی لەژمارەی پێشوو (١٢٠١) دا رابوورد.

١٢٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ صِغَارَ الأَعْيُنِ حُمْرَ الْوُجُوهِ ذُلْفَ الأُنُوفِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ وَلا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمْ الشَّعَرُ) (الحديث ٢٩٢٨، أطرافُهُ في: ٢٩٢٩، ٣٥٨٧، ٣٥٩٠، ٣٥٩١) [٢٥٨]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێ هەتا جەنگ لەگەڵ تورك دا نەکەن، نیشانەی ئەم هۆزەی تورك ئەوەیە: چاو بچکۆلەن، ڕەنگ سوورو سپین، لووت کورتو لوت داتەپیون، ڕوویان لەبەر خڕیو قەڵەوی دەڵێی قەڵخانەو بەسیرمەی زۆر دەورە گیراوە، قیامەت هەڵناسێ هەتا لەگەڵ هۆزێکی تر ئێوەی نەتەوەی موسوڵمان دەجەنگنو شەڕ دەکەن، پێڵاوی موو لەپێ دەکەن!). (تاج/٢٥٧/١٠ف١-از-٩٨. غەزاکردن لەگەڵ توركو حەبەشەدا).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

لەڕاستیدا زۆرینەی نیشانەکانی قیامەت کە لەفەرموودەی ساغو سیرەتو ژیاننامەی دروستی پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) چەسپاون زۆر زۆرن، هەندێکیان پێیان دەگوترێت نیشانەی بچوك، هەندێکین پێیان دەگوترێت:

(٢٥٧) اخرجه مسلم في الفتن وأشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يمرّ الرجل.. رقم: ٢٩٢٢.

(٢٥٨ ) اخرجه مسلم في الفتن وأشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يمرّ الرجل بقبر الرجل... رقم: ٢٩١٢.

نیشانەی گەورە لەڕاستیدا ئەم نیشانانە سێ شتیان پێ دەچەسپێ دوانیان لەبەشی هەواڵدان لەغەیبن چونکە:

١- هەندێکیان کە ئەم جۆرە فەرموودەن پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) چۆنی فەرمووە، لەپاش سەدان ساڵ هاتوونەتەدی. هەتا هەیانە ناوی کەسێکی تایبەتی تیایە، هەیانە ناوی شوێنێ، وەك بەصرە، فەلەستین... تاد.

٢- هەیانە باسی کارەساتی سروشتیو شتی وایە، ئەمانەشیان زۆرتریان هاتوونەتەدی وەك زۆر بوومەلەرزەو خەسف.

جا باشترین شت لەم لایەنەوە ئەوەیە کە خۆمان بەتاعەتی خواوە خەریك بکەینو لەنزاو پاڕانەوە بۆ ئوممەتی موحەممەد درێغی نەکەین، دەنا لەم لایەنەوە دەسەڵاتی هیچمان نییە، وەئەم باسانە بەتێرو تەسەلی لەبەرگی پێنجەمی تاجول ئوصولدا بەشی عەرەبی هەیە ص ٣٠٠ هەتا ص٣٥٨ لەوەرگەڕاوە کوردیەکەیدا لەبەرگی/١٠ل-٢٠٥ز-٨٧ هەتا ل-٣٥٠ز- ٨٧ هەتا ١١٥.

## لەکاتی جەنگ دا نزاو پاڕانەوە پەسەندەو بەسوودە (هەروا لەسەرتاوە بانگ بکرێن بۆ سەر ئایینی ئیسلام)

١٢٠٤- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) يَقُولُ: دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الأَحْزَابِ عَلَى الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ اللَّهُمَّ اهْزِمْ الأَحْزَابَ اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ) (الحديث ٢٩٣٣، أطرافُهُ في: ٢٩٦٥، ٣٠٢٥، ٤١١٥، ٦٣٩٢، ٧٤٨٩) [٢٥٩].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەقا، کەناودەبرێ بە جەنگی ئەحزابیش، واتە: گەلەکۆمە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) زۆر پاڕایەوەو، نزای شەڕی لەناموسوڵمانەکان کردو،

(٢٥٩) اخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: كراهة تمني لقاء العدو، باب: استحباب الدعاء بالنصر.. رقم: ١٧٤٢.

فەرمووی: : (اللّٰهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ اللّٰهُمَّ اهْزِمْ الأَحْزَابَ اللّٰهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ): ئەی خودایە! ئەی ئەو کەسەی کە قورئانت بەخەلأت ناردووە بۆ موحەممەد! ئەی خودایە! ئەم کۆمەڵەی لەشکری کوفرە کەلەدژی ئیسلام گەلەکۆمەیان کردووە، تێك شکێنەو بیان بەزێنە،و بیان شلەژێنەو، بیان شڵەقێنە!. (تاج/٨/١٢٣ف-١ +٢ز-٤٨).

## لەدەمەدەمی گەرمەی جەنگا پاڕانەوە پەسەندە

١٢٠٥-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) أَنَّ الْيَهُودَ دَخَلُوا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ فَلَعَنْتُهُمْ فَقَالَ: (مَا لَكِ) قُلْتُ: أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: (فَلَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ؟ وَعَلَيْكُمْ) (الحديث ٢٩٣٥، أطرافُهُ في: ٦٠٢٤، ٦٠٣٠، ٦٢٥٦، ٦٣٩٥، ٦٤٠١، ٦٩٢٧) [٢٦٠].

بۆ روونکردنەوە: ی ئەم فەرموودەیە ریوایەتەکەی تاج راگوێزدەکەین:

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: تاقمێ جوولەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کەهاتن لەباتی سڵاو گوتیان: (السَّامُ علیكَ) مردن بۆ تۆ: مەرگ بێ بەمیوانت، منیش تێی گەیشتمو گوت: (وعلیكُمُ السَّامُ واللعنَةُ) : مەرگ بۆ ئێوە لەگەڵ نەفرەتو لەعنەتدا، پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی عائیشە! هێواش هێواش! لەسەرە خۆبە، لەراستیدا خودا نەرمو نیانیو لەسەرەخۆیی لەهەموو شتێکدا پێ خۆشە!) منیش گوتم: ئاخر ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ گوێت لێ نەبوو کە گوتیان چی؟ فەرمووی: (با. تێ گەیشتم، بۆیە منیش ئاوا وەلأمم دانەوە، (وعلیكم) ئەوەی گوتان لەسەر خۆتان بێ واتە: مەرگ بۆ ئێوەش).(تاج/١٠ل-١٢٣ف-٤ز-٣٧. سڵاوکردن لەخاوەن نامەکان + تاج/٧ل-١٨٣ز-٤١ باسی سوورەتی مجادله ف-٢).

(٢٦٠) أخرجه مسلم في السلام، باب: النهي عن ابتداء أهل الكتاب بالسلام.. رقم: ٢١٦٥.

**راڤەو شیکردنەوە:**

پەیوەنـــدی ئـــەم فەرموودەیـــە بەباتەكـــەوە لـــەو رســـتەیەدایە، كەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وعليكُمْ: مـەرگ بۆخۆشـتان) چونكە ئەمـەش هـەر نزایـەو، سڵاوكردن لـەخاوەن نامـەكان، هـەروەها لەهـەموو ناموسوڵمانێـكی تـر، بابەتێـكی فـره لقـە لـەناو زانایانـا راجیـایی زۆر لـەم بابەتـەدا هەیـە. بـەڵام فـەرقی رۆژ بـاش‌و شـەو بـاش‌و چۆنی‌و چاكی لەگـەڵ (الـسَّلامُ علـيكمۦ رحمـةُ اللهِ بركاتـهُ) هەیـە، لـەم رۆژگـارەی ئێمـەدا رۆژبـاش‌و سڵاوكردن لەناموسـوڵمان، بـەپێی كـات‌و شـوێن‌و كـەس بڕیارەكـەی دەگۆڕێ، بـەڵام بەشـێوەیەكی گـشتی رۆژبـاش‌و سـلام علـيكم دروسـتە، دەنـا مـرۆی موسوڵمان بەمتوحش‌و كێوی دادەنرێ.

١٢٠٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ: قَدِمَ طُفَيْلُ بْنُ عَمْـرٍو الدَّوْسِـيُّ وَأَصْحَابُهُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ دَوْسًا عَـصَتْ وَأَبَتْ فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا فَقِيلَ هَلَـكَتْ دَوْسٌ قَـالَ: (اللَّهُـمَّ اهْـدِ دَوْسًـا وَأْتِ بِهِـمْ) (الحديث ٢٩٣٧، طرفاهُ في: ٤٣٩٢، ٦٣٩٧)[٢٦١].

ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: طوفـەیلی كـوڕی عـەمر، لەمەككە دەچێ بۆ خزمـەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئیسلام دەبێ، ودەبێ بەنوێنـەری پێغەمبەر لەناو هۆزەكەی خۆیدا، وەلەناویانا مایەوە هـەتا لـەپاش كۆچكردن لەغەزای خەیبەردا، لەگەڵ دەوری هەشـتا كەسـێ لـەهاوڕێیانی كەئیـسلام بـوو بـوون، هـاتن بـۆ خزمـەتی حـەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) عـەرزیان كـرد: قوربـان! دەوس یاخی‌و سەركەش بوون‌و لەڕێ دەرچوون. نزایبەدیان لێ بكە، گـوترا: ئای دەوس لەناوچوون چونكە پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نـزای خراپیـان لـێ دەكـا، نـزای پێغەمبـەریش گیرایـە، كەواتـە: دەوس تیادەچـێ. بـەڵام

---

(٢٦١) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل غفار و أسلم وجهينة..، رقم: ٢٥٢٤.

بەپێچەوانەوە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نزای باشی بۆ کردن و فەرمووی: (خودایە! بەمیهرەبانی خۆت رێگەی راست نیشانی هۆزی دەوس بدەو، بەموسوڵمانی کێشیان بکە بۆ ناو ئێمە).

## راڤەو شیکردنەوە:

بەناوی خوداوە. طوفەیلی کوڕی عەمر، دەوسییە، لەهۆزی دەوسە، ئەبو هورەیرەش لەهەمان هۆزە، لەمەککە هاتە خزمەتی حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) موسوڵمان بوو، رۆیشتەوە بۆ ناو هۆزەکەی وە زۆر لەگەڵیاندا خەریك بوو کە موسوڵمان ببن، سوودی کەم بوو، تا لەغەزای خەیبەردا لەگەڵ نزیکەی هەشتا کەسێکا لەهۆزەکەی کەیەکێکیان ئەبوهورەیرە بوو هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەبوهورەیرەو ئەو کۆمەڵە موسوڵمان بوون، طوفەیلیش لەمەدینە نیشتەجێ بوو تا کاتی مەرگی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ).

طوفەیل(رەزای خوای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هۆزی دەوس لەدەس دەرچوون، یاخی بوون، مل نادەن، نزای شەڕیان لێ بکە بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) نزای هیدایەت و رێنمایی بۆ کردن، ئیتر یەکسەر طوفەیل زانی کەنزاکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) گیرایە، لەبەر ئەوە یەکسەر داوای لەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کرد، کە ئەو بنێرێ بۆ ناویان و خەواریق و نیشانەیەکی وایشی پێ بدا کە ببێ بەهۆی موسوڵمان بوونیان، فەرمووی: (خودایە! طوفەیل نووراوی بفەرموو!) ئیتر نوورێکی گەش لەنێوانی هەردووچاوی پەیدا بوو.

طوفەیل فەرمووی: خودایە! دەترسم بڵێن: ئەمە خوای ئێمە پێی نواندووە، کە لەئایینی ئێمە هەڵگەڕاوەتەوە، بۆیە خوا رووی شێواندووە! جا بەفەرمانی خوا نوورەکە گوازرایەوە بۆ کلکی قەمچییەکەی، سەری

قەمچییەکەی وەك چرا بەشەو دەگڕاو، لەشەوی تاریکا دەوروبەرو بەردەمی خۆی وەك چرا ڕۆشن دەکردەوە، جا لەبەر ئەم کەرامەتە طوفەیلیان ناونا: (ذوالنور) واتە: نووردار: خاوەن نوور. خۆی دەفەرموێ: جاری وادەبوو سواری وشتر دەبووم بەشەو، وەك چرایێ هەڵواسرابێ بەنوکی قەمچیەکەمەوە ئاوا بوو، بەردەمی خۆمی بۆ روون دەکردمەوە. طوفەیل(ڕەزای خوای لێ بێ) ساڵی غەزای یەرموك لەسەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لەم غەزایەدا شەهید بووە(ڕەزای خوای لێ بێ).

ئەمڕۆ کەشەوی ئیسراو میعراجە ساڵی: ١٤٢٤ ك، بیستو حەوتی مانگی رەجەبە بەرێکەوتی ٢٠٠٣/٩/٢٣ یە، حەزدەکەم ئەم چەند سەرنجە تۆمار بکەم:

١- دنیا کشو مات وەك ماری تەزیو

هاکا لەپڕ بور بەبۆمبی تەقیو!

٢- همزةٌ قد قاد جيش الفيلِ

خانَ الحمى، ملعونٌ كلّ جيل(٢٦٢)

٣- ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.

١٢٠٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ يَوْمَ خَيْبَرَ: (لأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلاً يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ) فَقَامُوا يَرْجُونَ لِذَلِكَ أَيُّهُمْ يُعْطَى فَغَدَوْا وَكُلُّهُمْ يَرْجُو أَنْ يُعْطَى فَقَالَ: (أَيْنَ عَلِيٌّ؟) فَقِيلَ: يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ فَأَمَرَ فَدُعِيَ لَهُ فَبَصَقَ فِي عَيْنَيْهِ فَبَرَأَ مَكَانَهُ حَتَّى كَأَنَّه لَمْ يَكُنْ بِهِ شَيْءٌ فَقَالَ: نُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكونُوا مِثْلَنَا فَقَالَ: (عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلامِ وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ فَوَاللَّهِ لأَنْ يُهْدَى بِكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ) (الحديث ٢٩٤٢، أطرافُهُ في: ٣٠٠٩، ٣٧٠١، ٤٢١٠) (٢٦٣).

---

(٢٦٢ ) (قد= ١٠٤) رەمزی سوورەتی همزیە (قاد= ١٠٥) ژمارەی سوورەتی فیلە (وەرگێڕ).

(٢٦٣) اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: من فضائل علي بن ابي طالب (رضي الله عنه) ، رقم: ٢٤٠٦.

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای خەیبەردا گوێم لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بوو، فەرمووی: ئەم ئالآیە سبەینێ دەدەم بەپیاوێ، خوداو پێغەمبەری خودای خۆش دەوێ، خوداو پێغەمبەری خواش ئەویان خۆش دەوێ، لەسەر دەستی ئەودا خودا خەیبەر ئازاد دەکا، ئیتر ئەو شەوە هەتا بەیانی خەڵکەکە هەر رمڵیان لێ دەدا ئاخۆ ئالآکە دەدرێ بەکێ، وەکام لەوان ئەم شانازییە بێ مانەندەی دەست دەکەوێ، جا کە رۆژەوە بوو مەردومەکە زوو چوونە خزمەتی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) هەرکەسەیان لەدڵەوە بەتەما بوو کە ئالآکە بدرێ بەو، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (عەلی کوڕی ئەبوطالیب لەکوێیە؟) عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هەردووچاوی دێشێن. فەرمووی: (بنێرن بەشوێنیا).

کە عەلی هات، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) تفی خۆی کردە ناو هەردوو چاوەکانیەوەو، نزای چاکبوونەوەی بۆی کرد بۆیپاڕایەوە، ئیتر دەست بەجێ چاوەکانی واچاك بوونەوە. دەتگوت کەهەر چاوی نەئێشاوە! ئەوسا ئالآکەی پێدا، عەلی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا وەك ئێمەیان لێ دێ هەر شەڕیان لەگەڵ بکەم؟

فەرمووی: (بەئاهێستەو هێدیو هێواشی لەسەرەخۆ لەگەڵ سوپاکەتا بکشێو بڕۆن هەتا دەچیتە مەیدان بۆیانو دەگەیتە قەراخ ماڵەکانیان، لەوێ بانگیان بکە بۆ موسوڵمان بوون، ئەوەی مافی خودایەو لەئایینی ئیسلاما لەسەریان پێویستە، ئەوەیان بۆ روون بکەرەوە، جا ئەگەر ژنەوتیانو ئیسلام بوون ئەوا باشە، ئەگینا ئەوسا شەڕ بکەن لەگەڵیانا، دەسا بەو خودایەی کەکەسی لەرەنگ نییە ئەگەر بەهۆی تۆوە خودا تاقە پیاوێ رێنمایی بکا، رێگای راستی ئایینی خودای پێ نیشان بدا، ئەوە بۆ تۆ باشترە لەهەرچی وشتری سوور هەیە، کە نایابترین ماڵی عەرەبە) (تاج/٥/٦٠-٢. گەورەیی ئیمامی عەلی-ش+ تاج/١/ل-٨٦/ز-١٥/ف-٥. باسی راگەیاندنی زانست پێویستە).

## خواحافیزیو دەرچوون بۆ سەفەرو بۆ غەزا لەرۆژی پێنج شەممەدا سوننەتە

١٢٠٨- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كَانَ يَقُولُ لَقَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْرُجُ إِذَا خَرَجَ فِي سَفَرٍ إِلاَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ) (الحديث ٢٩٤٩، أطرافُهُ في: ٢٩٤٧، ٢٩٤٨، ٢٩٤٩، ٢٩٥٠، ٣٠٨٨، ٣٥٥٦، ٣٨٨٩، ٣٩٥١، ٤٤١٨، ٤٦٧٣، ٤٦٧٦، ٤٦٧٧، ٤٦٧٨، ٦٢٥٥، ٦٦٩٠، ٧٢٢٥) (٢٦٤).

کەعبی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەم وادەبوو، کەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەرچێ بۆ سەفەر لەغەیری ڕۆژی پێنج شەممەدا، هەمیشە حەزی دەکرد کە لەڕۆژی پێنج شەممەدا دەرچێ بۆ سەفەر.(تاج/٨/٨٤. باسی سەفەر. ز-٢٤).

١٢٠٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْثٍ وَقَالَ لَنَا: (إِنْ لَقِيتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا لِرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ سَمَّاهُمَا فَحَرِّقُوهُمَا بِالنَّارِ) قَالَ: ثُمَّ أَتَيْنَاهُ نُوَدِّعُهُ حِينَ أَرَدْنَا الْخُرُوجَ فَقَالَ: (إِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحَرِّقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا بِالنَّارِ وَإِنَّ النَّارَ لا يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللَّهُ فَإِنْ أَخَذْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا) (الحديث ٢٩٥٤، طرفُهُ في: ٣٠١٦) (٢٦٥).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەناو کۆمەڵەیێ لەسوپادا، ناردینی بۆ فەرمانێ فەرمووی پێمان: (ئەگەر فیسارەکەسو فیسارەکەستان تووشبوو بەئاگر بیانسوتێنن) ناوی دوو پیاوی قورەیشی بۆ دیاری کردین، فەرمووی: جا لەوکاتەدا کە دەرچووین پێش

(٢٦٤) من المتفق عليه (عيني/١٤ص٢١٦) حيث قال: وذكر صاحب التلويح بعد ذكر هذا الحديث الحديثين بعده: خرجه الستة.. — المترجم.

(٢٦٥) قال العسقلاني: لم يوافقه على حديث أبي هريرة في التحريق (فتح/٦/١٩٥) — المترجم.

ئـەوەی كـە بكەوینـە ڕێ، بـۆ خواحـافیزی چـووینەوە بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئـەوە بـوو مـن فـەرمانم پێكردبـوون كەهەر كاتێ تووشی ئـەو دووپیاوە بـوون، مۆڵـەتیان مـەدەن بـەئاگری سوور بیانسوتێنن، بەڵام لەراستیدا هەر بۆ خوا هەیە كە بەئاگر سزای كەسێ یا شتێ بدا، لەبەر ئەوە ئەگەر بەرهەوێڵتان كەوتن بەئاگر مەیانـسوتێنن، بـەڵام بەكوشتن بیانكوژن).

عەینیو مامۆستای حافظ أحمد كوڕی عـەلی كوڕی حەجـەر عەسقەلانی (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ) سـەبارەت بـەم دوو پیاوە دەفـەرموون: ناویـان هـەبباری كـوڕی ئەسـوەدو نـافیعی كـوڕی عەبدقـەیس بـووە، بەرهـەوێلی ئـەو لقـە هەناردەیـە ناكـەون، هـەبار دوایـی موسوڵمان دەبێو موسـوڵمانێ جوانی لـێ دەردەچێ، خەڵك لەسەر رابووردوی خراپی لەپاش موسوڵمان بـوونی جمێنـی پـێ دەدەن، سـكاڵای ئـەوە لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) دەكـا، دەفەرموێ: (تۆش جمێنیان پێ بدەرەوە). ئیتر خەڵكەكە وازیان لێ هێنا.

بەڵام چارەنووسی نافیعی كوڕی عەبدقەیس دیـار نییـە، رەنـگ بـێ پـێش موسوڵمان بوونی مردبێ. (تاج/٨ل-١٣١ف-١ز-٥٣)

## فەرمانبەریی فەرمانڕەواو پەیمان پێ دانی

١٢١٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: (السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ حَقٌّ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِالْمَعْصِيَةِ فَإِذَا أُمِـرَ بِمَعْـصِيَةٍ فَـلا سَـمْعَ وَلا طَاعَةَ) (الحديث ٢٩٥٥، طرفُهُ في: ٧١٤٤) [٢٦٦].

ئیبنـو عومـەر(رەزای خوایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (گوێڕایەڵیو فەرمانبەری فەرمانڕەوا مافێكی رەوایە لەئەستۆی

(٢٦٦) اخرجه مسلم في المغازي (عيني/١٤/٢٢١) – المترجم.

ملەتدا بەمەرجێ فەرمان نەکرێ بە نافەرمانی خودا، دەنا ئەگەر شتی واکرا نە گوێڕایەڵی دەمێنێو نە فەرمانبەریی).

١٢١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سمعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يقول: (نحنُ الآخرون السّابقون) ويقول: (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللّٰهَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللّٰهَ وَمَنْ يُطِعْ الأَمِيرَ فَقَدْ أطَاعَنِي وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي وَإِنَّمَا الإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللّٰهِ وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذَلِكَ أَجْرًا وَإِنْ قَالَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ مِنْهُ) (الحديث ٢٩٥٧، طرفُهُ في: ٧١٣٧) (٢٦٧).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم ژنەوتووە، دەیفەرموو: (هەر کەسێ فەرمانبەری من بکا ئەوە فەرمانبەری خودا دەکا، چونکە من هەموو شتێ لەسەر فەرمانی ئەو دەکەم، وە هەر کەسێ لەفەرمانی فەرمانڕەوای من دەربچێ ئەوە لەفەرمانی من دەردەچێ). وەفەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (پێشەوای ئیسلام قەڵایە، موسوڵمان لەدەوری پوورە دەدەن و لێی کۆدەبنەوەو، لەگەڵیا جەنگ دەکەن لەدژی دوژمن، لەهەمان کاتا پشتو پەناشە بۆیان، جا ئەگەر فەرمانی کرد بەلەخواترسیو، پێشەوایەکی دادپەروەر بوو، ئەوە لەجیاتی ئەوە پاداشتێکی گەورەی بۆ هەیە، وەئەگەر فەرمانیشی کرد بەشتێکی تر، ئەوە شتێکی ترە). (تاج/٣/٢٧٧-ا/ز-١٠٥ش/ن + ز-١٠٦ل-٢٨٦-٣-ش).

١٢١٢- عنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما) قال: رَجَعْنَا مِنْ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فَمَا اجْتَمَعَ مِنَّا اثْنَانِ عَلَى الشَّجَرَةِ الَّتِي بَايَعْنَا تَحْتَهَا كَانَتْ رَحْمَةً مِنْ اللّٰهِ فَسَأَلْتُ نَافِعًا عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعَهُمْ عَلَى الْمَوْتِ قَالَ: لا بَلْ بَايَعَهُمْ عَلَى الصَّبْرِ) (الحديث ٢٩٥٨) (٢٦٨).

---

(٢٦٧) اخرجه مسلم في الإمارة (صم/١٢/٢٢٣) — المترجم.

(٢٦٨) قال العلامة العيني- رحمه الله تعالى -: (وهذا الحديث من افراده) (عيني/١٤/٢٢٣) — المترجم.

ئیبنـو عومـەر(رەزای خوای لێ بێ) دەفـەرموێ: سـاڵی رێـکەوتنی حودەیبییـە کەلـەژێر سـێبەری دار سـەموورەیەکا، پـەیمانی بەیعـەتو لـرضوانمـان لەگـەڵ پێغەمبەردا(درووودی خوای لەسەر بێ) بەسـت، کـە خـودا لـەقورئانی پـیرۆزدا بـەم ئایەتـە باسی دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾.
جا لەساڵی ئاییندەدا کە گەڕاینەوە بۆ حودەیبییـە، کاتێ چووین بۆ عـەمرە ویستمان ئەو دارە سەموورەیە، کە ساڵی پێشوو لەژێریدا بەیعەتمان دابـوو بـە پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) ، بیدۆزینەوە، بەڵام نەمان دۆزییـەوە، بەشێوەیەکی وا لێمـان گـۆڕا هـیچ دوو کەسێـکمان یـەکمان نـەگرت لەسـەر ئـەوە کـە ئـەو درەختـە ئـەوە، ئـەوەش لەرەحمـەتی خـوداوە بـوو کـە ونبـوو لێمـان و نـەمان دۆزییـەوە، تـا نـەبێ بەمایـەی ئـاژاوەو فیتنـە بـۆ هەنـدێ مـرۆی نـەفام، زیـاد لەپێویست تەعظیمی بکەن و بەرە بەرە بیپەرستن.
عـەرزی نـافیع کـرا، لـەم پەیمانـەدا پێغەمبـەر(درووودی خوای لەسەر بێ) لەسەرچـی پەیمانی لەگەڵ هاوڕێـکانی دا بەسـت، ئایا لەسـەر ئـەوە کـە هـەتا دواهەناسـە لەبـەرەی شـەڕ هـەڵ نەیـەن؟ فـەرمووی: نـەء، لەسـەر ئـەوە نـەبوو، بەڵـکوو لەسەر ئەوە بوو کە خۆڕاگر بن. (بڕوانە ژمارە: (٣٣١ تجريد=٥٦٣ فتح).

١٢١٣-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ زَمَنُ الْحَرَّةِ أَتَاهُ آتٍ فَقَالَ لَهُ: إِنَّ ابْنَ حَنْظَلَةَ يُبَايِعُ النَّاسَ عَلَى الْمَوْتِ فَقَالَ: لا أُبَايِعُ عَلَى هَذَا أَحَدًا بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٢٩٥٩، طرفُهُ في: ٤١٦٧)[٢٦٩].

عەبـدوڵڵای کـوڕی زەیـد(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لەسـەردەمی هەراکـەی ئەلحـەررەدا، پیـاوێ هـات گـوتی پـێم: ئاگـات لێیـە کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی حەنظـەلە(رەزای خوای لێ بێ) ، لەسـەر مـەرگ پـەیمان بەجـەنگاوەرەکان دەدا؟ عەبـدوڵڵا فەرمووی: لەپاش پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) لەسەر مەرگ پەیمان بەکەس نادەم.

---

(٢٦٩) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: استحباب مبايعة الإمام الجيش عند إرادة القتال،برقم: ١٨٦١.

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە راڤەو روونکردنەوە: یەکی دوورو درێژی دەوێ:

١. ئیبنو ئەثیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) لەنیهایەدا دەفەرموێ: رۆژی ئەلحەررە رۆژێکە ناسراوە لەمێژووی ئیسلاما، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا رووی دا، سوپایەکی زۆری هێنا لەخەڵکی شام، بەسەرکردەیی موسلیمی کوڕی عوقبەی ئەلموڕڕی، لەمانگی قوربانی ساڵی شەستو سێی کۆچیدا (٦٨٣ز) دەستیان کرد بەکوشتو بڕی خەڵکی مەدینە، وەشاری مەدینەیان تالان کرد، صەحابەو تابیعینێکی زۆریان شەهید کرد. حەررە خڕە بەرداوییەکە، وا لەدەوری مەدینە، بەردێکی رەشی زۆری والێ، جەنگەی کوشتارەکە لەوێدا روی دا.

٢. مەولەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:

لەعنی یەزیدی چ بەحثی نەدەین طول
ئیمان پەنهانەو، خاتیمە مەجهوول
راستە ئەعمالی قەبیحی زۆر کرد
بەڵام چووزانی ئیمانی نەبرد

جا بۆ بەرگری لەم جۆرە بەدرەفتارییەی یەزیدو، بۆ سکاڵای حاڵو ئامۆژگاری خێر، لەهەموو لایەکەوە دەنگی ناڕەزایی بەرزەوە بوو، بەڵام سوودی نەبوو، جا لەم روانگەیەوە، وەفدێ لەخەڵکی مەدینە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی حەظەلەدا چوون بۆ لای یەزید، جا پاش هەوڵو کۆششێکی زۆری بێ سوود، کۆمەڵێ کاری بێ شەرعیو ناپەسەندیان لەیەزیدو دەستەو بەستەکەی بینی، جا کاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە لەپاش راوێژ یەزیدیان لەخەلافەت خەلع کردو بڕیاریان دا کە یەزید لەم رۆ بەدواوە جێنشین نییە، لەشوێنی ئەو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریان کرد بەجێنشینو پەیمانیان پێ دا.

جا ئەوەبوو یەزید ئەو لەشکرەی بەفەرماندەیی موسلیمی کوڕی عوقبە نارد بۆ سەریان، کوشتارێکی گەڵی گەورەی لەخەڵکی مەدینە کرد، هەزارو حەوسەدکەسی لەپیاوماقوڵانی شار، لەصەحابەو تابیعین، کوشت، وە لەڕەشەخەڵکیش لەژن و منالّو پیرو کاسبکار دەهەزار کەسی تری کوشت، جا لەپاش رۆژەکەی ئەلحەررە موسلیم جاڕی دا، کەسێ رۆژ شاری مەدینە بەرەڵایە، بێستانی بێ خاوەنە، چیدەکەن لەکوشتن و بڕین و تالانی و ژن تالانی کردن بیکەن!!

جا موسوڵمانان بەم بۆنەیەوە فەرماندەی شەڕەکە، کەناوی (موسلیم) بوو، ناوەکەیان گۆڕی چونکە مسلم واتە: بێوەی و ئاشتیخواز، وەلەناوەکەی و لەواقیعی حاڵی، ناوێکی تازەیان بۆ داتاشی و ناویان نا (مُسرِف) واتە: زیادەڕەویکار لەخوێنڕشتن دا!! وەیەزید خۆی لەپاش ئەم زوڵم و زۆرە لەناو چوو، بوو بەمیوانی مەرگی رەش.

٣- ئەمەی ئەمڕۆ لەسوریا روودەدا، حافظ أسد بەیەك دووڕۆژ لەحمص و حما،، دەهەزار کەس دەکوژێ، ئەژدەهاکەی عیڕاق بەسەدان هەزار مرۆڤی بێتاوانی موسوڵمان ئەنفال دەکاو زیندەبەچاڵ دەکا، دووبارە بوونەوەیەکی کردەوەکانی یەزیدوموسریفی کوڕی عوقبەیە. جا خوا بکا کوردەکانی خۆشمان نەکەونە ئەم هەڵانەوە.

لەراستیدا ئەمڕۆ ئەم عەلمانییەتە وای لەو خەڵکە کردووە باوەڕی بەهیچ نەماوە، مەگەر بەبەرژەوەندی خۆی، وەزۆرداریش لەزۆرداری پێش خۆی پەندو عیبرەت وەرناگرێ، لەبەرئەوە دەبینین هەموو زۆردارێ لەئەوەی پێش خۆی خراپترە، وەئەو چیکردووە ئەمیش دەیکا بەزیادەوە!

بڕوانە: (بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٩٧ ژیاننامەی ئەسماء کەدایکی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە، فەرموودەی ژمارە: ٧٥ + تاج/ ٥/ ٧٩ز —١٠ف- ٢. مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + تاج/ ١٠ال-٢٥٤ز- ٩٧. لەهۆزی ئەقیف هەڵاتبازێك و

خوینمژێـك پەیـدا دەبـن + ریـاض/١ل —١٨٦ز- ٢٠٢ز-٢٥. باسـی دابـەش کردنـی کەلەپوورەکەی زوبەیر).

٤- حەنظەلەی باوکی ئەم عەبدوڵڵایە ناسـراوە بـە: (غـسيلُ المَلائِكَة: شـۆراوی فریشتە) چونکە لەغـەزای ئوحـوددا بەلەشی گرانـەوە شـەهيد بـوو، فریـشتە شۆردبوويان و لەشپیسییان دەرکردبوو.

١٢١٤- عَـنْ سَـلَمَةَ بـن الأكـوع (رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ) قَـالَ: بَايَعْـتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ عَدَلْتُ إِلَى ظِلِّ الشَّجَرَةِ فَلَمَّا خَفَّ النَّاسُ قَالَ: (يَا ابْنَ الأَكْوَعِ أَلا تُبَايِعُ؟) قَالَ: قُلْتُ: قَدْ بَايَعْتُ يَا رَسُولَ اللَّـهِ قَـالَ: وَأَيْـضًا فَبَايَعْتُـهُ الثَّانِيَةَ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُسْلِمٍ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تُبَايِعُونَ يَوْمَئِذٍ قَالَ عَلَـى الْمَـوْتِ) (الحديث ٢٩٦٠، أطرافُهُ في: ٤١٦٩، ٧٢٠٦، ٧٢٠٨) (٢٧٠).

سـەلەمەی کـوڕی ئـەکوەع(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لەبەيعـەتو لـريضوانـا واتــە: لەپــەیمانی خۆشـنووديدا، لــەڕۆژی حودەيبييــەدا، پــەيمانم لەگــەڵ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەست، ئەوجا چوومە بـن سێبەری شێخەڵـێ، کـاتێ بەرەبـەرە پـەیمانکارەکان هاتنـە کـزیو موسـوڵمان هـەموو پـەیمانیان بەسـت لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێ) ، پێی فەرمووم: (ئەی کوڕی ئەکوەع ئـەدی وەرە پەیمان وەربگرە) سەلەمە فەرمووی: عەرزیم کرد: قوربان! مـن پـەیمانم لەتۆ وەرگرت. فـەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (دیـسانەوەیش پـەیمان وەربگـرەوە، قازانجی هەیە زیانی نییە).

جـامنیش بـۆ جـاری دووەم پـەیمانم پـێ دا. عـەرزی سـەلەمە کـرا: ئـەو سەردەمە لەسەرچی پـەیمانتان بەپێغـەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەدا؟ فـەرمووی: (پــەيمانمان پــێ دەدا کەئەگــەر کوژراويــشين لەبــەرەی جــەنگا رانەکــەين) (تاج/٨ل-٧٩ز-٢١ف-٢-ش/ت. باسی پەیمان بەستن لەسەر غەزاکردن).

---

(٢٧٠) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: استحباب مبايعة الإمام الجيش..برقم: ١٨٦٠.

**راڤەو روونكردنەوە:**

ئـەم فەرمووديـەش يەكێـكى تـرە لـە فـەرمووده سـيانيەكانى بوخـارى، بڕوانە: بەرگى دووەم لاپەڕە: (٢٧٨) هەروا —ل ١١٣ بەرگى يەكـەم ژمـارە: (٩٠) + ژمارە: (٤٨) + بەرگى دووەم ل ١١٦-٦٩٤، فەرموودەى ژمارە يازدەى سيانييە.

١٢١٥– عَنْ مُجَاشِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَـالَ: أَتَيْـتُ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَأَخِي فَقُلْتُ: بَايِعْنَا عَلَى الْهِجْرَةِ فَقَالَ: (مَضَتْ الْهِجْرَةُ لأَهْلِهَا) فَقُلْـتُ: عَلامَ تُبَايِعُنَا؟ قَالَ: (عَلَى الإِسْلامِ وَالْجِهَادِ) (الحديث ٢٩٦٢، أطرافُهُ في: ٣٠٧٨، ٤٣٠٥، ٤٣٠٧) و (الحـــديث ٢٩٦٣، أطرافُـــهُ في: ٣٠٧٩، ٤٣٠٦، ٤٣٠٨)[٢٧١].

موجاشيعى كوڕى مەسعوود(ڕەزاى خواى لێ بێ) فـەرمووى: لـەپاش ئـازادبوونى مەككـە لەگـەڵ موجاليـدى كـوڕى مەسـعوودى برامـا، چـوين بـۆ خزمـەتى پێغەمبـەر(درودى خواى لەسەر بێ) عـەرزيم كـرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! پـەيمانمان بـدەرێ لەسـەر كۆچـكردن بـۆلات بـۆ مەدينـە. فـەرمووى: (كۆچـكردن بەسەرچوو، ئەوەى كۆچى كرد لەكاتى خۆيدا، دەستى خـۆى وەشـاند!) گـوتم: ئـەى لەسـەر چـى پـەيمانمان لەگـەڵ دەبەسـتى؟ فـەرمووى: (پـەيمانم بـدەنێ لەسەر خزمەتى ئايينى ئيسلامو غـەزاكردن) (تـاج/٣/ل-٢٧٣ف —از- ١٠٤. باسى پەيمان بەستن).

**راڤەو روونكردنەوە:**

موجاشـيعى كـوڕى مەسـعوودو موجاليـدى كـوڕى مەسـعوود بـران، هەردوكيان صەحابەن، موجاشيع لەبوخارى‌و موسليم دا گێڕانەوە(ريوايـة) ى هەيـە، وەك ئـەم فـەرموودەى ئێـرە كـە هـەردوو پـير گێڕاويانەتـەوە، لەسـەر

(٢٧١) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: المبايعة بعد فتح مكة على الإسلام و الجهادبرقم: ١٨٦٣.

فەرمایشتی ئیصابە دولابی دەفەرموێ: موجاشیع شاری کابولی لەوڵاتی هیند غەزاکرد، موجاشیع دەچێتە ناو ژووری بتخانەکە گەوهەرێ لەچاوێ بتێ دەردەهێنێو دەیباو، دەفەرموێ: بۆ ئەوە وام کرد هەتا بزانن کە ئەو بتە نەزیان دەبەخشێو نەسوود، موجاشیع یەك فەرموودەی لەبوخاری دا هەیە، لەروداوی ئەلجەمەلدا کوژراوە – رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ لە خۆیو لە موجالیدی برای.

## ئەرکێ دەخرێتە سەرشانی غەزاکار کە لەووزەی دا هەبێ

١٢١٦– عنْ ابن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ: لَقَدْ أَتَانِي الْيَوْمَ رَجُلٌ فَسَأَلَنِي عَنْ أَمْرٍ مَا دَرَيْتُ مَا أَرُدُّ عَلَيْهِ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً مُؤْدِيًا نَشِيطًا يَخْرُجُ مَعَ أُمَرَائِنَا فِي الْمَغَازِي فَيَعْزِمُ عَلَيْنَا فِي أَشْيَاءَ لا نُحْصِيهَا؟ فَقُلْتُ لَهُ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لَكَ إِلاّ أَنَّا كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَسَى أَنْ لا يَعْزِمَ عَلَيْنَا فِي أَمْرٍ إِلاّ مَرَّةً حَتَّى نَفْعَلَهُ وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَنْ يَزَالَ بِخَيْرٍ مَا اتَّقَى اللَّهَ وَإِذَا شَكَّ فِي نَفْسِهِ شَيْءٌ سَأَلَ رَجُلاً فَشَفَاهُ مِنْهُ. وَأَوْشَكَ أَنْ لا تَجِدُوهُ وَالَّذِي لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ مَا أَذْكُرُ مَا غَبَرَ مِنْ الدُّنْيَا إِلاّ كَالثَّغْبِ شُرِبَ صَفْوُهُ وَبَقِيَ كَدَرُهُ) (الحديث ٢٩٦٤) [(٢٧٢)].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەمڕۆ پیاوێ هات بۆلام، لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێ کردم نەمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە، گوتی: پێم بلێ، پیاوێکی تەواناى گورجو گۆڵ لەگەڵ فەرمانڕەواکانمانا دەردەچێ بۆ غەزا، فەرمانڕەواکەیشی زیاد لەتوانا ئەرکو ئیشو کاری دەدا بەسەریداو، جەختی لێ دەکا کەئەنجامیان بدا، جا چاری ئەم جۆرە پیاوە چییە؟ ئەم جۆرە فەرمانانە بەجێ بهێنێ یان نا؟.

---

(٢٧٢) لم یوافقه مسلم علی تخریج حدیث ابن مسعود فیما غبر من الدنیا (فتح/٦/١٩٥) – للمترجم.

منيش پێم گوت: بەخوا نازانم چيت پێ بڵێم، بەڵام ئەوەندە هەيە، ئێمە كاتێ لەخزمەت پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) بووين، جاروبار لەكاتی ناچاريدا تاقە فەرمانێكی لەم شێوەی تۆ دەيڵێيت لێ داوا دەكردين‌و جەختی لێ دەكردين كە ئەنجامی بدەين، وەئێمەيش ئەنجامان دەداو ئيتر نەيدەكرد بەدوو كارو سێ كار.

وەكی تريش گرنگ ئەوەيە كە ئێوە تەقوا كاربن‌و لەتەقوای خوا دەرنەچن چونكە هەتا تەقوای خودا ئەنجام بدەن چاكە كارن، ئەوەيش پێويستی بەمە هەيە: كاتێ كارێ دێتە پێش مرۆڤ ئەگەر خۆی بڕيارەكەی زانی ئەوە بەپێی ئەوە بەبوون‌و نەبوون دەيكا، بەڵام هەركاتێ كەسێ لەكارێ دوودڵ بوو، نەيدەزانی كەدروستە يان نا، ئەوە با لەزانايێ بپرسێ، هەتا دەرمانی دەردی نەزانييەكەی بكاو، وەڵامێكی‌وای بداتەوە بۆی ببێ بەدەرمان بۆ ئەو دوو دڵيەی، هاكا ئەو جۆرە زانايانەشتان دەست نەكەوێ، كەبتوانێ وەڵامی راستی پرسيارەكانتان بداتەوە.

بەو خودايە كە هەر خۆی خودايە بۆباشی‌و خراپی دنيا، ئەم جيهانەم ئاوا دێتە بەرچاو وەك: ئەستێڵێكی زەلكاوی وايە، كە ئاوە ساف‌و روون‌و ساردەكەی خورابێتەوەو، خڵتەو لێڵاوو قوڕو ليتەكەی بنی مابێ!!).

## راڤەو شيكردنەوە:

كورت‌و پوخت: وەڵامەكە ئەمەيە بەپێی توانا، ئەوەندەی لەوزەی مرۆڤا هەيە، دەبێ فەرمانی فەرمانڕەواكانی جێ بەجێ بكا، بەمەرجێ فەرمانپێكراوەكە بەپێی تەقوای خودا بێ‌و مايەی رەزای ئەو بێ.

## كاتی هەڵبژاردەی دەست پێكردنی جەنگ

١٢١٧-عنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا انْتَظَرَ حَتَّى مَالَتْ الشَّمْسُ ثُمَّ قَامَ فِي

النَّاسِ خَطِيبًا قَالَ أَيُّهَا النَّاسُ لا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلالِ السُّيُوفِ ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ) (الحديث ٢٩٦٥، طرفُهُ في: (١٢٠٤تجريد=٢٩٣٣فتح) (٢٧٣).

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: (ڕۆژێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) خۆی ئامادە دەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنێ، جا چاوەڕوانی کرد هەتا خۆر لار بۆوە، ئەوسا هەڵسایەوەو وتارێکی دا بەخەڵکەکەی فەرموو: (ئەی مەردوم! ئاوات مەخوازن بۆ گەیشتن‌و بەرەنگارەوە بوونی دوژمن، بەڵکو لەخودا داوای ئاسوودەیی‌و بێوەیی بکەن، کاتێکیش تووشی دوژمن بوون‌و بەرەنگاری یەکتر بوون، خۆگرو بەپشوو بن، وەبزانن کەبەهەشت وا لەژێر سایەی سێبەری شمشێردا) ئەوجا فەرمووی: (اللهمَّ مُنزِّلَ الكتابِ، ومُجريَ السَّحابِ، وهازِمِ الأحزابِ، إهزِمْهُمْ وانصُرْنا عليهِمْ) : خودایە! ئەی ئەو کەسەی کە قورئانت بەخەلات ناردووە بۆ موحەممەد! ئەی ئەو کەسەی کەبەتەوانایی خۆت با هەڵدەکەیت و، بەهەموو لایەکا هەوری پێ دەخەیتە ڕێ، ئەی ئەو کەسەی کەبەتەنیا خۆت گەلەکۆمەی کۆمەڵەی دوژمنانی ئیسلامت لەرۆژی ئەحزابا تێک شکاند! ئەی خودایە! لەم غەزایەشدا بیانشکێنە، وە سەرمان بخە بەسەریانا). (تاج/١٢٣/٨/ ز-٤٨ف -١-ش/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

(بڕوانە: ریاض /٣ل-١٩٥١ز-٢٣٤ف-١٨)

١- نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەفەرموودەکانا زۆر باسی -العافیة- کراوە، مەبەست لەم وشەیە: داواکردنی لابردنی هەموو جۆرە ناخۆشییەکی

---

(٢٧٣) أخرجه مسلم في الجهاد، باب: كراهة تمني لقاء العدو (صم/١٢ص٤٦) - المترجم.

دین‌و دونیایه، که مرۆڤ بەبێوەی بەلەشی ساغ، لەسێبەری ئایینی خودادا، لەجیهانا بژی، لەوجیهانیش هەروا.
٢- مەبەست لەوە کەدەفەرموێ: (بەهەشت وا لەژێر سایەی شیردا..) ئەمەیە: کەبەهەشت لەخەباتگێڕانی ڕێگەی خوداوە لەهەموو کەسێ تر نزیکترە.

## باسی ئاڵاو کرێکار لەغەزاداو هەندێ هۆی سەرکەوتن‌و وردە شتی تر

١٢١٨- عَنْ الْعَبَّاسَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قالَ لِلزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) : هَا هُنَا أَمَرَكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تَرْكُزَ الرَّايَةَ) (الحديث ٢٩٧٦، طرفُهُ في: ٤٢٨٠) [٢٧٤].

عەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەزوبەیری کوڕی عەوام: ئالێرەدا - واتە: لەحەجون- پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەغەزای ئازادکردنی مەککەدا، فەرمانی پێ کردیت کە ئاڵاکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) داچەقێنیت. بۆ باسی ئاڵا بڕوانە: (تاج /٨ل-١١١ز-٤١).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

عەباسی کوڕی عەبدولوطەلیب هەق مامەی پێغەمبەرە، برای باوکیەتی بەدوو ساڵ لەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) گەورەترە، دایکی ناوی‌نەثلەی کچی خەبابە، بەمناڵی عەبباس ون دەبێ، دایکی نەذر دەکا ئەگەر بیدۆزێتەوە، بەرگی ئاوریشم بۆ کەعبە بکا، کەدەیدۆزێتەوە، نەزرەکەی جێ بەجێ دەکات، یەکەم ژن بووە کەبەرگ بۆ کەعبە بکا، عەبباس لەپێش ئازادبوونی مەککەدا ئیسلام بوو بوو، بەڵام بەنهێنی هەواڵی قورەیشی بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ)

---

(٢٧٤) لم يوافقه على حديث العباس في الراية (فتح/١٩٥/٦) خاتمة كتاب الجهاد والسير– المترجم.

دەنارد، لەکاتی ئازادبوونی مەککەدا ئیسلام بوونی خۆی ئاشکرا کرد، ئامادەی غەزای حونەین و طائیف بوو، لەغەزای حونەین دا لەگەڵ چەند کەسێکی تری کەم دا، دەوری پێغەمبەریان چۆڵ نەکرد، لەپاش ئەبو طالیبی برای لەهەموو کەسێ زیاتر یاریدەی پێغەمبەری دەدا، عەباس زۆر سەخی بوو، نانبدە بوو، سیلەی رەحمی زۆر بەجێ دەهێنا، عومەرو عوسمان ئەگەر بەسواریی بەلایا رەت ببونایێ بۆ رێز بۆ ئەو لەوڵاخەکە دادەبەزین، تالێ ی رەت دەبوون.

عەباس پیاوێکی جوانی سپی کاری باڵاناوەندی بوو، دوو پەلکەی هەبوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە. پێنج فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، ئیمامی عەبباس (رەزای خوای لێ بێ) لەتەمەنی هەشتاو نۆ ساڵی دا، لەمەدینە، لەرۆژی هەینی دا، لەسیازدەی رەجەبی ساڵی سی و دووی کۆچیدا مردووە، بەر لەشەهید بوونی عوسمان بەدووساڵ، لەبەقیع نێژراوە، عەبدوڵلای کوڕی دایهێشتە ناو گۆڕەکەیەوە،لەئیسلاما سی و دوو ساڵ ژیاوە، بەر لەهاتنی ئیسلامیش پەنجاو دووساڵ ژیاوە.

لەساڵی بێبارانی دا ئیمامی عومەر دەیکرد بەوەسیلەو هۆکار لەلای خوا کەبارانیان بۆ ببارێنێ، وەخوا نزاکەی گیرا دەکردن، (بڕوانە: بەرگی/٢ل-١٤٩ژ-٧٢١) +(تاج/٥ل-١٠٣ز-١٧. باسی گەورەیی عەباس) + (تەجرید.ژمارە: ٥ بەرگی یەکەم ل-١٩+ بەرگی دووەم ل-٢٠٦ ژ — ٧٨٨ + ژ — ٧٨٢ + ژ - ٧٢٨).

١٢١٩- عَنْ يَعْلَى بن أميّة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ تَبُوكَ فَحَمَلْتُ عَلَى بَكْرٍ فَهُوَ أَوْثَقُ أَعْمَالِي فِي نَفْسِي فَاسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا فَقَاتَلَ رَجُلاً فَعَضَّ أَحَدُهُمَا الآخَرَ فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ وَنَزَعَ ثَنِيَّتَهُ فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَهْدَرَهَا فَقَالَ: (أَيَدْفَعُ يَدَهُ إِلَيْكَ فَتَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ) (الحديث ٢٩٧٣، أطرافُهُ في: ١٨٤٨، ٢٢٦٩، ٤٤١٧، ٦٨٩٣) [٢٧٥].

(٢٧٥) أخرجه مسلم في القسامة، باب: الصائل على نفس الإنسان..برقم: ١٦٧٤.

یەعلای کوڕی ئومەییە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا(درودی خوای لەسەر بێ) غەزای تەبوکمان کرد، لەم غەزایەدا وشترە نێرەیەکم دا بەغەزاکارێ لەڕێگەی خودادا سواری بوو، لەباری دڵم دا ئەم هاوکارییەم لەم بابەتەدا باشترین کردەوەی باشم بوو، کەلای خودا ببێ بەزەخیرە بۆم.

لەم غەزایەدا پیاوێکم بەکرێ گرت، لەگەڵ پیاوێکی تردا بوو بەشەڕی یەکێکیان دەستی ئەویتریانی برد بەدەماو گازی لێ گرت، ئەویش لەتاوانا دەستی خۆی لەدەمی راپسکاند، یەکێ لەددانە دووینەکانی خست!

کابرای ددانکەوتوو بۆ سکالاّ هات بۆلای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەویش فەرمووی: (وەك نێرە وشتر دەستی برای خۆتان دەکرۆژن،، خوێنت ناکەوێ) (تاج/٣/ل-٢٢٦ف -١ ز-٨٧).

١٢٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ فَوُضِعَتْ فِي يَدِي) قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا) (الحديث ٢٩٧٧، أطرافُهُ في: ٦٩٩٨، ٧٠١٣، ٧٢٧٣)[٢٧٦].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودا منی کردوە بەپێغەمبەرو رەوانەی کردوم بۆ سەر ئەو خەڵکە، قسەی نەستەقو فەرموودەی پڕمەعنای پێ بەخشیووم، وەتا مانگە ڕێیەك دوژمن لەسامو شکۆی خۆمو لەشکرم زەندەقیان دەچێو ورە بەردەدەنو ئەمە بووە بەهۆی سەرکەوتن بۆ ئێمە) وەهەروا فەرمووی: (لەخەونا بووم کلیلەکانی گەنجینەکانی زەویم پێ دراو، خرانە ناو دەستم).

(٢٧٦) أخرجه مسلم في أوائل كتاب المساجد ومواضع الصلاة برقم: ٥٢٣.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەتا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی نەماوەو ئێوە بەرودوا لەپاش ئەو، خەزنەی ناو ئەو گەنجانە دەردەهێنن‌و بەکێشیان دەکەن‌و وڵات لەدوا وڵات ئازادی دەکەن! مەبەست لە (جوامع الکلم) ئایەتەکانی قورئان وفەرمووده پڕواتاکانی پێغەمبەره (بڕ: ژ: ٢١٧ تەجریید=٣٣٥ فەتح + تاج/١/ل-٣٤٣ف -٤).

١٢٢١- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ صَنَعْتُ سُفْرَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ حِينَ أَرَادَ أَنْ يُهَاجِرَ إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَتْ فَلَمْ نَجِدْ لِسُفْرَتِهِ وَلا لِسِقَائِهِ مَا نَرْبِطُهُمَا بِهِ فَقُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ وَاللَّهِ مَا أَجِدُ شَيْئًا أَرْبِطُ بِهِ إِلاَّ نِطَاقِي قَالَ: فَشُقِّيهِ بِاثْنَيْنِ فَارْبِطِيهِ بِوَاحِدٍ السِّقَاءَ وَبِالآخَرِ السُّفْرَةَ فَفَعَلْتُ فَلِذَلِكَ سُمِّيَتْ ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ) (الحديث ٢٩٧٩، طرفاهُ في: ٣٩٠٧، ٥٣٨٨) [٢٧٧].

ئەسمای کچی ئەبوبەکر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەوکاتە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ویستی لەگەڵ باوکم دا، لەمەککەوە کۆچ بکەن بۆ مەدینە، لەتاو زۆربۆهێنانی ناموسوڵمانەکان، خۆم توێشەبەرەکەی پێغەمبەرم دروست کرد، بەڵام شتێ نەبوو دەمی توێشەبەرەکەو دەمی کوندەکەی پێ‌ببەستین. بەباوکم گوت: بەخوا هیچم دەست ناکەوێ بیکەم بەدەمبین مەگەر پشتێنەکەی خۆم؟ ئەویش فەرمووی: دەی باشە پشتێنەکەت بکە بەدوو لەتەوە، بەیەکێکیان دەمی کوندەکە ببەستەو بەویتریشیان دەمی توێشەبەرەکە، منیش وام کرد، جا لەمەوە ناونرام: (ذات النطاقین) واتە: دوو پشتێن خان. (تاج/٤/٣١٤ف -٣ز-١٠١. باسی کۆچکردن).

١٢٢٢-عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَى إِكَافٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ وَرَاءَهُ) (الحديث ٢٩٨٧، أطرافُهُ في: ٤٥٦٦، ٥٦٦٣، ٥٩٦٤، ٦٢٠٧) [٢٧٨].

---

(٢٧٧) لاحظ ما جاء في خاتمة كتاب الجهاد (فتح/٦/ص١٩٥) — المترجم.

(٢٧٨) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: في دعاء النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) وصبره على أذى..برقم: ١٧٩٨.

ئوسامەی کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر کورتانێکەوە سورای گوێدرێژێ بوو، سەرکورتانەکە قەیفە بوو، منیشی لەپاشکۆی خۆیەوە سوارکرد. (تاج/٨/١٠٠ف-٤ز-٣٢- دەستوورەکانی سواریی).

١٢٢٣- عنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْبَلَ يَوْمَ الْفَتْحِ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ عَلَى رَاحِلَتِهِ مُرْدِفًا أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَمَعَهُ بِلالٌ وَمَعَهُ عُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ مِنْ الْحَجَبَةِ حَتَّى أَنَاخَ فِي الْمَسْجِدِ فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْتِيَ بِمِفْتَاحِ الْبَيْتِ فَفَتَحَ وَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ أُسَامَةُ وَبِلالٌ وَعُثْمَانُ فَمَكَثَ فِيهَا نَهَارًا طَوِيلاً ثُمَّ خَرَجَ فَاسْتَبَقَ النَّاسُ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَوَّلَ مَنْ دَخَلَ فَوَجَدَ بِلالاً وَرَاءَ الْبَابِ قَائِمًا فَسَأَلَهُ أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَشَارَ لَهُ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ فَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى مِنْ سَجْدَةٍ (الحديث ٢٩٨٨، أطرافُهُ في: ٣٩٧، ٤٦٨، ٥٠٤، ٥٠٦، ١١٦٧، ١٥٩٨، ١٥٩٩، ٢٩٨٨، ٤٢٨٩، ٤٤٠٠)[٢٧٩].

عەبدوللای کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆژی ئازادکردنی مەککە لەلای سەروی مەککەوە بەسواری وشترەکەی هاتە ناو مەککەوە، ئوسامەی کوڕی زەیدی خستبوویە پاشکۆی خۆیەوە، بیلالی لەگەڵ بوو، عوسمانی کوڕی طەلحەیشی لەگەڵ بوو، کەیەکێ بوو لەزێوانەکانی بەیت، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەسوایی تەشریفی هات، هەتا گەیشتە مزگەوت، لەحەوشی مزگەوتدا وشترەکەی ییخ دا، ئەوجا فەرمانی بەعوسمانی کوڕی طەلحە کرد، کلیلی بەیتی هێناو دەرگای کابەی کردەوەو، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) چووە ژوورەوەو ئوسامەو بیلال‌و عوسمانیش لەگەڵیا چوونە ژوورەوە، دنیا ڕۆژ بوو.

---

(٢٧٩) من المتفق عليه (فتح/٦/١٩٥) وقال مؤلف التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول: رواه الخمسة (تاج/٢/ص/ ١٧٨ + تاج/ ٤ص ٤٢٠+ صم/٩ص٨٢ + ٨٤) - المترجم.

پێغەمبەرو ئەو چەند کەسەیە ماوەیەکی زۆر لەژوورەوە مانەوە، ئەوجا هاتە دەرەوە خەڵکەکەش پەلاماری ژوورەوەیان دا، ئیبنو عومەر یەکەم کەس بوو کەخۆی کرد بەژوورا، روانی بیلال لەپشت دەرگاکەوە وەستاوە،، لێی دەپرسێ: ئایا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەکوێدا نوێژی سوننەتی ناوبەیتی کرد؟ ئەویش ئەو جێگەیەی پێ نیشان دەدا کە حەزرەت نوێژی تیادا کردبوو، ئیبنو عومەر فەرمووی: بەڵام لەبیرم نەبوو کە لەبیلال بپرسم کە خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) چەند رکات نوێژی تیا کرد.(تاج/٨/٢٣٦ف-٨) +(تاج٢ل-٢٧٢ف-٢- باسی نوێژکردن لەناو ماڵی کابەدا-ش/د/ت/ن).

## سەفەر بەقورئان بۆ وڵاتی دوژمن ناباشە، ذیکر لەسەفەردا

١٢٢٤-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ (الحديث ٢٩٩٠) (٢٨٠).

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا کە قورئان ببرێ بۆ وڵاتی دوژمن. چونکە مەترسی ئەوە دەکرێ کە دەستکاری قورئان بکرێ، یا بێرێزی پێ بکرێ لەلایەنی دوژمنەوە.

### روونکردنەوە:

مەبەست لەم جۆرە بابەتو بریارە، لەو رۆژگارەدا بوو کەهێشتا مەترسی ئەوە دەکرا، کە بەهۆی دەستکاری قورئانەوە، قورئان گۆڕانکاری تیابکرێ، بەڵام ئێستا ئەم مەترسییە نەماوە، چونکە بەسەدان مەلیۆن نوسخە لەقورئان، لەدەسخەتو لەچاپکراو، بەجیهان بڵاوبۆتەوە، بگرە ئێستا باشترین

---

(٢٨٠) اخرجه مسلم في الإمارة، باب: النهي أن يسافر بالمصحف..برقم: ١٨٦٩.

چاپی قورئان ئەوەیە کە لە ولاتە ناموسولمانەکان چاپ دەکرێ لەبەر ئەوە واباشە بۆ ئەو بەرێزانەی کە لەولاتی ئیسلامەوە، کۆچ یاسەفەر، دەکەن بۆ ولاتە ناموسولمانەکان، قورئانو کتێبی حەدیثو تەفسیرو شەریعەت لەگەڵ خۆیان بەرن، یا هەوڵ بدەن کە پەیدایان بکەن، چونکە یەکێ لەهۆی بەردەوامبوونی بیرو باوەڕ ئەوەیە کە هۆکاری روونکردنەوە: و پەخشەوە بوونی لەبەردەستدابێ.

جا لەکاتی نەقڵو گواستنەوەی ئەم جۆرە شتانەدا، بەم مەبەستە رەوایە موسامەحەو چاوپۆشی لەهەندێ گیرو گرفتی پێشهات دەکرێ، وەك دوور نییە کە کتێبە پیرۆزەکان، لەناو پاپۆڕو خۆشرۆو شتیوادا، لەجێگەی شایانی خۆیان دانەنرێن، یا لەلایەن کرێکارو حەماڵو دەستەی کارمەندانی بەرپرسیاری ئەم جۆرە کارو فرمانانەوە رێزی شایانی خۆیان پێ نەدرێ، بەڵام لەهەمان کاتدا وەك پێویست ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن،و ئەوەی مەبەستی هەموو لایەکە دێتەدی. لەبەر ئەوە موسامەحەو چاوپۆشی لەم جۆرە گرفتانە دەکرێو بەرئەو جۆرە یاسایە دەکەوێ کە دەفەرموێ: (للضروراتِ أحكامُها: ناچاریەکان بڕیاری تایبەتی خۆیان هەیە).

١٢٢٥- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكُنَّا إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى وَادٍ هَلَّلْنَا وَكَبَّرْنَا ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلا غَائِبًا إِنَّهُ مَعَكُمْ إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ تَبَارَكَ اسْمُهُ وَتَعَالَى جَدُّهُ) (الحديث ٢٩٩٢، أطرافُهُ في: ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠٩، ٦٦١٠، ٧٣٨٦)[٢٨١].

(٢٨١) أخرجه مسلم في الذكر و الدعاء، باب: استحباب خفض الصوت بالذكر،رقم: ٢٧٠٤.

ئەبومووسای ئەشعەری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێکا لەخزمەتی حەزرەتدا بووین، گشت جارێ کە دەگەیشتینە سەر بەرزاییەك کە دەیڕوانی بەسەر شیوو دۆڵێکا، دەستمان دەکرد بەگوتنی: (لاإلـه الا الله) و (الله أکبر) بەدەنگی بەرز، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! بەزەویتان بەخۆتانا بێتەوە، ئەم هاتو هاوارەی پێناوێ، خۆ ئێوە هاوار لەکەڕو لاڵ یا لە نادیار ناکەن، ئێوە بانگی کەسێ دەکەن و لەکەسێ دەپاڕێنەوە، کەئاگای لەخشەی مارو مێرووە، کە خوای گەورەیە، کەبیسەرەو لەهەموو شتێ نزیکترە، پیرۆزبێ ناوی و پیت و فەڕی مەزن بێ).

١٢٢٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ: (كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا وَإِذَا نَزَلْنَا سَبَّحْنَا) (الحديث ٢٩٩٣، طرفُهُ في: ٢٩٩٤) [٢٨٢].

جابیری کوڕی عەبدوڵلای (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران دەستوورمان وابوو کەسەردەکەوتینە سەر بەرزایی (اللهُ أکبَر) مان دەکرد، کە دادەبەزین بۆ شوێنی نزم و نەوی (سبحانَ الله) مان دەکرد.

١٢٢٧- عنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا) (الحديث ٢٩٩٦) [٢٨٣]

ئەبومووسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاتی نەخۆشی و لەکاتی سەفەردا بەندەی خودا، چی پیاوبێ، چی ژن، کاتێ لەش ساغ بووەو لەماڵەوە بووە، چی کارێکی باشی کردبێ و چی پەرستشێکی ئەنجام دابێ، وەك قورئانخوێندن و شەونوێژو ڕۆژووی سوننەت و شتی تری وا، کە لەبەر نەخۆشی یالەبەر سەفەر، ئەوەی بۆ ئەنجام

---

(٢٨٢) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جابر في التسبيح(فتح/٦/١٩٥) خاتمة كتاب الجهاد والسير-المترجم.

(٢٨٣) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي موسى: (إذا مرض العبد) المصدر السابق – المترجم.

نـەدرێ، ئـەوە خـودا پاداشـتی وێنـەی ئـەوەی لـەکاتی نەخۆشـیو لـەماوەی سەفەرەکەیدا بۆ دەنوسێت).

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- مەبەست لە(عبد) موسوڵمانە، نێربێ یا مێ.

٢- هەرکارێ موسوڵمان خووی پێوە بگرێو لەکاتی لەشساغیدا بیکات، ئەگـەر نەخۆش کـەوت، وەلەبـەر نەخۆشیەکەی ئـەو کـارە باشـەی بـۆ ئـەنجام نـەدرا، ئەوە خێری کردنی ئەو کارە باشەی بۆ دەنووسرێ، بەمـەرجێ نیـازی کردنـی ئـەو کـارە باشـەی هـەبێ، لـەکاتی نەخۆشـینەکەدا، کـەنایکات نەخۆشـینەکە رێـگرە لێی.

٣- نـەکردنی کـاری سـوننەت چـی بـەهۆی نەخۆشـینەوە بـێ، یـا بـەهۆی سـەفەرەوەبێ، یـا بـەهۆی عـوزرەوەبێ، وەك زۆربۆهێنـانی خـەو، رێـك وەك حاڵەتی نەخۆشی وایە، بەڵام سەفەرەکە نابێ سەفەری گوناه بێ.

٤- ئەنجامدانی کاری فەرز، لەکاتی هەبوونی مەهانـەی رەوادا، لەسـەر شـێوەیێ کەنەگاتـە شـێوەی هەرەتـەواوی ئەنجامـدانی ئـەو کـارە لـەکاتی لـەش سـاغیدا، ئـەوە هـەمان پاداشـتی کـاتی لـەش سـاغی بـۆ هەیـە، بـە وێنـە: نەخۆشـێ کەنوێژەکـەی بەدانیـشتنەوە بکـا بەقـەد پاداشـتی کـاتی لـەش سـاغی بـۆ دەنوسرێ، کە نوێژەکەی بەپێوە دەکا.

٥- نەکردنی کاری خراپ، بەهۆی نەخۆشیو سەفەرو شتی واوە، گونـاهی کـاتی لـەش سـاغی بـۆ نانوسـرێ، کـە ئـەو کارانـەی لـەو کاتـەدا کـردووە، ئـەوە رەحمەتێکە لەخوداوە.

٦- نـەخۆشو رێبـوار ئەگـەر زەحمـەت بکێشنو ئـەوەی لـەکاتی لـەش ساغیو لـەکاتی بوونیـان لەماڵـەوە کردوویانـە، لـەکاتی نەخۆشـیو لـەکاتی سـەفەردا، هەمان شت بکەن خێری زیـاترە بۆیـان مەگـەر دەقـێ هـەبێ لەسـەر ئـەوە کـە نـەکردنی ئـەو کـارە، لـەو دوو کاتـەدا باشـترە لـەکردنی، وەك گرتنـی رۆژووی

رۆژی نۆمینەی حاجیان، بۆ حاجی لەکێوی عەرەفە، کە لەو رۆژەدا حاجی سەرگەرمی کردنی حەجە. (بڕ: تاج/٢ ل-١٣٤)

## سەفەرکردن بەتەنها یا بە بێ فەرمانی باوكو دایك

١٢٢٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الْوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ) (الحديث٢٩٩٨) [٢٨٤].

ئیبنوعومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی من دەیزانم لەبارەی تەنهاییەوە ئەگەر خەڵکیش وەك من بیزانن، هیچ کەسێ بەشەو بەتەنها خۆی، بەبێ هاوڕی نەدەڕۆیشت بۆ هیچ شوێنێ) (تاج/٨ل —٨٥ف —٤ز-٢٤.باسی سەفەر..).

### راڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کەشەو جێگەی مەترسییە، زیاتر لەرۆژ هەمو جانەوەرێ لەشەودا دەکەوێتەکار، وەکی تریش جنۆکەو شەیاتینیش لەشەودا دەکەونە گەڕ، دوور نیەخۆیانی نیشان بدەن بەهەرشێوەیێ بووە تووشی ئێشو ئازارو خایەڵەی بکەن، ئەوەی لەبەر چاوە هەتاوەکو ئێستاش نەخۆشی دەروونیو شێتی زۆربەی لەشەودا تووشی توشبوان دەبن، خودا پەنامان بدات.

١٢٢٩-عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الْجِهَادِ فَقَالَ: (أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟) قَالَ: نَعَمْ قَالَ: (فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ) (الحديث٣٠٠٤، طرفُهُ في: ٥٩٧٢) [٢٨٥].

---

(٢٨٤) لم يوافقه على إخراج حديث ابن عمر في السير وحده (فتح/٦/١٩٥) — المترجم.

(٢٨٥) أخرجه مسلم في البرّ والصّلة والآداب، باب: برّ الوالدين... رقم: ٢٥٤٩.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویـ: پیاوێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پرسی پێی کرد کەڕێگەی بدا بچێ بۆ غەزا، پێی فەرموو: (ئایا باوكو دایکت ماون؟) گوتی: بەڵێ. فەرموویـ: دەی کەواتە بڕۆ بۆخزمەتی ئەوان تێکۆشەو غەزای تۆ ئەوەیە کەخزمەتی ئەوان بکەی!) (تاج/٨ل —٧٨ز —٢٠ خاوەنی مەهانەی ڕەوا ئەگەر نەشچێ بۆ غەزا قەیناکا).

## هەندێ بابەتی جیا جیا لەکاتی غەزادا، وەهەندێ مەهانەی ڕەوا

١٢٣٠-عَنْ أَبِي بَشِيرٍ الأنْصَارِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَسُولاً: (أَنْ لا يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلادَةٌ مِنْ وَتَرٍ أَوْ قِلادَةٌ إِلاَّ قُطِعَتْ) (الحديث٣٠٠٥) [٢٨٦].

ئەبوبەشیری ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویـ: لەسەفەرێکا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین خەڵکەکە شوێنی شەویان گرتبوو، کەمێ بڵاو بوو بوونەوە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ڕابەرێکی نارد بۆلایان، کەپێیان ڕابگەیەنێ: کە هەر وشترێ ملیوانکەی ژێی کەوانی لەمل دایە، یاخود هەر ملیوانکەیەکی دیکەی لەگەردندایە، بیپچڕێننەوەو لەملی دابکەنن!) (تاج/٨ل/٩٥ز-٢٩ف-١)

هۆی ئەم نەهیە وەك شێخی عەینی دەفەرموێ: ژێی کەوان زۆر قایمە لەبەر ئەوە هەندێ کێشە دروست دەکا، وەك:

١- هەندێ کەس هەندێ شت دەکەنە ملی وڵاخ بەنیازی چاوەزار.

---

(٢٨٦) أخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب: كراهة قلادة الوتر في رقبة البعير، رقم: ٢١١٥.

٢- شەرع فەرمانیان پێ دەکا بەپچڕاندنی چونکە ئەو جۆرە شتانە نابن بەچاوەزار لەبەر ئەوە زیانیان هەیە نەوەك قازانج، وەك لەبینیان توند دەبێو دەیان خنکێنێ یا دەگیرێ لەقەڵبەیەكو دەبێتە هۆی خنکاندنی ئاژەڵەکە. بەڵام چاوەزار بەناوە جوانەکانی خواو بەصیفاتەکانیو بەئایاتی قورئان دروستە (بڕوانە: فەرموودەی ژمارە: ١٠٠٦ لەم بەرگەیەدا) وەئەوە بەر ئەم نەهیە ناکەوێ بەڵام شتی وایش دەبێ بەشێوەیەکی شایان بەوڵاخو ئاژەڵەکەدا هەڵواسرێ، وەك ئەوە بەبەنێکی ناقایم بکرێتە ملی، یا بەجلو کورتانو سەرکەللەو زینو سەرزینی وڵاخەکەدا دادووری یا لەشوێنێکی شایانا لەتەویلەو وپشتیرو جێگەی ئاژەڵەکە دابنرێ. شەرع رێگەی شتیوا دەدا، چونکە بناغەی شەرع لەسەر ئاسانکاریو بەرژەوەندی بەندەکانە.

ئەبوبەشیری ئەنصاری هاوڕێی پێغەمبەرە، لەناو هاوڕێیانی پێغەمبەردا کەسێکی تر نییە بەم ناوە، بەڵام هەیانە کە کەسناو (کونیە) ی ئەبو بەشیر بێ، وەك: بەراء پێشی دەگوترێ: ئەبوبەشیر.

ئەبوبەشیر لەپاش رووداوی ئەل حەررە مردووە (بڕوانە: ژمارە: ١٢١٣) ئامادەی غەزای ئوحودو غەزای خەندەق بووە، دەڵێن: تەمەن درێژ بووە.

١٢٣١ - عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ وَلا تُسَافِرَنَّ امْرَأَةٌ إِلاّ وَمَعَهَا مَحْرَمٌ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا وَخَرَجَتْ امْرَأَتِي حَاجَّةً؟ قَالَ: (اذْهَبْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ). (الحديث ٣٠٠٦، أطرافُهُ في: ١٩٦٢، ٣٠٠٦، ٣٠٦١، ٥٢٣٣)[٢٨٧].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (نابێ پیاوو ژنی بیانی بەتەنها، دوو بەدوو، لەشوێنێکا

(٢٨٧) أخرجه مسلم في الحج، باب: سفر المراة مع محرم إلى حج وغيره رقم: ٢١١٥.

كۆببنەوە، ئافرەتیش نابێ بچێ بۆ سەفەری دوور مەگەر خۆیی (مەحرەم) ی لەگەڵدا بێ). پیاوێ هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم بۆ فیسارە غەزا ناونوس کراوم‌و ژنەکەشم چووە بۆ حەج؟! فەرمووی: (دەی خۆشت بڕۆ لەگەڵ ژنەکەتا بۆ حەج) (بڕوانە: ژمارە: ٨٥١بەرگی دووەم باسی سەفەرکردنی ژن بەتەنها بەبێ کەسێکی خۆیی..).

## کوشتنی ژن‌و منداڵ‌و سووتاندن بەئاگرو دیل‌و بارمتەو....

١٢٣٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (عَجِبَ اللَّهُ مِنْ قَوْمٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فِي السَّلَاسِلِ). (الحديث ٣٠١٠، طرفُهُ في: ٤٥٥٧) [(٢٨٨)]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (خودا تەعەجوب دەکا سەیری دێ لەهۆزێ کەبەزنجیرو کۆتەوە دەچنە بەهەشتەوە) (بڕوانە: تاج/٨ل -١٧١ف-١).

١٢٣٣- عَنْ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: (هُمْ مِنْهُمْ) وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (لا حِمَى إِلاّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ). (الحديث ٣٠١٢، طرفُهُ في: ١٠٤١ تجريد= ٢٣٧٠ فتح) [(٢٨٩)].

صەعبی کوڕی جەثامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە ئەبواء، یا لە وەددان، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات، ئەم پرسیارەیان لێ کرد: لەشەودا دەدرێ بەسەر ناموسوڵمانانی جەنگی (حەربی) دا، لەناو ماڵەکانیانا لەکاتی

---

(٢٨٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه، (فتح/٦/١٩٥) — المترجم.

(٢٨٩) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: جواز قتل النساء والصبيان.. رقم: ١٧٤٥.

ئەو شەبەیخوونەدا، ژنو منالّیان بەردەکەون ئایا بەکوشتن یا بەزامار بوون، ئایا حوکمو بڕیاری ئەو ژنو منالانە چییە؟ فەرمووی: (ئەوانیش لەوانن لەبەرناچاری بڕیاری کوشتنی ژنو منالّو شەڕکەریان لەحالّی وادا — کەستەمە لەیەکتری جیابکرێنەوە- وەك یەکەو دروستە) (بڕوانە: تاج/٨/ل-١٣٠از-٥٢ف-٢. باسی ژنو مندالّو پیرەمێرد ناکوژرێن) +(ژمارە: ١٠٤١ تجرید).

١٢٣٤-عَنْ عَبْد اللّٰهِ بن عمر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) أَخْبَرَهُ أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقْتُولَةً فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ. (الحديث ٣٠١٤، طرفُهُ في: ٣٠١٥) [(٢٩٠)]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایەکا لەغەزاکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لاشەی ژنێکی کوژراو دۆزرایەوە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کوشتنی ژنو منالّی بەناپەسەند دانا. (تاج/٨/ل-١٣٠ف-١از -٥٢. باسی ژنو منالّو پیرەمێردو کۆیلەو سوتان).

١٢٣٥- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) لَمّا بلغهُ أنّ عليّاً (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَمْ أُحَرِّقْهُمْ لأنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللّٰهِ) وَلَقَتَلْتُهُمْ كَمَا قَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ) (الحديث ٣٠١٧، طرفُهُ في: ٦٩٢٢) [(٢٩١)].

عیکرەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەستەیەکی سووتاند، کە لەئیسلام وەرگەڕابوون، کە ئەمە گەیشتەوە بەئیبنوعەبباس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر من بومایە لەشوێنی عەلی نەمدەسوتاندن چونکە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەسزای تایبەتی خودا، کەبریتییە لەسزادان بەئاگر، کەس سزا مەدەن) بەلام ئەوانەم دەکوشت چونکە

(٢٩٠) أخرجه مسلم في الجهاد والسِّير، باب: تحريم قتل النساء والصبيان في الحرب، رقم: ١٧٤٤.

(٢٩١) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عبّاس مع علي (فتح/٦/١٩٥) - المترجم.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کەسێ ئایینی خۆی گۆڕی بیکوژن) (تاج٣ل-٢٢٩ف-٢ز-٨٨. باسی حوکمی وەرگەڕاوە لەدین).

١٢٣٦ –عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (قَرَصَتْ نَمْلَةٌ نَبِيًّا مِنْ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَحْرَقْتَ أُمَّةً مِنْ الأُمَمِ تُسَبِّحُ) (الحديث ٣٠١٩، طرفُهُ في: ٣٣١٩) [٢٩٢].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لەخۆشەویست (درودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (جارێ مێروولەیێ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکان دەگەزێ، پێغەمبەرەکە فەرمان دەدا شارە مێرولەکە هەموو دەسوتێنن، جا خودا لەسەر ئەوە گلەیی لێ دەکاو سروشی بۆ دەنێرێ، خۆ تۆ تاقە یەك مێرولە گەستتی کەچی نەتەوەیەکت لەنەتەوەکان سەر تۆپ سووتاند کە حاڵیان وابوو تەسبیحاتو سوپاسو ستایشی خوایان دەکرد) (تاج/٤ل –١٥ز-٤ گیانلەبەرێ کوشتنی قەدەغەبێ).

١٢٣٧– عن جَرِير بن عبد الله قَالَ: قال لِي رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَلا تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ وَكَانَ بَيْتًا فِي خَثْعَمَ يُسَمَّى كَعْبَةَ الْيَمَانِيَةِ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ مِنْ أَحْمَسَ وَكَانُوا أَصْحَابَ خَيْلٍ قَالَ وَكُنْتُ لا أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ فَضَرَبَ فِي صَدْرِي حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ أَصَابِعِهِ فِي صَدْرِي وَقَالَ: (اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ وَاجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا) فَانْطَلَقَ إِلَيْهَا فَكَسَرَهَا وَحَرَّقَهَا ثُمَّ بَعَثَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخْبِرُهُ فَقَالَ رَسُولُ جَرِيرٍ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْتُهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ أَجْوَفُ أَوْ أَجْرَبُ قَالَ: (فَبَارَكَ فِي خَيْلِ أَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ) (الحديث ٣٠٢٠، أطرافُهُ في: ٣٠٣٦، ٣٠٧٦، ٣٨٢٣، ٤٣٥٥، ٤٣٥٦، ٤٣٥٧،٦٠٩٠، ٦٣٣٣) [٢٩٣].

---

(٢٩٢) اخرجه مسلم في السلام، باب: النهي عن قتل النمل، رقم: ٢٢٤١.

(٢٩٣) اخرجه مسلم في الفضائل، باب: فضائل جرير بن عبدالله، رقم: ٢٤٧٦.

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەرێ بوتخانەی ذولخەصەم لەکۆڵ ناکەیتەوە) بوتخانەیێ لەیەمەن هەبوو ناوی ذولخەلەسە بوو، پێیان دەگوت: کەعبەی یەمانی، لەبەر ئەوەی کە لەوڵاتی یەمەن بوو.

فەرمووی: منیش بەسەدو پەنجا سوارەوە لەهۆزی ئەحمەس کە هۆزی خۆمن، تاوم دایە، وەك دەزانین هۆزی ئەحمەس خاوەن ڕەوگن، بەلام من خۆم بەسەر ماینەوە پێ نەدەگیرا ئەوەم عەرزی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کرد، جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ موفەرکی، بەنیازی خۆگرتن بەسەر ولاخی سوارییەوە دەستی دا بەسینگما، تەنانەت شوێنەواری لێدانی پەنجەکانی بەسەر سینگمەوە دیار بوو، وە فەرمووی: (خودایە راگیری بفەرموو وە بیکە بەرابەرێکی شارەزا) ئیتر لەوەدوا جەریر قەت لەمایین نەکەوتە خوارەوە، ئەوجا خۆم و لەشکرەکە ڕۆیشتین بۆ گیانی بوتخانەکەو بتەکەمان شکان و خانوەکەمان رمان و ئەوەشی لەوێ بوو کووشتمان و دوایی کابە درۆینەکەمان بەتەواوی سووتاند، ئەوجا رابەرێکمان نارد بۆ خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەم هەواڵە خۆشەی پێ راگەیاند، رابەرەکەی جەریر عەرزی حەزرەت دەکا: بەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راست و دروست و ڕەوانەی کردووی بۆ سەرئێمە، کەهاتم بتخانەکە سووتابوو ئەتووت وشتری گەڕەو قەترانی لێ دراوە، ئاوا ڕەش داگیرسابوو! وەك کەلاوەیەکی کۆن چۆڵ و هۆڵ بوو! گوتی: جا پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) پێنج جار نزای پیرۆزی بۆ ڕەوگ و پیاوانی هۆزی ئەحمەس فەرموو) (تاج/٥ل-٢٣٠ف-٢ز-٦٥. گەورەیی جەریر -ش /ت).

## ڕوونکردنەوە:

باخ سووتاندن و ژن و منداڵ کوشتن و دێ سووتاندن و باخ و ڕەز داهێنان و گەلێ شتی تری لەم بابەتانە، بڕیارەکەیان بەپێی هەڵوێست و بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانان دەگۆڕێ، بەشێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە شتانە هەتا لەکاتی ڕوودانی

جـەنگا ناباش‌و نـارەوان‌و نـابێ ئـەنجام بـدرێن. بـەڵام ئەگـەر شـەڕ گـەرم بـوو جـەنگاوەر نەیدەپەرژایـە سـەر جیاکردنـەوی جـەنگاوەریان لـەنا جـەنگاوەریان، یا بـوو بەشـەڕە تـۆپ‌و شـەڕە فـڕۆك‌و لەهـەردوولا مـاڵ‌و منـاڵ‌و پـیرو پەککەوتـە کوژران‌و پێوە بوون، ئەوە لەبەر ناچاری ڕێ بەو جۆرە شتانە دەدریٚ.

لەراستیدا بۆ ئەم سەردەمە مەلاو زاناکان تا رادەیێ دوورن لەهەڵسوڕانی جـەنگ‌و دوورە شـەڕن‌و لەبـەر ئـەوە کـەمتر ئاگایـان لـەبارودۆخی دەروونـی جەنگاوەرەکان هەیە، کەوەك تەنـدووری داخـراو کڵپـە کڵپیـەتی! لەبـەر ئـەوە بڕیارەکانیان لەم لایەنەوە هەر بڕیارە کۆنەکانەو، تارادەیێ نیوە ناچڵە.

١٢٣٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَــالَ: (هَلَــكَ كِــسْرَى ثُــمَّ لا يَــكُونُ كِــسْرَى بَعْــدَهُ وَقَيْــصَرٌ لَــيَهْلِكَنَّ ثُمَّ لا يَـكُونُ قَيْصَرٌ بَعْدَهُ وَلَتُقْسَمَنَّ كُنُوزُهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ) (الحديث٣٠٢٧ أطرافُـهُ في: ٣١٢٠، ٣٦١٨، ٦٦٣٠)[٢٩٤]

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (وا کیسرا لەناو چوو ئیتر لـەپاش ئـەو کیـسرای تـر نـابێ، قەیـسەریش لـەناو ئەچـێ‌و لـەپاش ئـەویش قەیـسەری تـر نـابێ، بـەو کەسـە کـە گیـانی منـی بەدەسـتە، گـەنج‌و سـامان‌و گەنجینـەی ئـەم دوو پادشـایە دەسـت موسـوڵمانان دەکەون‌و بەخت دەکرێن لەپێناوی خودادا) (تاج/٤ل-٣٦٧ف –٧ز-١١٢).

– وعنْهُ في روايةٍ: قَالَ سَمّى النبيُّ (درودی خوای لەسەر بێ) الْحَـرْبَ خَدْعَـةً) (الحـديث ٣٠٢٩، طرفُهُ في: ٣٠٢٨).

دیـسان ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەڕ فڕوفێڵە، جەنگ بە فڕو فێڵ دەبرێتەوە) (تـاج/٨ل-١٢٨ف-٢ز-٥٠. شوێنە گومکێ لەشەڕدا پەسەندە).

---

(٢٩٤) اخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: جواز الخداع في الحرب، رقم: ١٧٤٠ وفي الفتن وأشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يمرَ الرّجل بقبره... رقم: ٢٩١٨.

# دووبەرەکیو بەگوێ نەکردنی فەرمانی سەربازیو هەندێ بابەتی تر

١٢٣٩-عن الْبَراء بْنَ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) يُحَدِّثُ قَالَ: جَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الرَّجَّالَةِ يَوْمَ أُحُدٍ وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلاً عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ: (إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ فَلا تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا الْقَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ فَلا تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ) فَهَزَمُوهُمْ قَالَ: فَأَنَا وَاللَّهِ رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ قَدْ بَدَتْ خَلاخِلُهُنَّ وَأَسْوُقُهُنَّ رَافِعَاتٍ ثِيَابَهُنَّ فَقَالَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جُبَيْرٍ: الْغَنِيمَةَ أَيْ قَوْمِ الْغَنِيمَةَ ظَهَرَ أَصْحَابُكُمْ فَمَا تَنْتَظِرُونَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جُبَيْرٍ: أَنَسِيتُمْ مَا قَالَ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا: وَاللَّهِ لَنَأْتِيَنَّ النَّاسَ فَلَنُصِيبَنَّ مِنْ الْغَنِيمَةِ فَلَمَّا أَتَوْهُمْ صُرِفَتْ وُجُوهُهُمْ فَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ فَذَاكَ إِذْ يَدْعُوهُمْ الرَّسُولُ فِي أُخْرَاهُمْ فَلَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَيْرُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً فَأَصَابُوا مِنَّا سَبْعِينَ وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ أَصَابُوا مِنْ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعِينَ وَمِائَةً سَبْعِينَ أَسِيرًا وَسَبْعِينَ قَتِيلاً فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ أَفِي الْقَوْمِ مُحَمَّدٌ ثَلاثَ مَرَّاتٍ فَنَهَاهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُجِيبُوهُ ثُمَّ قَالَ أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ قَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ الْخَطَّابِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ أَمَّا هَؤُلاءِ فَقَدْ قُتِلُوا فَمَا مَلَكَ عُمَرُ نَفْسَهُ فَقَالَ: كَذَبْتَ وَاللَّهِ يَا عَدُوَّ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ عَدَدْتَ لأَحْيَاءٌ كُلُّهُمْ وَقَدْ بَقِيَ لَكَ مَا يَسُوءُكَ.

قَالَ: يَوْمٌ بِيَوْمِ بَدْرٍ وَالْحَرْبُ سِجَالٌ إِنَّكُمْ سَتَجِدُونَ فِي الْقَوْمِ مُثْلَةً لَمْ آمُرْ بِهَا وَلَمْ تَسُؤْنِي ثُمَّ أَخَذَ يَرْتَجِزُ أُعْلُ هُبَلْ أُعْلُ هُبَلْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلا تُجِيبُوا لَهُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَقُولُ؟ قَالَ: (قُولُوا: اللَّهُ أَعْلَى وَأَجَلُّ) قَالَ: إِنَّ لَنَا الْعُزَّى وَلا عُزَّى لَكُمْ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَلا تُجِيبُوا لَهُ؟ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَقُولُ؟ قَالَ: قُولُوا: (اللَّهُ مَوْلانَا وَلا مَوْلَى لَكُمْ) (الحديث ٣٠٣٩، أطرافُهُ في: ٣٩٨٦، ٤٠٤٣، ٤٠٦٧، ٤٥٦١).

بەراء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای ئوحوددا، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کرد بەسەرکردەی پیادەکان، کە پەنجا پیاوی تیرهاوێژ بوون پێی فەرموون: ئەگەر بەچاوی خۆتان ئێمەتان دی لەوناوەدا کوژراوین‌و لاشەمان کەوتووەو مەل‌و مۆرو جانەوەر دەمان خۆن، ئێوە لەم شوێنەی خۆتان مەجولێن‌و پشتمان چۆڵ مەکەن، هەتا خۆم دەنێرم بەشوێنتانا لەجێگەی خۆتان مەبزوێن.

جا سوپای ئیسلام لەشکری ناموسوڵمانەکانیان تێک شکان، بەراء فەرمووی: بەخودا بەچاوی خۆم ئافرەتە ناموسوڵمانەکانی قورەیشیم بینی، قۆڵیان هەڵماڵی بوو خڵخاڵ‌و لاقیان بەدەرەوە بوو، بەرەو لوتکەی شاخەکە لەترسی دیل کردن، بەهەڕاکردن هەڵدەهاتن! چاک‌و دامێنی کراسەکەیان کردبوو بەلادا، هەتا باش بتوانن رابکەن.

ئیتر هاوڕێکانی عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر گوتیان: خزمینە! ڕۆژی تالانە، زووکەن فریاکەون، ئەوەتا سوپای خۆمان سەرکەوتوون‌و ئیتر چاوەڕوانی چیدەکەن؟ عەبدوڵڵای سەرکردەیان پێی فەرموون: ئەی لەیادتان چووە کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) چی پێ فەرموون؟ گوتیان بەخوا دەڕۆین بۆ ناو مەردومەکە بەشی خۆمان تالان دەگرین، ئیتر سەنگەرەکانی خۆیان چۆڵ کرد، عەبدوڵڵاو چەند کەسێ لەوێ مانەوە، هەموویان شەهید کران، ئەوانی تریان چوون بۆ تالانی کۆکردنەوە.

جا کاتێ ڕۆیشتن بۆناو خەڵکەکە سەریان لێ تێک چوو، نەیان دەزانی سەربەچ لایەکا دەربکەن‌و بەرەو دوا شکان‌و هەڵهاتن، هۆی ئەوەش ئەوەبوو ئەمانە کەپشتی سوپای ئیسلامیان چۆڵ کردو، ئالان بەتالان‌و پڕو پیتی جیهانەوە، لەم کاتە ناسکەدا، خالیدی کوڕی ولید، کە ئەوکاتە لەگەڵ سوپای ناموسوڵمانەکان بوو هەلی دەست کەوت‌و هێرشی بردو بوو بەهۆی تێک شکاندنی سوپای ئیسلام، ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە خودا لەقورئانا بەم ئایەتە

باسی دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَى أَحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ﴾ جا موسوڵمانان زۆر خراپ شکانو هەموو هەڵهاتن، تەنها دوازدە پیاو رایان نەکرد کە لەخەزمەت پێغەمبەردا مانەوە، دوژمن حەفتا کەسی لەئێمە شەهید کرد پێغەمبەرو هاوڕێیانی لەغەزای بەدردا زیانی سەدو چل کەسیان لەدوژمن دابوو، حەفتا دیلو حەفتا کوژراویان هەبوو.

جا ئەبو سوفیان کەئەو رۆژە سەرۆکی بێ باوەڕەکان بوو، کردیە سەر بەرزییەكو بانگی کرد: ئایا موحەممەد خۆی ماوە یا کوژراوە؟ سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، ئەوجا هەمان پرسیاری سەبارەت بە ئەبوبەکرو عومەری کوڕی خەطاب سێ جار دووبارە کردەوە، ئەوجا بایدایەوە بۆ ناو کۆمەڵەکەیو گوتی: دیارە کەئەمانە هەموویان کوژراون، ئەگینا ئەگەر زیندوو بونایە وەڵامیان دەدایەوە.

عومەریش خۆی پێ رانەگیرا، فەرمووی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خودا! ئەو ناوانەی کە تۆ یەکەیەکە هەڵیانت دا لەسایەی خوداوە هەموویان ماون، خودا مایەی خەمو خەفەتو ناخۆشی بۆ تۆ هێشتۆتەوە کەپێی بتەقی!

دوایی ئەبوسوفیان گوتی: ئەم رۆژە بەرۆژەکەی بەدر، بزانن شەڕیش بەسەرەیە هەرجارەی لایەك دەیباتەوە، وەك سەتڵی سەر بیر وایە، هەرساتەی وا بەدەست کەسێکەوە! هەروا گوتیشی: لەناو تەرمەکانتانا هەیە کە تەرمەکەی شێواوەو لچو لێوو لوتو گوێ کراون، ئەوە هەرچەند بەفەرمانی من نەبوو، بەڵام پێشم ناخۆش نەبووە!

ئەوجا لەخۆشیانا دەستی کرد بەسۆزکردنو سروود گوتنو بەدەنگی بەرز خۆش خۆش دەیگوت: (اعلُ هبَل، اعلُ هبَل: سەربەرزی بۆ هوبەل! سەربەرزی بۆ هوبەل! ) هوبەل ناوی بوتی گەورەیان بوو!

پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە بۆ وەڵامی نادەنەوە؟!) عەرزیان کرد: قوربان بڵێین چی؟ فەرمووی: (بڵێن: اللهُ أعلىء أجلّ). واتە: خودا گەورەترو شکۆمەندترە.

ئەبوسوفیانش گوتی: ئێمە خودایە تریشمان هەیە ناوی عوززایە، ئێوە ئەوەتان نییە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە بۆ وەڵامی نادەنەوە؟!) گوتیان: قوربان بڵێین چی؟ فەرمووی: (بڵێن: ئێمە خودای گەورە خاوەن‌و سەروەرمانە، بەڵام ئێوە بێ خاوەن‌و بێ سەروەرن!).(تاج/٦ل-٨٥ف-٢٦ز-٤. سوورەتی ئالی عیمران + تاج/٨ل-٢٠٩ز-٨٧. باسی غەزای ئوحود).

١٢٤٠ –عَنْ سَلَمَةَ (رضي اللهُ عنه) قَالَ: خَرَجْتُ مِنَ الْمَدِينَةِ ذَاهِبًا نَحْوَ الْغَابَةِ حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِثَنِيَّةِ الْغَابَةِ لَقِيَنِي غُلامٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قُلْتُ: وَيْحَكَ مَا بِكَ قَالَ: أُخِذَتْ لِقَاحُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: مَنْ أَخَذَهَا؟ قَالَ غَطَفَانُ: وَفَزَارَةُ فَصَرَخْتُ ثَلاثَ صَرَخَاتٍ أَسْمَعْتُ مَا بَيْنَ لابَتَيْهَا يَا صَبَاحَاهْ يَا صَبَاحَاهْ ثُمَّ انْدَفَعْتُ حَتَّى أَلْقَاهُمْ وَقَدْ أَخَذُوهَا فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ وَأَقُولُ:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعْ

فَاسْتَنْقَذْتُهَا مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يَشْرَبُوا فَأَقْبَلْتُ بِهَا أَسُوقُهَا فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْقَوْمَ عِطَاشٌ وَإِنِّي أَعْجَلْتُهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا سِقْيَهُمْ فَابْعَثْ فِي إِثْرِهِمْ فَقَالَ يَا ابْنَ الأَكْوَعِ مَلَكْتَ فَأَسْجِحْ إِنَّ الْقَوْمَ يُقْرَوْنَ فِي قَوْمِهِمْ) (الحديث ٣٠٤١، طرفه في: ٤١٩٤) [(٢٩٥)].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەرچووم بۆ جەنگەڵەکە کەنزیکەی بەریدێ لەمەدینەوە دوورە، بەریدێ دوو فەرسەخە، کاتێ گەیشتمە ملەی جەنگەڵەکە، خوڵامێکی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفم پێگەیشت پەشۆکا بوو، گوتم: ئەوە چیتە هاوار لەخۆت؟ گوتی: وشترە شیردارەکانی پێغەمبەریان فڕاند. گوتم: کێ فڕاندی ؟ گوتی: چەتەی هۆزی

---

(٢٩٥) اخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: غزوة ذي قدر وغيرها، رقم: ١٨٠٦.

غەطەفان‌و هۆزی فەزارە، جامنیش وەك باوە لەكاتی وادا، سێ جار بەهەموو دەنگم بەرەو مەدینە هاوارم كرد: ئای لەم دەمە دەمی بەیانییەدا، خەڵكەكە! فریاكەون قەوماوە! بەم قیژەیە لەم پەڕی مەدینەوە هەتا ئەو پەڕی مەدینەم ئاگادار كردەوە. سەلەمە لەم غەزایەدا پیادە بوو وڵاخی سواری پێ نەبوو ئەوجا خۆم بەتەنها گوزمم داو بەرەو چەتەكان تێم تەقان‌و پاش ماوەیێ گرتمنەوە، دەبینم وشترە دزیەكانیان واپێ، جابەتیر دام گرتن‌و بەدەم تیر تێگرتنەوە هۆرەم دەكردو دەمگوت:

أَنَا ابْـــنُ الأَكْـــوَعِ وَالْيَـــوْمُ يَوْمُ الـــرُّضَّعْ

واتە:

ئەمن سەلەمەی كوڕی ئەكوەعم نامەرد دەكوژم بەئەمری شەرعم

ئیتر بەشەڕە تیر هەڵم فڕاندن‌و وشترەكانم لێ سەندنەوەو مەودای ئەوەم نەدان كەبگەنە سەرئاوو ئاو بخۆنەوە، ئەوجا بەرەو مەدینە لێم خوڕین‌و گەڕامەوە. جا لەڕێ پێغەمبەرو هاوڕێیانی كەهاتبوون بەدەم ئەم رووداوەوە پێم گەیشتن، عەرزیم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دوژمن حاڵیان شڕە ماندوو مردووو تینوون، منیش بەپەلە هەڵم فڕاندن، نەمهێشت پاراو ببن، ئەگەر سوپایێ بنێری بەدوایانا دەیانگرنەوەو تۆڵەی بەرودوایان لێ دەسێنن!

فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (ئەی كوڕی ئەكوەع! بەمرازی خۆت گەیشتوی داخی دڵی خۆت پێ ڕشتوون، پێ لێ هەڵبڕینیش زۆر باش نییە، كەواتە لێبوردنت هەبێ باشە! چاوپۆشی بكە، وەكی تریش ئێستا گەیشتوونەتە جێگەی قایم، وان لەناو وڵات‌و هۆزی خۆیانا، هۆزەكەیان یاریدەیان دەدەن بشنێرین بەشوێنیانا سوودی نییەو، هەر بەئاسانی بۆمان زەوت ناكرێن).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە دوازدەهەم فەرموودەی سیانی (ثلاثي) یە، لەبوخاری پیرۆزدا (بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ١٢١٤ات = ٢٩٦٠ف).

١٢٤١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فُكُّوا الْعَانِيَ يَعْنِي الأَسِيرَ وَأَطْعِمُوا الْجَائِعَ وَعُودُوا الْمَرِيضَ. (الحديث ٣٠٤٦، أطرافُهُ في: ٥١٧٤، ٥٣٧٣، ٥٦٤٩، ٧١٧٣) (٢٩٦).

ئەبوموسا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (دیل ڕزگاربکەن، برسی تێر بکەن، بچن بۆ سەردانی نەخۆش‌و بۆ هەواڵپرسینی).

١٢٤٢- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قُلْتُ لِعَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنْ الْوَحْيِ إِلاَّ مَا فِي كِتَابِ اللَّهِ قَالَ لا وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ مَا أَعْلَمُهُ إِلاَّ فَهْمًا يُعْطِيهِ اللَّهُ رَجُلاً فِي الْقُرْآنِ وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ قُلْتُ وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ قَالَ الْعَقْلُ وَفَكَاكُ الأَسِيرِ وَأَنْ لا يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ) (الحديث ٣٠٤٧، أطرافُهُ في: ١١١، ١٨٧٠، ٣٠٤٧، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٦٩٠٣، ٦٩١٥، ٧٣٠٠) (٢٩٧).

ئەبوجوحەیفە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەعەلیم گوت: ئێوە کە بنەماڵەی پێغەمبەرن، ئایا هیچ نامەو نووسراوو سرووشێکی تایبەتییتان والا، کەلای ئەو خەڵکەی تر نەبێ، وەك هەندێ کەس ئەم داوایە دەکەن ؟ فەرمووی: (بەوکەسە کە تۆمە دەتەقێنێ‌و دەیڕوێنێ‌و، بەو کەسە کە هەموو گیانلەبەرانی دروست کردووە، شتی وامان لانییە، جگە لەقورئان کەنامەی

---

(٢٩٦) لاحظ خاتمة كتاب الجهاد(فتح/٦/ص١٩٥٩) المترجم.

(٢٩٧) قال صاحب التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول رواه الشيخان (تاج/١/ص ٦٩،تاج/٣/ص٣٤) - المترجم.

خودایە، مەگەر تێگەیشتن و فەهمێ کەخودا بیدا بەموسوڵمان، لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە، لەگەڵ ئەمەش کەوا لەم تۆمارە نووسراوەدا. گوتم: باشە ئەم تۆمارە چی لێ نووسراوە؟).

فەرمووی: (باسی چۆنێتی خوێندان و، ئەندازەو چەشنی خوێنبایی و باسی سەرانەو بارمتەی دیل و، ئەو مەسەلەیەیش کە موسوڵمان لەباتی بێ باوەڕ (کافر) ناکوژرێتەوە!). (تاج/١/٨٨ز-١٦. زانین دەنووسرێتەوە - ش/ت).

١٢٤٣- عَنْ أَنَسِ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رِجَالاً مِنْ الأَنْصَارِ اسْتَأْذَنُوا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ فَلْنَتْرُكْ لابْنِ أُخْتِنَا عَبَّاسٍ فِدَاءَهُ فَقَالَ: لا تَدَعُونَ مِنْهَا دِرْهَمًا) (الحديث ٣٠٤٨، طرفاهُ في: ٢٥٣٧، ٤٠١٨)[(٢٩٨)]

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەغەزای بەدردا، دیل کرا، ویستی سەرانە بداو خۆی ئازادبکا، پیاوانێ لەئەنصارەکان، کەخاڵوانی عەبدو لموطەلیبی باوکی عەبباس بوون، عەرزی پێغەمبەریان کرد: قوربان! ڕێگەمان پێ بدە، کەهەندێ لەسەرانەکەی عەبباسی خوشکەزامان خۆش ببین،و هەندێ لەبارمتەکەی کەم بکەینەوە؟ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (یەك درەم چییە لەبارمتەکەی سەری کەم ناکەنەوە).

١٢٤٤- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَيْنٌ مِنْ الْمُشْرِكِينَ وَهُوَ فِي سَفَرٍ فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ فَقَتَلَهُ فَنَفَّلَهُ سَلَبَهُ) (الحديث ٣٠٥١)[(٢٩٩)].

---

(٢٩٨) لم يوافقه مسلم على حديث أنس في قصة عباس (فتح/٥ ).

(٢٩٩) أنظر: مسلم: الجهاد والسير، باب: استحقاق القاتل سلب القتيل، رقم: ١٧٥٤.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای هەوازینا خەفییەیەکی ناموسوڵمانەکان هات بۆ سووسەکردنی هەواڵی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو هاوڕێکانی دا دانیشتو دەستی کرد بەقسەو باس، لەپاشدا دزکەی لێ کردو فڕکەی لێ کرد. پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بیدۆزنەوە بیکوژن) منیش شوێنی کەوتمو کوشتمو وشترەکەی ژێریم هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئەویش تفاقو وشترەکەی دابەخۆم لەگەڵ چەکەکەیدا.

١٢٤٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّهُ قَالَ: يَوْمُ الْخَمِيسِ وَمَايَوْمُ الْخَمِيسِ ثُمَّ بَكَى حَتَّى خَضَبَ دَمْعُهُ الْحَصْبَاءَ فَقَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَعُهُ يَوْمَ الْخَمِيسِ فَقَالَ: (ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا) فَتَنَازَعُوا وَلا يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ فَقَالُوا: هَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (دَعُونِي فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونِي إِلَيْهِ) وَأَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بِثَلاثٍ: (أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ) وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ) (الحديث ٣٠٥٣، طرفُهُ في: ٩٣ تجريد= ١١٤ فتح الباري) [٣٠٠].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئای لەو ڕۆژی پێنج شەممەیە چی ڕۆژێ بوو؟! ئەوجا ئیبنو عەبباس زۆر گریا، هەتا بەفرمێسك چەوی بەرپێی خۆی تەڕکرد، ئەوجا فەرمووی: لەرۆژی پێنج شەممەدا، نەخۆشیەکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تەواو کەشەنگ بوو، فەرمووی: (نامەیەکم بۆ بهێنن، هەتا نامەیەکتان بۆ بنووسم، ئیتر لەپاش ئەو وەسیەت نامەیە هەتایە ڕێگەی ڕاست وون ناکەنو سەرتان لێ ناشێوێ!) بەڵام یاران لەناو خۆیانا بوو بەهەرایان، خزمەتی پێغەمبەرانیش شوێنی مشتو

(٣٠٠) اخرجه مسلم في الوصية، باب: ترك الوصية لمن ليس له شيئ يوصي فيه، رقم: ١٦٣٧.

مرِو بگرەو بەردەو شوێنی هەراو هوریا نییەو نابێ شتی وا روو بدا، ئەوە بوو هەندێ کەس ووتیان: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەبرِسکێنێ! حەزرەت – سەرو ماڵو منالّو باوكو دایكو هەستو نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆرِی پیرۆزی بێ – فەرمووی: (کە وای لێ هات لێم گەرِێن باخەریکی حاڵی خۆم بمو خۆم ئامادە بکەم بۆ شادبوون بەخزمەتی پەروەردگارم، ئەم حاڵەی خۆم گەلێ باشترو چاکترە لەمەی کەئێوە لەمنتان دەوێ!).

فەرمووی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی مردنی دا سێ راسپێری موسوڵمانانی کرد: فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (فرەخواکان لەدوورگەی عەرەب دەرکەنو، وەك خۆم بەجوانی نوێنەر (وەفد) بەرِێ بکەن..) فەرمووی: راسپێری سێهەمیانم لەیاد نەماوە. (تاج/٨ل-١٨٨ف —١ز-٨١.باسی دەرکردنی ناموسوڵمانەکان لە لەدوورگەی عەرەب) +(برِ: ژ-٩٣).

١٢٤٦–عنْ ابْن عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قال: قَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللّٰهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: (إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ وَمَا مِنْ نَبِيّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَ قَوْمَهُ لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ وَلَكِنْ سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَأَنَّ اللّٰهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ) (الحديث ٣٠٥٧، أطرافُهُ في: ٣٣٣٧، ٣٤٣٩، ٤٤٠٢، ٦١٧٥، ٧١٢٣، ٧١٢٧، ٧٤٠٧) (٣٠١).

ئیبنوعومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵسایەوە دوانێکی بۆ مەردومەکەدا سوپاسێ کەشایستەی خودا بێ کردی و، ئینجا هاتە سەر باسی جەجاڵو فەرمووی: (من هۆشیارتان دەکەمەوەو مەترسیتان دەخەمەبەر لە جەجاڵ، هەموو پێغەمبەرەکانی تریش لەپێش مندا گەلەکانی خۆیان ئاگادارکردۆتەوەو مەترسی ئەویان خستونەتە بەر، بەلاّم

(٣٠١) أخرجه مسلم في كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: ذكر الدّجال (صم/١٨ص٥٩) - المترجم.

من قسەیەکتان بۆ دەکەم لەبابەت ئەو نەحلەتییەوە، کە هیچ پێغەمبەرێ ئەم قسەیەی نەکردووە بۆ گەلی خۆی، ئەویش ئەمەیە کە جەجاڵ یەکلەچاوە دیارە کە خودای گەورە یەکلەچاو نییە – ش/د/ت) (تاج/١٠ل-٣١٤ف-١ز –١١٢ نیشانەکانی جەجاڵە...).

١٢٤٧– عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (اكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلامِ مِنَ النَّاسِ) فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفًا وَخَمْسَ مِائَةِ رَجُلٍ فَقُلْنَا نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُ مِائَةٍ فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا ابْتُلِينَا حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي وَحْدَهُ وَهُوَ خَائِفٌ) (الحديث ٣٠٦٠)[٣٠٢]

حوزەیفە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوانەی کە موسوڵمان بوون ناویانم بۆ بنووسن) کاتێ ناوەکانمان نووسی هەزارو پێنج سەد پیاو بوون لەناو خۆمانا دەمانگوت: تازە ئێمە لەدوژمن بترسین، وەلحاڵ هەزارو پێنج سەد کەس بین، بەلام لەوەدوا خودا تووشی تاقیکردنەوەیەکی وای کردین تەنانەت پیاو بەتەنهایش نوێژی بکردایە هەر دەترسا، کەپێی بزانن و تووشی ئاژاوەو فەرتەنەی بکەن.

١٢٤٨– عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاثَ لَيَالٍ). (الحديث ٣٠٦٥، طرفُهُ في: ٣٩٧٦)[٣٠٣].

ئەبوطەلحە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) جاران کاتێ کەزاڵ دەبوو بەسەر هۆزێکا، سێ شەو لەلامالانەکەیان لەدیاریان دەمایەوە، هەتا خۆیان پشوێ بدەن و دوژمنیش بەتەواوی داماوو چاوترسێن ببێ) (تاج/٨ل –١٢٣ف- ٢ز-٤٧- کاتو دەمی شەڕ خۆش بوون).

---

(٣٠٢) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الإستسرار بالإيمان للخائف رقم: ١٤٩.

(٣٠٣) أشار العسقلاني والعينيُ إلى أن مسلما أخرج متابعة عبد الأعلى لهذا الحديث (فتح الباري حديث رقم: ٣٠٦٥ -) المترجم.

١٢٤٩– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ ذَهَبَ فَرَسٌ لَـهُ فَأَخَـذَهُ الْعَـدُوُّ فَظَهَرَ عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) وَأَبَـقَ عَبْدٌ لَهُ فَلَحِقَ بِالرُّومِ فَظَهَرَ عَلَيْهِمْ الْمُسْلِمُونَ فَرَدَّهُ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بَعْـدَ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٣٠٦٧، أطرافُهُ في: ٣٠٦٨، ٣٠٦٩) (٣٠٤).

ئیبنوعومـەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ئەسپێـکم هـەبوو تـەرا بـوو، دوژمـن گرتیـان‌و بردیانــەوە بـۆ خۆیـان، لـەپاش دا کەسـوپای موسـوڵمانان سـەرکەوت بەسـەریاندا، ئەسـپەکەیان دایـەوە بـەخۆم، ئەمـەیش بەسـەرینی پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) خـۆی بـوو، لەسـەر فـەرمانی خۆشـی دایانـەوە پـێم لـەپاش مـەرگی پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) ، کۆیلەیەکم هـەبوو هـەڵهات‌و رایکـردە نـاو رۆمـەوە، کـاتێ کـە موسـوڵمانان سـەرکەوتن بەسـەریان دا، خالیـدی کـوڕی وەلیـد کەسەرکردەی سوپای ئیسلام بـوو، لـەو سـەرکەوتنەدا کۆیلەکـەی دایـەوە بـەخۆم) (تاج/٨/١٥٠-١از –٦٣ –ناموسوڵمانی جەنگی نابێ بەخاوەنی ماڵی موسوڵمان).

١٢٥٠– عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ: قُلْتُ: يَارَسُولَ اللَّـهِ ذَبَحْنَـا بُهَيْمَـةً لَنَـا وَطَحَنْـتُ صَـاعًا مِـنْ شَـعِيرٍ فَتَعَـالَ أَنْـتَ وَنَفَـرٌ فَـصَاحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَـالَ: (يَـا أَهْـلَ الْخَنْـدَقِ إِنَّ جَـابِرًا قَـدْ صَـنَعَ سُـؤْرًا فَحَـيَّ هَـلاً بِكُـمْ) (الحـديث ٣٠٧٠، طرفـاهُ في: ٤١٠١، ٤١٠٢) (٣٠٥).

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: ڕۆژی غـەزای خەنـدەق لـەکاتی هەڵـگەندنی خەندەکەکـەدا، سـەرنجم دا پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) تەواو برسی بوو، جا چوومەوە بۆ لای ژنەکـەم‌و پـێم گـوت: هیـچمان هەیـە؟ دەبینـم پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تەواو برسییەتی ئەویش هەمانەیـەکی هێنـا

---

(٣٠٤) الظاهر لم يخرجه مسلم – المترجم.

(٣٠٥) قال العيني: (الحديث من أفراده) (ج/١٦ص١٧٩) – المترجم.

مەنێ جۆی تیابوو، بەرخۆلەیەکی دەستەمۆشمان هەبوو ئەویشم سەربڕی، جا ئەو جۆکەی هاڕی‌و منیش بەرخەکەم جنی‌و کردمە ناو دیزەکەیەوە وەهەردوکمان پێکەوە لێ بوینەوە..

ئەوجا چووم عەرزی پێغەمبەرم کرد: قوربان! بەرخۆلەیەکمان سەربڕیوەو مەنێ جۆشمان هاڕیوە بۆ نان، خۆت‌و چەند کەسێ بفەرموون، وەرن بۆ نیوەرۆژە بۆ ماڵی ئێمە پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: ئەی ئەهلی خەندەق! جابیر قاوەڵتی -واتە: نیوەرۆژەی- دروست کردووە بفەرموون بەزوویی بچین!) (تاج/٤ل-٣٤٠ ف-٢- یەکێ تر لەموعجیزەکانی پێغەمبەر زۆرکردنی نان‌و چێشتە).

١٢٥١- عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ أَبِي وَعَلَيَّ قَمِيصٌ أَصْفَرُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (سَنَهْ سَنَهْ) قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَهِيَ بِالْحَبَشِيَّةِ حَسَنَةٌ قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَلْعَبُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ فَزَبَرَنِي أَبِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (دَعْهَا) ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَبْلِي وَأَخْلِفِي ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِفِي ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِفِي) (الحديث ٣٠٧١، أطرافُهُ في: ٣٨٧٤، ٥٨٢٣، ٥٨٤٥، ٥٩٩٣)[٣٠٦].

ئوم خالید کچی خالیدی کوڕی سەعید (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت باوکم دا مناڵ بووم چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کراسێکی زەردم لەبەردا بوو پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەنە سەنە) ئەم ووشەیە بەزمانی حەبەشی واتە: جوانە جوانە، ئوم خالید فەرمووی: جاچووم یاریم بەمۆری پێغەمبەرایەتی کرد کەلوولەیەکی سوور بوو بەقەد هێلکەی کۆترێ دەبوو، بەناوشانیەوە بوو باوکیشم تێی خوڕیم کەشتی وانەکەم، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: قەیناکە وازی لێ بێنە).

---

(٣٠٦) راجع رقم: (٦٧٠ ت- ١٤٠٢ فـمجلد/٢ل-٩٥) - المترجم.

لەپاشان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) دوعای بۆ کردمو فەرمووی: (جار لەگەڵ جارا بژیت، تا ئەم جلەو وێنەی کۆن دەکەیت) (بڕوانە: تاج/٤ل-١٣٢ف-٤ز-٣٩-ستایش کردن لەکاتی جل پۆشینا + تاج/ ٤ل-٢٨٠ز- ٩٢ف-١، ٢، ٣، + تاج/٤ل-٢٥٧ف-٨ز-٨٣ — نیشانەکانی جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ).

## گزیو دەسپیسیو بەرێکردنو پێشوازی خەباتگێڕان

١٢٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ قَالَ: لا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي فَأَقُولُ لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ وَعَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي فَأَقُولُ لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ وَعَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي فَأَقُولُ لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ أَوْ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي فَأَقُولُ لا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ) (الحديث ٣٠٧٣، طرفُهُ في: ٦٧٠ت=١٤٠٢ت= ب/٢ل-٩٥) (٣٠٧).

وەرگەڕاوەکەی بەتەواوی والەپێشەوە لەژمارە: ٦٧٠ دا رابوورد.

١٢٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: كِرْكِرَةُ فَمَاتَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (هُوَ فِي النَّارِ) فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ فَوَجَدُوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّهَا) (الحديث ٣٠٧٤) (٣٠٨).

---

(٣٠٧) أخرجه مسلم في الإمارة، باب: غلظ تحريم الفلول، رقم: ١٨٣١.

(٣٠٨) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عبدالله بن عمرو،في قصة الفال (فتح/٦ص١٩٥ - خاتمة كتاب الجهاد والسير) - المترجم.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هەبوو ناوی کەرکەرە بوو، بارگەچی پێغەمبەر بوو، کاتێ مرد پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەرکەرە لەناو ئاگری دۆزەخ دایە).

کەچوون تەماشایان کرد بالاپۆشێکیان دۆزییەوە، کە کەرکەرە(ڕەزای خوای لێ بێ) لەتالانی دزیبووی بۆ خۆی!) (تاج/٨/١٦٧ز-٦٧).

١٢٥٤- عَنْ ابْنُ الزُّبَيْرِ لابْنِ جَعْفَرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهم) أَتَذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَأَنْتَ وَابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ نَعَمْ فَحَمَلَنَا وَتَرَكَكَ) (الحديث ٣٠٨٢) [٣٠٩].

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری فەرموو(ڕەزای خوای لێ بێ) : ئایا لەیادتە کە منو تۆو ئیبنو عەبباس چوین بەپیری پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ تەشریفی هات بۆ مەککە؟ فەرمووی: بەلێ لەبیرمە، ئەوەبوو ئێمەی هەڵگرتو تۆی هەڵنەگرت، چونکە یەکێکمانی خستە پاشکۆیو یەکێکمانی خستە بەردەمی ). (تاج/٨/٨٧ز-٢٥-بەڕێکردنو پێشوازی خەباتگێڕان- ش).

١٢٥٥- عَنْ السَّائِبِ بْنُ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ذَهَبْنَا نَتَلَقَّى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ الصِّبْيَانِ إِلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ) (الحديث ٣٠٨٣، طرفاهُ في: ٤٤٢٦، ٤٤٢٧) [٣١٠].

سائیبی کوڕی یەزید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەتا ثەنیەتولوداع، لەگەڵ منالاندا چووین بەپیری پێغەمبەرەوە(دروودی خوای لەسەر بێ).(تاج/٨/ل-٨٧ف- ٣ز-٢٥- توديع الغزاةِ واستقبالهم).

---

(٣٠٩) لم يستثنه العسقلاني من المتفق عليه بين الشيخين (المصدر السابق) — المترجم.

(٣١٠) لم يوافقه مسلم على تخريجه (المصدر السابق) — المترجم.

ئەنیە: واتە: ملە، وەك لەلای پێنجوێن شوێنێ هەیە پێی دەگوترێ: ملەکەوە. جابەدەوری مەدینەدا چەند ملەیێ هەیە کەجاران باو بوو کاتێ ڕێبوارێکی ئازیز بەڕێدەکرا یادەچوون بەپیریەوە تا ئەو جێگەیە بەڕێیان دەکرد، یا دەچوون بەپیریەوە، کەواتە وشەی (ثنيـة الـوداع) واتە: ملەی خواحافیزی.

١٢٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقْفَلَهُ مِنْ عُسْفَانَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَاحِلَتِهِ وَقَدْ أَرْدَفَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ فَعَثَرَتْ نَاقَتُهُ فَصُرِعَا جَمِيعًا فَاقْتَحَمَ أَبُو طَلْحَةَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ جَعَلَنِي اللَّهُ فِدَاءَكَ قَالَ: (عَلَيْكَ الْمَرْأَةَ) فَقَلَبَ ثَوْبًا عَلَى وَجْهِهِ وَأَتَاهَا فَأَلْقَاهُ عَلَيْهَا وَأَصْلَحَ لَهُمَا مَرْكَبَهُمَا فَرَكِبَا وَاكْتَنَفْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ) فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُ ذَلِكَ حَتَّى دَخَلَ الْمَدِينَةَ) (الحديث ٣٠٨٥، طرفُهُ في: ٢٣٥ت= ٣٧١ف) [(٣١١)].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا بووین کاتێ لەغەزای عوسفان گەڕایەوە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەسواری وشترەکەی خۆی بوو، صەفییەی خێزانی خستبوە پاشکۆی خۆی، وشترەکەیان سەرسمێکی دا، هەردووکیان پێکەوە کەوتنە خوارەوە ئەبوطەلحەش خۆی هەڵدایە خوارەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا بمکات بەقوربانی تۆ! فەرمووی: (ئاگات لەصەفییە بێ) جا ئەبوطەلحە بەزوویی جلێکی دا بەڕووی خۆیداو پەلاماری ژنەکەیداو ئەو جلکەی دا بەسەر ژنەکەداو، ڕزگاری کرد لەو هەڵوێستە ئاڵۆزەو، ولاخەکەی سازکردەوە بۆیان و، هەردووکیان سوار بوونەوە. ئیتر وەك خەرمانەی مانگ ئاخڵەمان

---

(٣١١) راجع العدد: ٢٣٥تجريد= ٣٧١ فتح. قال العيني: (واخرجه مسلم في المناسك ج/١٥ ص١٤) — المترجم.

لەپێغەمبەردا، جا کاتێ مەدینەمان لێ دەرکەوت، هەتا چووینە ناوشاری مەدینە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەر دەیفەرموو: (آیبون تائبون عابدون لربّنا حامدون: واگەڕاینەوە بۆ لای خودای خۆمان، پەشیمانین لەهەموو خراپی خۆمان، خودای خۆمان دەپەرستین و بەکوڵی دڵ سوپاس و ستایشی دەکەین!) (تاج/٨ل-١٠٠ف-٥ز-٣٢-دەستوورەکانی سواری) +(ریاض/٣ل-٨٠٢ز-١٧٧).

١٢٥٧-عَنْ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ ضُحًى دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ (الحديث ٣٠٨٨، أطرافُـــهُ في: ٢٧٥٧، ٢٩٤٧، ٢٩٤٨، ٢٩٤٩، ٢٩٥٠، ٣٥٥٦، ٣٨٨٩، ٣٩٥١، ٤٤١٨، ٤٦٧٣، ٤٦٧٦، ٤٦٧٧، ٤٦٧٨، ٦٢٥٥، ٦٦٩٠، ٧٢٢٥).

کەعبی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ لەکاتی چێشتەنگاودا لەسەفەر بهاتبایەتەوە، لەپێشا دەچوو بۆ مزگەوت و لەوێ بەر لەوە دابنیشێ دوورکات نوێژی سوننەتی دەکرد) (ریاض/٣ل-٨٠٣ز- ١٧٨ف- ١- وا سوننەتە کە ڕێبوار کە گەیشتە جێ لەپێش دا بچێ بۆ مزگەوت..).

مامۆستای مامۆستایان (الحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني) لەپایانی ئەم نامەی (الجهاد والسّير) دا دەفەرموێ: نامەی خەبات و تێکۆشان و غەزاو ژیننامە، لەسەرەتاوە هەتا ئێرە (٣٧٦) سێ سەدو حەفتاو شەش فەرموودەی بەرزەوەبووی واتیادا، چلیان بێ ڕشتەن (موعەللەقن = تەعلیقن = بێڕشتەن) ئەوانی تریشیان پەیوەستن (واتە: موصولن) دووبارەبووەکانیان (٢٦٦) دووسەدو شەشت و شەش فەرموودەن، پوختەکەیان: (٣٧٦-٢٦٦= ١١٠) سەد فەرموودەن، موسلیمیش هەموویانی دەرهێناوە بێجگە لەمانەیان:

١- فەرمووده‌ى ژماره: ١١٤٩ت = ٢٧٩٠ ف = (الجنّة مائة درجة).

٢- فـەرمووده‌ى ژمـاره: ٢٧٩٧ فـتح له‌ته‌جريده‌كـه‌دا نييـه: (لـولا أنَّ رجـالاً من....).

٣- فـەرمووده‌ى ژمـاره: ٢٨١٥ فـتح له‌ته‌جريده‌كـه‌دا نييـه: (اصـطبح نـاسٌ الخمرة...).

٤- فەرمووده‌كه‌ى موغه‌يره‌ى كوڕى شوعبه: (بلغنا نبيُّنا) وا له‌پێش ژماره: ٢٨١٨ ف.

٥- فەرمووده‌كه‌ى عومه‌ر: (أليسَ قتلانا في الجنّة) وا له‌پێش ژماره: ٢٨١٨ ف.

٦- ژ: ٢٨٢٤ ف له (ت) دا نييه: (..طلحة يحدِّثُ عنْ يوم أحدٍ...).

٧- ژ: ١١٦٤ ت = ٢٨٢٨ ف: (.. كان أبو طلحة لايصومُ...من أجل الغزو..).

٨- ژ: ١١٧٣ ت = ٢٨٤٥ ف: (وقد حسَرَ عنْ فخذيهِ وهوَ يتحنَّطُ...).

٩- ژ: ١١٧٨ ت = ٢٨٥٥ ف: (فرسٌ يُقالُ له اللحيفُ...).

١٠- ژ: ١١٨٤ ت = ٢٨٧٢ ف: (.. ناقة تسمّى العضباء لاتُسبقُ..).

١١- ژ: ١١٩٢ ت = ٢٨٩٦ ف: (رأى سعد أنّ لهُ فضلاً على منْ دونهُ...).

١٢- ژ: ٢٨٩٩ ف له (ت) نييه: (..إرموا فأنا معكم كلّكم..).

١٣- ژ: ١١٩٤ ت = ٢٩٠٠ ف: (إذا أكثبوكمْ فعليْكُم بالنّبلِ..).

١٤- ژ: ١١٩٧ ت = ٢٩٠٩ ف: (ما كانتْ حليةُ سيوفهم الذّهبُ الفضة...).

١٥- ژ: حديث ابن عمر بعثتُ بينَ يدَي الساعة.

١٦- ژ: ١١٩٨ ت = ٢٩١٥ ف. لكن أخرجه من طريق أخرى عن ابن عبّاس عن عمر: (..سيهزَمُ الجمعُ ويولّون الدُّبُر...).

١٧- حديث عمرو بن تغلب، رقم: ٢٩٢٧ ف. له (ت) نييه: (..قتال الترك..).

١٨- ژ: ١٢٠٩ ت = ٢٩٥٤ ف: (.. وإذا لقيتُمْ فلاناً وفلاناً فحرِّقوهما بالنّارِ..).

١٩- ژ: ١٢١٦ ت =٢٩٦٤ ف: (.. ماغبرَ منَ الدّنيا إلاّ كالثعلبِ..).

٢٠- ژ: ٢٩٧٤ ف له (ت) نييه: (.. قيس بن سعد أراد الحجّ فرحل..).

٢١- ژ: ١٢٢٦ ت = ٢٩٩٣ ف: (...أذا نزلنا سبّحنا..).

٢٢- ژ: ١٢١٨ ت = ٢٩٧٦ ف: (... هاهُنا أنْ تركزَ الرّاية...).

٢٣- ژ: ١٢٢٦ ت = ٢٩٩٣ ف: (...أذا نزلنا سبّحنا..).

٢٤- ژ: ١٢٢٧ ت = ٢٩٩٦ف: (إذا مرضَ العبدُ المؤمِنُ... كتِبَ لهُ مثلُ ما كان يعمل).

٢٥- ژ: ١٢٢٨ ت = ٢٩٩٨ ف: (لو يعلمُ النّاسُ ما في الوحدَةِ)

٢٦- ژ: ١٢٣٢ ت = ٣٠١٠ ف: (عجب اللهُ من قومٍ يدخلون الجنّةَ في السلاسل).

٢٧- ژ: ١٢٣٥ ت = ٣٠١٧ ف: (منْ بدّلَ دينَهُ فاقتلوه...).

٢٨- ژ: ٣٠٤٥ ف. لەتەجریدەکەدا لەم شوینەدا نییە، داستانەکەی خوبەیب. وفيه حديثُ بنت عيّاض.

٢٩- ژ: ١٢٤٤ ت = ٣٠٥١ ف: (أتى النبيُّ عينَ المشركين).

٣٠- ژ: ٣٠٥٩ ف له (ت) نییه: (واتقِ دعوة المظلوم... فإنّها مستجابة).

٣١- ژ: ١٢٥٣ ت = ٣٠٧٤ ف: (كان على ثقل النبيّ... قصة كركرة).

٣٢- ژ: ١٢٥٥ ت =٣٠٨٣ ف: (نتلقّى رسول الله.... إلى ثنيّة الوداع).

هەروا دەفەرموێ: بیست‌و حەوت بیستراو (أثر) ی هاوەڵانیشی واتیادا خودا بۆ خۆی باشتری لێ دەزانێ.

بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم ل —٨٦٥ز- ٣٤٦ هەتا ل —٨٩٨ ز- ٣٥٧ + نامەی خەبات‌و تێکۆشان — ریاض الصالحين/٣/ل-٩٣٦ زنجیره/٢٣٤ هەتا ل-٩٧٨ ز —٢٣٥.

ل= لاپەڕە، ز= زنجیره. تەرجەمە کوردییەکە.

نامەی خەبات‌و تێکۆشان (الجهاد) لەریاض الصالحين دا وا لە لاپەڕە/ ٩٣٦ بەرگی سێیەم. زنجیره /٢٣٤ هەتا ل —٩٩٥ ز —٢٤١.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦١- باسەكانی پێنج یەك (أبواب الخُمس)

(بڕوانە: تاج/٨ ل-١٣٣ز-٥٦ + ل ١٣٩ز -٥٨ + ل -١٤٠ز -٥٩)

١٢٥٨- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا جَالِسٌ فِي أَهْلِي حِينَ مَتَعَ النَّهَارُ إِذَا رَسُولُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَأْتِينِي فَقَالَ: أَجِبْ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى عُمَرَ فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ عَلَى رِمَالِ سَرِيرٍ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ جَلَسْتُ فَقَالَ: يَا مَالِ إِنَّهُ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ قَوْمِكَ أَهْلُ أَبْيَاتٍ وَقَدْ أَمَرْتُ فِيهِمْ بِرَضْخٍ فَاقْبِضْهُ فَاقْسِمْهُ بَيْنَهُمْ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لَوْ أَمَرْتَ بِهِ غَيْرِي قَالَ اقْبِضْهُ أَيُّهَا الْمَرْءُ فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَهُ أَتَاهُ حَاجِبُهُ يَرْفَا فَقَالَ هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ يَسْتَأْذِنُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ فَأَذِنَ لَهُمْ فَدَخَلُوا فَسَلَّمُوا وَجَلَسُوا ثُمَّ جَلَسَ يَرْفَا يَسِيرًا ثُمَّ قَالَ هَلْ لَكَ فِي عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ قَالَ نَعَمْ فَأَذِنَ لَهُمَا فَدَخَلا فَسَلَّمَا فَجَلَسَا.

فَقَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا وَهُمَا يَخْتَصِمَانِ فِيمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَالِ بَنِي النَّضِيرِ فَقَالَ: الرَّهْطُ عُثْمَانُ وَأَصْحَابُهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اقْضِ بَيْنَهُمَا وَأَرِحْ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ.

قَالَ عُمَرُ: تَيْدَكُمْ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (لا نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ) يُرِيدُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَفْسَهُ قَالَ الرَّهْطُ: قَدْ قَالَ ذَلِكَ فَأَقْبَلَ عُمَرُ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا اللَّهَ أَتَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ قَالَ: ذَلِكَ قَالا قَدْ قَالَ ذَلِكَ قَالَ عُمَرُ: فَإِنِّي أُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ خَصَّ رَسُولَهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي هَذَا الْفَيْءِ بِشَيْءٍ لَمْ يُعْطِهِ أَحَدًا غَيْرَهُ ثُمَّ قَرَأَ ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ﴾ إِلَى قَوْلِهِ قَدِيرٌ فَكَانَتْ هَذِهِ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ وَلا اسْتَأْثَرَ بِهَا

عَلَيْكُمْ قَدْ أَعْطَاكُمُوهَا وَبَثَّهَا فِيكُمْ حَتَّى بَقِيَ مِنْهَا هَذَا الْمَالُ فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِمْ مِنْ هَذَا الْمَالِ ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ فَعَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذَلِكَ حَيَاتَهُ أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ ذَلِكَ قَالُوا: نَعَمْ.

ثُمَّ قَالَ لِعَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ قَالَ عُمَرُ ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ نَبِيَّهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَبَضَهَا أَبُو بَكْرٍ فَعَمِلَ فِيهَا بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ فِيهَا لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ فَكُنْتُ أَنَا وَلِيَّ أَبِي بَكْرٍ فَقَبَضْتُهَا سَنَتَيْنِ مِنْ إِمَارَتِي أَعْمَلُ فِيهَا بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا عَمِلَ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي فِيهَا لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ ثُمَّ جِئْتُمَانِي تُكَلِّمَانِي وَكَلِمَتُكُمَا وَاحِدَةٌ وَأَمْرُكُمَا وَاحِدٌ جِئْتَنِي يَا عَبَّاسُ تَسْأَلُنِي نَصِيبَكَ مِنْ ابْنِ أَخِيكَ وَجَاءَنِي هَذَا يُرِيدُ عَلِيًّا يُرِيدُ نَصِيبَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا فَقُلْتُ لَكُمَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لا نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ فَلَمَّا بَدَا لِي أَنْ أَدْفَعَهُ إِلَيْكُمَا قُلْتُ: إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ لَتَعْمَلانِ فِيهَا بِمَا عَمِلَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِمَا عَمِلَ فِيهَا أَبُو بَكْرٍ وَبِمَا عَمِلْتُ فِيهَا مُنْذُ وَلِيتُهَا فَقُلْتُمَا ادْفَعْهَا إِلَيْنَا فَبِذَلِكَ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا فَأَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْهِمَا بِذَلِكَ؟ قَالَ الرَّهْطُ نَعَمْ.

ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ فَقَالَ أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا بِذَلِكَ قَالا: نَعَمْ قَالَ فَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ فَوَاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ لا أَقْضِي فِيهَا قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَادْفَعَاهَا إِلَيَّ فَإِنِّي أَكْفِيكُمَاهَا) (الحديث ٣٠٩٤، أطرافُهُ في: ٢٩٠٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٥٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥)(٣١٢).

(٣١٢) اخرجه مسلم في المغازي (عيني/١٥ص٢٣) – المترجم.

مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی حەدثان (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەماڵی خۆم لەناو كەسو كارم دانیشتبووم، چێشتەنگاوێكی درەنگ بوو، لەودەمەدا نێردراوی عومەری كوڕی خەطاب هات بەدواما، گوتی: فەرمانڕەوای موسوڵمانان منی ناردووە بەشوێنتا كەبچی بۆ خزمەتی منیش لەگەڵیا چووم‌و چوومە خزمەتی تەماشام كرد لەسەر تەختەیەكی بەپەلكە خورما چنراوی رووت دانیشتووە، دۆشەك‌و رایەخ‌و شتی وای لەسەر رانەخراوە، بەڵكو رێك لەسەر تەختە رەق‌و تەقەكە پاڵ كەوتووە،و لەسەر پشتیەكی چەرمین شانی داداوە، سڵاوو رۆژ باشیم لێ كردو ئەوجا لەخزمەتیدا دانیشتم.

فەرمووی: (مالە! چەند بنەماڵەیێ لەهۆزەكەی تۆ هاتوون بۆ لامان، منیش هەندێ یارمەتیم بڕیارداوە بۆیان، وەری بگرەو خۆت دابەشی بكە بەسەریانا. منیش گوتم: قوربان! خۆزگە فەرمانت دەكرد بەكەسێكی تر كەبەم كارە هەڵسێ. فەرمووی: دەبێ هەر وەری بگری ئەی پیاوی باش!

من هەر هێشتا لەخزمەتی دا دانیشتبووم كە پەردەدار(دەرگاوان) ەكەی كەناوی یەرفەء بوو، هات بۆ خزمەتی‌و عەرزی كرد: قوربان! عوسمانی كوڕی عەففان‌و عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف‌و زوبەیری كوڕی عەوام‌و سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص، لەدەرەوە چاوەڕوان دەكەن، كەجەنابتان رێگەیان پێ بدەن بێن بۆ خزمەتتان، فەرمانتان بەچییە؟

عومەر فەرمووی: با بێن، ئەویش فەرمووی لێ كردن‌و هاتنە ژوورەوەو سڵاویان كردو دانیشتن. ئەوجا یەرفەء كەمێ تر لەشوێنی خۆی دانیشتەوەو هاتەوەو گوتی: عەلی‌و عەبباسیش چاوەڕوانن رێگەخوازی دەكەن، فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: بەلێ بابێن! ئەویش فەرمووی لەوانیش كردو ئەوانیش هاتن‌و سڵاویان كردو دانیشتن، جا عەبباس فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! دادگایی نێوان من‌و نێوانی ئەمە بكە، عەبباس‌و عەلی

کێشەیەکیان هەبوو، سەبارەت بەدابەش کردنی ئەو دەستکەوتەی کە لەم ئایەتەدا باس کراوە: ﴿ وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ﴾ (بڕوانە: ژمارە: ١١٩٥ت = ٢٩٠٤ ف) کۆمەڵەکەش واتە: عوسمان وهاوەڵەکانی فەرموویان: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! بفەرموو دادگایی نێوان ئەم دوانە بکە رزگاریان بکە لەدەستی یەکتری، چونکە گیرۆدە بوون بەدەستی ئەم کێشەیەوە.

ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (لەسەرە خۆبن، تو ئەو خودایەی کەبەفەرمانی ئەو ئەرزو ئاسمان راوەستاوە، ئایا ئاگاتان لێیە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (کەلەپوور لەئێمەی پێغەمبەران ناگیرێ ئەوەی لەدارایی دنیا لەئێمە بەجێ بمێنێ لەپاش مەرگمان دەبێ بەخێرو خەرج دەکرێ، لەبەرژەوەندی ئیسلامدا) ، دیارە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەم فەرموودەیە خۆشی مەبەستە، ئایا ئەمە دەزانن یا نا؟ کۆمەڵەکە فەرموویان: بەلێ ئەوەی فەرمووە ).

ئەوجا عومەر رووی کردە عەلی‌و عەبباس پێی فەرموون: تو خودا ئایا ئێوەش ئەمە دەزانن؟ هەردووکیان گوتیان بەڵێ ئەوەی فەرمووە، عومەر فەرمووی: دەبا باسی ئەم کارەتان بۆ بکەم، هەموو دەزانین کە خودا لەم فەیئە، لەم مفتەماڵە، هەندێ شتی تەرخان کردووە بۆ پێغەمبەر خۆی، وەئەوەی بەکەسی تر نەداوە، ئنجا بۆ روونکردنەوە: ی ئەو شتەی کەتەرخان کراوە بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەباسی ئەو شتە دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ کە مەعناکەی لەپێشەوە رۆیشت عومەر(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (دەی ئەمە تایبەت بوو بەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵام سوێندم بەخودا، گەرچی ئەمە وایەو خودا خۆی ئەم بەشەی تەرخان کردبوو بۆ پێغەمبەر، بەڵام

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەر بۆخۆی بەتەنها ئەمەی خەرج نەدەکردو ئێوەی لێ بێبەش بکا، بەڵکوو بەشی ئێوەشی لێ دەداو پەخشی دەکرد بەناوتانا، تا ئەم سامانەی کە ئێستا ئێوە کێشەتانە لەسەری مایەوە بۆ پێغەمبەر خۆی.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا ئازوقەی ساڵانەی خێزانەکانی لەو ماڵی فەیئە دابین دەکرد، وئەوەیشی لەوە دەمایەوە حیسابی ماڵی خوای بۆ دەکرد،و دایدەنا بۆ ئیش‌و کارو پێویستی موسوڵمانان جا هەتا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی مابوو، لەژیانی خۆیدا ئەم حاڵە بەردەوام بوو، توو زاتی خودا ئایا ئاگاتان لەمە هەیە یا نا ؟ کۆمەڵەکە فەرموویان: بەلێ ئاگامان لێیەتی‌و چۆن دەفەرموێ وایە. ئەوجا ئیمامی عومەر بەعەلی‌و عەبباسی فەرموو: (توو زاتی خودا ئێوەش وەك ئەوان ئەم باس‌و خواسە دەزانن یا نا؟) ئەوانیش فەرموویان: بەلێ دەیزانین.

عومەر فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خودا بردیەوەو پیاڵەی مەرگی نۆشی، ئەبوبەکری صدیق کەبوو بەجێنشینی ئەو فەرمووی: من سەروەسێتی شەرعی پێغەمبەرم‌و لەجێی ئەو کارو بارەکانی ئەنجام دەدەم، ئەوەبوو ئەبوبەکر ئەو ماڵەی وەرگرت رێك بەپێی بەرنامەکەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دابەشی دەکرد، خودا بۆ خۆی دەزانێ: کە ئەبوبەکر ئەو ماڵەی بەراست‌و دروستی زۆر بەباشی بەپێی هەق وەك پێغەمبەر خۆی بەبێ کەم‌و زیاد خەرج دەکرد، تا کاتێ ئەبوبەکریش خودا بردیەوە بۆ لای خۆی‌و منیش بووم بەسەروەسێتی ئەبوبەکرو ئەم ماڵەم وەرگرت، وەتا ماوەی دوو ساڵ بەرنامەکەی پێغەمبەرو بەرنامەکەی ئەبوبەکرم، سەبارەت بەم ماڵە پەیرەو دەکرد.

وەخودا بۆ خۆی بەو بانی سەرەوە ئاگادارە کەمن لەم کارەدا راست‌و دروست بووم‌و چاکەکارو رێگەی هەق گربووم، پەیرەوی رەوایم دەکرد،

کەچی ئەوەبوو ئێوە هەردووکتان بەمە رازی نەبوون هەردووکتان بەیەکەوە هاتن بۆلام و قسەتان کردبوو بەیەك ئەی عەبباس! تۆ هاتبووی داوای پشکە کەلەپووری خۆتت لەبرازاکەت دەکرد، عەلیش هاتبوو داوای بەشی ژنەکەی لەمیراتی باوکی دەکرد، ئەوە بوو منیش پێتانم گوت: پێغەمبەری خودا(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەلەپوورمان لێ ناگیرێ، هەرچی لەئێمە لەپاش مەرگ بەجێ بمێنێ دەبێ بەخێرو صەدەقە).

بەڵام کاتێ بۆم دەرکەوت کەتەسلیمی ئێوەی بکەم سەرم سوکتر دەبێ، ئەوە بوو بەم مەرجە تەسلیمی ئێوەم کرد: (بەڵێن و پەیمان بێت دەی دەیدەین بەخودای گەورە سەبارەت بەمماڵە، پەیڕەوی ئەو بەرنامەیە بکەین کە پێغەمبەر لەسەردەمی خۆیداو ئەبوبەکر لەسەردەمی خۆیدا و، من لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا جێ بەجێمان کردووە) وەئێوەش بەمە قاییل بوون و من لەسەر ئەم بنەمایەیە، ئەم ماڵەم تەسلیمی ئێوە کرد کە ئێوە سەروەسیەت بن بۆ دابەشکردنی ساڵانەی بەسەر پێشیاوانیدا، جا سویندتان دەدەم بەخودا ئایا من لەسەر ئەم شێوەیە ئەم ماڵەم تەسلیم بەم دوانە کرد یا نا؟ کۆمەڵەکە فەرموویان: بەڵێ وایە.

ئەوجا رویکردە عەلی و عەباسیش و پێیانی فەرموو: سویندتان دەدەم بەخودا ئایا من لەسەر ئەم شێوەیەو بەپێی ئەم مەرجە ئەم ماڵەم تەسلیم بەئێوە کردووە یا نا؟ هەردووکیان گوتیان: بەڵێ چۆن دەفەرمووی وایە. عومەر فەرمووی: (ئەی ئیتر چیتان لەمن دەوێ، دیارە بڕیارێکی ترتان لەمن دەوێ لەم بارەیەوە! دەی سوێندم بەو خودایەی کە ئەم ئاسمان و زەمینە بەفەرمانی ئەو هەڵدەسوڕێن، بڕیاری تری جگە لەمە لەم بارەیەوە نادەم، چونکە هەر بڕیارێکی تر بدەم ناهەقەو منیش شتی ناهەق ناکەم، بەمە رازین ئەوا باشە، خۆ ئەگەر ناتوانن ئەم بەرنامەیەی ئێمە جێ بەجێ بکەن و

دەبێ بەکێشەو بەرەتان لەسەری، ئەوا روو بەرووی خۆمی بکەنەوە، من چارەسەری دەکەم بۆتان.(بڕوانە: ژمارە: ٩٧٧ ت = ٢١٧٤ ف).

١٢٥٩- عنْ أَنَسٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أنّه أَخْرَجَ نَعْلَيْنِ جَرْدَاوَيْنِ لَهُمَا قِبَالانِ فَحَدَّثَ أَنَّهُمَا نَعْلا النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٣١٠٧، طرفاهُ في: ٥٨٥٧، ٥٨٥٨) [(٣١٣)].

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) جووتێ سۆلی چەرمینی بێ مووی دەرهێنا، دوو بەرەزوانەیان هەبوو، بریتی بوون لەدوو زوێڵ قایش قایم کرابوون لەپێشی سۆلەکان، پارچەیەکیان سەرێکی بەندکرابوو بەسەرێکی سۆلەکەوەو ئەو سەرەکەی تری بەو بەسەری سۆلەکەوە، دەکەوتە نێوان پەنجە کەڵەو پەنجەکەی تەنیشتیەوە، وەپارچەکەی تریشیان هەروەها بوو، بەڵام ئەمیان دەکەوتە نێوان پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی براتووتەوە، تاکی دووەمیش هەروەها، وەئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەمە سۆلەکانی پێغەمبەرە(درودی خوای لەسەر بێ) (تاج/١٢١/٤ز-٣٦-پێلاو- ب/د/ت/ن).

پەیوەندی ئەم فەرموودانە بەپێنج یەکەوە، لەچەند روویەکەوەیە وەك:

١- بەڵگەی هەبوونی پێنج یەكو چەسپاندنی.

٢- سەرەتای چەسپانی پێنج یەك.

٣- پێنج یەك لەچی دەکەوێو لەچی ناکەوێ، کێ دابەشی دەکا.

٤- ئەو شتانەی لە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەجێماون، پەیوەندییان بەپێنج یەکەوە چییە، وەك سۆلو شمشێرو خانوو.. تاد.

٥- ماڵەکانی هاوسەرەکانی لەم لایەنەوە بڕیاریان چییە.

١٢٦٠- عَنْ عَائِشَةَ أنّها أَخْرَجَتْ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) كِسَاءً مُلَبَّدًا وَقَالَتْ فِي هَذَا نُزِعَ رُوحُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وفي رواية: أنّها أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ

(٣١٣) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أنس في النعلين (فتح/٦/٢٨٥- خاتمة كتاب الجزية والموادعة).

إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ وَكِسَاءً مِنْ هَذِهِ الَّتِي يَدْعُونَهَا الْمُلَبَّدَةَ) (الحديث ٣١٠٨، طرفُهُ في: ٥٨١٨) (٣١٤).

ئەبو بوردە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) پۆشاکێکی ئەستووری پیناوی دەرهێناو فەرمووی: ئائە لەمەدا گیانی پێغەمبەری خودا کێشرا. لە گێڕانەوەیەکا ئەبو بوردە دەفەرموێ: چووم بۆ دێنی دایکە عائیشە بۆ ماڵەوە، بەرکۆش (ئیزار) ێکی ئەستووری دەرهێنا، لەو جۆرە بەرکۆش‌و ئیزارانە کەلەیەمەن دروست دەکرێن، لەگەڵ جلێکی تری پینە پیناویدا، ئینجا سوێندی بۆمان خوارد بەخوا: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی گیان کێشانیداو، لەسەرەمەرگ دا، ئەم دوو جلکەی لەبەردا بوو) (تاج/٤/١٠٩ فـ٣ز- ٣٢- ش/د/ ت).

١٢٦١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ قَدَحَ النَّبِيِّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْكَسَرَ فَاتَّخَذَ مَكَانَ الشَّعْبِ سِلْسِلَةً مِنْ فِضَّةٍ) (الحديث ٣١٠٩، أطرافُهُ في: ٥٦٣٨) (٣١٥).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جامەکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) کە ئاوو شتی‌وای پێ دەخواردەوە شکا، جێگەی قڵیشەکەی بەکشتەکێکی زیو پینە کرد.

١٢٦٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلامٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ فَقَالَتْ الأَنْصَارُ لا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلا نُنْعِمُكَ عَيْنًا فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ لِي غُلامٌ فَسَمَّيْتُهُ الْقَاسِمَ فَقَالَتْ الأَنْصَارُ لا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلا نُنْعِمُكَ عَيْنًا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحْسَنَتْ الأَنْصَارُ سَمُّوا بِاسْمِي وَلا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ) (الحديث ٣١١٥، أطرافُهُ في: ٣١١٤، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦) (٣١٦).

---

(٣١٤) قال العيني: (واخرجه مسلم في اللباس) (عيني/١٥ص٣٢) - المترجم.

(٣١٥) قال في الفتح/٦ص٢٨٥: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أنس في القدح — المترجم.

(٣١٦) اخرجه مسلم في الآداب، باب: النهي عن التكني بأبي القاسم...، رقم: ٢١٣٣.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری کوڕێکی بوو ناوی نا قاسم، یاران پێیان فەرموو: نەپێت دەڵێین ئەبولقاسم‌و نەبەم کەسناوە (نەبەم کونیەیە) چاوو دڵت ڕۆشن دەکەینەوە (چونکە ئەبولقاسم کەسناوی پێغەمبەرەو هەر قابیل بەخۆیەتی). پیاوەکەش چوو بۆ لای پێغەمبەرو ئەمەی بۆ باس کرد، فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (ئافەریم بۆ ئەنصار! ناوی من کە محمدو ئەحمەد و...ناوەکانی ترمە، بکەن بەناو بۆ خۆتان، بۆ منداڵو کەس‌و کارتان، بەڵام کەسناوەکەم -کە ئەبولقاسمە- مەکەن بەکەسناو بۆ خۆتان، لەڕاستیدا من قاسمم —واتە: پشك دابەش کارم— لەناوتاندا، بەڵام بەشەکە خۆی کەمە، یا زۆرە، بەدەستی خوایە، بەدەستی من نییە) (تاج/١٠ل-١٥٥ز-٦٢ — کونیەو کەسناوی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ).

١٢٦٣—عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَا أُعْطِيكُمْ وَلا أَمْنَعُكُمْ إِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَضَعُ حَيْثُ أُمِرْتُ) (الحديث ٣١١٧) (٣١٧).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەپێدانی بەش بەدەست منەو نە نەدانی، من تەنیا دابەشکارم، خودا خۆی بەشی گەورەو بەشی بچوك دەدا، وەئەندازەو جۆری دیاری دەکا، ئەوەی بەدەستی منە ئەوەیە: ئەوەی خوا دەیدا لەناوتانا، بەپێی فەرمانی خودا خۆی دابەشی بکەم بەسەرتانا).

١٢٦٤— عَنْ خَوْلَةَ الأَنْصَارِيَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ رِجَالاً يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللَّهِ بِغَيْرِ حَقٍّ فَلَهُمْ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث٣١١٨) (٣١٨).

---

(٣١٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة: (ماأعطيكم ولا امنعكم..) (فتح/٦ص٢٨٥) المترجم.

(٣١٨) لم يوافقه على تخريج حديث خولة: (إنّ رجالاً يخوضون) المصدر السابق — المترجم.

خەولـەی ئەنـصارییە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لەپێغەمبـەرم بیـست دەیفـەرموو: (پیـاو گەلێـکی زۆر بـەنارەوا لـرف لـەماڵو سـامانی خـوا دەدەن، بەهـەقو بەناهـەق مـاڵی بەنـدەکانی خـوا دەخـۆن، یازیـانی سـامانییان لـێ دەدەن! ). (تاج/٨/١٣٦ ف-٣ز- ٥٦).

## ڕوونکردنەوە:

خەولـە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەنـصارییە، صـەحابییە، راسـتر ئەوەیـە: کـەناوی خەولەی کچی قەیسی کوڕی فەهدە، کونیـەی: ئـوم موحەممـەدە، لەپێشا ژنـی حـەمزەی مـامی پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) بـووە، لـەدوا ئـەو شـووی کـردووە بەپیاوێـکی ئەنـصاری لـەهۆزی بـەنی زریـق، لـەبوخاری پـیرۆزدا یـەك فەرموودەی هەیە. کە ئەم فەرموودەیە واین لەخزمەتیدا.

١٢٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (غَزَا نَبِيٌّ مِنْ الأَنْبِيَاءِ فَقَالَ لِقَوْمِهِ: لا يَتْبَعْنِي رَجُلٌ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ بِهَا وَلا أَحَدٌ بَنَى بُيُوتًا وَلَمْ يَرْفَعْ سُقُوفَهَا وَلا أَحَدٌ اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وَهُوَ يَنْتَظِرُ وِلادَهَا فَغَزَا فَدَنَا مِنْ الْقَرْيَةِ صَلاةَ الْعَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ لِلشَّمْسِ: إِنَّكِ مَأْمُورَةٌ وَأَنَا مَأْمُورٌ اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيْنَا فَحُبِسَتْ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَجَمَعَ الْغَنَائِمَ فَجَاءَتْ يَعْنِي النَّارَ لِتَأْكُلَهَا فَلَمْ تَطْعَمْهَا فَقَالَ: إِنَّ فِيكُمْ غُلُولا فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: فِيكُمْ الْغُلُولُ فَلْيُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاثَةٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: فِيكُمْ الْغُلُولُ فَجَاءُوا بِرَأْسٍ مِثْلِ رَأْسِ بَقَرَةٍ مِنْ الذَّهَبِ فَوَضَعُوهَا فَجَاءَتْ النَّارُ فَأَكَلَتْهَا ثُمَّ أَحَلَّ اللَّهُ لَنَا الْغَنَائِمَ رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا فَأَحَلَّهَا لَنَا) (الحديث ٣١٢٤، طرفهُ في: ٥١٥٧) [٣١٩].

---

(٣١٩) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: تحليل الغنائم لهذه الأمة خاصة، رقم: ١٧٤٧.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران - درودی خوای گەورە لەسەر هەموویان- ویستی بچێ بۆ غەزایێ بەگەلەکەی خۆی فەرموو: ئەو پیاوەی کەژنی مارەبڕیوەو دەیەوێ کە بیگوێزێتەوە وە نەیگوێزاوەتەوە، با ئەو جۆرە پیاوە لەگەڵمانا نەیەت بۆ ئەم غەزایە، هەروەها ئەو کەسەیش کە خانویەکی دروست کردوە هێشتا سەری نەگرتووە، هەروەها ئەو کەسەیش کەبزن‌و مەڕوماڵیاتی ئاوسی لەسەر گوانی کڕیوەو چاوەڕوانی زایینیان دەکات.

فەرمووی: ئەوجا چوو بۆ غەزاکەو، دەمی نوێژی عەسر، یانزیکی کاتی نوێژی عەسر، لەدێکە نزیکەوە بوو پێغەمبەرەکە بەخۆری فەرموو: تۆیش فەرمانبەری‌و منیش فەرمانبەرم، خودایە! ئەم خۆرە رابگرە بۆمان‌و مەیەڵە ئاوا ببێ هەتا فەرمانی خۆمان ئەنجام دەدەین‌و ئەم گوندە ئازاد دەکەین، ئیتر خودا خۆرەکەی راگرت بۆی‌و خۆرەکە ئاوا نەبوو هەتا خودا شارەکەی فەتح کرد بۆی، فەرمووی: ئەنجا هەرچی تالانیان گرتبوو کۆیان کردەوەو لەسەر دەستوورو یاسای پێشینەی پێغەمبەران لەشوێنێکی بەرزی بەرچاودا خڕیان کردەوە، دایان نا هەتا ئاگر لەئاسمانەوە بەفەرمانی خودا بێت بیخوا، بۆ دووپات کردنەوەی ئەوەی کە غەزاکەیان لەبەر خودا بووەو لەبەر تەمای ماڵی دنیا نەبووە، کەچی ئاگرەکە هات چەشکەی نەکرد!

ئیتر پێغەمبەرەکە زانی کەگزی‌و دزی‌و دەسپیسی لە تالانییەکە کراوە، بۆیە فەرمووی: گزیتان لەتالانییەکە کردووە بۆیە ئاگرەکە نایخوا! کەوایە با لەهەر خێلێ پیاوێ پەیمانم بداتێ، جا لەکاتی پەیمان کردنەکەدا، دەستی پیاوێ لەسەر خێڵەکان نووسا بەدەستی پێغەمبەرەکەوە.فەرمووی: دزییەکە وا لەناو ئێوەدا، باخێڵەکەی تۆ بێن یەکەیەکە پەیمانم بدەنێ، کاتێ ئەو خێڵە پەیمانیان پێ دا، دەستی پیاوێ یا دوو پیاو لکا بەدەستی پێغەمبەرەکەوەو دزەکان دۆزرانەوەو فەرمووی: دزییەکە ئێوە کردوتانە.

ئەوجا پارچەیێ زێڕیان هێنا بۆ پێغەمبەرەکە، لەسەر شێوەی سەرەگا وابوو، ئەویشیان لەسەر ماڵی تاڵانییەکە دانا، کە لەسەر زەوییەکە دانرابوو ئەوجا ئاگرەکە لەئاسمانەوە هاتو هەمووی خوارد! حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپێش ئێمەدا خواردنی تاڵانی بۆ کەسی تر حەڵاڵ نەبووە، بەڵام لەپاش دا خودای پاكو پیرۆزو گەورە، کەدی حاڵی ئێمەی گەلی ئیسلام کزەو بێ هێزەو زەبوونین، بەزەوی پیامان دا هاتەوەو، بۆی حەڵاڵ کردین) (تاج /٨ /١٣٥-١-ش).

١٢٦٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً فَكَانَتْ سِهَامُهُمْ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيرًا وَنُفِّلُوا بَعِيرًا بَعِيرًا) (الحديث ٣١٣٤، طرفُهُ في: ٤٣٣٨) [٣٢٠].

ئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پەلێ لەشکری نارد بەرەو نەجد بۆ غەزا، من خۆم لەناویانا بووم، ڕانە وشترو گەلەیەکی زۆرمان بەتاڵان گرت، گشتمان هەریەکی سەرو دوازدە وشتر، پشکمان بەرکەوت. پێغەمبەریش هەریەکی سەرو وشتری تری بەزیادە بەش پێمان دا. (تاج/٨/١٣٦ز-٥٦ ف-٤+٥).

١٢٦٧-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ إِذْ قَالَ لَهُ رَجُلٌ اعْدِلْ فَقَالَ: لَهُ لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ) (الحديث ٣١٣٨) [٣٢١]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەجەعرانە تاڵانی دابەش دەکرد بەسەر یارانیدا، لەپاش غەزای

(٣٢٠) أخرجه مسلم في الجهاد والسير، باب: الأنفال، رقم: ١٧٤٩.

(٣٢١) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: ذكر الخوارج وصفاتهم، رقم: ١٠٦٣.

هەوازین، لەو دەمەدا پیاوێ کەناوی ذولخوەیصەرەی تەمیمی بوو، پێی گوت: شتەکە بەعەدالەت دابەشکە! پێغەمبەریش پێی فەرموو: (بەدبەخت خۆم ئەگەر عادڵو دادپەروەر نەبم!). (بڕوانە: ژمارە: ١١٨٣ ت= ٢٨٦٤ ف + ژمارە: ١٠١٥ت = ٢٣٠٧ ف).

١٢٦٨– عَنْ ابن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَصَابَ جَارِيَتَيْنِ مِنْ سَبْيِ حُنَيْنٍ فَوَضَعَهُمَا فِي بَعْضِ بُيُوتِ مَكَّةَ قَالَ فَمَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى سَبْيِ حُنَيْنٍ فَجَعَلُوا يَسْعَوْنَ فِي السِّكَكِ فَقَالَ عُمَرُ يَا عَبْدَ اللَّهِ انْظُرْ مَا هَذَا فَقَالَ مَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى السَّبْيِ قَالَ اذْهَبْ فَأَرْسِلْ الْجَارِيَتَيْنِ) (الحديث ٣١٤٤، طرفُهُ في: ٩٢٩ تجريد= ٢٠٣٢ فتح الباري).

ئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموو: عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) لەژنە دیلەکانی غەزای حونەین دوو کەنیزەکی دەست کەوت، لەمەککە لەماڵێ دایانی نا، کاتێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەپیاوەتی ژنو منداڵە دیلەکانی هۆزی هەوازینی بەردا،، لەخۆشیاندا خەڵکەکە بەناو کۆڵانەکان دا رایان دەکردو دەهاتنو دەچوون. عومەر فەرمووی: عەبدوڵلا بزانە ئەم قاڵ قاڵە چییە؟ منیش پاش تێگەیشتن لەکارەکە عەرزیم کرد: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەپیاوەتی ژنە دیلەکانی هۆزی هەوازینی ئازاد کردووە. باوکم فەرمووی: دەتۆش بچۆ ئەو دوو کەنیزەکەی منیش کە لەدیلەکانی غەزای هەوازین بەرم کەوتوون بەرەڵلا بکە.

١٢٦٩–عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ بَيْنَا أَنَا وَاقِفٌ فِي الصَّفِّ يَوْمَ بَدْرٍ فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي فَإِذَا أَنَا بِغُلَامَيْنِ مِنْ الْأَنْصَارِ حَدِيثَةٍ أَسْنَانُهُمَا تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ بَيْنَ أَضْلَعَ مِنْهُمَا فَغَمَزَنِي أَحَدُهُمَا فَقَالَ يَا عَمِّ هَلْ تَعْرِفُ أَبَا جَهْلٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ مَا حَاجَتُكَ إِلَيْهِ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ يَسُبُّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَئِنْ رَأَيْتُهُ لا يُفَارِقُ سَوَادِي سَوَادَهُ

حَتَّى يَمُوتَ الأَعْجَلُ مِنَّا فَتَعَجَّبْتُ لِذَلِكَ فَغَمَزَنِي الآخَرُ فَقَالَ لِي مِثْلَهَا فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ نَظَرْتُ إِلَى أَبِي جَهْلٍ يَجُولُ فِي النَّاسِ قُلْتُ أَلا إِنَّ هَذَا صَاحِبُكُمَا الَّذِي سَأَلْتُمَانِي فَابْتَدَرَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا فَضَرَبَاهُ حَتَّى قَتَلاهُ ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَاهُ فَقَالَ: (أَيُّكُمَا قَتَلَهُ؟) قَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: أَنَا قَتَلْتُهُ فَقَالَ: (هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا؟) قَالا: لا فَنَظَرَ فِي السَّيْفَيْنِ فَقَالَ: (كِلاكُمَا قَتَلَهُ سَلَبُهُ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ) وَكَانَا مُعَاذَ بْنَ عَفْرَاءَ وَمُعَاذَ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ) (الحديث ٣١٤١، طرفاهُ في: ٣٩٦٤، ٣٩٨٨).

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای بەدردا وا لەریزی شەڕکردن دا راوەستاوم، کەسەیری راستو چەپی خۆمم کرد وادوو کوڕی مێرد منداڵی ئەنصاری وان لەراستو چەپمەوە، لەدڵی خۆما گوتم: خۆزگە لەنێوانی دوو پیاوی لەمانە دلێرتردا بوومایە، کە کارامە بوونایەو ئەزموونی جەنگیان هەبوایە.

جا یەکێکیان تێوەی ژەندمو گوتی: مامەکە! ئایا ئەبوجەهل دەناسیت؟ گوتم: بەلێ، بۆچییتە، ئەی کوڕی برام؟ گوتی: بیستوومە جمێن بە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەدا، بەوکەسە گیانی منی وا لەدەسا، ئەگەر بیبینم لەکۆڵی نابمەوە تا یادەمکوژێ یا دەیکوژم، دیارە ئەوەمان دەکوژرێ کە زووتر ئاکامی دێت! منیش لەم قسەیە سەرسام بوومو لەلام سەیرو عەنتیکە بوو، ئەوی تریشیان هەروا، ئەوەندەی نەبرد، تەماشام کرد ئەبوجەهل جێ بەخۆی ناگرێ، وەك سەگی هار دێو دەچێ. جابەدوو لاوەکەم گوت: وریابن ئەمە یارۆکەتانە کە لەبارەیەوە لەمنتان پرسی، ئەوە ئەبوجەهلە ئیتر هەردوکیان بەشمشێری رووتەوە پەلاماریان دا، وەدایانە بەرشیر، هەتا کوشتیان.

ئەوجا چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەرو پێیان گوت: ئەبوجەهلمان کوشت، فەرمووی: کامتان کوشتتان؟ هەردووکیان گوتیان: من کوشتم. فەرمووی: ئایا

شمشێرەکانتان سڕیوە ؟ گوتیان: نەء کەتەماشای شمشێرەکانی کردن فەرمووی: ڕاست دەکەن بەهەردووکتان کوشتووتانە.

ئەوجا تفاق و کەلوپەلە رووتکراوەکەی دا بە موعاذی کوڕی جەمووح، وە ئەو دوو لاوەیش: موعاذی کوڕی عەفراو موعاذی کوڕی جەمووح بوون. (بڕوانە: تاج/٨ل-١٤٨ز – ٦٢- کەسێ لەغەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێ تفاق و کەلوپەلەکەی بۆ خۆیەتی + ل-٢٠٨ ف- از –٨٦ – کوشتنی ئەبوجەهل لەعنەتی خودای لێ بێ).

١٢٧٠– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنِّي أُعْطِي قُرَيْشًا أَتَأَلَّفُهُمْ لأَنَّهُمْ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ) (الحديث ٣١٤٦، أطرافُهُ في: ٣١٤٧، ٣٥٢٨، ٣٧٧٨، ٣٧٩٣، ٤٣٣١، ٤٣٣٢، ٤٣٣٣، ٤٣٣٤، ٤٣٣٧، ٥٨٦٠، ٦٧٦٢، ٧٤٤١) (٣٢٢).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من بۆیە لەماڵی پێنج یەك و شتی وەها بەشی قورەیش دەدەم چونکە دەمەوێ هۆگری ئیسلامیان بکەم و بیانلاوێنم و دڵیان ڕابگرم، چونکە نۆ موسوڵمانن و تازە لەباوو نەریتی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامەتی دابڕاون) (بڕوانە: تاج/٨/١٥٣ز-٦٥- باسی خەڵات کردنی نۆ موسوڵمان).

١٢٧١– عنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ نَاسًا مِنْ الأَنْصَارِ قَالُوا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ مَا أَفَاءَ فَطَفِقَ يُعْطِي رِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمِائَةَ مِنْ الإِبِلِ فَقَالُوا يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَدَعُنَا وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ قَالَ أَنَسٌ فَحُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَقَالَتِهِمْ فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ وَلَمْ يَدْعُ مَعَهُمْ أَحَدًا غَيْرَهُمْ.

(٣٢٢) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة قلوبهم على الإسلام، رقم: ١٠٥٩.

فَلَمَّـا اجْتَمَعُـوا جَـاءَهُمْ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَقَـالَ: (مَا كَانَ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ) قَالَ لَهُ: فُقَهَاؤُهُمْ: أَمَّا ذَوُو آرَائِنَا يَا رَسُولَ اللَّـهِ فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئًا وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَتْرُكُ الأَنْصَارَ وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِـنْ دِمَـائِهِمْ فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنِّي أُعْطِي رِجَالاً حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ أَمَـا تَرْضَـوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ وَتَرْجِعُوا إِلَـى رِحَـالِكُمْ بِرَسُـولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَوَاللَّهِ مَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ) قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ رَضِينَا فَقَالَ لَهُمْ: (إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَـرَةً شَـدِيدَةً فَاصْبِرُوا حَتَّـى تَلْقَـوْا اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) عَلَـى الْحَـوْضِ) قَـالَ أَنَـسٌ: فَلَـمْ نَـصْبِرْ) (الحـديث: ٣١٤٧، طرفُـهُ سـبق في الحـديث الـذي قبلـهُ، أي في رقـم: ١٢٧٠ت= ٣١٤٦ف)[٣٢٣].

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای حونەین کە خودای گەورە ماڵێکی زۆری بێ ئارەقی مفتی زۆری ڕەخساند بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەو ماڵەی کە بەتاڵانی لەهۆزی هەوازین گیرا، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی کرد بەبەخشین لێی، وەچەند پیاوێ لەقورەیش یەکی سەرو سەد وشتری دا پێیان، جا چەند کەسێ لە یاریدەدەران گوتیان: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ دەچێ بەشی قورەیشیەکان دەدات، کە هەتا دوێنێ بێ باوەڕ بوون شەڕیان لەگەڵ ئێمە دەکردو بەرهەڵستی ئیسلامیان دەکرد، کەچی بەشی ئێمە نادات، کەهێشتا خوێنی ئەوانەی کەبەشیان دەدات، لەشمشێرەکانمان دەتکێ‌و، ئەوان لەچاو ئێمەدا دوێنێ موسوڵمان بوون!! ئیتر بۆ بەشی ئەوان دەداتو بەشی ئێمە نادات ؟.

(٣٢٣) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة ومن يخاف على إيمانه صحيح مسلم، بشرح النووي ج/٧ص١٥٠ — المترجم.

پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) قسەکەیانی بەرگوێ کەوتەوەو، ناردی بەشوێن یاریدەدەران داو لەخێوەتێکی چەرمین دا کۆیکردنەوە و، کە کۆبوونەوە خۆیشی چوو بۆ ناویانو فەرمووی: (ئەوە قسەیە چییە کە لەئێوە وە پێم گەیشتۆتەوە؟!).

پیاوە زاناو هۆشمەندەکانی یاریدەدەران -أنصار- فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوماقوڵەکانمان و دنیا دیدەکانمان هیچیان نەگوتووە، کە دڵی تۆ گەردی پێ بگرێ ئەوەندە هەیە چەند کەسێکی مێرد منداڵمان لەهەرزەکارەکانمان لەڕووی نازەوە، گلەییان کردووە گوتوویانە: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ دەچێ بەشی نۆ موسوڵمانەکان لەتاڵان دەدا کەچی بەشی ئێمە نادات، وەلحاڵ ئەوان لەم ڕۆژانەدا، بە زەبری شمشێری ئێمە موسوڵمان بوون!

پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەلێ ئەمە وایە وادەبێ کەمن خەڵاتی هەندێ پیاو دەکەم، لەبەر ئەوەی کە نۆ موسوڵمانن و تازە لە کوفرو بێ باوەڕی دابڕاون، چونکە دەمەوێ دڵیان ڕابگرمو دڵنەواییان بکەمو هۆگری ئیسلامیان بکەمو بیانلاوێنم، وبەجوانی بیانکەمە خۆم، بەڵام ئەمە مەعنای وانیە کە من باوی ئەوان دەدەم بەسەر ئێوەدا، دەی باشە ئایا ئێوە بەشی خۆتان دەگۆڕنەوە بەبەشی ئەو خەڵکە، دەی پێم بڵێن: ئایا ئێوە بەو بەشە رازی نابن کە خەڵکی ماڵو پڕو پیتی دنیا لەگەڵ خۆیان ببەنەوە و، بەڵام ئێوە لەجیاتی ئەوە پێغەمبەری خودا ببەنەوە لەگەڵ خۆتان بۆ ماڵەوەتان، سابەو خودا گەورەیە، ئەم بەشەی کەئێوە دەیبەنەوە، کە بریتییە لە خۆشەویستیو لێ رازی بوونی خوداو پێغەمبەری خودا، گەلێ گەلێ باشترەو گەورەترە لەوبەشەی کە ئەو خەڵکەی تر دەیبەنەوە کە بریتییە لەپڕوپیتی جیهان!

گوتیـان: بەڵـێ، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ڕازی دەبـینو زیـاتریش، فەرمووی: (دەی بزانن کە ئێوە لەپاش من تووشی خۆ خۆییەکی سەخت دەبن هەندێ کەسو کار بەدەستو فەرمانڕەوای وا پەیدا دەبن کەهەر بەلای خۆیانا ڕایدەکێشنو کەسی تریان لەبیر نییە، بەڵام ئێوە خۆتان ڕابگرنو بەهیچ جۆرێ لایەنی هەقو ئیسلام بەرمەدەن، هەتا دەمرنو لەو دنیا دەچنەوە بەر دیوانی خودا، وەمن خۆم لەسەر حەوزی کەوسەرم چاوەڕوانتان دەکەمو، ئەوانەی کە ئارام دەگرن لەبەر هیچ مەهانەو بیانوویەك لەخەتی ئیسلام لانادەن، خەڵاتو پاداشی باشو گەورە وەردەگرن).

یاریدەدەران -أنصار- یش فەرموویان: ئێمەیش بەڵێنەو دەیدەین صەبرو ئارام دەگرین! (ش) (تاج/٨ل-١٥٣ز-٦٥ف-١-باسی خەلات کردنی نۆ موسوڵمان).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە: کەهەندێ کاربەدەست لەموسوڵمانان پەیدا دەبن، زۆر خۆپەرستو بەرژەوەند پەرستن، وە خۆخۆییەکی زۆر دەکەن هەتا خۆیانو کەسو کاری خۆیان وەستابێ، کەسی تریان لەبیر نییە، ئەم فەرموودەیە لەوڵاتی ئێمەدا، لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا بەڵگەیە لەسەر ئەم دووشتە:

١- کاربەدەستانی کوردستان نموونەیەکی زیندوون لەم جۆرە کاربەدەستە خۆپەرستە موسوڵمانانە، لە خوا بەزیادبێ هێشتا موسوڵمانن!! لەبەر ئەوە تکایە بوختانی ناموسوڵمانییان بۆ مەکەن.

٢- هەر موسوڵمانێ صەبرو ئارام بگرێ لەسەر ئەم خۆخۆییو خۆپەرستی ئەم زۆربەرێزانە، مژدەی لێ بێ کەلەڕۆژی قیامەتدا، لەسەر حەوزی کەوسەر بەخزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەگا[٣٢٤].

(٣٢٤) ئەم جۆرە کاربەدەستانە زۆر زۆرن لەهەموو لایێ هەن کە ئەم شیعرانە زمانحاڵیانە:

١٢٧٢- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ بَيْنَا هُوَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ النَّاسُ مُقْبِلاً مِنْ حُنَيْنٍ عَلِقَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الأَعْرَابُ يَسْأَلُونَهُ حَتَّى اضْطَرُّوهُ إِلَى سَمُرَةٍ فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ فَوَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (أَعْطُونِي رِدَائِي فَلَوْ كَانَ عَدَدُ هَذِهِ الْعِضَاهِ نَعَمًا لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ ثُمَّ لا تَجِدُونِي بَخِيلاً وَلا كَذُوبًا وَلا جَبَانًا) (الحديث ٣١٤٨، طرفُهُ في: ٢٨٢١) [٣٢٥].

جوبەیری کوڕی موطعم(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا(دروودی خوای لەسەر بێ) بووم، لەغەزای حونەین دەگەڕایەوە، عەرەبە بەدەوەکان تێی ئاڵان وداوای دەسەنەو بەشیان لێ کرد، تەنگیان پێ هەڵچنیو ئاڵاندیانە بنجێ دڕکەزی، عاباکەی ئاڵا لەبنکە دڕکەزییەکەوە، ئەوجا وەستاو فەرمووی: (عاباکەم بدەنەوە ئەگەر بەقەدەر ئەم دڕکەزییانە ئاژەڵم ببێ هەمووی دابەش دەکەم بەسەرتانا، قەت بە ڕژدیو چرووکیو درۆزنیو ترسنۆکی من نابینن) (ریاض/٢ل١١١ز-باسی سەخاوەت ف-١٢/٥٥٥).

١٢٧٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَذَبَهُ جَذْبَةً شَدِيدَةً حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عَاتِقِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ أَثَّرَتْ بِهِ حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَذْبَتِهِ ثُمَّ قَالَ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ فَضَحِكَ ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ) (الحديث ٣١٤٩، طرفاهُ في: ٥٨٠٩، ٦٠٨٨) [٣٢٦].

---

مسۆولی خۆشە دەست کێ دەکەوێ لەتەڕ بخواتو لە وشکو بخەوێ
گوێ نەدا بەهیچ، بژی وەك خەوگەل نەترسێ لەخوا، نەشەرمێ لە گەل (وەرگێڕ)

(٣٢٥) أشار العسقلاني إلى موافقة مسلم له في خاتمة كتاب الجهاد (ج/٦ص١٩٥- المترجم).

(٣٢٦) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: إعطاء من سأل بفحش.. رقم: ١٠٥٧.

ئەنەس(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) دەڕۆیشتم بەڕێدا، شاڵێکی نەجرانی پەراوێز ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، عارەبێکی دەشتەکی پێی گەیشت، یەخەی پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرتو بەتووندی وا رایکێشا لاملی حەزرەتی دابڕی! ئەوجا پێی گوت: ئەی موحەممەد! لەم ماڵە کەهی خودایەو لەلای تۆ دانراوە بەشم بدە.پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) بەدەمیەوە پێکەنی و، فەرمانی کرد کەبەشی بدەن!) (تاج/٤ل- ١٠٦ز-٣١- باسی جۆرەکانی جل و بەرگ).

١٢٧٤–عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ آثَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُنَاسًا فِي الْقِسْمَةِ فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنْ الإِبِلِ وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذَلِكَ وَأَعْطَى أُنَاسًا مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ فَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ قَالَ رَجُلٌ وَاللَّهِ إِنَّ هَذِهِ الْقِسْمَةَ مَا عُدِلَ فِيهَا وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللَّهِ، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لأُخْبِرَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: (فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يَعْدِلْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ رَحِمَ اللَّهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ) (الحديث ٣١٥٠، أطرافُهُ في: ٣٤٠٥، ٤٣٣٥، ٤٣٣٦، ٦٠٥٩، ٦١٠٠، ٦٢٩١، ٦٣٣٦)[٣٢٧].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کەرۆژی غەزای حونەین رووی دا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەماڵی تالانی جەنگ، بەشی چەند کەسێکی زیاتر دا، سەد وشتری دا بە ئەقرەعی کوڕی حابیس سەدیشی دا بەعویەینە و، بەشی چەند کەسێکی تریشی لەخانەدانەکانی عەرەب بەم شێوەیە دا، لەو رۆژەدا ئەوانەی لەبەش پێداندا جیاکردەوەو بەشی زۆر باشی پێدان! پیاوێکیش گوتی: خودایە! ئەم بەشکردنە نە بەهەق و عەدالەت بوو، وەنە بۆ رەزای خودا بوو، گوتی: منیش گوتم: بەخودا دەبێ بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ).

(٣٢٧) أخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة قلوبهم على الإسلام، رقم: ١٠٦٢.

جا چووم بۆ خزمەتیو قسەی کابرام بۆ گێڕایەوە بۆی، ڕەنگی حەزرەت وەك خوێن سوور داگیرسا لەپاشا فەرمووی: (ئەگەر خوداو پێغەمبەری خودا شت بەهەقو دادپەروەری نەکەن، ئەی کێی تر ئەوە دەکا؟!). دوایی فەرمووی: (ڕەحمەتی خودا لە پێغەمبەر مووسا، لەلایەنی گەلەکەیەوە لەمەیش زیاتر ئازار دەدرا، بەڵام ددانی بەخۆدا گرت، کەواتە شتی وا، صەبر لەسەر ئازاری نەفامانو إعراضو چاوپۆشی لەهەڵەیان ڕەفتاری پێغەمبەرانە، منیش پابەندی ئەمە دەبم).

ئەنەس فەرمووی: منیش لەدڵی خۆما گوتم: وای لێ هات! کەواتە هەتا هەتایە دوای ئەم جارە هیچ قسەیەکی لەم بابەتەی بۆ نابەمەوە! (تاج/٨ل-١٥٦ز-٦٥- خەڵاتکردنی نۆ موسوڵمان).

١٢٧٥ – عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ كُنَّا نُصِيبُ فِي مَغَازِينَا الْعَسَلَ وَالْعِنَبَ فَنَأْكُلُهُ وَلا نَرْفَعُهُ) (الحديث ٣١٥٤) (٣٢٨).

ئیبنوعومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لەغەزادا هەنگوینو ترێو میوەو شتی وامان دەست دەکەوت، بۆ خۆمان دەمانخواردو نەمان دەبردە خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) هەتا بیخاتە سەر تاڵانییەکەو دوایی دابەشی بکا بەسەر پێشیاوانی دا. (تاج٨ل-١٧٨ز-٧٣ف-٢).

**تێبینی**:

١- نامەی خەباتو تێکۆشان(الجهاد) لەریاض الصالحین دا وا لە (ل-٩٣٦ هەتا ٩٩٥).

---

(٣٢٨) من أفراد البخاري، قال العسقلاني: لم يوافقهُ على تخريج حديثِ ابن عمر: (كنا نصيبُ في مغازينا العسل) - فتح/٦/٢٨٥ — المترجم.

٢- بڕوانه: فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە/٨٧٩ زنجیرە/٣٥١ باسی دابەش کردنی ماڵی تالانی + ز- ٣٥٢ ل –٨٨٤ + ز-٣٥٣ –بڕیارەکانی سەرانە + ز ٣٥٤ل –٨٨٧+ ز-٣٥٥ل-٨٨٩- ئەندازەی سەرانە + ز-٣٥٦ ل-٨٩٦- نیشانەکردنی جلو بەرگیان.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٦٢- باسی سەرانەو نەشەڕو نەجەنگ (أبواب الجزيةو الموادعة)

١٢٧٦– عن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أنّـه كتـب إلى اهـل البـصرة قَبْلَ مَوْتِهِ بِسَنَةٍ: (فَرِّقُوا بَيْنَ كُلِّ ذِي مَحْرَمٍ مِنْ الْمَجُوسِ) وَلَمْ يَـكُنْ عُمَـرُ (رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَخَذَ الْجِزْيَةَ مِنْ الْمَجُوسِ حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْـنُ عَـوْفٍ أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ) (الحديث ٣١٥٦) (٣٢٩).

عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێش مەرگیدا بەساڵێ، نامەی نارد بۆ خەڵکی بەسرە هەر ژنو مێردێ لەئاگرپەرستەکان، کە لەناو خۆیانا خۆیینو بەپێی شەرعی ئیسلام بەیەکتری ناشێن، لەیەکیان جیابکەنەوە.

وەهەتا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف شایەتی نەدا: کە پێغەمبەر(درودی خوای لسەر بێ) سەرانەی لەئاگرپەرستەکان وەردەگرت، حەزرەتی عومەر سەرانەی لێ وەرنەدەگرتن، بەڵکوو بەس ئیسلامی لێ قەبووڵ دەکردن، دەنا بەشیر دەکوژران. (تاج/٨/١٦٠ ف-١- ز-٦٦- سەرانە).

### ڕوونکرنەوە:

١- مەجووس واتە: ئاگرپەرست بەپێی ئایینی خۆیان، خوشك لەبرای خۆی مارەدەکەن، شتیوا لەئیسلاما حەرامە، لەبەر ئەوە هەرکاتێ

(٣٢٩) من أفراد البخاري، (فتح٦ص٢٨٥ - فتح ٦ص٤٢٤ طبعة جديدة) - المترجم.

لەقەڵەمڕەوی دەوڵەتی موسوڵمانا، شتیوا رووی دا دەبێ قەدەغە بکرێو رێگەی ئەوەیان نەدرێ.

٢- ئاگرپەرست بۆ ئێمە ژنو ژنخوازی لێیان دروست نییە، لەمەدا لەگاورو جولەکە جییان، وەبەئەهلی کیتاب دانانرێن. بەڵام بۆ سەرانە دروستە سەرانەیان لێ وەربگیرێ، بۆ ئەمەیان حیسابی خاوەن نامەیان بۆدەکرێ، شەڕیان لەگەڵ دەکرێ هەتا یابەسەرانە رازی دەبن، یا ئیسلام دەبن.

١٢٧٧- عنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ الأَنْصَارِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَهُوَ حَلِيفٌ لِبَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ الْعَلاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنْ الْبَحْرَيْنِ فَسَمِعَتْ الأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَوَافَتْ صَلاةَ الصُّبْحِ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا صَلَّى بِهِمْ الْفَجْرَ انْصَرَفَ فَتَعَرَّضُوا لَهُ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ رَآهُمْ وَقَالَ: (أَظُنُّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدْ جَاءَ بِشَيْءٍ) قَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: (فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ فَوَاللَّهِ لا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمْ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ) (الحديث ٣١٥٨، طرفاهُ في: ٤٠١٥، ٦٤٢٥) (٣٣٠).

عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری بەدری(ڕەزای خوای لێ بێ) کەسوێند خۆری بەنی عامیری کوڕی لوئەی بوو، کەئامادەی جەنگی بەدر بوو بوو، لەریزی سوپای ئیسلاما، لەدژی لەشکری بێ باوەڕان، ئەم عەمرە فەرمووی:

---

(٣٣٠) أخرجه مسلم في أوائل كتاب الزهد والرقائق، رقم: ٢٩٦١.

(پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد بۆ بەحرەین، کەسەرانەی وڵاتی بەحرەین بێنێ، چونکە لەوەبەر پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ خەڵکی وڵاتی بەحرەین دا ڕێك کەوتبوو، عەلای کوڕی حەضرەمی کردبوو بەسەرداریان، کە ئەبوعوبەیدە هاتەوە ماڵێکی زۆری لەبەحرەینەوە هێنا بوو، یاریدەدەرانیش -أنصار- بیستیانەوە کە ئەبوعوبەیدە هاتۆتەوە ئیتر بۆ نوێژی بەیانی هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەویش نوێژی بۆ کردن و گەڕایەوە، جا یاریدەدەران لەوکاتەدا داوای بەشیان لێ کرد.

پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) کەلەسەر ئەم حاڵە بینینی بزەیەك گرتی و فەرمووی: (وادەزانم کە زنەوتووتانە کەئەبوعوبەیدە شتێکی هێناوە!) عەرزیان کرد: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەمژدەبێ لەئێوەو خۆشیتان لێ بێ دەسا بەزاتی خودا لەهەژاری لێتان ناترسم، بەلام بەپێچەوانەوە، مەترسی ئەوەم هەیە کە ئێوەش وەك نەتەوەکانی پێش ئێوە خۆشی دنیا رووتان تێ بکاو، دنیا بێت بەپیرتانەوەو ئێوەش وەك ئەوان بەدەست ودەم پەلاماری دنیا بدەن و باوەشی پیا بکەن و تێی ورووکێن!.

جا ئەو کاتە وەك چۆن ئەوانی لەناو برد ئاوا ئێوەش لەناو ببات) (تاج/٨ل-١٦١ز-٦٦- سەرانە).

١٢٧٨- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ بَعَثَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) النَّاسَ فِي أَفْنَاءِ الأَمْصَارِ يُقَاتِلُونَ الْمُشْرِكِينَ فَأَسْلَمَ الْهُرْمُزَانُ فَقَالَ: إِنِّي مُسْتَشِيرُكَ فِي مَغَازِيَّ هَذِهِ قَالَ نَعَمْ مَثَلُهَا وَمَثَلُ مَنْ فِيهَا مِنْ النَّاسِ مِنْ عَدُوِّ الْمُسْلِمِينَ مَثَلُ طَائِرٍ: لَهُ رَأْسٌ وَلَهُ جَنَاحَانِ وَلَهُ رِجْلانِ فَإِنْ كُسِرَ أَحَدُ الْجَنَاحَيْنِ نَهَضَتْ الرِّجْلانِ بِجَنَاحٍ وَالرَّأْسُ فَإِنْ كُسِرَ الْجَنَاحُ الآخَرُ نَهَضَتْ الرِّجْلانِ وَالرَّأْسُ وَإِنْ شُدِخَ الرَّأْسُ ذَهَبَتْ الرِّجْلانِ وَالْجَنَاحَانِ وَالرَّأْسُ فَالرَّأْسُ كِسْرَى وَالْجَنَاحُ قَيْصَرُ وَالْجَنَاحُ الآخَرُ فَارِسُ فَمُرْ الْمُسْلِمِينَ فَلْيَنْفِرُوا إِلَى كِسْرَى.

وَقَالَ بَكْرٌ وَزِيَادٌ جَمِيعًا عَنْ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ قَالَ فَنَدَبَنَا عُمَرُ وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْنَا النُّعْمَانَ بْنَ مُقَرِّنٍ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِأَرْضِ الْعَدُوِّ وَخَرَجَ عَلَيْنَا عَامِلُ كِسْرَى فِي أَرْبَعِينَ أَلْفًا فَقَامَ تَرْجُمَانٌ فَقَالَ لِيُكَلِّمْنِي رَجُلٌ مِنْكُمْ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ: سَلْ عَمَّا شِئْتَ قَالَ: مَا أَنْتُمْ؟ قَالَ: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ كُنَّا فِي شَقَاءٍ شَدِيدٍ وَبَلاءٍ شَدِيدٍ نَمَصُّ الْجِلْدَ وَالنَّوَى مِنَ الْجُوعِ وَنَلْبَسُ الْوَبَرَ وَالشَّعَرَ وَنَعْبُدُ الشَّجَرَ وَالْحَجَرَ فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرَضِينَ تَعَالَى ذِكْرُهُ وَجَلَّتْ عَظَمَتُهُ إِلَيْنَا نَبِيًّا مِنْ أَنْفُسِنَا نَعْرِفُ أَبَاهُ وَأُمَّهُ فَأَمَرَنَا نَبِيُّنَا رَسُولُ رَبِّنَا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ نُقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ أَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ وَأَخْبَرَنَا نَبِيُّنَا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ رِسَالَةِ رَبِّنَا أَنَّهُ مَنْ قُتِلَ مِنَّا صَارَ إِلَى الْجَنَّةِ فِي نَعِيمٍ لَمْ يَرَ مِثْلَهَا قَطُّ وَمَنْ بَقِيَ مِنَّا مَلَكَ رِقَابَكُمْ (الحديث: ٣١٥٩ طرفُهُ في: ٧٥٣٠).

فَقَالَ النُّعْمَانُ: رُبَّمَا أَشْهَدَكَ اللَّهُ مِثْلَهَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يُنَدِّمْكَ وَلَمْ يُخْزِكَ وَلَكِنِّي شَهِدْتُ الْقِتَالَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ انْتَظَرَ حَتَّى تَهُبَّ الأَرْوَاحُ وَتَحْضُرَ الصَّلَوَاتُ) (الحديث ٣١٦٠) (٣٣١).

جوبەیری کوڕی حەییە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێ بێ) خەڵکی دەنارد لەناو گەورە شارەکانا کوشتاری بتپەرستەکانیان دەکرد، لەو ماوەیەدا هورموزان کەسەرکردەی یەکێ لەسوپاکانی فارس بوو، وە ناوی رۆستەم بوو موسوڵمان بوو، جا عومەر(رەزای خوای لێ بێ) پێی فەرموو: من لەم غەزەواتانەدا پرسو راوێژت پێ دەکەم، رای تۆ چۆنە پێم بڵێ؟ ئەویش گوتی: بەلێ باشە، خەڵکی ئەم وڵاتانە کە ئێستا دوژمنی موسوڵمانانن، وەك باڵندەیەك وان کە سەرێكو دوو باڵو دوو قاچی هەیە، باڵندەکە ئەگەر باڵێکی بشکێ، هەردوو قاچەکەی لەگەڵ ئەو باڵەکەی تریدا بەزەبری سەرەکەی هەڵدەسنەوە، ئەگەر باڵەکەی تریشی بشکێ هەردوو قاچەکەیو

(٣٣١) لاحظ ما جاء في خاتمة كتاب الجهاد والسي والخمس والموادعة (ج/٦ص٢٨٥) – المترجم.

سەرەكەی هەڵدەسنەوە،بەلام ئەگەر سەرەكەی بشكێ ئیتر هەم باڵو هەم قاچو هەم سەرەكەی هەموو تیادەچن!

لەم پەندەدا مەبەست لەسەرەكە كیسرای شای ئێرانە، مەبەست لەباڵێكیان قەیسەرە، مەبەست لەباڵەكەی تریان فارسە، جا ئەی خەلیفە! فەرمان بدە بە موسوڵمانان كە عێلجارِی لێ بكەن وەدەرچن بۆ سەركیسرا. گوتی: ئیتر عومەریش بەرِێی كردین و نوعمانی كورِی موقەرِینی كرد بەسەركردەمان، رۆیشتین تا چووینە خاكی دوژمن، لەوێ سەركاری كیسرا بەچل هەزار كەسەوە پێشی لێ گرتین، زمانزانەكەیان هاتو گوتی: باپیاوێكتان بێ قسەم لەگەڵ بكا، موغەیرەیش پێی گوت: چی حەز دەكەی بپرسە. گوتی: ئێوە چین؟ فەرمووی: ئێمە كەسانێكین لە عەرب لەمەپێش لە بەدبەختییەكی ناهەموارو گرفتارییەكی دژواردا بووین، حاڵمان زۆر خراپ بوو لەبرسانا پێستەمان دەخواردو، ناوكە خورمامان دەمژێو، كوڵكو موومان لەبەر دەكرد، دارو بەردمان دەپەرست. هەتا خودای هەموو ئاسمانەكانو هەموو زەمینەكان – هەمیشە ناوو یادی پایەداربێو گەورەییو شكۆمەندی بەرقەراربێ – لەناكاو پێغەمبەرێكی نارد بۆمان، لەخۆمانەو دەزانین باوكو دایكی كێنو كێ نین، وە زۆر باش رەسەنی دەزانین هەتا بڵێی خانەدانە،و ناكەس بەچە نییە، حەڵاڵ زادەیەو نەوەی حەڵاڵ زادەیە، جا ئەم پێغەمبەرەی ئێمە كەپێغەمبەری راستو دروستی خودا خۆیەتی، فەرمانی پێ كردوین كە جەنگتان لەگەڵ بكەین هەتا بەیەكێ لەم دووشتە رازی دەبن:

یان وەك ئێمە ئیسلام دەبنو خودای تاكو تەنیا بەتەنیا خۆی دەپەرستن و، ئیتر حاڵتان وەك حاڵی ئێمە وایە لەخۆشیو ناخۆشی دا.

یان ئەگەر بەمە رازی نابن دەبێ سەرانەمان بدەنێ ئەم پێغەمبەرە نازدارەمان - لەسەر راسپێری پەروەردگارمانو لەسەر زمانی ئەوەوە- هەواڵی بەئێمە داوە: (كە ئەوەی لەئێمە دەكوژرێ دەچێ بۆ بەهەشتو دەكەوێ بەسەر نازو خۆشی داو دەكەوێتە نازو نیعمەتێكی واوە كە هەرگیز شتیوای

نەدیبێ، ئەوەیشی لەئێمە ماو، نەکوژرا، ئەوا زاڵ دەبێ بەسەر ئێوەداو، دەبێ بە ئاغاتان).

نوعمان بە موغیرەی کوڕی شوعبەی فەرموو: کاتێ موغیرە ویستی کەیەکسەر پاش ئەم گفتوگۆیە، لەسەرەتای ڕۆژەوە دەست بەجەنگ بکرێ، پێی فەرموو: (بێگومان ئەی موغیرە! وا بووە تۆ لەخزمەتی پێغەمبەردا، لەغەزاکانیدا، تووشی هەڵوێستی دژوارو سەختی بووی، وەخوا بەکەرەمی خۆی نەپەشیمانی کردوویتەوە، نەتەریقی بەسەر هێناوی بەڵام پێویست بەم پەلەپەلە ناکات، چونکە منیش لەخزمەتی پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ)، ئامادەی دەستپێکردنی جەنگین بووم، دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو ئەگەر سەرلەبەیانی دەستی نەکردایە بەجەنگ کردن، شەڕدەستپێکردنی دوادەخست هەتا دەبوو بەنیوەڕۆ، وباهەڵی دەکرد،و نەصرو سەرکەوتن و پیرۆزی دادەبەزی، بەتایبەتی کاتێ نوێژی عەصر دەبێ) ( تاج/٨ل-١٢٢ف-١= فەرموودەی ژمارە: ٣١٦٠فتح+ تاج/٨ل-١٦٢ف-٤= فەرموودەی ژمارە: ٣١٥٩ فتح).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ڕاستە کەراوی ئایا صەحابی بێ، یاکەسێکی تر بێ، دەگاتە پلەوپایەی عەدالەت، وەدەبێ بەثیقەو جێگەی متمانە، وەئەوەندەبەسە بۆ ئەوەی کە فەرموودە ناسە کە گەورەکان گێڕانەوەی لێوە ئەنجام بدەن، بەڵام بەهیچ جۆرێ ئەوە واتای وانییە کە ئیتر ئەو جۆرە کەسە دوورە لەهەڵەو قەت هەڵە ناکات، ڕێ دەکەوێ هەڵەی گەورە گەورەش دەکا، جاری وادەبێ لەمەتنی فەرموودەکەدا هەڵە دەکا، یالەڕشتەکەی دا، یالەژمارەی کەسەکاندا، یا لەڕۆژەکەیدا، یالەساڵەکەیدا یاتێکەڵ و پێکەڵیەکی زەینی پەیدا دەبێ و فەرموودەیێ لەچەند فەرموودەیەکی تر جیا جیا دروست دەکات وەراوی

لەمانەدا بەقەستی شتی وا ناکات، وەئەم جۆرە هەڵەو باسو خواسانە لەپەڕاوەکانی زانستی فەرموودەدا بەدوورو درێژی باسکراون وەك تەدریبی راوی ئیمامی سیوطی، وەلەصحیحەینیش دا ئەم جۆرە هەڵانە هەیە:

جا لەسەر ئەم بنیاتە لەم فەرموودەیە دا چەند هەڵەیەك هەیە، لێرەدا لەبەر کەمی کات مەودای ساخکردنەوەی ئەو هەڵانەمان نییە، دەتوانرێ موتاڵای شەرحە گەورەکانی ئەم فەرموودەیە بکرێ بۆ ئەم لایەنە. بەڵام لێرەدا ئاماژە دەکەین بۆ ئەم چەند خاڵە گرنگە:

١- پرۆژەی گرتنی عێراق لەلایەنی ئەمریکاوە کە ئەمساڵ ٢٠٠٣ز ئەنجام درا، لەسەرەتاوە بەعەمەلییەی قەطعی رأس دەستی پێکرا، دەق وەك پیادەکردنێ بۆ ئەوبیردۆزە سەربازییە کە لەم فەرموودەیەدا، رەچاوکراوە.

٢- هورموزان هەروا بەئاسانی ئیسلام نەبوو بەڵکو پاش شەڕێکی قورس، موسوڵمانان دیلیان کردو بەدیلکراوی ناردیان بۆ ئیمامی عومەر، لەوێ موسوڵمان بوو، عومەر رێزی دەگرتو لەخۆی نزیك دەکردەوەو، راوێژی پێ دەکرد هەتا حەزرەتی عومەر پێکرا، عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، تۆمەتی پیلانکاری لە هورموزان دا، کە گوایە لەگەڵ ئەبو لوءلوئەی فارسی دا دەستی هەیە لەکوشتنی باوکیدا، کاتێ عومەر شەهید بوو عوبەیدوڵڵا پەلاماری داو کوشتی.

٣- دروستتر ئەوەیە: کە جوبەیری کوڕی حەییە هاوڕێیە، واتە: صەحابیە لەسەردەمی پێغەمبەردا منداڵ بووە، ناوی تەواوی جوبەیری کوڕی حەییەی کوڕی مەسعودی ئەلثەقەفییە، برازای عوروەی کوڕی مەسعودە. فەرموودەی لە بوخاری دا هەیە، لەبنەماڵەیەکی خانەدانی گەورەیە، مامەی کە عوروەی کوڕی مەسعودە لەسەردەمی خۆیا، سەرۆکی هۆزی

ثەقیف بووە کەهۆزێکی گەورەی عەرەبن، لەسەردەمی پێغەمبەردا ئەم هۆزی ثەقیفە سەرجەم موسوڵمان بوون، ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەوە جوبەیر صەحابییە، چونکە ئیبنو عەبدولبەرر دەفەرموێ: (لەساڵی حەجیماڵئاواییدا کەس نەما لەهۆزی قورەیش‌و لەهۆزی ثەقیف کە ئیسلام نەبووبێ، وەهەمووشیان لەخزمەت پێغەمبەردا خەریکی حەجی ماڵئاوایی بوون، دیارە کە جوبەریش یەکێکە لەوان..).

لەسەردەمی جێنشینی عەبدولەلیك دا کۆچی دوایی کردووە. موغیرەی کوڕی شوعبە کە ئامۆزای بووە، جوبەیر گێڕانەوەی لەوو لەعومەری خەطاب‌و لەنوعمانی بەشیرەوە هەیە.

موغەیرەی ئامۆزای پیاوێکی بەخۆوە بووە، لەپێش ساڵی عەمرەی حودەیبییەدا ئیسلام بوو، ئامادەی پەیمانی خۆشنودی بوو، لەو پەیمانەدا رۆڵێکی جوانی بوو، چاوێکی لەغەزای یەرموکدا کوێر بوو، شەعبی دەڵێ: ( بلیمەتەکانی عەرەب ئەم چوارەن: موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان‌و عەمری کوڕی عاص‌و موغیرەی کوڕی شوعبەو زیاد).

لەئیصابەدا دەفەرموێ: (عومەر کردی بەسەرکاری بەحرەین، حەزیان لێ ی نەبوو لەلای عومەر شکاتیان لێ ی کرد لای برد، دوایی مەترسی ئەوەیان هەبوو کەبیگێڕێتەوە بۆ سەریان، سەدهەزار پارەیان کۆکردەوەو کوێخاکەیان هەڵی گرت‌و چوو بۆ لای عومەر و پێی گوت: ئەمە موغیرە دزیویەتی‌و لەلای من داینـاوە کە بۆی هەڵبگرم، عومەریش بانگی کردو لێی پرسی، گوتی: درۆ دەکا سەد هەزار نییە دوسەد هەزارە!).

عومەریش پێی فەرموو: (دەی چی ئەمەی پێ کردیت؟) گوتی: زۆری خێزان! کوێخا هەستی بەهەڵەی خۆی کردو سوێندی گەورەی بۆ ئیمامی عومەر خوارد کەشتەکە درۆی رووتە. نە زۆرو نەکەم پارەو پوولی لەلای ئەو

داناوه، ئیمامی عومەر بە موغیرەی فەرموو: ئەی بۆ وات گوت؟ گوتی: چونکە ئەو ئەم بوختانە گەورەی بۆ من کرد، منیش ویستم تەریقی بەسەر بهێنم.

١٢٧٩- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السّاعدي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: غزونا مَعَ النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تبوك وَأَهْدَى مَلِكُ أَيْلَةَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَغْلَةً بَيْضَاءَ وَكَسَاهُ بُرْدًا وَكَتَبَ لَهُ بِبَحْرِهِمْ) (الحديث ٣١٦٢- طرفه في: ٧١٣ت = ١٤٨١ ف).

واتەی فەرموودەکە لەو جێگەیەدا رابوورد (بەرگی /٢ لاپەڕە: ١٣٥) فەرموودەی ژمارە: (٧١٣ ت= ١٤٨١ ف).

١٢٨٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا) (الحديث ٣١٦٦، طرفُهُ في: ٦٩١٤) [٣٣٢].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ یەکێ لەئەهلی ذیمە بکوژێ بۆنی بەهەشت ناکات وەلحاڵ بۆنی بەهەشت چل ساڵ رێگە دەڕوا!) (تاج/٣/ل-٢٠٧ ف-١٣ ز- ٨١ — باسی هەڕەشەکردن لەپیاوکوژی).

١٢٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (اجْمَعُوا إِلَيَّ مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ يَهُودَ) فَجُمِعُوا لَهُ فَقَالَ: (إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ؟) فَقَالُوا: نَعَمْ قَالَ لَهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (مَنْ أَبُوكُمْ؟) قَالُوا: فُلَانٌ فَقَالَ:

---

(٣٣٢) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث (من قتل معاهداً) لإبن عمرو (فتح/٦ص٢٨٥) خاتمة كتاب الجهاد....و الخمس..) — المترجم.

(كَذَبْتُم بَلْ أَبُو كُمْ فُلانٌ) قَالُوا: صَدَقْتَ قَالَ: (فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُ عَنْهُ؟) فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ وَإِنْ كَذَبْنَا عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَهُ فِي أَبِينَا فَقَالَ لَهُمْ: (مَنْ أَهْلُ النَّارِ؟) قَالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيرًا ثُمَّ تَخْلُفُونَا فِيهَا فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (اخْسَئُوا فِيهَا وَاللَّهِ لا نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَدًا) ثُمَّ قَالَ: (هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟) فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ قَالَ: (هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا؟) قَالُوا: نَعَمْ قَالَ: (مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟) قَالُوا: أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا نَسْتَرِيحُ وَإِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ) (الحديث ٣١٦٩، طرفاهُ في: ٤٢٤٩، ٥٧٧٧) (٣٣٣).

ئـەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: لـەکاتی گرتنـی قـەڵای خەیبـەردا، مەڕێکی زەهراویان دانا بـۆ پێغەمبـەرو یـارانی، هـەم پێغەمبـەر خـۆیو هـەم یارانی هەنێ لەو مەڕەیان خوارد، لەگەرمەی خواردنـدا بـوون پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: (دەست بگرنـەوە ئەم مەڕە دەڵێ پـێم زەهـری پێـوە کراوە!).

ئـەوجا فـەرمووی: (هەرچـی جولەکـەیێ والێـرەدا کۆیـان بکەنـەوە بـۆم) ، کەکۆیان کردنەوە بۆی، فەرمووی پێیان: (من پرسـیاری شتێـکتان لـێ دەکـەم ئایا ئێوە راسـتیم پـێ دەڵێن؟) گوتیـان: بەلـێ، فـەرمووی پێیـان: (کێ بـاوکی ئێوەیە؟) ، گوتیان: باوکی ئێمە فیسارە پیاوە، فـەرمووی: (درۆدەکـەن، بەڵـکو باوکی ئێوە فیسارە کەسە، نەوەك ئەو پیـاوەی ئێـوە دەیڵێن). گوتیـان: راسـت دەکەی قسەی تۆ تەواوە.

فەرمووی: (پرسیاری شتێـکی ترتـان لـێ دەکـەم ئایـا راسـتم پـێ دەڵێن؟) گوتیان: بەلێ راستت پێ دەڵێین ئەی ئەبولقاسم! چونکە ئەگەر درۆت لەگەڵ بکەین تۆ بەدرۆکەمان دەزانی، وەك چۆن بۆ مەسەلەکەی باوکمان پێت زانـی.

(٣٣٣) وأخرجهُ مسلم عن أنس (عيني/١٥/٩١) - المترجم.

فەرمووی پێیان: (كێ دۆزەخییە؟) گوتیان: ئێمە نەختێ لەدۆزەخ دا دەبین، بەڵام ئێوە لەپاش دەرچوونی ئێمە هەر تیادا دەمێننەوەو دەبن بەجێگری ئێمە لەدۆزەخا!

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: (چغەتان لێ بێ! دۆزەخ جێگەی ئێوەیە، بەیەزدانی پاك هەرگیز ئێمە لەپاش ئێوە لەوێ نامێنینەوە) ئەوجا پێی فەرموون: (ئەگەر شتێكی ترتان لێ بپرسم ئەمجارەیان راستیم پێ دەڵێن؟) گوتیان: بەلێ. فەرمووی: (ئایا زەهرتان كردۆتە ناو گۆشتی ئەم مەڕە برژاوەوە، كە ئێستا ئێمە لێمان خوارد؟) گوتیان: ئا،تێمان كردووە، فەرمووی: (چی ئەمەی پێ كردوون‌و لەبەر چی ئەمەتان كرد؟) گوتیان: ویستمان تاقیت بكەینەوەو، گوتمان: ئەگەر پێغەمبەری راستی نەبی‌و پێغەمبەرە درۆزنە بیت، ئەوا دەتكوژین، بەم زەهرەو رزگاردەبین، لەدەستت، بەڵام ئەگەر پێغەمبەری راستی بیت ئەوە ئەم زەهرە كارت لێ ناكات‌و زیانت پێ ناگەیەنێ. (تاج/٤ل-١٨١ز-٥٥- باسی زەهر -بڕوانە: ف -١+٢+٣+٤، بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم داستانە).

١٢٨٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: انْطَلَقَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ بْنُ مَسْعُودِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) إِلَى خَيْبَرَ وَهِيَ يَوْمَئِذٍ صُلْحٌ فَتَفَرَّقَا فَأَتَى مُحَيِّصَةُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَهْلٍ وَهُوَ يَتَشَحَّطُ فِي دَمِهِ قَتِيلا فَدَفَنَهُ ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَانْطَلَقَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةُ وَحُوَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكَلَّمُ فَقَالَ كَبِّرْ كَبِّرْ وَهُوَ أَحْدَثُ الْقَوْمِ فَسَكَتَ فَتَكَلَّمَا فَقَالَ تَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ قَاتِلَكُمْ أَوْ صَاحِبَكُمْ قَالُوا وَكَيْفَ نَحْلِفُ وَلَمْ نَشْهَدْ وَلَمْ نَرَ قَالَ فَتُبْرِيكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ فَقَالُوا كَيْفَ نَأْخُذُ أَيْمَانَ قَوْمٍ كُفَّارٍ فَعَقَلَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عِنْدِهِ) (الحديث ٣١٧٣، أطرافُهُ في: ٢٧٠٢، ٦١٤٣، ٦٨٩٤، ٧١٩٢)[٣٣٤].

(٣٣٤) وأخرجهُ مسلم في الحدود (عيني/١٥/٩٦) - المترجم.

سەهلی کوڕی ئەبو خەیثەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی سەهل‌و موحەییصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەچن بۆ خەیبەر، خەیبەر ئەو سەردەمە ئاشت‌و بێ شەڕو شۆڕ دەبێ،و لەوێ بەناو باخە خورماکان دا بڵاو دەبنەوە لەوێ عەبدوڵڵایان دەکوژرێ، کە موحەییصەی ئامۆزای دەیدۆزێتەوە دەبینێ لەخوێنی خۆیدا گەوزاوە، جا لەوێ دەینێژی‌و دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە. وەگومان دەخەنە سەر جولەکەکان، جا عەبدوڕەحمانی برای کوژراوەکەو دوو ئامۆزای -کە حوەییصەو موحەییصە بوون- هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) جا عەبدوڕەحمان کەبەتەمەن لەوان بچوکتر بوو، ویستی باسی کوشتنی براکەی بکا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕێزی لەخۆت گەورەتر بگرە) دووجار وای فەرموو، ئەویش بێ دەنگ بوو، جا ئەوان باسی داستانی کوشتنی ئامۆزاکەیانیان کرد، پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) : فەرمووی: (پەنجا کەس لەئێوە سوێند بخۆن لەسەر پیاوێ لەوان کەئەو بەرپرسە لەم کوشتنە، ئەو پیاوە پەت دەکرێ‌و دەدرێتە دەستی ئێوە، لەباتی کوژراوەکەتان بیکوژنەوە).

گوتیان: قوربان! شتێ کەبەدیاریەوە نەبووین چۆن لەخۆمانەوە سوێندی لەسەر بخۆین، شتی‌وا ناکەین. فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (کەواتە جولەکەکان پەنجا کەسیان سوێندتان بۆ دەخۆن بەوە پاکانەتان بۆ دەکەن، وخۆیان بەوە دەپەڕێننەوە!). گوتیان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هۆزێکی بێ باوەڕن وەدەربەستی سوێندو سوێندکاری نایەن، سوێندی ئەوانە کوا بایەخی هەیە.

جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بۆ بەرژەوەندی گشتی بۆ بنەبڕکردنی ئاژاوە خۆی لەوشتری زەکات خوێنی کوژراوەکەی دا) (تاج/٣/ل-٢٢٥ز-٨٦- باسی پاکانە(قەسامە) + (فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٨٠٠. باسی پاکانە(قەسامە).

سەهلی کوڕی ئەبو خەیثەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، ڕاستتر ئەوەیە کەلەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) ، تەمەنی شەش حەوت ساڵانە بووە، وەلەهاوڕێ بچوکەکانە، ڕیوایەتی لەپێغەمبەرەوە هەیە، سەهل لەبوخاری دا سێ فەرموودەی هەیە.

١٢٨٣- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُحِرَ حَتَّى كَانَ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ صَنَعَ شَيْئًا وَلَمْ يَصْنَعْهُ) (الحديث ٣١٧٥، أطرافُهُ في: ٣٢٦٨، ٥٧٦٣، ٥٧٦٦، ٦٠٦٣، ٦٣٩١) (انظر: رقم: ١٣٢١ت=٣٢٦٨ف) (٣٣٥).

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) جادوی لێ کرا تەنانەت شتی وا هەبوو کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیکردبوو بەڵام بەخەیاڵ وای دائەنا کە ئەو شتەی کردووە.

١٢٨٤- عنْ عَوْف بْنَ مَالِكٍ قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ فَقَالَ اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ مَوْتِي ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ ثُمَّ مُوْتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا ثُمَّ فِتْنَةٌ لا يَبْقَى بَيْتٌ مِنْ الْعَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْهُ ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا) (الحديث ٣١٧٦) (٣٣٦).

عەوفی کوڕی مالیك فەرمووی: لەغەزای تەبووکا چوومە خزمەتی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو چاتوڵێکی چەرمینا بوو فەرمووی: (لەبەردەمی هەڵسانی قیامەتەوە ئەم شەش نیشانەیە بژمێرە: یەکەم:

---

(٣٣٥) لاحظ ماجاء في خاتمة كتاب الجهاد والسير في الفتح – المترجم.

(٣٣٦) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عوف في الملاحم – فتح/٦/٢٨٥ – المترجم.

مردنــی مــن، دووەم: گــرتنو ئــازادکردنی بەیتولمەقـدیس (خانــەی خــاوێن: خانەی پیرۆز) ، ئەوجا قڕە مردنێـکتان تێ دەکـەوێ وەك رانـێ پـزوو بگـرێ ئـاوا، یـا گەلـەیێ مافەتـە لـێ ی بـدا ئـاوا، ئـەوجا مـاڵ بەجۆرێـکی وا دەبـێ بەلێـشاو، پیـاوی وادەبـێ سـەد لـیرەی زێـڕی دەدرێتـێ کەچـی هێـشتا هـەر لووتەلایـەو، نارازییـەو لـێی دەتـۆرێ، ئینجـا فەرتەنـەیێ بـەرپا دەبـێ مـاڵی عەرەب نامێنێ کەسەری پیادا نـەکا، ئـەوجا لـەنێوانی ئێـوەو لـەنێوانی رۆم دا پێـکهاتنو شـەڕ وەسـتانێ دەبـێ، بـەڵام لەئـەنجاما ئـەوان ناپـاك دەردەچـنو پەیمان دەشـکێنن و، بەهەشـتا لەشـکرەوە دێـن بۆسـەرتان، کـە هـەر لەشـکرەی ئـاڵای تایبـەتی خـۆی هەیـەو هەمووئاڵایـەکیش دوازدە هـەزار کەسـی لـەژێر فەرمان دایە) (تاج/١٠ل –٢٧٨فـ٩).

عــەوفی کــوڕی مــالیکی ئەشــجەعی (رەزای خـوای لـێ بـێ) یەکــەم شــەهیدگا کــە ئامادەی بووە خەیبەرە، لەرۆژی ئازادکردنی خەیبەردا ئـاڵای هـۆزی ئەشـجەع بەو بوو، لەشـام نیـشتەجێ بـوو، لەبوخاری دا یـەك فـەرموودەی هەیـە، راوی لەچینی دووەمـی موسـوڵمانان زۆرە، ئـەبوهورەیرەش ریوایـەتی لێـوە ئـەنجام داوە،ساڵی حەفتاو سێی کۆچی لەسـەردەمی عەبدولـمەلیکی کوڕی مـەروان دا کۆچی دوایی کردووە –رەزاو رەحمەتو دروودی خودای لـێ بێ-.

١٢٨٥– عنْ أبي هريرة (رضي اللهُ عنْهُ) قالَ: كيف أنتم إذا لم تجتنبـوا دينـاراً ولا درهمـــاً؟ فقيـــل لـــهُ وكيـــف تـــرى ذلـــك كائنـــاً يـــا أبـــا هريـــرة؟ قالَ: إي والذي نفسُ أبوهريرَةَ بيدِهِ، عنْ قولِ الصادق المصدوق، قالوا: عـمّ ذاك؟ قالَ: تُنتهكُ ذمةُ الله وذمّة رسولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فيشدّ الله عزّو جل قلوب أهلِ الذّمَةِ، فيمنعون ما في أيديهم.) (الحديث: ٣١٨٠) [٣٣٧].

---

٣٣٧) انظر مسلم، كتاب الفتن وأشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات، رقم: ١٧٣٦.

ئـەبوهورەيرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: (دەبـێ وەزعتـان چـۆن بـێ ئـەو سـەردەمەی کـە نـە سـەرانەو نەخـەراجی دینـارو درەمتـان دەسـت دەکـەوێ؟) عەرزی ئەبوهورەیرە کرا: قوربان! جا بە بۆچونی تۆ ئەوە چۆن روو دەدات؟ فەرمووی: بەڵێ ئەو کەسە کەگیانی منی وا لەدەستا ئەمە قسەی من نیە بەڵکو فەرمایشتی ئەو پێغەمبەرە نازدارەیە، کە خۆی راستگۆو جوبرائیلیش هەمیشە قسەی راستی بۆ کردووە) گوتیان: باشە هۆی رودانی ئەم بارودۆخە چییە؟ فـەرمووی: نافـەرمانیو بـێ فەرمانیـەکی زۆری خـودا دەکـرێ رێـزی پەیمانی خوداو پەیمانی پێغەمبەری خودا، وەك پێویست نـاگیرێ، جا خودای باڵادەستو خاوەن شکۆ دڵی ئەهلی نیممە رەق دەکاو دڵیان قایم دەبێ، ئـیتر ئـەو سـەرانەو خەراجـەی لەسـەریانە نایـدەن) (تـاج/١٠ل-٢٧٨ف-٧- نیـشانەی داهاتنی قیامەت).

١٢٨٦- عنْ عبد الله وعنْ انس (رضي اللهُ عنْهُما) عنِ النبيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: (لكلِّ غادر لواءٌ يومَ القيامةِ، قالَ أحدُهما: يُنصَبُ، وقالَ الآخرُ: يومَ القيامةِ، يعرفُ بهِ) (الحديثان: ٣١٨٦، ٣١٨٧).

عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعودو ئەنـەس (ڕەزای خوایـان لـێ بـێ) فـەرموویان: پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (لـەرۆژی قیامەتـدا، لەئێـستگاکانا بـۆ هەموو ستەمگەرو بێ پەیمانێ، ئاڵایەکی تایبـەتی خـۆی هەیـە، لـەدیار سـەری بۆی هەڵدەکرێ هەتا پێی بناسرێتەوەو ریسوا ببێ، بانگەواز هەڵدەدرێ ئەمـە نیشانەی ناپاکیو پەیمان شکێنی ئەم کابرایەیە) (تاج/٣/٢٧٥-٧- باسی پـەیمان -ز-١٠٤) +(تاج/٨/١٣٢ز-٥٥).

## پایانێ (خاتمة)

پێشەوا (الحافظ أحمد بن علی بن حجر العسقلاني) لێرەدا دەفـەرموێ: باسەکانی پێنج یەكو سەرانەو نەشەڕو نەجەنگ، سـەدو شـازدە فـەرموودەی بـەرزەوەبووی واتیـادا حەڤـدە رێـگەیان بێڕشتەن ئـەوانی تریـان پەیوەسـتن

دووبارەکانیان شەستو حەوت فەرموودەیە، پوختەکەیان: (١١٦-٦٧=٤٩) چل‌و نۆ فەرموودەن، موسلیمیش وەك مامۆستای بوخاری هەموویانی دەرهێناوە، بێجگە لەمانەیان:

١- فەرموودەکەی ئەنەس: (صفةُ نقش الخاتم = ٣١٠٦ فتح).

٢- فەرموودەکەی ئەنەس: (أخرج نعلين جرداوين: ١٢٥٩ت=٣١٠٧ف).

٣- فەرموودەکەی ئەنەس: (.. مكان الشعب سلسلةً من فضّة = ١٢٦١ت= ٣١٠٩ف).

٤- فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە: (ما أعطيكم ولا أمنعكم =١٢٦٣ت =٣١١٧ف).

٥- فەرموودەکەی خەولەی ئەنصارییە: (إنّ رجالاً لايخوضون =١٢٦٤ت = ٣١١٨ف).

٦- حديث تركة الزبير: (٣١٢٩فتح). لەتەجریدەکەدا نییە. بڕوانە: (ریاض صالحين. بەرگی یەکەم لاپەڕە: ١٨٦ چاپی دووەم. زنجیرە: ٢٥. باسی فەرمان کردن بەدانەوەی ئەمانەت فەرموودەی ژمارە: ٢٠٢/٤).

٧- حديث سؤال هوازن من طريق عمرو بن شعيب، بڕوانە پێش ژمارە: ٣١٣١ لەگەڵ شەرحی (ما سأل هوازن النبيّ (صلّى الله عليه وسلّم) برضاعِهِ ص٣٦٧ج/٦).

٨- حديث إعطاء جابر من تمر خيبر (بڕوانە: پێش ژمارە: ٣١٣١ فتح).

٩- فەرموودەی: (لم يعتمر من الجعرانة) =٣١٤٤ ف.

١٠- فەرموودەی: (كنّا نصيبُ في مغازينا العسل) =١٢٧٥ ت = ٣١٥٤ ف

١١- حديث عبد الرحمن بن عوف في المجوس وحديث عمر فيه (١٢٧٦ ت = ٣١٥٦ف).

١٢- حديث (من قتل معاهداً = ١٢٨٠ ت = ٣١٦٦ ف).

١٣- حديث ابن شهاب فيمن سحر: (تەعلیقەکەی ابن وەهەب وا لەپێش ٣١٧٥ فەتحەوە).

١٤- حديث عوف في الملاحم= (١٢٨٤ تجريد = ٣١٧٦ فتح).

١٥- فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە: (كيف أنتم إذا لم تجتنبوا..= ١٢٨٥ ت =٣١٨٠ ف).

هەروا دەفەرمویٚ: بیست بیستراو -أثر- یشی واتیادا. بڕوانە: بەرگی /٣ل-٨٨٧ز-٣٥٠ هەتا-ل-٨٩٦ز —٣٥٦.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٦٣- نامەی سەرەتای دروستبوان (مەخلوقات)

# (كتاب بدء الخلق)

١٢٨٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ جَاءَ نَفَرٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (يَا بَنِي تَمِيمٍ أَبْشِرُوا) قَالُوا: بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا فَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ فَجَاءَهُ أَهْلُ الْيَمَنِ فَقَالَ: (يَا أَهْلَ الْيَمَنِ اقْبَلُوا الْبُشْرَى إِذْ لَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ) قَالُوا: قَبِلْنَا فَأَخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحَدِّثُ بَدْءَ الْخَلْقِ وَالْعَرْشِ فَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا عِمْرَانُ رَاحِلَتُكَ تَفَلَّتَتْ لَيْتَنِي لَمْ أَقُمْ) (الحديث ٣١٩٠، أطرافُهُ في: ٣١٩١، ٤٣٦٥، ٤٣٨٦، ٧٤١٨) [٣٣٨].

عیمرانی کوڕی حوصەین(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) لەبەردەمی مزگەوتەکەدا وشترەکەمم ئەشکێل کرد، کۆمەڵێکی بەنی تەمیمی هاتن بۆ خزمەتی، فەرمووی پێیان: ئەی هۆزی بەنی تەمیم! لەپیتو فەڕو پیرۆزی ئیسلامەوە، موژدەی بەهەشتو پایەی بەرزتان دەدەمێ! بەشارەتو مزگێنی وەربگرن) گوتیان: موژدەت پێ داوین موژدانەکە چییە بماندەرێ!

دووجار پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئاوای پێ فەرموون: ئەوانیش لەمەبەستەکەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تێ نەگەیشتنو ئاوایان وەڵام دایەوە. لەوەڵامەکەیان رووی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) تێك چوو، ڕەنگی پەستی لێ نیشت لەپاشا کۆمەڵێ لەخەڵکی یەمەن هاتنە خزمەتی، کەئەبوموسای ئەشعەریو هاوڕێکانی بوون، پێی فەرموون: (ئەی خەڵکی یەمەن کەبەنی تەمیم! موژدەیان قەبووڵ نەکرد ئێوە قەبووڵی بکەن)

---

(٣٣٨) لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٦ص٣٦٠ + ص٥١٨ — طبعة جديدة) — المترجم.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە قەبوڵمانە وا ئەو موژدەیەمان وەرگرت، ئیتر پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەستی کرد بەباسکردنی دروستبوونی بوونەوەرو عەرش و بارەگای خودا، لەم دەمەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی عیمران! وشترەکەت بەربووەو بەلەسە بووە، فریای کەوە منیش کۆڕەکەم بەجێ هێشت و چووم بۆ وشترەکەم، خۆزگە مەجلیسەکەی پێغەمبەرم بەجێ نەهێشتا بۆ وشترێ و، بەتەواوی فەرمایشتەکانیم گوێ لێ بوایە). (تاج/١٠ل-١٩٨ز-٨٥- باسی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر. ف-١).

١٢٨٧م- وعَنْهُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) في روايةٍ: (قَالَ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَقَلْتُ نَاقَتِي بِالْبَابِ فَأَتَاهُ نَاسٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ فَقَالَ: اقْبَلُوا الْبُشْرَى يَا بَنِي تَمِيمٍ قَالُوا قَدْ بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا مَرَّتَيْنِ ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْهِ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ اقْبَلُوا الْبُشْرَى يَا أَهْلَ الْيَمَنِ إِذْ لَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ قَالُوا قَدْ قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالُوا: جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ هَذَا الأَمْرِ قَالَ: (كَانَ اللَّهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ وَخَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ) فَنَادَى مُنَادٍ ذَهَبَتْ نَاقَتُكَ يَا ابْنَ الْحُصَيْنِ فَانْطَلَقْتُ فَإِذَا هِيَ يَقْطَعُ دُونَهَا السَّرَابُ فَوَاللَّهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ تَرَكْتُهَا). (الحديث ٣١٩١، طرفهُ في: ٣١٩٠)[٣٣٩].

لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: عەرزیان کرد: قوربان! بۆیە هاتووینەتە خزمەتت کەبارودۆخی ئەم جیهانەمان تێ بگەیەنی، کەچۆن دروست بووە، فەرمووی: (لەپێش پێش سەرەتاوە تەنیا خودا هەر خۆی بووەو هیچی تر نەبووە، لەپاشا لەپێش درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دا، خودا ئاوو عەرشی دروستکرد، عەرشی خودا لەسەر ئاو بوو (واتە بێجگە لەعەرشی خوداو ئاو هیچی تر نەبوو) هەروا خودا لە تابلۆی

---

(٣٣٩) راجع رقم: ١٢٨٧- المترجم.

پارێزراودا واته: لەلەوحولمەحفوظدا، هەموو شتێ کەدروست دەکرێ، هەمووی نووسی، وەخودا ئاسمانەکان وزەوی لەنەبوون لەماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد).

عیمران فەرمووی: جێگەی داخە لەم وەختەدا بانگکەرێ بانگی کردم ئەی عیمران! وشترەکەت ڕۆیی ئیتر منیش بەشوێنیدا چووم، کەتەماشام کرد ناوی کردووەو تەواو دوورکەوتۆتەوە. سوێندم بەخوا حەزم دەکرد کە گوێم لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بگرتایەو هەقم بەسەر وشترەکەوە نەبووایە) (بڕوانە: ژ-١٢٨٧+تاج//٦ل-٢٤٠ز-١٢ف-٢).

١٢٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُرَاهُ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (يَشْتِمُنِي ابْنُ آدَمَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَشْتِمَنِي وَيُكَذِّبُنِي وَمَا يَنْبَغِي لَهُ أَمَّا شَتْمُهُ فَقَوْلُهُ: إِنَّ لِي وَلَدًا وَأَمَّا تَكْذِيبُهُ فَقَوْلُهُ لَيْسَ يُعِيدُنِي كَمَا بَدَأَنِي) (الحديث ٣١٩٣، طرفاهُ في: ٤٩٧٤، ٤٩٧٥) [٣٤٠].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورە دەفەرموێ: ئادەمیزاد رادەی ئەوەی نییە کە جنێو بەمن بدا، یامن بەدرۆ بخاتەوە، کەچی دەچێ شتی وا دەکا، ئەوەیان کە جنێو بەمن دەدا ئەو قسەیەتی کەدەڵێ: گوایە من منالّم هەیە! ئەوەیشی کەمن بەدرۆ دەخاتەوە ئەو قسەیەتی کەدەڵێ: گوایە من ناتوانم لەپاش مردنی وەك جارانی، سەرلەنوێ دروستی بکەمەوە) (تاج/٦ل-١٤ز-٢).

(٣٤٠) روى البخاري –رحمه الله تعالى- هذا الحديث على ما جاء في فتح الباري في ثلاث مواضع عن أبي هريرة هنا (٣١٩٣) وفي التفسير رقم: ٤٩٧٤، رقم: ٤٩٧٥. ومن الغريب انه قال العسقلاني، في خاتمة كتاب التفسير: (لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث ابن عباس: كذبني إبن آدم). (فتح/٨/ص٧٤٣- المترجم).

١٢٨٩–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (لَمَّا قَضَى اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي) (الحديث ٣١٩٤، أطرافُهُ في: ٧٤٠٤، ٧٤٢٢، ٧٤٥٧، ٧٥٥٣، ٧٥٥٤) [٣٤١].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) دەفەرمویْ: (کاتێ خودای گەورە بڕیاری دا ئەم بوونەوەرە دروست بکا، لەنامەیەکا نووسی رەحمەتو میهرەبانی مـن پێش رقو خەشمم دەکەوێ، بەحری رەحمەتم هەرکاتێ هاتە جۆشو خرۆش، ئاگرو بڵێسەی کورەی رقو غەضەبم دەکوژێنێتەوە، وەئەو نامەیەش کەئەمەی تیا نووسراوە لەلای خودا خۆیەتی، لەسەرو تەختو بارەگا(عەرشە) وە داینـاوە!) (تاج/ل- ٣٧ز –٦- باسی باوەڕ بەچارەنووس-ش/ت).

١٢٩٠– عَنْ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ الزَّمَانَ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ثَلاثٌ مُتَوَالِيَاتٌ ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ) (الحديث ٣١٩٧، أطرافُهُ في: ٦٠ ت= ٦٧ ف= بەرگی یەکەم لاپەڕە/٨٦) [٣٤٢].

ئەبوبەکرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (چەرخ چۆتەوە دەوری جارانی خۆیو زەمـان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەی خۆی، کە خودای گەورە ئاسمانەکانو زەوی دروست کرد و، شەوو رۆژو مانگو ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بوەتەوە بەدوانزە مانگو هەموو مانگی لەدوانزە مانگەی خوا کەوتۆتەوە شوێنی راستەقینەی خۆیو نەسیئ نەما، وەك سەردەمی پێغەمبەرەکان (درودی خوا لەپێغەمبەری خۆشمانو لەوانیش

(٣٤١) أخرجهُ مسلم في التوبة، باب: في سعة رحمة الله تعالى... رقم: ٢٧٥١.

(٣٤٢) راجع رقم: ٦٧ ت =٦٧ ف – المترجم.

بێ) ئەوەی ڕەوایە بووەتەوە بەڕەواو ئەوەی ناڕەوایە بووەتەوە بەناڕەوا، وەئەو گۆڕان‌و دەستکاری شەریعەتە کەلەسەردەمی نەزانی دا کرابوون، راست کرانەوە.

وەئەم مانگانە چواریان مانگی حەرامن‌و خاوەن ڕێزو قەدرو نرخن‌و لەبەر ئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر تیا حەرامە، وە لەم چوار مانگە سێیان بەرودوان‌و بەشوێن یەکا دێن کەناوجەژنان‌و نۆمینەو موحەڕەمن، ئەوی تریشیان کە تەنیایە مانگی ڕەجەبە کە ناودارو ناسراوە بەرەجەبی هۆزی موضەر، لەبەر ئەوەی کە هۆزی موضەر زۆر ڕێزی دەگرن، کە دەکەوێتە بەینی جومادای دووهەم‌و کوڵەمانگەوە) (تاج/٢/ل-٢٢١ف-٣ز-١١٢-وتاری رۆژی جەژن).

١٢٩١- عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّٰمَ) لأَبِي ذَرّ حِينَ غَرَبَتْ الشَّمْسُ: (أَتَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ؟) قُلْتُ: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: (فَإِنَّهَا تَذْهَبُ حَتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَسْتَأْذِنَ فَيُؤْذَنُ لَهَا وَيُوشِكُ أَنْ تَسْجُدَ فَلا يُقْبَلَ مِنْهَا وَتَسْتَأْذِنَ فَلا يُؤْذَنَ لَهَا يُقَالُ لَهَا: ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾). (الحديث ٣١٩٩، أطرافه في: ٤٨٠٢، ٤٨٠٣، ٧٤٢٤، ٧٤٣٣)[٣٤٣].

ئەبوذەڕ(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاوابوونی خۆردا، لەمزگەوت لەخزمەتی خۆشەویست دا بووم فەرمووی: (ئەی ئەبوذەڕ! دەزانی کە ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێ‌و لەکوێ ئاوادەبێ؟) گوتم: خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن.(بڕوانە: تاج/٢/ل-٢٨٧ فـ ٢٠ز ١٠٥).

---

(٣٤٣) اخرجهٔ مسلم في الإيمان، باب: بيان الزمن الذي لايقبل فيه الإيمان، رقم: ١٥٩. (بڕوانە: تاج/١٠/ل- ٢٨١ز — ١٠٥ فـ ١٢ ).

فەرمووی: (ئەم خۆرە هەروا دەڕواتو، هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی دەچێت لەژێر عەرشا کورنوش و نووچ دەباو داوا لەخودا دەکاتەوە: کە دیسانەوە ڕێگای پێبداتەوە تا لەشوێنی خۆیەوە هەڵبێتەوە، هەر لەکورنوشدا دەبێ تا خودا ڕێگەی پێدەداو سەر لەنوێ، وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵدێتەوە، بەڵام هاکا ئەو ڕۆژە هات کە خۆر دەچێ وەك جاران کورنووش دەباو لێ ی قەبوڵ ناکرێو داوای ڕوخصەت دەکا، کەوەك جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵبێتەوە، خودا ڕێگەی ئەوەی پێناداو دەفەرموێ پێی: بەسەر شۆپی خۆتا ڕێك بگەڕێرەوە دواوە، لەو شوێنەوە هەڵبێ کەلێ ی ئاوا بووی، ئیتر خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ، مەبەست ئەمەیە لەو ئایەتەی قورئان کەدەفەرموێ: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ یسین-٣٨/٣٦- واتە: خۆر لەسەر ئەم یاسای هاتوچۆی خۆیە کەئێستا هەیە، هەموو ڕۆژێ بەرێکوپێکی بەردەوام دەبێو دێو دەچێو، لەخۆرهەڵاتەوە هەڵدێو لەخۆرئاواوە ئاوا دەبێ). (تاج/٧ل-١١٤ز ١٩ف-٢-سوورەتی یاسین).

١٢٩٢–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ مُكَوَّرَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) (الحديث ٣٢٠٠)[٣٤٤].

**ئەبوهورەیرە**(ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (لەرۆژی قیامەتا خۆرو مانگ دەپێچرێنەوەو لوول دەدرێنو ڕووناکیان نامێنێ!!) (بڕوانە: باسی نیشانەکانی هاتنی قیامەت= تاج/١٠ل-٢٧٤ز-١٠٥).**

١٢٩٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِذَا رَأَى مَخِيلَةً فِي السَّمَاءِ أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ وَدَخَلَ وَخَرَجَ وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ فَإِذَا أَمْطَرَتْ السَّمَاءُ سُرِّيَ عَنْهُ فَعَرَّفَتْهُ عَائِشَةُ ذَلِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :

---

(٣٤٤) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (تكور الشمس والقمر) (فتح/٦ص ٣٦٠ +ص٥١٨ طبعة جديدة) — المترجم.

(مَا أَدْرِي لَعَلَّهُ كَمَا قَالَ قَوْمٌ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ الآيَةَ) (الحديث ٣٢٠٦، طرفُهُ في: ٤٨٢٩) [(٣٤٥)].

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: قەت نەمدیووە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وا پێبکەنێ، کە زمانە بچکۆلەی دەربکەوێو دەم دابچەقێنێو بدا لەقاقای پێکەنین! بەڵام بەسەلاری بەزەردەخەنەوە پێدەکەنی.

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ هەور یابا هەڵی دەکرد، ڕەنگی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەگۆڕا خێرا خێرا جێگۆڕکێی دەکردو دەهاتە ژوورەوەو دەچووە دەرەوە، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خەڵك کەهەور دەبینن خۆشی دەکەن، بەئومێدی ئەوە کەبارانی پێوە بێ، کەچی دەبینم تۆ کەهەور دەبینی خەمو پەژارە لەرووت دیارە؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! دەترسم کەئەوە هەوری مەینەتو سزابێ، عادی هۆزی هوود (سەلامی خوای لێ بێ) کاتێ سزاکە هاتە سەریانو بەچاوی خۆیان شەپۆلی باو، گەردەلوولەکەیان دی چاویان بەبەرایی سزاکە کەوت. گوتیان: ﴿هَـٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾-٢٤/٤٦- واتە: ئەمە هەوری بارانە، بارانمان بۆ دەبارێنێ، بەڵام ئەو هەورە هەوری باران نەبوو، بەڵکوو هەوری غەزەب بوو، سزایەکی سەخت بوو).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە مەبەست لێ ی ئەمە بوو کەنووسیمان وەك زاناکان دەفەرموون: (الحديثُ يفسِّرُ بعضُهُ بعضاً) ئەمە دەقی ڕیوایەتێکی تری ئەم فەرموودەیەیە کە ژمارەکەی لە (فتح الباري) دا (٤٨٢٩) یە، کەطەرەفی ئەم فەرموودەیەیە. (بڕوانە: تاج/٧ل-١٣٨ز-٢٩ف-٢- سوورەتی ئەحقاف).

(٣٤٥) أخرجهُ مسلم في القدر، باب: كيفية خلق الآدمي في بطن أمه، رقم: ٢٦٤٣.

١٢٩٤- عنْ عَبْدُ اللّٰهِ بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قال: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَبْعَثُ اللّٰهُ مَلَكًا فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ وَيُقَالُ لَهُ اكْتُبْ عَمَلَهُ وَرِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ فَإِنَّ الرَّجُلَ مِنْكُمْ لَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ كِتَابُهُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ وَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ إِلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ). (الحديث ٣٢٠٨، أطرافُهُ في: ٣٣٣٢، ٦٥٩٤، ٧٤٥٤) [٣٤٦].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری ڕاستگۆ کە فەرمایشتی جێی باوەڕە، دەفەرموێ: هەریەکێ لەئێوە کە خودا دروستی دەکا چل ڕۆژ بەتۆمەیی (نوطفەیی) لەسکی دایکیا کۆدەکرێتەوەو، دەمێنێتەوە، ئینجا بەچل ڕۆژی تریش دەبێ بەپارچە خوێنێکی مەییو، ئنجا بەچل ڕۆژی تریش دەبێ بەپارچە گۆشتێ بەقەد پارووێ، ئنجا گیانی بەبەردا دەکرێ، جا خودای گەورە فەرمان دەکا بەو فریشتەیە کە گیان دەکا بە بەریا ئەم چوار وشەیە بنوسێ:

یەکەم ڕزق‌و ڕۆزی ئەم مناڵە چییەو چی نییە. دووەم: ئەجەل‌و ئاکامی کەیەو کەی نییە، سێیەم: کارو کردەوەی، چوارەم: بەدبەخت‌و بەدکار دەبێ یاکامەران‌و بەختیار دەبێ، دەسا بەوتاقە خودایە، کەهەر خۆی خودایە، کەسی واهەیە کردارو ڕەفتاری وەك کردارو ڕەفتاری بەهەشتی وایە، لەخەڵك وایە بەهەشتییە، بەڵام نامەی چارەنووسی دەستپێشخەری لێ دەکاو دەست دەکا بەکردنی کاری خەڵکی دۆزەخ،و دەچێتە ناو دۆزەخەوە، کەسی واشتان هەیە بەکردارو ڕەفتار بێ لەدۆزەخی دەچێ، لەخەڵك وایە جەهەننەمییە،

(٣٤٦) اخرجهُ مسلم في القدر، باب: كيفية خلق الآدمي في بطن امه، رقم: ٢٦٤٣.

بەڵام نامەی چارەنووسی پێش دەستی لێ دەکا و، خاتیمەی بەخێر دەگەڕێو دەست دەکا بەکردنی کردەوەی باشو دەچێتە ناو بەهەشتو دەبێ بەبەهەشتی!) (تاج/١/ل-٤٠/ز-٦/ف-٤- باسی باوەڕ بەچارەنووس).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم جۆرە شوێنە، توێژینەوەیەکی دوورو درێژی دەوێ بەڵام کورتو پوخت مەبەست ئەمەیە: چارەنووسی خودایی سەرچاوەی هەموو بەسەرهاتو هەڵسووکەوتی بەندەیە، جا چارەنووس، واتە: قەدەر چییەو چۆنەو چۆن شتیوا دەبێ ئەوەش بابەتێکی زۆر دوورو درێژە، هەتا شەنو کەوی بکەی خەست تر دەبێ، چاری ئەوەیە بەبێ چەنو چوون خۆت بدەیتە دەست خواو، تەسلیمی قەزاو قەدەر بیو خواو پێغەمبەرانی خوا لەم بارەیەوە چیان فەرمووە، قەبوڵمانەو لەسەر چاوانە. من بەش بەحاڵی خۆم ئاوا لەچارەنووسی خودایی تێ دەگەم:

**پەپوولە پازدەی دەمی ڕەشەبا    هەر خوا بزانێ: با بۆ کوێت دەبا**

١٢٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَابَعَهُ أَبُو عَاصِمٍ عَنْ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ أَخْبَرَنِي مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ عَنْ نَافِعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحْبِبْهُ فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ) (الحديث ٣٢٠٩، طرفاهُ في: ٦٠٤٠، ٧٤٨٥) [٣٤٧].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ خوای گەورە بەندەیێکی خۆشویست بانگی جوبرائیل دەکا،و

(٣٤٧) وأخرجهُ مسلم في البرّو الصلة والآداب، باب: إذا أحبّ الله عبداً حبّبه إلى عباده، رقم: ٢٦٣٧.

دەفەرموێ: ئەی جوبرائیل! خودای گەورە فیسارە بەندەی خۆش دەوێ، دەی تۆیش خۆشت بوێ، ئیتر جوبرائیلیش خۆشی دەوێو جاڕ دەدا بەناو خەڵکی ئاسمانا خودا فیسارە بەندەی خۆش دەوێ، کەواتە ئێوەیش خۆشتان بوێ، ئیتر خەڵکی ئاسمانیش هەموو خۆشیان دەوێ، ئەوجا لەناو دانیشتوانی زەوی دا، رەزای سووكو شیرین دەبێو، بەشێوەی گشتی لەناو خەڵکی دا پەسەند دەکرێ.

وەکاتێ خودای گەورە رقی لەکەسێ بێ جوبرائیل بانگ دەکاو دەفەرموێ: من رقم لەفیسارە کەسە، دەی تۆیش رقی لێ بگرە، جوبرائیلیش رقی لێ دەگریو، ئەوجا بەئاسمانا بانگەواز دەکاو دەفەرموێ: خوای گەورە رقی لەفیسارە کەسە ئێوەش رقی لێ بگرن! ئیتر لەزەویشا رەزای تاڵ دەبێو، لەبەر چاوی خەڵك ئێسکی قورس دەبێ) (وەك زۆر لەکاربەدەستانی خۆمان خوا پەنامان بدا). (ریاض/١ل- ٣٠٢ف- ٣٨٧ز-٤٧- باسی نیشانەی خۆشەویستی خودا...) +(تاج/٧ ل-٢٥ز-٢ف-٨- باسی سوورەتی مەریەم).

١٢٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي جَعْفَرٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (إِنَّ الْمَلائِكَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنَانِ وَهُوَ السَّحَابُ فَتَذْكُرُ الأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ فَتَسْتَرِقُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ فَتَسْمَعُهُ فَتُوحِيهِ إِلَى الْكُهَّانِ فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ) (الحديث ٣٢١٠، أطرافُهُ في: ٣٢٨٨، ٥٧٦٢، ٦٢١٣، ٧٥٦١) [٣٤٨].

عائیشە (رەزای خوای لێ بێ) کەهاوسەری پێغەمبەرە(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەپێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (فریشتە لەناو هەورا دێنە

(٣٤٨) من المتفق عليه (رياض الصالحين ص ٣٠٣ –كوردى/٤ل-١٢١٢ز ١-) - المترجم.

خوارەوە، باسی کارێ دەکەن کە خودای گەورە لەئاسمان بەبوون یا بەنەبوون، بڕیاری لەسەر داوە، دێوەکانیش کەبەعەربی پێیان دەگوترێ: شەیاتینی گوێ هەڵدەخەن، بۆ گفتوگۆی فریشتەکان، کەباسی ئەو کارە دەکەن کە لەئاسمان بڕیاری لەسەر دراوە، وەجاروبار وارێ دەکەوێ ئەو جنۆکەو دێوانە قسەیە لەو بارەیەوە، لەدەمی فریشتەکان دەبیستن و دەیفڕێنن بۆ خۆیان، لەپاشا بەسرتە دەیچرپێنن بەگوێی برادەرەکانیانا، لەکوڵەنانی و فاڵچی و ئەمجۆرە غەیبچیانە، ئەوانیش لەگیرفانی خۆیانەوە سەد درۆی تری پێوە دەنێن، جا لەمەوەیە جاروبار قسەی ئەم کوڵەنانییانە راست دەردەچێ) (ریاض/٤ل-١٢٢١ ز- ٣٠٣ ف- ١ -باسی نەهی کردن لەهاموشۆکردنی کوڵەنانی و ئەستێرەگرەوەو فاڵچی +تاج/٤ل-٢٣٥ز ٧٩- باسی کاهینی و کوڵەنانی و دانەگرتنەوەو رەمڵ گرتنەوە).

### راڤەو شیکردنەوە:

یەکێ لەو موسیبەتانەی کە لەم رۆژگارەی ئێمەدا، تووشی ئیمانداران بووە، ئەم جۆرە بابەتانەیە کەبە زۆر شێوە سەریان هەڵداوە، بەتایبەتی بەناوی پێشبینی کردنی چۆنێتی دوارۆژی مرۆڤ بەناوی بورجەوە، یابەناوی قاوەگرتنەوەو فاڵگرتنەوەو خوێندنی لەپی دەستەوە ئەم جۆرە بابەتانە لەکەناڵە ئاسمانیەکانی راگەیاندنەوە لەسەر شێوەیەکی سادەو بەرچاو، سەرنجی خەڵکەکە رادەکێشێ و وا لە بڕواداری ساویلکە دەکا، کەلەخەوی خۆش و خەیاڵی مەستانەدا بژی، شەیتانیش وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا باس کراوە یارمەتی ئەم کەناڵە شەیتانیانە دەدا، بەمەبەستی سەر لێشێوان لەدەستەی بڕواداران، هەتا بەرەبەرە خەڵکەکە بەگشتی و ئەهلی دین بەتایبەتی بێنە سەر ئەو بیروباوەڕە کە دینیش شتێکە لەم بابەتە، بڕواداریش وەك دواکەوتوانی کوڵەنانی و فاڵچیان کەسێکە کە لەخەیاڵ

پلاودا دەژیو ئەوەی والەبەرچاو پالەوانانی ئەم جۆرە بابەتە شەیتانییانە، لەکۆنو نوێدا جوولەکەو لایەنگرانی جوولەکەن، وە زۆرینەی پێ هەلخەلەتاوانی ئەم جۆرە بیروباوەڕە چەواشەکارانە ژنانو لاوانی دواکەوتووی لەکاروان بەجێماوی بەئاوات نەگەیشتوون.

جا بەندەی دلسۆزو دوعاگۆی ئێوە عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەمو دەلێم: سوێندم بەخودا گوێگرتن لەلاژگە لاژگی ئەم کولەنانیو جووکیو فالچیو دانەوەگرانە، عەینی گومڕاییو سەرلێشێوانو گومڕاییە، مایەی خۆشنوودیو ڕەزامەندی شەیتانو دەستەی شەیتانە، وە هۆی توڕەبوونو قاری خوداو پێغەمبەری خودایە، وەئەوەی لەم سەردەمەی ئێمەدا پێی دەگوترێ: قاوەگرتنەوەو ناولەپ خوێندنەوەو بەخت گرتنەوەو بورجو تەنجیمو فالچیو قرائەتی موستەقبەلو شتی تری لەم بابەتانە، کە دوور نییە بەناوی تریشەوە سەرهەلبدەن، ئەمانە هەموو کەلەوەحی شەیتانن، زیانیان بۆ دینو دنیای هەموومان هەیە، ئەوەی دوای ئەم جۆرە کردارانە بکەوێ لەخوا لە پێغەمبەر، لەئایینی پیرۆزی ئیسلام دوور دەکەوێتەوە، نیشانەی درووستی ئەم قسەیەیش، سەرەرای فەرموودەی راستو دروستی زۆر، ئەمەیە:

(کەنالەکانی راگەیاندن، چ دەنگ، چ ڕەنگ، چ تۆمارو نووسین، بەتایبەتی ئەوانەیان کە عەلمانین و، زمانیان بڕی قسەی خێر بۆ ئایینو پەیڕەوانی ئایین ناکەن بەتایبەتی ئەم جۆرە کەنالە لەخوا دوورانە، زۆر زۆر گرنگی بەم بابەتە شەیتانییانە دەدەن، وەلەسەر شێوەیەکی رازاوەو دلگیرو سەرنج ڕاکێش، پڕوپاگەندەیان بۆ دەکەنو برەویان پێدەدەنو پێشکەشیان بەجەماوەر دەکەن! ).

بەراستی لەم سەردەمەدا ئەم جۆرە بابەتە سیحر ئامێزانە بوون بەتلیاکو بەنگی سڕکەری جەماوەرە ساویلکەکە، هەتا سەرۆک کۆمارە

ملهوڕەکانو سەرەك پارتە شەیتانییەکان بەمەیان زانییوە، لەبەر ئەوە لەم لایەنەوە ایحاء بۆ جەماوەرە قوڕ بەسەرەکە دەکەن: کە وەك ران شوێن ئەوان بکەون بیر لەهیچی تر نەکەنەوە!! چونکە ئەستێرەی بەختی بەڕێزی لەگەشانەوەدایە!!

١٢٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ الْمَلَائِكَةُ يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوْا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ) (الحديث ٣٢١١، طرفُهُ في: ٩٢٩) [٣٤٩].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ ڕۆژی هەینی دێ لەبەر دەرگاکانی هەموو مزگەوتێ فریشتە ئامادە دەبنو قەڵەمو دەفتەر بەدەستەوە دەگرن، یەك لەدوای یەك بەڕیز ناوی ئەوانە دەنووسن کەدێن بۆ نوێژی هەینی، تا ئەوکاتەی کە پێشنوێژ دێو دەچێتە سەر دوانگە، ئیتر ئەوانیش دەفتەرەکانیان دەپێچنەوەو،دەچن گوێ لەووتارەکەی دەگرن!) (بڕوانە: تاج/١ل –٤١٨ ز –١٤٣ ف -٢-. نوێژی هەینی + ریاض/٢/٨٧٧ ز –٢١٠ فـ ٩).

١٢٩٨- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِحَسَّانَ: (اهْجُهُمْ أَوْ هَاجِهِمْ وَجِبْرِيلُ مَعَكَ) (الحديث ٣٢١٣، أطرافُهُ في: ٤١٢٣، ٤١٢٤، ٦١٥٣).

بەراء(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەحەسانی کوڕی ثابیتی دەفەرموو: (ئەی حەسان! بەشیعری هەجو دەستەی بێباوەڕان شڕ بکە و، بەتانەو تەشەر دایان شۆرە، لەم کارە پیرۆزەداکە لەبەرژەوەندی ئیسلامەو لەزیانی بێباوەڕانە، جوبرائیل بەفەرمانی خودا

(٣٤٩) انظر: (صم/٦ص ١٤٥، باب: فضل التهجير يوم الجمعة) - المترجم.

لەگەڵتەو پشتت دەگرێ) (بڕوانە: تاج/٥ل- ١٩٠ ز- ٥٧ ف- ٢- باسی چاکێتی حەسانی کوڕی ثابیت+ تاج/٥ل- ١٩٤ ف -٥ ز-٥٧).

١٢٩٩-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهَا: (يَا عَائِشَةُ هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلامَ) فَقَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ تَرَى مَا لا أَرَى تُرِيدُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٣٢١٧، أطرافُهُ في: ٣٧٦٨، ٦٢٠١,٦٢٤٩، ٦١٥٣) (٣٥٠).

**عائیشە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **پێی فەرمووم: (ئایشێ! ئەمە جوبرەئیلە تەشریفی هاتووە بۆلای من سڵاوت لێ دەکا) منیش گوتم: (وعليه السلام ورحمةُ اللهِ وبركاتُهُ: سڵاوو ڕەحمەتو پیتو پیرۆزییەکانی خودا لەسەر ئەویش بێ. تۆ ئەی پێغەمبەری خودا! گەلێ شتی وا دەبینی کەبەمن نابینرێ) (تاج/١٥٤/٥ ز- ٣٧).**

١٣٠٠- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِجِبْرِيلَ: (أَلا تَزُورُنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟) قَالَ: فَنَزَلَتْ ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا﴾ الآيَةَ) (الحديث ٣٢١٨، طرفاهُ في: ٤٧٣١، ٧٤٥٥) (٣٥١).

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست**(درودی خوای لەسەر بێ) **بە جوبرائیلی فەرموو: (ئەوە بۆچی نافەرمووی زیاتر بێی بۆ دێنیو سەردانمان!) فەرمووی: جا بۆ وەڵامی ئەم پێشنیارەی خۆشەویست ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ مريم ٦٤/١٩ واتە:**

---

(٣٥٠) أخرجهُ مسلم في فضائل الصحابة، باب: في فضل عائشة....، رقم: ٢٤٤٧.

(٣٥١) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عباس في زيارة جبريل (فتح/٦ص٣٦٠ أوص ٥١٨ طبعة جديدة) — المترجم.

ئەی خۆشەویست! ئێمە بەبێ فەرمانی خودای گەورە نایەینە خوارەوە، هاتنی ئێمەی فریشتە گەل بۆ خزمەتی تۆو پێغەمبەرانی پێش تۆ بەدەست خۆمان نییەو لەسەر فەرمانی خودایە، لەئەزەل هەتا ئەبەد، لەسەرەتا هەتا کۆتا، کاروباری هەردوو جیهان لەراستیدا وا لەدەستی خودادا و، خودا خۆی هەمووی زۆر بەباشی دەزانیو ئەم بوونەوەرە هەمووی بەبێ جیاوازی، موڵكو دروستکراوی خۆیەتی، ئاگای لەهەموویەتی هیچی لێ ون نابێ، گەردێ بەرووی بەردێکی ناو هەردێکی ناو ریزە چیاو شاخو هەڵەتو هەزار بەهەزارەوە، لەعیلمی خودا دا چوون یەکە لەگەڵ کۆمەڵەی رۆژیدا، لەناو کاکەشانی خۆیدا.

ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! کەدرەنگ دێین بۆ خزمەتت حیکمەتو دانایی خودایی واتیادا، خودا هیچی لەبیرناچێ هەموو شتێ والە زانستی خودادا،و جێگەو رێگەی دیاری بۆ دانراوە، خودا داناو زانایە بەهەموو شتێ) (تاج/ ٥ ل- ٢٢ز -٢- سوورەتی مەریەم. ف-٤. لەتاجەکەدا هەڵەیەکی چاپ هەیە، خوا یاربێ لەچاپەکانی ئاییندەدا راست دەکرێتەوە).

١٣٠١- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ) (الحديث ٣٢١٩، طرفُهُ في: ٤٩٩١) [٣٥٢]

ئیبنو عەبباس(رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (جوبرائیل لەسەر یەك شێوە(شێوە، حەرف، قیرائەت) قورئانی پێ دەخوێندم، منیش هەمو جارێ هەر داوام لێ دەکرد، کە شێوەکانم بۆ زیاد بکا، ئەویش هەر بۆی زیاتر دەکردم، هەتا لەئەنجاما لەسەر فەرمانی خودا خۆی، ژمارەی شێوەکانی خوێندن(قیرائەت) ی قورئان لەسەر حەوت شێوەی جوان کۆتاییان پێهات). ش-(تاج/٥ ل-٣٢٥ ز-٩٣- شێوەکانی خوێندنی قورئان).

(٣٥٢) اخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها، باب: بيان أن القرآن على سبعة أحرف، رقم: ٨١٩

١٣٠٢-عَنْ يَعْلَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ قَالَ سُفْيَانُ فِي قِرَاءَةِ عَبْدِ اللَّهِ وَنَادَوْا يَا مَالِ) (الحديث ٣٢٣٠، طرفاهُ في: ٣٢٦٦، ٤٨١٩) [٣٥٣]

يەعلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەرم ژنەوت لەسەر دوانگە (لەسەر مینبەر) ئەم ئایەتەی ئاوا خوێند: ﴿وَنَادَوا يامالِ﴾.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

قیرائەت واتە: شێوەی خوێندنو خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز -بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە توێژینەوەیەکی دوورو درێژمان دەوێ، کە ئێرە مەودای ئەوەی نییە، کورتو پوخت دەڵێین: هەندی وشە لەقورئانی پیرۆز بەچەند شێوەیێ دەخوێندرێتەوە، هەروا هەنێ ڕستەو هەندێ ئایەت، بەپێی شێوە خوێندنەکانی، وشەیێ زیادی هەیە یا کەمی هەیە، وئەمە هوونەرێکی بەرزە لەزانستەکانی قیرائات دا بەدوورو درێژی قسەی لێ کراوە، چەند نموونەیێ لەم خوێندنەوانە بەوێنە:

١-(مالك) لەم ئایەتەدا بەم چەند شێوەیە خوێندراوەتەوە:

أ- یامالك.

ب - (یا مالِ) بەبێ کاف لەسەر شێوەی مونادای مورەخەم، بەکەسرەی لام.

ج- (یامالُ) بەبێ کاف لەسەر شێوەی مونادای مورەخەم، کە مامەڵەی مونادای موفرەدی مەعریفەی بۆ کرابێ، واتە: مەبنی بێت لەسەر ضمەی دواپیتی کە لامەکەیەتی ئاوا: (یامالُ = یامالو).

٢- (مالك یوم الدّین) (ملك یوم الدین) یش خوێندراوەتەوە.

---

(٣٥٣) أخرجه مسلم في الجمعة، باب: تخفيف الصلاة و الخطبة، رقم: ٨٧١.

١٣٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثَتْهُ أَنَّهَا قَالَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ قَالَ: لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ مَا لَقِيتُ وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلالٍ فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاّ وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللّٰهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ فَسَلَّمَ عَلَيَّ ثُمَّ قَالَ يَا مُحَمَّدُ فَقَالَ ذَلِكَ فِيمَا شِئْتَ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللّٰهُ مِنْ أَصْلابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللّٰهَ وَحْدَهُ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا) (الحديث ٣٢٣١، طرفُهُ في: ٧٣٨٩) (٣٥٤).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر- دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هاوسەرەکانی – فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕۆژی وات بەسەر هاتووە کەلەڕۆژی ئوحود سەختتربێ؟ فەرمووی: (لەم هۆزەی تۆوە تووشی دەردی سەری و ئێش و ئازاری یەکجار زۆر بووم، بەتایبەتی لەڕۆژەکەی عەقەبەدا تەواو سەخڵەتیان کردم، مەبەستم ئەو ڕۆژەیە کەلەعەقەبەی مینادا خۆم پێشکەشی عەبدویالیلی برای عەبدوکەلال کرد، لەپاشا چووم بۆلایان بۆ طائیف و دەرۆژ لەناویانا مامەوە، لەوێش دیسان داوام لەخۆی و لەهۆزەکەی ثەقیف کرد، کەئیسلام بن و ببن بەپشت وپەنای ئیسلام، بەلام مرازمیان نەداو بەگوێیان نەکردم.

ئیتر منیش – بەخەم باری و بەپەرێشانی- کەوتمە ڕێ و بەبێ ئاگا ڕێگەم گرتە بەرو ڕۆیشتم، کاتێ هۆشم هاتەوەو بەئاگا هاتمەوە تەماشام کرد وام

(٣٥٤) اخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: ما لقي النبيُ من أذى.. رقم: ١٧٩٥.

لەقــەرنوثــەعاليــب، كەســەرم هــەڵبڕی تەماشــام كــرد واپەڵــەیێ هــەور بەراســەرمەوە راوەســتاوەو بــووە بەسێبەر بــۆم، كەســەرنجم دا جــوبرائيلم لــەناودا بينــی، جوبرائيــل بــانگی كــردمو فــەرمووی: یــەزدانی هێــژاو ســەرومر ئاگای لــێ بوو، كە هۆزەكەت چییان پێ گوتيتو چۆنيان وەلام دايتــەوە، ئــەوا فريشتەی كێوانی بۆ ناردويت چی فەرمانێكت هەيە پێی بفــەرموو، چۆن تــۆ حەزدەكــەيت ئاوايــان لــێ دەكــا، جــا فريــشتەی كێــوانيش بــانگی لــێ كــردمو سلاوی لــێ كــردمو فــەرمووی: ئــەی موحەممــەد! خــودا گــوێی لــێ بــوو كــە هۆزەكەت چۆن بەناشيرينی وەلاميــان دايتــەوەو دالْدەيان نــەدايت، ئــەوە مــن فريــشتەی ســەركاری چــياكانمو هــەموو كێــوو چــياكان بەدەســتی منــەو مــن بەرپرســم لێيــان، ئەگــەر ئــارەزوو دەكــەی هــەردوو كێوەكــە تــەبخ دەكــەم بەســەرياندا، كێــوی ئــەبو قوبــەيسو كێــوی قــەيقوعان، كەشــاری مەككــە دەكەوێتە نێوانيانەوە، دەدەم بەسەر بەيەكدا!).

حــەزرەت(دروودی خــوای لەسەر بێ) دەفــەرموێ: (خــەير! مــن شــتیوا داواناكــەم، بەڵكوو من ئومێد دەكەم كە خودا لەپشتی ئەمانە نەوەیێ بخاتەوە كە ئــەوان خــودا بپەرســتنو، بــەتاكو تــەنيای بــزاننو هــيچ هاوبەشــی بــۆ دانــەنێن!) (تاج/٨ل-١٩٢ ز- ٨٢ ف- ٣- باسی ئازاردانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ).

١٣٠٤ – عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيُّ قَالَ سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى قَالَ أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّ مِائَةِ جَنَاحٍ) (الحديث ٣٢٣٢، طرفاهُ في: ٤٨٥٦، ٤٨٥٧) (٣٥٥).

شــەيبانی(رەحمەتی خوودی لێ بێ) فــەرمووی: پرســيارم لــەزيڕ كــرد لــەبارەی فەرموودەی خــوداوە: ﴿..... فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى﴾ -نەجم/٥٣/٩-١١-واتە: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ)

---

(٣٥٥) اخرجه مسلم في الإيمان، باب: في ذكر سدرة المنتهى، رقم: ١٧٤.

لەسەفەری ئیسرادا وەها جوبرائیل لێیەوە نزیکەوە بوو، کە نێوانیان بەقەد دوو کەوان دەبوو یا کەمتر، جا لەو شوێنەدا جوبرائیل وەحیو سروشی هێنا بۆ لای بەندەی خۆشەویستی خودا کە موحەممەدە، ئەو سروشو وەحیە حەقائیقو تەفاصیلو ئەسرارو نهێنیەکانی، هەر خوداو پێغەمبەر خۆیان زۆر باش دەزانن، کە چییەو چی نییە، ئەوەی کە موحەممەد بەچاوی سەر بینی، بەچاوی دڵیش بینیو هەستو هۆش لەبۆنی رەحمەتو رەفعی زەحمەت مەست بوونو چاوو دڵ بۆ یەکتری بوون بەشایەتی داوای یەکتری!) (بڕ: تاج/٦ل- ١٦٠ ز- ٧- سوورەتی ئەنعام ف-٨).

شەیبانی فەرمووی: لەوەڵاما زیڕ فەرمووی: لەم بارەیەوە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود هەواڵی بەئێمە داوە: (کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەم جێگەیەدا جوبرائیلی دیوە، -درودی خودا لەسەر هەردوکیان بێ- شەش سەد باڵی بووە!) (ش/ت-تاج/٧/ل-١٦٣ف-١-سوورەتی نەجم).

١٣٠٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) في قولِهِ تعالى: ﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾ قَالَ: رَأَى رَفْرَفًا أَخْضَرَ سَدَّ أُفُقَ السَّمَاءِ. (الحديث ٣٢٣٣، طرفُهُ في: ٤٨٥٨) (٣٥٦).

دیسان عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لەبارەی ئایەتی: ﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾ وە، فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تارایەکی سەوزی دیبوو کەناری ئاسمانی داگرتبوو.

١٣٠٦-عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) قَالَتْ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ وَلَكِنْ قَدْ رَأَى جِبْرِيلَ فِي صُورَتِهِ وَخَلْقِهِ سَادٌّ مَا بَيْنَ الأُفُقِ) (الحديث ٣٢٣٤، أطرافُهُ في: ٣٢٣٥، ٤٦١٢، ٤٨٥٥، ٧٣٨٠، ٧٥٣١) (٣٥٧).

---

(٣٥٦) من المتفق عليه، على ماجاء في خاتمة كتاب بدء الخلق (فتح/٦ص٣٦٠ + ٥١٨) - المترجم.

(٣٥٧) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: معنى قول الله ﴿ ولقد رآه نزلة...﴾ رقم: ١٧٧.

مەسروق (رەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لای عائیشەی پوورم بووم، پاڵم دادا بوو، فەرمووی: هەرکەسێ یەکێ لەم سێ قسەیە بکا ئەوەبەڕاستی هەڵاتێکی گەلێ گەورە هەڵدەبەستێ بۆ خوا:

ئەوەی بڵێ موحەممەد(دروودی خوای لەسەر بێ) خودای خۆی بەچاوی سەر دیوە، ئەوە بەراستی درۆیەکی گەلێ زلی هەڵبەستووە، بەدەم خوداوە، چونکە خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ﴾ چاوانی سەر خودا نابینن‌و دەرکی کونهی‌و چییەتی ئەو ناکەن، بەڵام خودا زۆر باش دەرکی چاوان‌و خاوەن چاوان دەکا، تا ئەوێ کە مەسروق دەفەرموێ: کە پوورم وای فەرموو منیش ڕێك دانیشتم‌و گوتم: ئەی دایکی موسوڵمانان مۆڵەتم بدەو پەلەم لێ مەکە، ئەی ئەوە نییە کە خودا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى﴾ -١٣/٥٣- واتە: لەگەڵ ئەوەدا کەجارێکی دیکەش لەداپەڕینێکی دیکەدا، لەلای درەختی سیدرەتولمونتەهادا، حەزرەت ئەوی بینی، لەژووررووی ئاسمانی حەوتەمەوە، ئەی ئەوە نییە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ﴾ -٢٣/٨١- واتە: موحەممەد(دروودی خوای لەسەر بێ) بەچاوی سەر لەکەناری ئاسماندا بەروونی ئەوی بینی‌و چاوی پێی کەوت. کەواتە ئەی پوورە عائیشە! تۆ چۆن وادەڵێیت؟ عائیشەش فەرمووی: من خۆم یەکەم کەس بووم کە ئەم پرسیارەی تۆم لەحەزرەت کرد، فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (ئەوەی کە من چاوم پێکەوتووە جوبرائیل بوو، تەنیا ئەم دوو جارە لەسەر شێوی خۆی جوبرائیلم دیوە، واتە: لەسەر ئەو صورەت وشێوەیەی کە خودا لەسەرەتاوە لەسەری دروستی کردووە!).

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرەئیلم دی لەئاسمانەوە داپەڕی، قەڵافەتی ئەوەندە گەورە بوو وەلەش‌و لاری ئەوەندە زل بوو، ناوەندی ئاسمان‌و زەوی داگرتبوو) (بڕوانە: تاج/٦ل- ١٥٨ ف- ٨ ز -٧ - سوورەتی ئەنعام).

١٣٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَبَاتَ غضبانَ عليها لَعَنَتْهَا الْمَلائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ) (٣٥٨).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ پیاو داوای سەرجێی لەژنەکەی بکا، وەژنەکەی ملی پێنەدا، ئەو شەوە تابەیانی فریشتەکان لەعنەتو نەفرەت لەو ژنە دەکەن!) (ش/د) (تاج/٣/ل-١١٣ف-٢ز -٤٦ مافی مێرد لەسەر ژنی خۆی).

١٣٠٨-عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَأَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي مُوسَى رَجُلاً آدَمَ طُوَالاً جَعْدًا كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ وَرَأَيْتُ عِيسَى رَجُلاً مَرْبُوعًا مَرْبُوعَ الْخَلْقِ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ سَبِطَ الرَّأْسِ وَرَأَيْتُ مَالِكًا خَازِنَ النَّارِ وَالدَّجَّالَ فِي آيَاتٍ أَرَاهُنَّ اللّٰهُ إِيَّاهُ فَلا تَكُنْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَائِهِ) (الحديث ٣٢٣٩، طرفُهُ في: ٣٣٩٦) (٣٥٩).

ئیبنو عەبباس(رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو شەوەی کەبردمیان بۆ شەو ڕەوی کەناسراوە بەشەوی ئیسراء، پێغەمبەر مووسام بینی، پیاوێکی گەنم ڕەنگی درێژی قژ لوولە، لەگەنم ڕەنگیو درێژی دا دەق لەپیاوانی هۆزی شەنووئە دەکات، وەپێغەمبەر عیساشم بینی پیاوێکی مامناوەندییە نە زۆر کورت وە نەزۆر درێژە، نە زۆر کراوەو پانو پۆڕ، ڕەنگی سوورو سپی دەینواند قژی خاو بوو، مالیکی سەرۆکی وەردیانەکانی دۆزەخم بینی، هەروەها جەجالم بینی، هەروەها چەندین نیشانەی گەورە گەورەم بینی، کە خودا ئەوانەی بەمن پیشان دا. پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) پاش ئەم فەرمایشتانەی فەرمووشی: ئەی

(٣٥٨) اخرجه مسلم في النكاح، باب: تحريم امتناعها من فراش زوجها. رقم: ١١٣٦.

(٣٥٩) اخرجه مسلم في الإيمان، باب: الإسراء برسول الله (صلى الله عليه وسلم) رقم: ١٦٥.

موسوڵمان! لەهاتن و بینینی جەجاڵ گومانت نەبێ) (تاج/٤ل-٣٨٤ ز- ١١٧ف -٢- باسی گەورەیی عیسا +تاج/٤ل- ٣٧٨ز-١١٥-گەورەیی هەندێ لە پێغەمبەران. ف- ٤+تاج/٤ل-٣٠٦ ز-١٠٠ف -٣- باسی ئیسراء).

١٣٠٩-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ فَإِنَّهُ يُعْرَضُ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ فَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ) (الحديث ٣٢٤٠، طرفُهُ في: ٦٥٨ت = ١٣٧٩ف.) [(٣٦٠)].

ئەم فەرموودەیە لەوێ تەرجەمەکەی بەتەواوی ڕۆیشت = بەرگی دووەم، لاپەڕە/٧٨.

١٣١٠- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). (الحديث ٣٢٤١، أطرافُهُ في: ٥١٩٨، ٦٤٤٩، ٦٥٤٦) [(٣٦١)].

عیمرانی کوڕی حوصەین(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەشەوی ئیسرادا سەرنجی ناو بەهەشتم دا، تەماشام کرد زۆربەی خەڵکەکەی هەژاران بوون، سەرنجی ناو دۆزەخیشم دا روانیم زۆربەی خەڵکەکەی ژنان بوون). (ش/ت-تاج/٩ل-٣١٢ز-٩٨ف-١٠-باسی گەورەیی بەهرەی هەژاری).

١٣١١-عنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ قَالَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ فَإِذَا امْرَأَةٌ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا الْقَصْرُ؟ فَقَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَذَكَرْتُ غَيْرَتَهُ

---

(٣٦٠) أخرجه مسلم في الجنة (راجع: رقم: ٦٥٨) - المترجم.

(٣٦١) لم يوافقهُ مسلم على تخريج حديث عمران: (اطلعت في الجنة) (فتح/٦/٣٦٠) - المترجم.

فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا) فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: أَعَلَيْكَ أَغَارُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟) (الحديث ٣٢٤٢، أطرافُهُ في: ٣٦٨٠، ٥٢٢٧، ٧٠٢٣، ٧٠٢٥) (٣٦٢).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (خەوتبووم، والەخەوما وام لەناو بەهەشتا، کەتەماشام کرد وا ئافرەتێ لەپاڵ کۆشکێکا دەستنوێژ دەگرێ، گوتم: ئەم کۆشکو تەلارە هی کێیە؟ گوتیان: هی عومەری کوڕی خەطابە. جا ویستم بچمە ناویو تەماشای بکەم بەڵام کەبیری غیرەتی عومەرم کەوتەوە، کەچەندە بەتەنگ ناموسەوە دێت ئیتر نەچوومو بەرەودوا گەڕامەوە). (ش) (تاج/٥ل-٢٣ز-٤ ف-٥-باسی گەورەیی حەزرەتی عومەر).

**راڤەو شیکردنەوە:**

١- خەوی پێغەمبەران حەقەو، سرووشو نیگایە لەخواوە، رووداوی پێدەچەسپێ، بڕیاری لێ وەردەگیرێ، کار بەو بڕیارە دەکرێ وەك خەوی خەڵکانی تر نییە.

٢- دەستنوێژو زۆر پەرستشی تر لەبەهەشتا هەیە وەك تەسبیح وتەکبیرکردنو حەمدو سوپاسکردنو کوڕنووش بردن (بڕ: بەرگی/١ ل- ١٧٨ — ١٧٩).

٣- پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بە فەرموودەکانی پیشی هەروا فەرموودەکانی پاشی بەسەر باسەکەوە کە (سەرەتای دروستبوون = بدء الخلق) ە، لەچەند روویەکەوەیە، وەك ئەوە هەندێ راجیایی هەیە لەبارەی هەبوونی فریشتەو بەهەشتو دۆزەخو شتی ترەوە، جاشێخی بوخاری رای خۆی دەردەبڕێو، ئەو ئایەتو فەرموودانە دەکا بەبەڵگەو نیشانەو شایەت

(٣٦٢) أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: فضائل عمر... رقم: ٢٣٩٥.

لەسەر راو بۆچوونەکەی خۆی، گەلێ جار بەڵگەیی فەرموودەکە لەسەر باسەکە روونو ئاشکرایە، وەك ئەم فەرموودانە: (ژمارە: ١٢٨٧، ١٢٩٠، ١٢٩١، ١٢٩٤، ١٢٩٥، ١٢٩٦، ١٢٩٧) هەتا ئێرە. چونکە ئەم فەرموودانە بەئاشکرا باس لە سەرەتای دروستبوونی مەخلوقاتو عەرشو ئاسمانو زەویو ساڵو مانگو خۆرو فریشتەو جوبرائیلو شەیاتینو بەهەشتو دۆزەخ دەکەن، وەئەم جۆرە شتانە دروستکراونو ئێستا هەن.

بەڵام هەندێ جار بەڵگەیی فەرموودەکە لەسەرباسەکە، کەمێ پەنهانە، وەك: ژمارە: ١٢٩٢. ئەمە کە دەگەڕێینەوە بۆ سەر صەحیحی بوخاری، دەبینین کەسەرباسەکە کە بەدئی خەلقە، چەند لاباسێکی لێ بۆتەوە، لاباسی ژمارە: ٤ بەناونیشانی: باسی چۆنێتی خۆرو مانگە، ئەوکاتە دەردەکەوێ بۆمان کە پەیوەندی فەرموودەی ژمارە: ١٢٩٢، بەباسەکەی خۆیەوە زۆر ئاشکراو روونە، وەهەروا ئەوانی تریش.

## تێبینی:

گەلێ جار من لاباسەکان نانووسمو ئیکتیفا بەسەر باسە سەرەکییەکە دەکەم، چونکە لاباسەکان زۆر گرنگ نین، بەتایبەتی ئەگەر دەق نەبن لەبڕیاری شەرعی دا، لەباتی ئەوە لەکۆتایی فەرموودەکاندا، ئاماژە دەکەم بۆ سەرباسێ لەبارتر بۆ فەرموودەکە وەك تاجولئوصول کردوویەتی، یا ریاض الصالحین، یا صەحیحی موسلیم... تاد.

١٣١٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَلِجُ الْجَنَّةَ صُورَتُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لا يَبْصُقُونَ فِيهَا وَلا يَمْتَخِطُونَ وَلا يَتَغَوَّطُونَ آنِيَتُهُمْ فِيهَا الذَّهَبُ أَمْشَاطُهُمْ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَمَجَامِرُهُمْ الأَلُوَّةُ وَرَشْحُهُمْ الْمِسْكُ وَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا

مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ مِنْ الْحُسْنِ لا اخْتِلافَ بَيْنَهُمْ وَلا تَبَاغُضَ قُلُوبُهُمْ قَلْبٌ وَاحِدٌ يُسَبِّحُونَ اللَّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا) (الحديث ٣٢٤٥، أطرافُهُ في: ٣٢٤٦، ٣٢٥٤، ٣٣٢٧) [٣٦٣].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (یەکەم دەستەیێ کەدەچنە بەهەشت لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، ئاوا جوانو گەشو ناسكو نازدارن، لەناو ریزی بەهەشتیەکانی تردا دیارن، دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرەی ئاسمان وان، خەڵکی بەهەشت نەگمێز دەکەن، نەسەراو دەکەن، نەچڵم دەسڕن، نەتفو بەڵغەم رۆدەکەن، (نەقرخنن نەلرخنن) شانەکانیان زێڕە ئارەقیان میسکە، بخووریان عوودە، ژنەکانیان پەرییە چاوجوانەکانی بەهەشتە، رەفتارو رەوشتیان وەك یەك جوانە، لەسەر شێوەی قەڵافەتی ئادەمی باوکیانن، باڵایان شەست باڵ درێژە).

لە گێڕانەوەیەکدا: هەر پیاوەی دوو ژنی هەیە، پیاوی رەبەن لەبەهەشتا نییە، هەموو ژندارن، ژنەکانیان لەبەر جوانیو ناسکیو نازداری مۆخی ناو لاقیان لەژێر چەرمو گۆشتو ئێسکەکەوە دیارە، وەك لەناو میناداییێ ئاوایە جیاوازیو دژایەتیو ناخۆشیو ناکۆکیان لەنێوان دا نییە، وە رقو دەغەزو کینە لەیەکتر ناکێشن، لەناو خۆیانا زۆر تەباو رێکن، هەموویان یەك دڵو یەك مەشرەبن، دڵیان لەئاستی یەکتر پاکە، بەیانیو ئێوارێ خەریکی یادو تەسبیحاتی خوادی گەورەن) (ش/ت) (ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیە لەتاج دا، بەرگی /١٠ل –٤٦٣ ز- ١٤٢ – باسی چۆنێتیو شێوەی دانیشتوانی بەهەشت. بڕوانە: تاج/ ٦ل –٥ ز- ٣. باسی سوورەتی بەقەرە. ف –٢ +

---

(٣٦٣) اخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها، باب: أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر، وباب: في صفة الجنة واهلها.... رقم: ٢٨٣٤.

تـاج/١٠ل —٤٦٤ فـ ٥ ز -١٤٢) + (ريـاض/٤ ل —١٣٩٤-٣ + ل- ١٣٩٢ ف —١ ز- ٣٧٢. باسـی ئـەو خۆشـیو بەهرانـەی کـە خـوا لەبەهەشـتا ئامـادەی کـردووە بـۆ موسولمان).

١٣١٢م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ وَالَّذِينَ عَلَى إِثْرِهِمْ كَأَشَدِّ كَوْكَبٍ إِضَاءَةً قُلُوبُهُمْ عَلَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ لا اخْتِلافَ بَيْنَهُمْ وَلا تَبَاغُضَ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ كُلُّ وَاحِدَةٍمِنْهُمَا يُرَى مُخُّ سَاقِهَا مِنْ وَرَاءِ لَحْمِهَا مِنْ الْحُسْنِ يُسَبِّحُونَ اللَّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا لا يَسْقَمُونَ وَلا يَمْتَخِطُونَ وَلا يَبْصُقُونَ آنِيَتُهُمْ الذَّهَبُ وَالْفِضَّةُ وَأَمْشَاطُهُمْ الذَّهَبُ وَوَقُودُ مَجَامِرِهِمْ الأَلُوَّةُ قَالَ أَبُو الْيَمَانِ يَعْنِي الْعُودَ وَرَشْحُهُمْ الْمِسْكُ ) (الحديث ٣٢٤٦، طرفُهُ في: ١٣١٢ت= ٣٢٤٥ف) (٣٦٤).

واتەی ئەم گێڕانەوەیە بەتەواوی لە فەرموودەکەی پێشیەوە ڕۆی، تـەنیا لێرە ئەم دوو زیادەیەی واتیا: (قاپو دەفرەکانیـان زێـڕو زیـوە) وەئـەوەش کـە دەفەرموێ: (لایَسقَمون: نەخۆش ناکەون).

١٣١٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَيَدْخُلَنَّ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفًا أَوْ سَبْعُ مِائَةِ أَلْفٍ لا يَدْخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمْ وُجُوهُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ) (الحديث ٣٢٤٧، طرفاهُ في: ٦٥٤٣، ٦٥٥٤) (٣٦٥).

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەئۆمەتی من حەفتا هەزارکەس، یا فـەرمووی: سـەدهەزار کـەس بەیـەك ریـز بەیـەك جار دەچـنە نـاو بەهەشـت، بـەڕیز دەسـتی یـەکتریـیان

(٣٦٤) قال في التاج: (رواه الشيخان والترمذي) - المترجم.

(٣٦٥) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: الذليل على دخول طوائف.... رقم: ٢١٩.

گرتووه، وەك لەریزی نوێژدا راوەستابن ئاوا، لەسەر ئەم حاڵە هەموویان پێکەوە لەیەك كاتا دەچنە ژوورەوە بۆ ناو بەهەشت، دەمووچاویان ئەوەندە جوان‌و بەشەوقە، وەك مانگی شەوی چواردە، دەدرەوشێتەوە) (ش= شەیخەین= ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم گێڕاویانەتەوە) (تاج/١٠ ل- ٤٦٩ ز-١٤٤ف- ٥).

١٣١٤- عنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جُبَّةُ سُنْدُسٍ وَكَانَ يَنْهَى عَنْ الْحَرِيرِ فَعَجِبَ النَّاسُ مِنْهَا فَقَالَ: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا) (الحديث ٣٢٤٩، أطرافه في: ٣٨٠٢,٥٨٣٦، ٦٦٤٠) (٣٦٦).

ئەنەسی(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جبەیەكی ئاوریشمینیان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو نەیی لەجل‌و بەرگی ئاوریشم دەكرد، خەڵكەكە سەرسام بوون لەجوانی ئەو جبەیە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەیرتان لەمەدێ! دەی بەو خودایەی كە گیانی منی بەدەستە، دەستەسڕەكانی سەعدی كوڕی موعاذ لەبەهەشتا لەمە باشترە!) (تاج/٤ ل —٩٨ ز —٢٩ ف —٣. باسی جل‌و بەرگ).

١٣١٥- وعَنْه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لا يَقْطَعُهَا) (الحديث ٣٢٥١(ر انظر ٣٢٥٢) (٣٦٧).

ئەنەسی(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (درەختێ هەیە لەبەهەشتا سواری ئەسپی خێرای زۆر چاك كەمەشق دیدەبێ‌و ئامادە كرابێ بۆ قۆچ‌و تەراتێن، سەد ساڵ بەغار بەبن سێبەری

(٣٦٦) أخرجه مسلم في الفضائل، باب: من فضائل سعد بن معاذ (رضي الله عنه) رقم: ٢٤٦٩.

(٣٦٧) قال العيني: (والحديث من أفراده —ج/١٥ص١٥٧) - المترجم.

لقەكانی دا دەڕوا ناگاتە ئەو پەڕی!) (ش/ت-تاج/١٠ل- ٤٤٢ ز-١٣٧ ف -٢. باسی دارو درەختو میوەی بەهەشت).

١٣١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لا يَقْطَعُهَا وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ وَظِلٍّ مَمْدُودٍ ولقابُ قوس احدِكم في الجنَّةِ خيرٌ مما طلعت عليه الشّمسُ أوْ تغرُبُ) (الحديث ٣٢٥٢، طرفُهُ في: ٤٨٨١+ الحديث٣٢٥٣، طرفُهُ في: رقم: ١١٥١ تجريد = ٢٧٩٣ فتح) (٣٦٨).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەم گێڕانەوەدا: (... ئەگەر حەزیش دەكەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە كە دەفەرموێ: ﴿وظـلٍ ممـدودٍ﴾) -٥٦/٣٠- واتە: وە وان لەسێبەری خەستی درێژی ئاوڕشێنكراودا. وەبەقەد جێگەی كەوانێ لەبەهەشتا، كەهی یەكێ لەئێوە بێ چاكترە لەهەموو سامانو موڵكی هەموو جیهان). (ش/ت- تاج/٧ل - ١٧٥ز -٣٩- سوورەتی واقیعە).

١٣١٧-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا يَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ فِي الأُفُقِ مِنْ الْمَشْرِقِ أَوْ الْمَغْرِبِ لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: (بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ) (الحديث ٣٢٥٦، طرفُهُ في: ٦٥٥٦) (٣٦٩).

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهەشتیەكان كەتەماشای خەڵكی ناو باڵەخانەكان دەكەن كەوان

---

(٣٦٨) قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (إن في الجنةِ شجرة...) (فتح/ ٦ص٣٦٠ + ص٥١٨. طبعة جديدة) -المترجم.

(٣٦٩) اخرجه مسلم في الجنة وصفة نعميها وأهلها، باب: ترائى أهل الجنة.. رقم: ٢٨٣١.

لەسەرووبانەوە، وەھا پیایاندا ھەڵدەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك ئێوە چۆن چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کە تەواو دوورکەوتوونەتەوەو، لەکەناری ئاسمان نزیك بوونەتەوەو لەخۆرھەڵاتەوە یا لەخۆرئاواوە خەریکن ئاوادەبن، دیارە کە ئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازی پلەو پایەی نێوانیانەوە).

یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودادیارە ئەو جێگە بەرزانە ھەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: (وانییە، بەو خودایە کەھەر خۆی خودایە کە گیانی ھەموومان والەدەستی تەوانایی ئەودا، زۆر کەسی تریش ھەیە، کەدەگەنە ئەو پلەو پایە بەرزانە، لەگەڵ ئەوەشا پێغەمبەر نەبوون، بەلام لەئۆمەتەکانیان بوون، باوەڕی ساخیان بەخودا ھەبووەو، بەدەمو بەدڵو بەکردەوەی باش باوەڕیان بەپێغەمبەران بووە) (ش/ت- تاج/١٠ل — ٤٤٣ ز- ١٣٨ ف- ١. باسی ھۆدەوماڵی بەھەشتیەکان).

١٣١٨-عَنْ عَائِشَةَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ) (الحديث: ٣٢٦٣، أطرافُهُ في: ٣٢٦١,٥٧٢٥، ٣٢٦٢، ٥٧٢٦، ٣٢٦٤، ٥٧٢٣) [(٣٧٠)].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تا لەھاڵاوی دۆزەخە بەئاو فێنکی بکەنەوە!) (ش/ت-تاج/ ٤ ل- ٢٠٥ ز —٦٦ ف —١. باسی: ئاو بۆ چارەسەری تادار).

ئەم فەرموودەیە بوخاری ئەم تەرجەمەیەی بۆ داناوە: (باب: صِفَةِ النَّارِ وأنّها مخلوقَةٌ). واتە: پێشەوا بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەژێر ناونیشانی:

---

(٣٧٠) أخرجه مسلم في السلام، باب: لكلّ داء دواء واستحباب التداوي، رقم: ٢٢١٠.

باسی چۆنیەتی نیشانەو چۆنێتی دۆزەخ‌و، باسی ئەوەیش کە دۆزەخ ئێستا هەیەو دروست کراوە، نەوەك وەك هەندێ دەڵێن: لەقیامەتا دروست دەکرێ.

١٣١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً قَالَ: (فُضِّلَتْ عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا) (الحديث ٣٢٦٦، طرفُهُ في: رقم: ١٣٠٢ت= ٣٢٣٠ف) (٣٧١).

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم ئاگرەی ئێوە کەلەم جیهانەدا بەکاری دەهێنن، یەك لەحەفتای ئاگر دۆزەخ گەرمە، واتە: ئاگری دۆزەخ حەفتا ئەوەندە گەرمە. یاران (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزیان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا! خۆ ئاگری دۆزەخ بەئەندازەی ئەم ئاگرەی دونیاش گەرم بێ، بەسەو سەرو زیادە بۆ سزاو ئازاردانی دۆزەخی، فەرمووی: دەسا شەست‌و نۆ جار لەم ئاگرە گەرمترە، رێك حەفتا ئەوەندەی ئەم گەرمە) (ش/ت- تاج/١٠ ل- ٤٩٢ ز- ١٥١ — باسی باس‌و خواسی دۆزەخ‌و دەرگاکانی. ف-١).

١٣٢٠-عن أُسَامَةَ قال: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: (يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ فِي النَّارِ فَيَدُورُ كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِرَحَاهُ فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عَلَيْهِ فَيَقُولُونَ أَيْ فُلانُ مَا شَأْنُكَ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عَنْ الْمُنْكَرِ؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُكُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَلا آتِيهِ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ). (الحديث ٣٢٦٧، طرفُهُ في: ٧٠٩٨) (٣٧٢).

ئوسامەی کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا(درودی خوای لەسەر بێ) : (لەڕۆژی قیامەتا بازێ پیاو دێنن‌و تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە، ریخۆڵەکانی

---

(٣٧١) أخرجه مسلم في الجنة وصفة نعميها وأهلها، باب: في شدة حرّ نار جهنم، رقم: ٢٨٤٣.

(٣٧٢) أخرجه مسلم في الزّهد والرقائق، باب: عقوبة من يأمر بالمعروف ولا يفعله، رقم: ٢٩٨٩.

دەڕژێتــە بــەرپێی وەك گــای گێــرە بــەدەوری خۆیــا دەخولێتــەوەو ریخۆڵــەکانی خــۆی گێــرە دەکــا، دۆزەخیــەکان لــەدەوری کۆمەڵــە دەکــەن‌و پێــی دەڵــێن: فلانــە کــەس! ئەمــە خــۆتی؟ تــۆ چییتە؟ تۆچــی دەکــەی لێــرە؟ خــۆ تــۆ لــەلای خــۆت ئامۆژگاری باشی ئێمەت دەکرد! ئەمەت لەچی‌و ئەوەت لەچی؟ ئــەویش دەڵــێ: بەڵێ وابوو، بەڵام داخەکەم بۆ خۆم وانەبووم، بەپێچەوانەوە، بەئێوەم دەگوت چاکە بکەن‌و خۆم نەیم دەکرد، بەئێوەم دەگوت: خراپە مەکەن، کەچی بۆ خۆم خراپەم دەکرد، ئەمەی دەیبینن سزای ئەو کەسانەیە کە ئەمە رەفتارو کرداریانە) (ش= متقف علیه-ریاض/١ل-١٨١ف١٩٨ز-٢٤. باسی سزای ئەو کەسەی کەبەپێچەوانەی قسەی باشی خۆی رەفتار بکات) + (تاج/١٠ل- ٧٩ ز- ٢٠ ف- ٣ — باسی فەرمانکردن بەچاکەو جڵەوگیری لەخراپە).

١٣٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ كَانَ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ عِنْدِي لَكِنَّهُ دَعَا وَدَعَا ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ أَتَانِي رَجُلانِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ) فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لِصَاحِبِهِ مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ فَقَالَ: مَطْبُوبٌ قَالَ: مَنْ طَبَّهُ قَالَ لَبِيدُ بْنُ الأَعْصَمِ: قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُفِّ طَلْعِ نَخْلَةٍ ذَكَرٍ قَالَ: وَأَيْنَ؟ هُوَ قَالَ: فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ كَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ أَوْ كَأَنَّ رُءُوسَ نَخْلِهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلا اسْتَخْرَجْتَهُ قَالَ: (قَدْ عَافَانِي اللَّهُ فَكَرِهْتُ أَنْ أُثَوِّرَ ؟عَلَى النَّاسِ فِيهِ شَرًّا فَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ ).(الحديث٥٧٦٣، ٥٧٦٥، ٥٧٦٦، ٦٠٦٣، ٦٣٩١، ٣٢٦٨، طرفـــــــــهُ في: ١٢٨٣ت = ٣١٧٥ف)[٣٧٣].

---

(٣٧٣) قال في التاج: (رواه الشيخان، تاج/٣ص١٩٣. بحث السحر) — هذا نص رقم (٥٧٦٣). المترجم.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: جوولەکەیـەکی بـەنی زورەیقی، کـەناوی لەبیـدی کوڕی ئەعـصەم بـوو، جـادووی لەپێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) کردبـوو، هـەتا هەنـدێ جار شـتیوا هـەبوو، کـە پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نـەیکردبوو کەچی بەخـەیاڵ وایدەزانی کە کردوویەتی!

هەتا ڕۆژێـکیان، یا شەوێـکیان، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) زۆر زۆر لـەخودا پاڕایەوە، کە ئەم وەیەی لەکۆڵ بخات، لەپاشا فەرمووی: (ئـەی عائیـشە! ئاگـات لێیە کـەخودا هـات بەدەممـەوەو چارەی دەردەکـەمی پـێ فـەرمووم: دوو پیـاو هـاتن بـۆ لام، یەکێـکیان لەسـەرینمەوە دانیـشت ئـەوی تریـان لەپاینمـەوە دانیشت، ئەوەیان کـە لەپایینمـەوە بـوو گوتی بـەوەیان کەلەسـەرینمەوە بـوو: ئازاری ئەم پیـاوە چییە؟ گوتی: جادووی لـێ کـراوە. گوتی: کێجادووی لـێ کـردووە؟ گوتی: لەبیـدی کوڕی ئەعـصەم. گوتی: لەچـی دا؟ گوتی: لەشانەو کوڵـك‌و مووی دەمـی شـانە، کـە لـەکاتی مووداهێنانـدا بەردەبێتـەوە، یـا لـەناو ددانەکانی شانەدا دەمێنێتەوە و، لـەکیف (قـاوغ) ی هێشووی خورمـای نێـردا، گوتی: جا ئەوە لەکوێیە؟ گوتی: وا لەناو بیری ذی ئەروان دا.

عائیـشە فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەگـەڵ دەسـتەیێ لـەیارانی خۆیا، چوون بۆ ئـەوێ، لەپاشا گەڕایـەوە فـەرمووی: ئـەی عائیـشە! بـەو تاقـە خودایـە ئاوەکـەی دەڵێـی لینجـاوی خەنەیـە،و دارخورماکـانی دەڵێـی سـەرو گوێلاکی شەیتانن وا ڕەزا قورس‌و نالەبارن. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا!ئایـا دەریت هێنـا لەبیرەکە؟ فـەرمووی: (نـەء، بـەڵام مـن خـودا چـاکی کردمـەوەو حەزیشم نەکرد کـە شـەڕ بوروژێنم لەخـەڵـك، جـا لەبـەر ئـەوە دەسـتوورم دا بیرەکـــەیان پڕکـــردەوەو گەڕامـــەوە). (ش) (تـــاج/٤ل- ١٧٩ز-٥٤ف-١-. باســـی جادووبازی).

١٣٢٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) : (يَـأْتِي الـشَّيْطَانُ أَحَـدَكُمْ فَيَقُـولُ مَـنْ خَلَـقَ كَـذَا مَـنْ خَلَـقَ

كَذَا حَتَّى يَقُولَ مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ وَلْيَنْتَهِ) (الحديث ٣٢٧٦) (٣٧٤).

**ئەبوهورەیرە**(رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر**(درودی خوای لەسەر بێ) **فەرمووی: (شەیتان دێ بەلای یەکێکتانەوە، دەچێتە بن کلێشەی‌و ختە ختەی دەداو دەڵێ: کێ ئەمەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دروست کردووە؟ هەتا بەرەبەرە دەڵێ: ئەی کێ خودای تۆی دروست کردووە؟ کە کار گەیشت بەم رادەیە پەنا بگرن بەخوداو، واز بێنن لەم جۆرە ووتو ویرەیە) (ش/د-تاج/١ ل -٢٨ ز- ٣ف- ٣. باسی باوەڕ زیادو کەم دەکاو وەسوەسە زیانی پێناگەیەنێ).**

١٣٢٣-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُشِيرُ إِلَى الْمَشْرِقِ فَقَالَ: (هَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَا هُنَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَا هُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ) (الحديث ٣٢٧٩، طرفه في: ٣١٠٤، ٣٥١١، ٥٢٩٦، ٧٠٩٢، ٧٠٩٣) (٣٧٥).

**عەبدوڵلای کوڕی عومەر**(رەزای خوایان لێ بێ) **فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات دەکردو دەیفەرموو: (بێداری! بەڕاستی ئالێرەوە لە خۆرهەڵاتەوە ئاشووبو فەرتەنەو ئاژاوەی گەورە گەورە سەر هەڵدەدەن، هەر لەوێشەوە شاخی شەیتان قوت دەبێتەوەو هەڵ دێ) (تاج/٥ل- ٢٥٥ز- ٧٢. باسی گەورەیی وڵاتی شام. ف-١، ٢، ٣، ٤، ٥).**

١٣٢٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا اسْتَجْنَحَ اللَّيْلُ أَوْ قَالَ: جُنْحُ اللَّيْلِ فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنْ الْعِشَاءِ فَخَلُّوهُمْ وَأَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَطْفِئْ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ

---

(٣٧٤) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان الوسوسة من الإيمان... رقم: ١٣٤.

(٣٧٥) قال العلامة العيني: ( وهذا الحديث من أفراده) (ج/١٥ص١٧٣) - المترجم.

اللَّـهِ وَلَـوْ تَعْـرُضُ عَلَيْـهِ شَـيْئًا) (الحـديث ٣٢٨٠، أطرافُـهُ في: ٣٣٠٤، ٣٣١٦، ٥٦٢٣، ٥٦٢٤، ٦٢٩٥، ٦٢٩٦) (٣٧٦).

جابیر(رەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(درودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کـە سەرەتای شەو داهات) یا فـەرمووی: (کەبـەرایی تـاریکی شـەو دەسـتی پێـکرد، ئیتر لەو دەمەدا منداڵەکانتان بگرنەوەو مەهێڵن لەو کاتـەدا بڵاو ببنـەوە بـەم لاو بەولادا، چـونکە دێوەکـان، واتـە: شـەیاطینـی، حـەزیان لەتاریکییـە، رقیـان لەرووناکییـە، لـەتاریکیو رەشـاییو دۆخـی وادا دەکەونـە هەڵپـەو چـالاکی نواندن. بەڵام کاتێ تاوێ لەشێوان تێپەڕیو بوو بەشەوی تەواو، ئیتر رێـگەی هاموشـۆیان لـێ مـەگرن. وەدەرگاکـەت دابخـەو نـاوی خـودا بهێنـە،و لـەکاتی پێویـستدا چـراکەت بکوژێنـەوەو نـاوی خـودا بهێنــە، وەدەمبینـی کونـدەو مەشکەکەت ببەستەو ناوی خودا بهێنە، سەری دەفرو حاجەتەکـەت داپۆشـەو ناوی خودا بهێنە، خۆ ئەگـەر هیچت دەست نەکـەوت، چڵێ دار لەسـەر بـاری پانی، لەسەردەمی قاپو حاجەتەکە دابنێو نـاوی خـودا بهێنـە) (تـاج/ ٤ل- ٦٤ ز- ١٩ – باسی دەفرو قاپو حاجەت. فـ٢+١+٣).

١٣٢٥- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ قَالَ كُنْتُ جَالِسًا مَعَ النَّبِيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) وَرَجُلانِ يَسْتَبَّانِ فَأَحَدُهُمَا احْمَرَّ وَجْهُهُ وَانْتَفَخَتْ أَوْدَاجُهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا ذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ لَوْ قَالَ أَعُوذُ بِاللَّـهِ مِنْ الشَّيْطَانِ ذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ) فَقَـالُوا لَـهُ: (إِنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ فَقَالَ: وَهَلْ بِي جُنُـونٌ) (الحـديث ٣٢٨٢، طرفـاهُ في: ٦٠٤٨، ٦١١٥) (٣٧٧).

---

(٣٧٦) أخرجه مسلم في الأشربة، باب: الأمر بتغطية الإناء... رقم: ٢٠١٢.

(٣٧٧) أخرجه مسلم في البرّ و الصلة و الآداب، باب: فضل من يملك نفسه عند الغضب،رقم: ٢٦١٠.

سولەیمانی کوڕی صورەد(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر بێ) دانیشتبووم، دوو پیاو لەلامانا بوو بەشەڕە جنێویان، یەکێکیان دەمو چاوی سوور هەڵگەڕاو ڕەگی لاملی هەڵسا، پێغەمبەریش(درودی خوای لەسەر بێ) کە حاڵەکەی بینی فەرمووی: (من وشەیێ دەزانم ئەگەر ئەم کابرایە بیلێ، ڕقەکەی دەنیشێتەوە، ئەو وشەیە ئەمەیە: أعوذُ باللهِ منَ الشيطانِ الرّجيم؛ پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی شەیتانی دوور لەرەحمەتی خودا) کەچی کە ئەم فەرمایشتەی حەزرەتیان بەکابرا گوت، کابرا گوتی: بۆچی؟ لەتۆ اویە من شێت بووم ئەعوذوبللا بکەم لەشەیتان‌و جنۆکەو شتی‌وا ؟). (ش/د/ت‌ـتاج/٩ل-٨٣ز-٣١ف-١. باسی چارەی ڕق هەڵسان).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

سولەیمانی کوڕی صورەدی کوڕی ئەلجون، پیاوێکی پیاوانەی خێرۆمەند بوو، ئایینداروخواپەرستێکی جوان بوو، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی یەسار بوو، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا سولەیمان. لەکوفە نیشتەجێ بوو، یەکەم جار کە موسوڵمانان کوفەیان ئاوەدانکردەوە، ئەویش لەوێ خانویەکی بۆ خۆی دروست کردو ئیتر بوو بە نیشتەجێی ئەوێ، پیاوێکی خانەدانی بەتەمەن بوو، خاوەنی ڕێزو قەدرێکی تایبەتی بوو، لەهۆزەکەیدا قسەی دەڕۆیی‌و دەم سپیان بوو.

لەگەڵ عەلی دا ئامادەی شەڕی صەفین بوو، لەدژی حەزرەتی عائیشە،و لەصەفین لەموبارەزەیەکا، چووە مەیدان بۆ حەوشەبی ذوظەلیم، وە کوشتی. لەگەڵ خەڵکی کوفەدا نامەیەکیان نووسی بۆ حوسەینی کوڕی عەلی، کەبچێ بۆ ناویان، ئەوان پشتگیری دەکەن، بەڵام کە حوسەین چوو ئەوان پشتگیریان نەکرد، کاتێ حوسەین شەهید بوو ئەوان پەشیمان بوونەوە.

جا لەناو خۆیانا گوتیان: تەوبەو پەشیمانیمان قەبووڵ نییە، مەگەر لەسەر ئیمامی حوسەین خۆمان بدەین بەکوشت، جا لەسەر ئەم بناغەیە لەسەرەتای مانگی رەبیعی دووەما، ساڵی شەستو پێنجی کۆچی لەشکریان کردو لەنەخیلە کۆبوونەوە و، سولەیمانی کوڕی صورەدیان کرد بەفەرمانڕەوای خۆیان، وناویان نا فەرمانڕەوای تەوبەکاران (أمير التوابين).

ئەوجا خۆیو موسەییبی کوڕی نەجیبە لەگەڵ لەشکرێکی چوار هەزار کەسیدا لەتەوبەکاران کەوتنەڕێ، لە(عين الوردة) کەناوی شوێنێکە بەرەنگاری سوپای عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد بوون، لەنەبەردێکا سولەیمانو موسەییبو سوپاکەیان هەموو کوژران، ئەو دەمەی شەهید بوو تەمەنی نەوەدو سێ ساڵ بوو، ئەوەی کوشتی ناوی یەزیدی کوڕی حوصەینی کوڕی بەهز بوو، تیرێکی پێوەناو بەو تیرە مرد، جا سەری سولەیمانو سەری موسەییبیان بڕیو، بەدیاری بردیان بۆ مەروانی کوڕی ئەلحەکەم! (بڕوانە: ژمارە: ١٠١٥ ت =٢٣٠٧ ف).

١٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (التَّثَاؤُبُ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَالَ هَا ضَحِكَ الشَّيْطَانُ) (الحديث ٣٢٨٩، طرفاهُ في: ٦٢٢٣، ٦٢٢٦) [(٣٧٨)].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (باوێشك لەشەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات، با هەتا دەتوانێ بەری بگرێو بیداتە دەواوە، چونکە کاتێ ئێوە باوێشك دەدەنو لەکاتی باوێشکدانەکەدا دەم دادەچەقێننو دەڵێن: هاها، شەیتان لەخۆشییانا بەوە

(٣٧٨) أخرجه مسلم في الزهد والرقائق، باب: تشميت العاطس... رقم: ٢٩٩٤.

پێدەکەنیّ!) (ریاض/٢ل- ٣٢٩ف- ٨٧٨ ز- ١٤٢ — باسی: دەستوورەکانی نزای پژمین و باوێشك).

١٣٢٧- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ وَالْحُلُمُ مِنَ الشَّيْطَانِ فَإِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ حُلُمًا يَخَافُهُ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لا تَضُرُّهُ) (الحديث ٣٢٩٢، أطرافُهُ في: ٥٧٤٧، ٦٩٨٤، ٦٩٨٦، ٦٩٩٥,٧٠٠٥، ٧٠٤٤)[٣٧٩].

ئەم فەرموودەیە لە تاج دا ئاوایە، کە دەبیّ بەروونکردنەوەی تەواو بۆ گێڕانەوەی ئێرە:

ئەبوقەتادە(رەزای خوای لیّ بیّ) فەرمووی: جاری وادەبوو خەونی وام دەبینی نەخۆشی دەخستم، هەتا جاریّ گوێم لیّ بوو لەسەروەرر دەیفەرموو: (خەونی باش لەخوداوەیەو خەونی خراپ لەشەیتانەوەیە، جا هەرکاتیّ یەکێکتان خەوێکی خۆشی دی بانەیگێڕێتەوە بۆ کەس، مەگەر بۆ دۆستو خەونزان، بەلاّم ئەگەر خەوێکی ناخۆشی دی، با لەلای چەپیەوە سیّ تف رۆبکا، وە پەنا بگریّ بەخودا لەشەڕی شەیتانو لەشەڕی ئەو خەونە و، ئیتر بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر خوا یاربیّ زیانی بۆی نابیّ) (تاج/٨ل-٥ز-١٠١. باسی خەونو خەون بینین. ف-٣).

١٣٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَتَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلاثًا فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيْشُومِهِ) (الحديث ٣٢٩٥)[٣٨٠].

---

(٣٧٩) قال في التاج: (رواه الأربعة: البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي) ولاحظ ماجاء بصدد هذا الحديث في خاتمة كتاب بدء الخلق في فتح الباري — المترجم.

(٣٨٠) اخرجه مسلم في الطهارة، باب: الإيتار في الإستنثار.. رقم: ٢٣٨.

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخۆشەویستەوە(درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ لەخەو خەبەرتان دەبێتەوە دەستنوێژێ بشۆرن، وەسێ جار هنگ بکەن‌و ئاو لە لووتدان رادەن، تالووتتان لەئازار پاك بێتەوە، چونکە شەیتان لەناو سەرووی کونە لووتی نووستوودا شەو دەکاتەوە!).

١٣٢٩-عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ فَإِنَّهُمَا يَطمِسَانِ الْبَصَرَ وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَلَ) (الحديث٣٢٩٧، أطرافُهُ في: ٣٣١٠، ٣٣١٢، ٤٠١٦، ٤٠١٧) (٣٨١).

ئیبنو عومەر(رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) لەسەر مینبەر ووتاری دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: (هەموو جۆرە مارێ بکوژن، بەتایبەتی ئەو چەشنە مارانەی کە دوو هێڵی رەش وەك هێڵی پەلکە خورما وابەسەر پشتیانەوەو هەروا کوڵەوەیباب، چونکە ئەم دوو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبەن‌و سك لەباری ژن دەبەن، ئەوەندە رەزایان تاڵە و،ئێسکیان قورس‌و رەزایان بێ رەزایە، تەنانەت بەچاوپێکەوتنیان ئاوی چاو دادێ‌و کۆرپەلە لەبار دەچێ!) (تاج/٤ل –١٩ ز- ٥ ف –١. باسی ماری ماڵی ناوماڵ..).

١٣٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (رَأْسُ الْكُفْرِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلاءُ فِي أَهْلِ الْخَيْلِ وَالإِبِلِ وَالْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ) (الحديث ٣٣٠١، أطرافُهُ في: ٣٤٩٩، ٤٣٨٨، ٤٣٨٩، ٤٣٩٠) (٣٨٢).

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەرچاوەی کوفرو بێباوەڕی لەلای خۆرهەڵاتەوەیە، شانازیکردن‌و فیزو

---

(٣٨١) أخرجه مسلم في السلام، باب: قتل الحيات وغيرها رقم: ٢٢٣٣.

(٣٨٢) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: تفاضل أهل الإيمان فيه... رقم: ٥٢.

دەعیە نواندن پیشەی خاوەن رەوگو خاوەن رانەوشترو وشتردارەکانە، بەلاّم هێمنیو سەلاری پیشەی خاوەن پەزو خاوەن رانو مالاّتە). (ش/ت) (تاج/٥ل-٢٣٨ز-٦٦ف- ٣، ٤، ٥. باسی چاکیی چەن هۆزێکی عەرەب).

١٣٣١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَشَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ نَحْوَ الْيَمَنِ فَقَالَ: (الإِيمَانُ يَمَانٍ هَا هُنَا أَلا إِنَّ الْقَسْوَةَ وَغِلَظَ الْقُلُوبِ فِي الْفَدَّادِينَ عِنْدَ أُصُولِ أَذْنَابِ الإِبِلِ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ فِي رَبِيعَةَ وَمُضَرَ) (الحديث ٣٣٠٢،أطرافُهُ في: ٣٤٩٨، ٤٣٨٧، ٥٣٠٣) (٣٨٣).

عوقبەی کوڕی عەمر، ناسراو بەئەبو مەسعوود(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەی بۆ لای یەمەن کردو فەرمووی: (یەمەن کانگەی باوەڕو ئیمانە، دڵڕەقیو دڵڕەشیش وا لەناو قیژنە دەنگ دراوەکانا، ئەوانەی کەهەر خەریکی خزمەتی رەوگو وشترو گاو گوڵکو کوڵك وموون!

کە لەو جۆرە جێگایانەدا، لەو شوێنانەدا دووشاخەی شەیتان هەڵدێ، کە ئەم مالاّتداریو ئاژەڵدارییە پیشەی هۆزی رەبیعەو هۆزی موضەرە) (تاج/٥ل-٢٣٩ف -٥ + ٤ + ٣).

١٣٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَانًا) (الحديث ٣٣٠٣) (٣٨٤).

---

(٣٨٣) اخرجه مسلم في الإيمان، باب: تفاضل أهل الإيمان فيه ورجحان أهل اليمن فيه، رقم: ٥١.

(٣٨٤) اخرجه مسلم في الذكر والدعاء والتوبة، باب: استحباب الدعاء عند صياح الديك، رقم: ٢٧٢٩.

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ گوێتان لەقوقەی کەڵە شێر بوو، داوای بەهرەو بەخشش لەخودا بکەن، چونکە ئەوە بۆیە دەخوێنێ فریشتەی بینیوە، کاتێ گوێتان لەزەڕەی کەریش بوو، پەنا بگرن بەخودا لەشەڕی شەیتان، بڵێن: أعوذُ باللهِ من الشيطانِ، پەنا دەگرم بەخودا لەشەڕی شەیتان، چونکە ئەوە ئەو کەرە کە دەزەڕێنێ شەیتانی دیوە!). )ش/د/ت/ن. تاج/٩ل —٢٢٥ز- ٧٧. باسی گوتەی کاتی خوێندنی کەڵەباب و کاتی زەڕینی گوێدرێژ).

١٣٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (فُقِدَتْ أُمَّةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لا يُدْرَى مَا فَعَلَتْ وَإِنِّي لا أُرَاهَا إِلاَّ الْفَارَ إِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الإِبِلِ لَمْ تَشْرَبْ وَإِذَا وُضِعَ لَهَا أَلْبَانُ الشَّاءِ شَرِبَتْ) فَحَدَّثْتُ كَعْبًا فَقَالَ: أَنْتَ سَمِعْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُهُ: قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ لِي مِرَارًا فَقُلْتُ: أَفَأَقْرَأُ التَّوْرَاةَ؟) (الحديث ٣٣٠٥) [(٣٨٥)].

ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بەرەیێ لەنەوەی ئیسرائیل، واتە: لەمڵەتی جوولەکە، بزربوون و بێ سەروشوێن ڕۆیشتوون، کەس نازانێ چییان بەسەر هاتووە، وەمن وادەزانم کەبوون بەمشك، وە ئەم مشکانەی ئێستا هەن لەو بەرەبابەن، چونکە مشکیش وەك جوولەکە ئەگەر شیری وشتری بۆ دابنرێ، نایخواتەوە، بەڵام ئەگەر شیری مەڕی بۆ دابنرێ دەیخواتەوە.

جا کاتێ ئەم فەرموودەیەم بۆ کەعبولئەحبار گێڕایەوە، گوتی: تۆ خۆت ئەمەت بیست کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) وا بفەرمووێ؟ گوتم: بەڵێ، چەند جارێ ئەمەی لێم دووبارەکردەوە، منیش لەوە بێزاربووم و پێم گوت: خۆ من تەوراتت بۆ ناخوێنمەوە، هەتا تۆ مەودای ڕەخنەگرتنت هەبێ،

---

(٣٨٥) أخرجه مسلم في الزّهد والرقائق، باب: الفأر وأنه مُسخ، رقم: ٢٩٩٧.

لەگێڕانەوەکەی من بەوێنە بڵێی: کەی شتیوا لەتەوراتا هەیە، من فەرموودەی پێغەمبەرت بۆ دەخوێنمەوەو تەواو!). (ش‌تاج/٤ل- ١٨از- ٤ف- ١٠. باسی ئەو گیانلەبەرانەی کە گۆشتیان ناخورێ).

١٣٣٤- عن أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً وَالأُخْرَى شِفَاءً) (الحديث ٣٣٢٠، طرفُهُ في: ٥٧٨٢)[٣٨٦].

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر ریکەوت مێش کەوتە ناو خواردنەوەی کەسێکتانەوە، بابەچوکڵێ یا بەشتێ نوقمی بکا، ئەوجا دەری بهێنێ‌و فڕەی بدا، حیکمەتی ئەوەش ئەمەیە: چونکە باڵێکی دەردی پێوەیەو ئەو باڵەکەی تری دەرمان جا کاتێ دەکەوێتە ناو شتێکەوە دەردەکە پێش دەخا، کە باڵەکەی تریشی نوقم بوو، دەرمانەکەش کاریگەری خۆی دەبینێ!).

١٣٣٥-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (غُفِرَ لامْرَأَةٍ مُومِسَةٍ مَرَّتْ بِكَلْبٍ عَلَى رَأْسِ رَكِيٍّ يَلْهَثُ قَالَ: كَادَ يَقْتُلُهُ الْعَطَشُ فَنَزَعَتْ خُفَّهَا فَأَوْثَقَتْهُ بِخِمَارِهَا فَنَزَعَتْ لَهُ مِنْ الْمَاءِ فَغُفِرَ لَهَا بِذَلِكَ) (الحديث ٣٣٢١، طرفُهُ في: ٣٤٦٧)[٣٨٧].

واتای ئەم فەرموودەیە بەتەواوی لەپێشەوە رابوورد، لەم بەرگەدا، ژمارە: ١٠٣٨ تەجرید= ٢٣٦٣ فتح. جیاوازییەك هەیە لە گێڕانەوەی پێشەوە ئاودەرەکە بەسەگەکە پیاوە، لێرە ژنێکی سۆزانی داوێنپیسە.

---

(٣٨٦) لم يوافقه مسلم على إخراج حديث أبي هريرة: ( إذا وقع الذباب في إناء) (خاتمة كتاب بدء الخلق ج/٦ص٣٦٠ + ص٥١٨ ط. ج) - المترجم.

(٣٨٧) راجع رقم: ١٠٣٨ تجريد = فتح من هذا المجلد — المترجم.

نامەی بەدئی خەلق تەواو سەرەی نامەی (أحاديث الأنبياء)ە شەوی نۆی رەمەزانی سالّی ١٤٢٤ ك= ٢٠٠٣/١١/٤ ز سلێمانی. مالّی خۆمان خوابیپارێزێ. ئامین. سەعات سێ چارەکێ کەمی شەو. سەرەی بەرگی چوارەمە خوایاربێ بە(أحاديث الأنبياء) دەست پێ دەکا.

خوادایە بەبەرەکەتی ئەم کتێبەو بەبەرەکەتی ئەم مانگە دەرفەتم بۆ برەخسێنی، کەلەپاش بەرگی چواری ئەم کتێبە پیرۆزە (مختصر صحيح مسلم للحافظ المنذري) یش تەرجەمە بکەمو وەری بگێرمە سەر زبانی شیرینی کوردی، وەلەم ماوەیەدا بەئاسوودە بژین لەسای سێبەری ئەم باخچەگەلانەدا خۆمانو مالّو منالّو دۆستو برادەرمانو هەرکەسێ خزمەتی ئەم کتێبە پیرۆزانە دەکا. ئامین.

بەرگی سێهەم تەواو، خوا یاربێ سەرەی بەرگی چوارەمە لەم پەڕاوە پیرۆزە، کە دوابەرگە، کەبە (كتاب أحاديث الأنبياء) دەست پێ دەکا.

وەرگێڕ نوری فارس حەمەخان حەسەن

٢٠٠٣/١١/٤ زایینی

# پێڕستی بابەتەکان


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| **٣٩- نامەی کڕینو فرۆشتن (کتاب البیوع)** | ٥ |
| باسی مامەڵە خۆشی | ١٧ |
| باسی بازاڕو سەوداو مامەڵەو ئەیارەو پێوانە | ٣٠ |
| باسی هەندێ دەستووری فرۆشتنی خۆراكو شت شاردنەوە بۆکاتیگرانی | ٣٩ |
| هەندێ مامەڵەو سەودای تایبەتی، یا نەیی لێکراو | ٤٤ |
| باسی کڕینی وێنەی شتی بێ گیان | ٦٣ |
| مرۆڤی ئازاد نافرۆشرێ | ٦٤ |
| **٤٠- نامەی سەلەم** | ٦٩ |
| **٤١- نامەی شوفعە** | ٧١ |
| **٤٢- نامەی بەکرێدان (کتاب الإجارة)** | ٧٤ |
| **٤٣- (نامەی بەرەو ڕوکردنەوە -حەواڵە) (کتابُ الحوالات)** | ٨٨ |
| قەرزی مردوویش دروستە هەواڵەی سەرکەسێ تر بکرێ | ٨٩ |
| **٤٤- نامەی دەستە بەربوون (کەفالەت) (کتاب الکفالة)** | ٩٠ |
| **٤٥- نامەی جێداریی، واتە: وەکالەت (کتابُ الوکالة)** | ٩٢ |
| **٤٦- نامەی کێلانو زەوی دان بە موڵکانە (باب الحرثِ والمزارعة)** | ١٠٥ |
| باسی زەوی بێ خاوەنو ئاوەدان کردنەوە | ١١٥ |
| **٤٧- نامەی باخەوانی(مساقات) و شت خواردنەو خێری ئاوو بیرو شتی تری لەم بابەتە (کتاب المساقاةِ (الشُّربُ)** | ١٢١ |
| باسی زەویو زاری خەڵاتی | ١٣٦ |
| باسی مافی هاموشۆو ئاودانو شتیوا | ١٣٧ |
| **٤٨- نامەی قەرزکردنو دانەوەی قەرزو دەست ستو نابووتی (کتابُ الإستقراض وأداء الدیون والحجر والتفلیس)** | ١٣٩ |
| **٤٩- نامەی دژایەتی (کتابُ الخصوماتِ)** | ١٤٤ |
| **٥٠ - نامەی دۆزراوە (کتابٌ في اللُقطة)** | ١٤٨ |

٥١- نامەی نارەواییەکان (کتابُ المَظالِمْ) ١٥٠
٥٢- نامەی هاوبەشی (کتابُ الشِركة) ١٦٤
٥٣- نامەی بارمتە (کتاب الرّهن) ١٧٣
٥٤- نامەی کۆیلە ئازادکردن (کتاب العتقِ) ١٧٥
نامەی نامەنووسی (کتابُ المُکاتِب) ١٨٢
٥٥- نامەی بەخشینو بەهرەی شت بەخشینو دیاری ١٨٥
٥٦- نامەی شایەتیدان (کتابُ الشهاداتِ) ٢٠٦
هەڕەشەکردن لەشایەتی درۆ ٢٠٦
شایەتی کوێرو بانگو سەوداو مامەڵەیو شتی تری وای کە پەیوەندی بەدەنگەوە بێ دروستە ٢٠٧
داستانی هەلاتو بوختانە گەورەکە (حديث الإفك) ٢٠٨
٥٧- نامەی ڕێکەوتن (سوڵح) (کتاب الصلح) ٢٢٩
٥٨- نامەی مەرجەکان (کتابُ الشروط) ٢٣٦
مەرجێ کە شەرعی نەبێ پووچە ٢٣٧
باسی مەرج لە غەزاداو، ڕێکەوتن لەگەڵ دوژمنو دەستەی جەنگ دا ٢٤٠
٥٩- نامەی راسپێری (وەسێت) (کتاب الوصايا) ٢٦٥
٦٠- نامەی خەبات وتێکۆشانو غەزاو ژینนامە ٢٧٦
باسی گەورەیی خەباتو غەزاکردنو ژیننامە ٢٧٦
باسی پەرییە چاو بەڵەکەکانو جۆنیەتی شێوەی شیرینیان ٢٨٠
خۆ شۆردن سوننەتە لەپاش شەڕو لەپاش تۆز ٢٨٩
ئیسلام بوونو شەهیدبوون هەموو تاوانێ دەشۆرنەوە ٢٩٠
شەهید بوون جۆری زۆرە ٢٩٢
خاوەنی عوزر بەقەد تێکۆشەران خێریان بۆ دەنوسرێ ٢٩٣
خەندەكو سەنگەر هەڵکەندن سوننەتن لەکاتی شەڕدا ٢٩٤
خێرو پاداشی سامان خەرج کردن لەڕێگەی خودادا ٢٩٩
خۆ بۆنخۆشکردن بەر لەدەستپێکردنی شەڕ ٣٠٠

| | |
|---|---|
| سووسەکردنو کۆکردنەوەی هەواڵی دوژمن | ٣٠١ |
| خێرو خۆشی لەناوچەوانی وڵاخی بەرزە گرێدراوە | ٣٠٢ |
| شوومیو بەدبوومیو هەندێ باسی تری وڵاخی سواری | ٣٠٦ |
| هاوبەشیو بەشداری کردنی ژن لەبەرەی جەنگا | ٣١٠ |
| پیتو فەڕی نزاو پاڕانەوی زەبوونان یەکێکە لەهۆی سەرکەوتن | ٣١٥ |
| باسی هەندێ کەرەستەی جەنگو هەندێ وردە بابەتی تری کاتی جەنگ | ٣١٧ |
| شەڕ لەگەڵ هەندێ نەتەوەدا | ٣٢١ |
| لەکاتی جەنگ دا نزاو پاڕانەوە پەسەندەو بەسوودە (هەروا لەسەرتاوە بانگ بکرێن بۆ سەر ئایینی ئیسلام) | ٣٢٤ |
| لەدەمەدەمی گەرمەی جەنگا پاڕانەوە پەسەندە | ٣٢٥ |
| خواحافیزیو دەرچوون بۆ سەفەرو بۆ غەزا لەرۆژی پێنج شەممەدا سوننەتە | ٣٣٠ |
| فەرمانبەریی فەرمانڕەواو پەیمان پێدانی | ٣٣١ |
| ئەرکێ دەخرێتە سەرشانی غەزاکار کە لەووزەی دا هەبێ | ٣٣٨ |
| کاتی هەڵبژاردەی دەست پێکردنی جەنگ | ٣٣٩ |
| باسی ئاڵاو کرێکار لەغەزاداو هەندێ هۆی سەرگەوتنو وردەشتی تر | ٣٤١ |
| سەفەر بەقورئان بۆ وڵاتی دوژمن ناباشە، زیکر لەسەفەردا | ٣٤٦ |
| سەفەرکردن بەتەنها یا بە بێفەرمانی باوكو دایك | ٣٥٠ |
| هەندێ بابەتی جیاجیا لەکاتی غەزادا وهەندێ مەهانەی رەوا | ٣٥١ |
| کوشتنی ژنو مناڵو سووتاندن بەئاگرو دیلو بارمتەو.... | ٣٥٣ |
| دووبەرەکیو بەگوێ نەکردنی فەرمانی سەربازیو هەندێ بابەتی تر | ٣٥٨ |
| گزیو دەسپیسی وبەرێکردنو پێشوازی خەباتگێران | ٣٧٠ |
| **٦١- باسەکانی پێنج یەك (أبواب الخمس)** | ٣٧٦ |
| **٦٢- باسی سەرانەو نەشەڕو نەجەنگ (أبواب الجزيةو الموادعة)** | ٣٧٩ |
| **٦٣- نامەی سەرەتای دروستبوان(مەخلوقات) (كتاب بدء الخلق)** | ٣١٣ |
| پێڕستی سەرباسەکان | ٤٥٥ |

بحمد الله